

تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
جەمهوریەتی کوردستان
لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی وسیاسییە
مەحمود مەلا عززەت

مەحمود مەلا عززەت

# جەمهوریەتی کوردستان

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسییە

سلێمانی 2001

- ناوی کتێب: جەمهوریەتی کوردستان
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- ناوی نووسەر: مەحمود مەلا عززەت
- تایپ: شیروان عزت/ تارا رەئووف
- مۆنتاژی کۆمپیوتەری : سەیران عبدالرحمن
- تیراژ : 750 دانە
- ژمارەی سپاردن: ( 252 )ی 2001
- چاپی یەکەم: سلێمانی 2001
- چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم






زنجیرە کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ( 124 )

## ناوەرۆك

# پێشەکی

جەمهوریەتی کوردستان ڕووداوێکی مێژوویی و سەردەمێکی حوکمڕانیی خۆماڵیی گرنگ و هەستیاری نەتەوەکەمانە، بابەخەکانی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەڕوداوەکانی، پڕن لەدەرس و پەند بۆ ئەمڕۆو بۆ ئاییندەی خەباتی میللەتەکان و ئەزمونی حوکمی خۆماڵیی، زیاتر لەوە ئەو مێژووە دووەم هەلی ڕەخساوی ناو ساڵانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بوو کە لەناو بارودۆخی نێودەوڵەتیدا خوڵقاو بوو بە دەرفەت و فرسەتێکی ئەوتۆ کە سەرەتای بەدەستهێنانی مافە مێژووییەکەی نەتەوەی کوردی لێوە ببینرێت...

لەبەرئەوانەو هەر لەسەرەتای ژیانی نوسین و لێکۆڵینەوەوە، بایەخێکی تایبەتیم بەڕووداوەکانی تەمەنی کەمتر لەیەك ساڵەی جەمهوریەتەکەو نزیك بەپێنج ساڵەی ئەزمونەکەی مەهاباد داوە. بۆ زیاتر لەسیی ساڵ دەچێت لەناو روداوو بووارو بابەتەکانی ئەم مێژووە باس و لێکۆڵینەوە بڵاودەکەمەوە سیمینارو پەنێلم لەسەر گرتوە، بەرهەمو لێکۆڵینەوە بڵاوکراوەکان، چ وەك کتێب و نامیلکەو چ وەك باس و بڵاوکراوە لەرۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەکانی کوردستان و دەرەوەی وڵاتدا گەیشتونەتە سنورێك، کە کتێبخانەی کوردی و بواری کۆمارناسیی دەوڵەمەند بکەن.

بەتایبەتیی لەو سێ ئەزمونی ئەو سێ هەلە مێژوویەی لەسەدەی بیستەمدا خوڵقاو دووانیان، مەبەستم: حوکمداریی و مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمودی نەمرە لەباشوری کوردستان(1918–1924)، وەجەمهوریەتی کوردستانە لەناوچەی موکریان (1/22–12/17–1946)، لەگەڵ ئەزمونەکەی ئەم هەلە مێژووییەی ئێستا کەلەکوردستانی عیراقدا دەوامی هەیە، ئەو روداوانە سێ هەلی مێژوویی ناو زەمینەیەکی سیاسیی ئەوتۆن کە کۆمەڵێك هۆو هۆکاری پێکهێنانی هەر یەکەیان لەوانی تر دەچن، کێشەکانی سەردەمی ژیانی هەریەکەیان و نەمانیان... لەیەکچوونی زۆری تێدایە.. هۆو هەلومەرجەکانی ڕەخساندنی ئەزمونەکان.. ئاستی بارودۆخە سیاسی و جیۆستراتیجی و ململانێ و ڕەوتی ڕووداوەکان.. فاکتەری گوشارو

کاریگەرییەکانی سەر ئاڵۆزیی و پیلانەکان.. ڕۆڵی زلهێزەکان و ناکۆکی و ململانێ لەسەر مەسەلە ئابوری و ناوچە جوگرافی و ستراتیجەکان.. هەڕەشەکانی ناوخۆو دەوروپشت و عامیلی زلهێزەکان و ڕۆڵیان لەناوچەکەدا. ئەوانە چەند هۆو فاکتەرێکی گرنگ و سەرەکین کەلەهەر سێ ڕووداوەکەدا بەجیاوازیی زەمین و زەمان و موعادەلە نێودەوڵەتییەکان زۆر هۆو عامیلی لەیەکچویان تێدایەو دەکرێ لێکۆڵینەوەی زۆریان لەسەر بکرێت.

میتۆدی نوسینی باس و لێکۆڵینەوەکان مەنهەجیی و پشت بەستووە بەرێبازی زانستیی لەلێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا، زانستی و بابەتییە لەلێکدانەوەو شیکردنەوەکاندا... پشت بەستوون بەبەڵگەنامە ڕەسەنەکانی سەردەمی جەمهوریەت و هی ناو ئەرشیفەکانی دەوڵەتانی هاوپێوەندن بەئەزمونەکەو بەناکۆکی و ململانێ لەسەر ناوچەکەو لەسەردەمەکەدا...

لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانی دوو توێی ئەم بەرهەمەم کردووە بەیانزدە بەشەوە، بەپێشەکییەکی کورت و کردنەوەی دەروازەیەك دەستم پێکردووە کەلێوەی و بەکورتی و چڕی دەچینە ناو دنیای نوسین و لێکۆڵینەوەکان لەسەردەمە جیاجیاکاندا، بەڵگەنامەو سەرچاوە ڕەسەنەکان بۆ لێکۆڵینەوەکان.

بەشی یەکەم بۆ جۆری نوسینی مێژو بەرێگە زانست و بابەتیانەکەی تەرخان کراوە ... لەبەشی دووهەم-دا باس لەکۆمەڵگەی کوردەواریە بەسەرنجێکی خێرا.

لەوێوە باس لەو جەنگ و پێکادانانەیە کەلەکوردستانداو بۆ کوردستان کراون.. ئینجا هۆکارەکانی دەخرێنە بەر باس و شیکردنەوەکە چۆن بوونەتە هۆی ناسروشتیی گەشەکردنەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی... دوا بەدوای ئەوەش روناکیی دەخرێتە سەر سیاسەتی دەوڵەتە داگیرکەرو ئیمپریالیستەکان.

بەشی سێهەم، لەسەر بزووتنەوەی کوردایەتییە کە چۆن لەسەردەمی هاتنی لەشکری سورەوە گەلێك هۆ یارمەتیدەر خولقاون و ڕاستەوخۆ کاری خۆیان لەسەر بەهێز بوونی بزوتنەوەی کوردایەتی کردووەو ئەمیش چۆن هۆیەکی زەمینە هەڵخەری دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان بووە.

لەناویاندا تیشك دەخرێتە سەر هۆیە سەرەکییە دەرەکی و خۆییەکان.

لەبەشی چوارەم-دا باس لەکورتەیەك لەمێژویی بزوتنەوەی پێکهێنانی رێکخراوی سیاسییو چالاکییەکانی هەر رێکخراوە دەکرێت، هەر لەکۆمەڵی ئیستخلاسی کوردستانو کۆمەڵی جیهاندانەوە تا حزبی ئازادیخوازانی کوردستان، کۆمەڵەی ژ.ك وەحزبی دیموکراتی کوردستان لەناویاندا باس لەبڵاوکراوەو چالاکیو ئامانجەکانی هەریەکە دەکرێت، بەبەراوردێك لەمەیدانی ئامانجو رێکخراوەیی، بەرنامە، سیاسەتو ستراتیجی هەریەکە لەم دوو رێکخراوە.

بەشی پێنجەم-یش سەرەتاکانی ژیانی سیاسیو چالاکیو پێوەندییەکانی کورد بەجیهانی دەوروپشتی دەخرێتە پێش چاو.. تا سەردانەکەی باکۆو سەرەتای وتووێژو هەڵوێستی سۆڤیەتو دوا بیرورِاکانیانو ئینجا سوربوونی کورد لەسەر وەرگرتنی مافی خۆی لەدامەزراندنی جەمهوریەتێکی خودموختار لەگەڵیاندا باس لەجۆری دامەزراندنی دامو دەزگاو وەزارتەکان دەکرێت.

روناکیی دەخرێتە سەر ناوی مێژویی قەوارەکە بەناوە حکومەتییو دەوڵەتییەکانەوە، لەگەڵیشیدا بەلێکۆڵینەوەیەکی پرِ لەبەڵگەو بەڵگەنامە ئەوە دەسەلمێنرێت کە قەوارەکە جەمهوریەتێکی خودموختار بووە نەك سەربەخۆ.

بەشی شەشەم بۆ توێژینەوەو هەڵسەنگاندنێکی چینایەتیو کۆمەڵایەتیی سەرکردایەتی حزبی دیموکراتو جەمهوریەتی کوردستان تەرخان کراوە، ئینجا روناکی دەخەینە سەر سروشتو خەسڵەتە تایبەتییەکانی جەمهوریەتی کوردستان..

بەشی حەوتەمیش تەرخانە بۆ تیشك خستنە سەر سەرەنجامی دامەزراندنو روخاندنی کۆمارە بەدەرخستنی قازانجو دەستکەوتەکانی جەمهوریەتی کوردستان.

لەبەشی هەشتەمیش دا گەلێك لێکۆڵینەوە لەسەر چەندین روداوو دیاردەی سەردەمەکە دەکرێت، باس لەناکۆکیو ململانێیەکان، ئاڵۆزییەکانی چواردەوری کۆمەڵگەی کوردەواریی، پیلانەکانی دوژمنان بەتایبەتی ئەرتەش، کەئەوەش بووە هۆی پێکهاتنی هەردوو کۆمار بەرێککەوتنێکی سیاسییو سەربازی... ئینجا چۆن تاران هەوڵی لەیەك دابرِینی ئەو دوو کۆمارەی داوە، لەوێوە بۆ بەسەرچوونی سەردەمی روناکی قەوارەکەو دەرکەوتنی ناکۆکییەکانو بۆ رۆژو ساتەکانی دواییو رودانی کارەسات... گرتنی قازی محەمەدو هاورِێکانی مەحکەمەکردنو حوکمی لەسێدارەدانو جۆری جێبەجێکردنی.

لەبەشی نۆهەمدا باس لەو هۆو فاکتەرانە دەکرێت کە جەمهوریەتی کوردستان-یان روخاند.. بۆچی وا ئاسان روخێنرا.. لەناویدا هۆیە خۆیی و دەرەکییەکان روناکیان دەخرێتە سەر.

دوابەدوای ئەوانەو لەبەشی دەهەمدا دەرس و پەندەکانی جەمهوریەتەکە لەدامەزراندن و روخاندن و سەرەنجامەکاندا دەخرێنە بەرچاو...

لەکۆتاییشدا لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەسەر ئەزمونەکەی مەهاباد کە تەمەن پێنج ساڵ و جەمهوریەتەکەی کوردستان کە نزیك بەساڵێکی خایاند، بەسەر باسی تێڕوانینێکی سەردەم لەجەمهوریەتەکەی کوردستان دەخرێتە بەر دیدی خوێنەر.

دەبو ئەم بەرهەمە گەلێ پاشکۆ بگرێتە خۆی، بەتایبەتی پاشکۆی ناو، زۆر لەبەڵگەنامەکانی سەردەمەکەی لەگەڵ بووایە، گەلێك نەخشەو وێنەی جۆراو جۆری بگرتایەتە خۆی، بەڵام نەبوونی کات و گەورەبوونی بەرهەمەکە دوو هۆی سەرەکین لەبەدینەهێنانی ئەو خواستانە.

سلێمانی

ئایاری *2001*

# دەروازەیەك

یەکەم کتێبێك کەلەلایەن کوردێکەوە لەسەر جەمهورییەتی کوردستان نووسرابێت لەساڵی نوسین و سەردەمی لەچاپدان و بڵاوکردنەوەشی، کۆماری میللی مەهاباد بوو.

سەرەتای لەدایکبوونی (ئەو کتێبە) ئەپریلی ساڵی (*1971*) بوو، لەم ساڵەداو دوایيتریش لەساڵی (*1979*)دا، دوای دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێران و رەخساندنی زەمینەی بوژاندنەوەی کوردایەتیی، دوو تەقەللا بۆ لەچاپدانی ئەو بەرهەمە بێئەنجام بوون. کەلەساڵی (*1984*)یشدا هەوڵمدا ئەو دەستنووسە بگەیەنرێتە دەستم بۆ سوید، تالەوێ بەچاپی بگەیەنم، ئەمجارەیان رێگاوبان بووە کۆسپ، ئیتر "یەکێتی نوسەرانی کوردستان" هەر لەساڵی *1984*دا بەچاپکردن و بڵاوکردنەوەی هەستاو نوسخەیەکیشان گەیاندە دەستم. لەسویدیش بەبێ‌دەستکاریی، جگە لەزیادکردنی پێشەکییەکی کورت بۆی، سەرلەنوێ چاپ و بڵاومکردەوە. تا ئەو کاتانەو تێپەڕبوونی نزیکەی چواردەساڵیش بەسەر نووسینی ئەو بەرهەمەداو تا ساڵی "یەکەم چاپکردنیشی". ئەوە یەکەم کتێب بوو کەمێژوونووسێکی کورد لەسەر جەمهوریەتی کوردستان نووسیبێتی و بڵاوکرابێتەوە. دووەم کتێبیش بوو لەدوای دانراوەکەی (ولیام ئیگلتن) بەناوی "کۆماری کورد *1946*" بەزمانی ئینگلیزیی، لەلەندەن لەساڵی *1963*دا بڵاویکردەوە.

گرنگیی مێژوویی و سەنگی بابەتییانەی لێکۆڵینەوە سیاسییەکەی ئەو بەرهەمە هەر لەوەدا نەبوو، بەڵکو لە بایەخپێدانی مێژونووس و نووسەرانی رووداوەکانی سەردەمەکەش‌دا دەرکەوت کەدیارە ئەویش بەهۆی رێبازە زانستیی و بابەتیانەکەیەوە بوو، بۆ نموونە د. عەبدولڕەحمان قاسملو لەنووسینی (چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادیدا) ئەو بەرهەمەی وەك تاکە سەرچاوە بەزمانی کوردیی وەرگرتووە، لەگەڵ (دوو) نووسینی خۆی و (سێ)ی حزبی دیموکرات و رۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمەکەو سەرچاوەی بیانیی کەسەرجەمیان (*10*) سەرچاوە بوون*.

---

* ئەوەی جێگەی سەرنجە ح.د.ك-ا دووەم چاپی کتێبەکەی قاسملۆی بڵاوکردەوە بەبێ ئەوەی لەنووووسینی سەرچاوەکاندا، وەك چاپەکەی یەکەم... ناوی ئەو کتێبەی منیان نووسیبێت.

دیسان نرخاندنی ئەو کتێبە لەنامەکەی زانای هەڵکەوتووی کورد دوکتۆر کەمال مەزهەردا دەردەکەوێ. کاتێك بۆ هەوڵی لەچاپدانی، بەرهەمەکەم خستە بەردەستی، تا لەرێنمایی و بۆچوونەکانی ئاگادارم بکات، ئەویش بەنامەیەك وەڵامی داواکەمی دایەوە کەلێرەدا، ئەو بەشەی پێوەندیی بەو بۆچوونەوە هەیە دەخەمە پێش چاوی خوێنەری ئازیز:

**پوختەی نامەکەی دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد:**

بەرێزکاك مەحمود

دوای سڵاوی زۆرم

دەبو لەدەمێکەوە وەڵامی نامەکەت بدەمەوە، هەندێك کاری تایبەتی‌ی خۆم بووە هۆی دواکەوتنم، داوای لێبووردنت لێ‌دەکەم.

بەوردی بەرهەمەکەتم خوێندەوە. سوپاسی بڕوات دەکەم کەدەتەوێت بیری من بەرامبەری بزانیت.

وابەکورتی ئەو لایانانەی بەیادما هاتون دەیانخەمە بەرچاوت. هیوادارم سودیان هەبێت.

—بەر لەهەموو شت پیرۆزبابیت لێ‌دەکەم، بێ‌گومان خۆت هیلاك کردووەو دڵسۆزانە ویستوتە بەرهەمێکی پڕ کەڵك بخەیتە بەردەم خوێندەواری کورد. ڕێبازی زانستی لەنوسینەکەتدا ئاشکرا خۆی نیشان داوە، هەرچەندە لایەنی تیۆری زۆر زاڵەو ئەوە جاروبار لەزەمینەی واقیع دوری خستویتەوە. دێمەوە سەر ئەم باسە. ئەو فەسڵەی بۆ باسی مێژوت تەرخان کردووە بۆ کورد پێویستە چونکە تائیستە مێژوو لای ئێمە بەر لەهەمو شت پیاهەڵدان و دەربڕینی هەستی رووتە. لەچەند شوێنێکدا دەکومێنت و بەڵگەی چاکت هێناوەتەوە کەسەرچاوەی ڕەسەنن بۆ لێکدانەوەی بەسەرهاتەکانی مەهاباد. زۆر چاکیشە کە دەستکاری‌ی ناوەرۆك و شێوازی نوسینیانت نەکردووەو وەك خۆیان نوسیوتنەوە.

—لەڕووی زمانەوە بەرهەمەکەت بەکوردی‌یەکی پاراوو ناسك و سادە نوسراوەتەوە کەهەمویان مەرجی پێویستە بۆ نوسینی سەرکەوتو. لەگەڵ ئەوەش چەند

تێبینی یەکم هەیە نمونەیانت دەخەمە بەرچاو، دیارە خۆت بڕیار دەدەیت پەسەندن یا نا...

دوای تێبینییەکان دکتۆر کەمال مەزهەر نامەکەی بەمجۆرە کۆتایی پێدەهێنێت:

-هیوادارم لەڕەقابە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەت بدەن، هەر لەبەرئەوەش من وای بەباش دەزانم چەند ناوێکی ناوی لابەریت. ئەگەر هاتو ڕێگەی چاپ دانی درا ئەوا بەهیچ جۆرێك لە 10 هەزار کەمتری لێ چاپ مەکە، چونکە کتێبەکە دەفرۆشرێت و زۆریشی دەگاتە ئەودیو. کۆتایی دیسان پڕ بەدڵ و گەرم پیرۆزباییت لێدەکەم. هیوادارم ئەم کارەت سەرەتای زنجیرەیەك کاری تری مێژوویی بێت کەئیمڕۆ و هەموکات بۆ گەلی کورد خزمەتێکی گەورەیە.

خۆشی و سەرکەوتنت. لەگەڵ ڕێزم

کەمال

1979-6-10

ساڵی پار کەبرایانی دەزگای سەردەم داوایان لێمکرد کە ئەو بەرهەمەم چاپبکرێتەوە، ئەوە داوای برایانی تری ڕێبازیی کۆمارناسیی وەبیرهێنامەوە کە دەمێ ساڵ بوو ئەوبیرەیان لام کردبوو بە پڕۆژەیەك، بەڵام بەدەستکارییکردن. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەو زانیارییانەی لەماوەی ئەو (30)ساڵەی بەسەر نوسینی بەرهەمەکەدا تێپەڕیوبو،بووە کۆسپی بەردەم بەئەنجامگەیاندنی پڕۆژەکە چونکە دەمزانیی کە وەختێکی زۆری دەوێت بەڵام کە بیرم لەهاتنەوەی یەکجاریی کردەوە، حسابی ئەوەم کرد کە وەختێکی زۆرم بەدەستەوەیە، بۆیە کەوتمە سەروکاری پێداچوونەوە. لەخوێندنەوەو پێداچوونەوەو شەن و کەوکردن و زیادوکەمکردنی باسەکان، کەدەمویست لەسنورێکی تەسکدا بێت. کەوتمە ناو دیاردەیەکی نوێوە، دیاردەی لێکۆڵینەوەیەکی نوێ.

ڕێبازو میتۆدی ئەم بەرهەمە، هەمان میتۆدی لێکۆڵینەوە مێژوییی و سیاسییەکەی کۆماری میللی مەهابادە..دیسان بۆ داڕشتنی قەوارەی باسەکان، گەلێك ئاڵوگۆڕو زیادکردنێکی ئەوتۆی تیاکرا، تا ئەو ئاستەی ببێتە بەرهەمێکی نوێ و ببێتە ئەو بەرهەمەی کە هەم لە ڕووی ناوو هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە سەنگین و فراوان و فرە باس بێت، وەهەم بژاری پەڵەبکرێت، هەڵەو کەبەهۆی کەمیی زانیاریی و نەبوونی سەرچاوە ڕەسەنەکان لەو ماوانەدا کەبەرهەمەکەی تێدا نوسرا ڕویاندابوو...بۆ نمونە بەهۆی ئەو زانیاریانەوە کە لەم ساڵانەی دواییدا کەوتونەتە بەردەست و هەڵوێستی خراپی بێ گریێ وگۆڵی یەکێتی سۆڤیەت و لێپرسراوەکانیان دەردەخەن، کەلەوەوبەر ئەو هەڵوێستانە تەمومژیان لەسەر بوو، بۆیە پاساو بۆ هەڵەکانیان هێنرابووە، یان وەك پێویست و لەبەر هۆ سیاسییەکان چاویان لێدەپۆشرا.. کۆماری میللی مەهابادیش لەو دیاردەیە بێبەش نەبوو، هەرچەند لایەنێکی ڕەخنەگرانەی زەقیشی لەخۆگرتبوو.

لەسەرچاوە ڕەسەنەکانی سەردەمەکە کەکەوتونەتە بەردەستم و بوونەتە هەوێنی ئەم بەرهەمە نوێیە:

یەکەم: *ڕۆژنامەی کوردستان، بڵاوکراوەی حزبی دیموکراتی کوردستان و زمانحاڵی جەمهوریەتی کوردستان: (66) ژمارە.

*گۆڤاری کوردستان، گۆڤاری بیری حزبی دیموکراتی کوردستان (4) ژمارە.
*گۆڤاری هەڵاڵە: (4) ژمارە.
*گۆڤاری گروگاڵی منداڵانی کورد (4) ژمارە.
*گۆڤاری نیشتمان، گۆڤاری کۆمەڵەی ژ.ك (9) ژمارە لەگەڵ یەك رۆژژمێر.
*گەلێك بڵاوکراوەی سەردەمەکە وەك: هەڵەکۆك، بەیان...هتد.

دووەم: *(557)بەڵگەنامەی لێپرسراوانی کۆمار لەوانە: (4) نامەی پێشەوا قازی محەمەد، نامەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی دیموکراتی کوردستان، پرۆتۆکۆلی ئەنجومەن (مجلس)ی ئەفسەرانی هێزی دیموکراتی کوردستان، بڕیارو نامەکانی وەزارەتو سەرۆکی ستادو فەرماندەو سەرلکی هێزەکان، جگە لەو دۆکومێنتو بەڵگانەی پەیوەندییان بەتۆماری نامەی هاتوو رویشتوو، ئازوقەو چەكو تەقەمەنیی تەسلیم کردن...تاد (7) نامەی سەیفی قازی، سەدان نامەی جەنراڵ حەمەرەشیدخانی بانە، (3) نامەی جەنراڵ بارزانی، (5) نامەی جەنراڵ عومەر خانی شەریفی، نامەی گەلێك لێپرسراوی تری وەك: محەمەدی نانەوازادە، جەعفەری کەریمی، عەبدولرەحمان زەبیحی، مەنافی کەریمی، ئەحمەی ئیلاهی، محەمەد قودسی، مستەفا خۆشناو، میرحاج، رەئیس بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، وەهاب ئاغای جوندیانی، ئەحمەد خانی فاروقی، هاشمی خەلیل زادە، نوری ئەحمەدی تەها، عەلی بەگ شێرزاد، حەمەئەمین خانی قادرخان زادە، مەجیدخانی حەمەرەشید خانو مرادی.. تاد)هەموو ئەمانەم لەئازاری 1973دا لەحەمەرەشیدخان وەرگرتو لە(3) بەرگی (دەوڵەتی جمهوری کوردستان) لەساڵانی (1992)،(1995)، (1997 دا لەسوید بەچاپم گەیاندنو ئێستاش بەرگی چوارەمم بەدەستەوەیە کەگەلێك بەڵگەنامەی‌تر دەگرێتەخۆی، لەناو ئەو نامانەدا ژمارەیەکیانم لەبرایانی هاوکاری ئەم مەیدانەم وەرگرت وەك لەشوێنی خۆیاندا ئاماژەم بۆ کردون.

لەو ماوانەی دوای نوسینی کۆماری میللی مەهاباد، جگە لەبەچاپگەیاندنی سێ بەرگەکەی دەوڵەتی جمهوریی کوردستان، کەتا ئەو کاتە بۆ یەکەم جارە لەمێژووی سیاسییو ئەرشیفی نەتەوەیی کورددا کارێکی وا گرنگو هەستیار بکرێو ژمارەیەکی وا زۆر لەبەڵگەنامەی سەردەمەکە، بەو جۆرە بخرێنە بەردەست

مێژونوس‌و نوسەران. زیاتر لەوانە گەلێ لێکۆڵینەوەو نووسینی مێژوویی‌و سیاسیم لەسەر ئەزمونەکەی مەهابادو کۆمارەکە لەگۆڤارو رۆژنامەکانی ناوەوەو دەرەوەی وڵات بڵاوکردۆتەوە کەبەگشتیی دەبنە بەشێکی گرنگ لەدەوڵەمەندکردنی بەرهەمە نوێیەکە، بۆ زیاتر سوود وەرگرتنیش لێیان، هەریەکە بەپێی دابەشبوونی بەشەکان‌و بابەتی هەربەشە، خراونەتە تەك ئەم چاپە.

سێیەم: لەم دەپانزە ساڵەی رابردوودا گەلێ خوێندکاری کورد لەدەرەوەی وڵات تێزی دوکتۆراو ماستەرەکانیان لەسەر کۆماری مەهاباد بڵاوکردەوە، گەلێ مێژوونوس‌و نوسەرانی‌تر چەندین باس‌و لێکۆڵینەوەی نوێیان لەسەر هەندێ لایەنی‌تری کۆمار بەچاپ گەیاند، لەوڵاتیش ژمارەیەك لەخوێندکار لەزانکۆی سلێمانی‌و سەلاحەددین بۆ خوێندنی باڵا لەگەڵ لایەنەکانی رۆژنامەو رۆژنامەنووسی‌و شیعرو شاعیران‌و بابەتی‌تر خەریکن. ئەوانەش هەموو گرنگییەکی‌تر دەدەن بەبواری زانستیانە لەنووسینی مێژووی جەمهوریەتی کوردستان کەچەند لایەنێکی‌تری نادیار دەخەنە بەرباس‌و توێژینەوەو ساغکردنەوە.. سوود وەرگرتن لەبەشێکی ئەوانە بەم بەرهەمە نوێیەوە دەردەکەوێت.

چوارەم: لەناو ئەرشیفەکانی دەوڵەتانی هاوپێوەند بەهەرێمەکەو بەو ئەزموونەی مەهابادەوە، زۆر نامەو بروسکەو گەلێ دۆکومێنتی گرنگ هەن، کەتائێستا هەندێکیان نەخراونەتە بەردەست، لەو ئەرشیفانەدا گەلێ هەوڵی دیپلۆماسییانەی ژمارەیەك لەسیاسییەکانی کورد لەگەڵ لێپرسراوانی زلهێزەکان دەکەونە بەرچاو کەبایەخێکی زۆری مێژووییان هەیەو رووناکیی دەخەنە سەر ئەم لایەنەی پەیوەندییەکانی کورد بەدەرەوە.

لەناو ئەوانەشدا فیلمێك لەسەر یەکێك لەسەردانەکانی پێشەوا بۆ تەورێز دەرکەوتووە کەلەگەڵ جعفر پێشەوەریدا مارشی سەربازیی بەبەردەمیاندا گوزەر دەکات‌و ئەمانیش سەلامیی سەربازییان بۆ دەکەن. دیسان بەشێ لەوانەش وەك سەرچاوە بۆ ئەم چاپە نوێیە سوودیان لێوەرگیراوە.

پێنجەم: هەر لەو ساڵانەدا گەڵێ بیرەوەریی و یادداشتی لێپرسراو یان هاوژیانی کۆمار بڵاوکراونەتەوە، یەکێك لەوانە (بەسەرهاتی کورد)ە، کەمیرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی نووسیویێتی و لەم دواییەدا لەدوو بەرگدا چاپ و بڵاوکرایەوە..کەگەلێك لایەنی نادیارو شاراوە لەبەسەرهاتەکانی سەردەمەکە باسدەکات و گرنگییەکی مێژوویی زۆری هەیە. دیسان ساڵێك بوو کورد ئازاد ئەژیا-ی عولە، گەڵێ دیدەنی هەندێ لێپرسراوانی وەك مەلا قادری مودەریسی، سدیق حەیدەری، نووسینەکانی عەبدولقادری دەباغی..تاد.

شەشەم: دۆکومێنتێکی تری گرنگ کەلەم ساڵانەی دواییدا کەوتۆتە بەردەست، بڵاوکردنەوەی وەسیەتنامەکەی پێشەوایە، کەڕاستەوخۆ پێش لەسێدارەدانی نووسراوەو دەقەکەی لەگۆڤاری مامۆستای کورد ژمارە *24*و *25*ی ساڵی *1995*دا بڵاوکراوەتەوەو لەشوێنێکی تردا، وەك خۆی دەیخەینە پێش چاو. دیسان گەلێك زانیاریی لەسەر جۆری روخانی کۆمارەکە، گرتنی قازیەکان و دادگایی کردنیان و لەسێدارەدانیان کەوتونەتە بەردەست.

حەوتەم: لەساڵانی ژیانی نەفیگەدا، لەگەڵ گەلێك نوسەرو مێژوونوس و خەمخۆرانی زیندووکردنەوەی مێژووی مەهابادو نوسەراندا، بوین بەدۆست و هاوکارو گۆڕینەوەی بیروڕاو بەڵگەنامە لەو مەیدانەدا بەتایبەتی: برایان: دوکتور ئەمیری حەسەنپوور ، سەلاحوددینی موهتەدی، مامۆستا شێخ عزەدینی حوسەینی، حەسەنی قازی، د. عەبباس وەلی، د. جەعفەری حەسەنپوور، کەریمی دانشیار، جگە لەدیدەنیی ژمارەیەك لەهاوژیاوانی کۆمار وەك: مامۆستا مەلا رەحیمی عەبباسی، میرزا عەلی خوسرەویی کەگەڵێ لەباس و خواسەکانی رووداوەکانیان روونکردەوە.

هاوینی ساڵی پار دوای روناکیی بینینی (کاروانی بێ کۆتایی)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لەڕێگەی دۆست و برایانی ئازیزم کاك شێرکۆ بێکەس و کاك رەئوف بێگەردو کاك دڵشاد عەبدوڵڵا بیری لەچاپدانەوەی کۆماری میللی مەهاباد-یان لام بوژاندەوە، لەڕاستیدا ئەوە هاندەرم بوو کەدەست بەو کارە بکەم و لەویشەوە هەر ئەوەبوو بەهۆی خولقانی بیری بەرهەمێکی نوێ، کەلام وایە بەو ناوەڕۆکە دەوڵەمەندو

زانیارییە نوێیانەو لێکۆڵینەوە پشت بەستووە بەبەڵگەنامەی رەسەن، جێگەی رەزامەندیی کۆمارناس و خوێنەران بێت و ئەرشیفی جەمهوریەتی کوردستان و کتێبخانەی کوردیی پێدەوڵەمەندتر بێت، بۆیە دەبێت پێشەکی سوپاسی ئەوان و هەموو دڵسۆزانەی تر بکەم کەکەم و زۆر یارمەتیدەری رووناکیی بینینی ئەم چاپەی جەمهوریەتی کوردستان بوون، بە تایبەتی بە ئینگلیزیی‌کردنی پێشەکیەکە لەلایەن م.فازل حسێن محەمەد بۆ بە عەرەبی‌کردنی م. مستەفا ساڵح کەریم و کاك دارا فەرەج، مامۆستا قادر میرخان بە نەخشەسازی بەرگ کەکاتی خۆی بۆ کاروانی بێ‌کۆتایش هەمان ئەرکی گرتە ئەستۆی خۆی، لەکۆمپیوتەرکردنی باسەکان خوشك‌وبرایان (تارا رەئووف) لەمۆنتاجکردنی (شیروان عزەت) و (سەیران عبدولرەحمان) و لەئامادەکردنی بۆ چاپ (شیروان تۆفیق) لەپێداچونەوەشدا بۆ هەڵەبڕیی و رێکخستنی سەرباسەکان پێشڕەو ئەحمەد، بەختیار مەلا عزەت.

* *

*

نوسین و نوسینەوەی مێژوی کورد بەگشتیی و مێژوی ئەزمونەکەی مەهاباد بەتایبەتیی، لێکۆڵینەوە لەهەر روداوێك و توێژینەوەی لایەنە جیاجیاکانی، بوژاندنەوەی سامانی نەتەوەو دەرخستنی رووی گەشی جوڵانەوەو راپەڕین و شۆڕشەکان، یەکالاکردنەوەی سیاسەت و جۆری مامەڵەی سەرکردەو سەرکردایەتییەکان لەپلەو قۆناغە جۆربەجۆرەکاندا، دەستنیشانکردنی هۆو فاکتەری نوشستیی و شکستییەکان و سەرەنجامی بزوتنەوەی چەکداریی و راپەرینەکان، ئاشکراو تۆمارکردنی هەڵەو لادان و چەوتییەکان، روناکیی خستنەسەر لێپرسراوەتیی لە سەرنەکەوتن و نەهامەتییەکان و مانەوەی بارودۆخەکان وەك خۆیان، دووبارەبونەوەی هەڵەو کارەساتەکان، بەهۆی تێنەگەیشتن لەهەلومەرج و هۆو زەمینەی نەرەخسیو و کامڵنەبونیان و نوقسانیی مەرجەکانی سەرکەوتن، نرخاندن و هەڵسەندگاندنی دروست و زانستییانەی ئەو لایەنانە، کارێکی ئاسایی و هێندە ئاسان نین، بەتایبەتی لەگرتنەبەری رێبازی زانستییانەو میتودی بابەتییانەو لەبار.

لەنووسینی سەرکەوتوانەی مێژودا نەشیاوو نەگونجاوە جڵەو بۆ سۆزو عاتیفەی بێبناغە شل بکرێ‌و حەزو ئارەزوی نوسەر چیی گەرەك بێت ئەوە بخرێتە سەرکاغەزو تۆمار بکرێت، دەبێت و پێویستە لەسەر مێژونوس کەلایەنە هەمەجۆرەکانی رووداو لەدوای رووداو بەسەر بکاتەوەو لەگەڵیدا راست و دروست لەهەڵەو چەوتیی کەم و کورتیی و نادروست لەدژەکانیان، بەرپرسیارییەکان، لەیەك جیابکرێنەوەو روناکیی بخرێتەسەر یەك بەیەکیان.. سەنگ و پێوانەکانی نرخاندن بەپێی زەمان و زەمین و بارودۆخ و هەلومەرجەکانی هەرپلەو قۆناغە بن، رووداوەکان وێنەگیربکرێن و بەپێی جیاوازییە جۆراوجۆرەکانی سەردەمەکان، هەڵسەنگاندنەکان بکرێن و حوکم و بڕیاری ئەنجامگیر هەڵبهێنجرێن.. چونکە هەر بەم شێوانە دەتوانین رووداوەکان وەك روویان داوە، نەك وەك دەخوازین، تۆمار بکەین، مێژوییەکی بێ‌درۆو دەلەسە بخەینە بەردەست نەوەکان تا رابردووی میللەتەکەیان لەبەرچاو بێت و بزانین چۆن و بەپێی چ رێبازێك لەناو هەڵبەزو دابەزینەکاندا گەیشتوونە سەردەمی حازر، چۆن گەشەکردنە هەمەلایەنەکان بوون و هۆی پەککەوتن و ئاڵۆزیی و شێواندنەکان چی‌بون.. بەو رێبازو لەناو ئەو تێگەیشتنانەو بەمیتودە زانستیانەکەی نوسینی مێژووەوە دەتوانین مێژوی نەتەوە بنوسین بەو جۆرەی کەبووە، هەر بەو جۆرەش دەتوانرێت لەرابردووی خۆمان

بگەین و نەوەکانی گەلەکەمانی پێ هۆشیار بکەین، بەو حاڵیبونەش لەرابوردوو، دەتوانین ئێستاو ڕێبازی سەرکەوتن و پاشەڕۆژی خۆمان ببینین. هەر بەو جۆرانەش نەوەکانی نەتەوە هۆشمەندو وشیار دەکەین، لەو ئاستەشدا دەتوانرێت سوود لەرابردوو، بەهەڵهێجانی دەرس و پەندەکان، وەربگیرێت و بیانکەینە ڕێنمایی ڕێبازی شارستانیو بەرەوپێشکەوتن بەخۆلادان لەدووبارەکردنەوەی هەڵەو لادان و نوشستییەکان، ئەو دووبارەو چەند بارەبوونەوانەی جۆرێك لەبۆچوونی نامۆی لای گەلێك کەس خوڵقاندووە کەگوایا، ئەوە مێژووە خۆی دووبارە دەکاتەوە، نەك هەڵەو لادانەکان کەنەهامەتیو کارەساتەکان دەخوڵقێننەوەو جارێکیتر دروشم و داواو ئامانجە بەدینەهێنراوەکان دووبارە دەکرێنەوەو ڕۆڵەکانی گەل و بزوتنەوەی نیشتمانیی ناچار دەکەن بەهەمان دروشم و داخوازییەوە، زۆرجار لەناو هەمان ڕێبازو بەهەمان هەڵەو تێنەگەیشتنەوە کاروانی خەبات دەست پێبکەنەوەو سەرلەنوێ بگەنەوە هەمان مەڵبەندی رابوردوو.

کاری گەورەو ئەرکی هەستیاری مێژونوس و زانایانی مێژوو ئەوەیە کەشان بەشانی روناکی خستنەسەر روداوەکان، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی کەجێگەی شانازیی ڕۆڵەکانی گەلەکەمانن، کەموکورتیی و هەڵەکانیش وەك خۆیان بەدەرخستنی هۆو فاکتەرە خوڵقێنەرەکانیان، دەربخرێن، لەوەشدا دەبێت سەنگ و پێوانەکان بەپێی زەمان و زەمین بێت، ناکرێت بەپێی هەلومەرجی رەخسیوی ئەمڕۆ سەنگ و مەحەکی سەردەم حوکم بەسەر رابوردا بدرێت، کەسەردەمەکانیان دورو جیاوازبن و، خاوەنی فاکتەری هاوبەش نەبن و هۆیە تایبەتییەکان هاو ئاستی یەکتر نەبن، پێویستە واقیعبینیانە تابلۆی روداوەکان ببینرێن و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت، سۆزو خۆشەویستیی بێبناغەو ناڕیالیستانە کار نەکەنەسەر شێوە زانستیانەکەی نوسین، هەست و نەستی نابابەتیی و نازانستیی، بیری زانستییانە نەشێوێنن.. هەیە وا لێکدەداتەوە کەنوسینی لەو بابەتە کەمکردنەوەی رۆڵی جەماوەرو ئەم سەرکردەو ئەو سەرکردەیە، کەمکردنەوەی لایەنی گەشی شانازییەکانە، گەرەکییانە چاو لەهەڵەو پەڵەو لادانەکان بپۆشرێت، خوازیارن چاك و خراپ، راستیی و چەوتیی، قازانج و زیان، هۆو فاکتەرەکانی شکستیی و سەرکەوتن، پێشکەوتن و دواکەوتن، تێکەڵبکرێن و لێکجیانەکرێنەوە، بەو لێکدانەوەیەی کەرابوردوومان هەمو شانازیی و گەش و رەزمەند

بووە. بەو مانايەی كە دەرخستنی هەڵەو كەموكورتييەكان شورەيیو نزمييە بۆ نەتەوەو مێژووەكەی.

لەباری راستو دروستيشدا ئەو جۆرە داواو بۆچونانە دەبنەهۆی شێواندنو شاردنەوەی راستيیو دووركەوتنەوە لەرێبازی زانستيی، ئەوانە مايەی چەواشەكردنو شێواندنن، دەرگا داخستنە لەنەوەی نوێو تازەپێگەيشتوەكان كەلەڕابوردوی خۆيانو گەلەكەيان نەگەن، بەمێژوی نيشتمانەكەيان نامۆبن، كەڵك لەئەزموونو پەندەكانی وەرنەگرن، لەرابوردوی باووباپيرانيان دابېڕێن، بەمەش نەتوانن دەرسو پەندەكانی ئەو رابوردووە بكەنە سەرمەشقی رێبازی نوێی زانستيانەو داهاتووی كوردايەتيی.

وەكو هەموو لايەكيشمان دەزانين نوسينی مێژوو بەو شێوەيەو لەو رێبازەداو لەناو ئەو بازنە سنووردارەدا، كارێكی ئاسان نييە، پێڕەوكردنی رێبازو پرنسيپە زانستيیو گونجاوەكان لەگەڵ بەرنامەيەكی بابەتييدا، پەنا بردنەبەر سەرچاوە رەسەنەكانو بەڵگەنامەو سەنەدەكانی سەردەمی باسەكە، كاری لێكۆڵينەوە ئاسانو بێ كۆسپو تەگەرە دەكەن، تابتوانين هەوڵبدەين كە ئەو سامانە مێژووييەمان، ئەوەی ماوە، بەدوويدا بگەڕێینو بيانپارێزين. چونكە زۆرمان لەناو چووە، نەك هەر لەپارچە داگيركراوەكاندا بگرە لەم بەشە نيمچە ئازادەشدا، چونكە شوێنەواری داگيركردنو چەوساندنەوە، ماف زەوتكردنو سەپاندنی ياسايەك كەدژ بەويستو ئارەزوومان بێت، سامانی نەتەوەی شێواندوەو زۆر كەممان بۆ ماوەتەوە، خۆشمان رۆڵی پۆسەتيڤو ئەكتيڤانەمان كەمبووە يان زۆر كەمو لەجێگەی نەبووان بووە. بۆيە سەرچاوەكان كەمو هەندێ جار دەگمەنن، جاری واش هەيە خۆمان هيلاك نەكردووە تا دەستمان بگاتە ئەوانەی ماون* .

ئەوەی لەهەمووی نامۆترە، ئەو دياردانە مێژووی نوێو سەردەمەكەشمان دەگەڕێتەوە، بەمێژوی جەمهوريەتی كوردستانيشەوە، هەرچەند لەم ساڵانەی دواييدا

---

* هەر لەبەر هەستياريیو رۆڵی مەزنی ئەرشيف، لەهارينی 1997دا بەيارمەتیو پشتگيريی سەرۆكی هەرێمی كوردستانو سەرۆك وەزيران ئەرشيفی نەتەوەيی كوردستان-مان دامەزراندو بۆ يەكەم جار لەمێژووی نەتەوەی كوردا، ئەرشيفێكی نەتەوەيی لەو جۆرە بكرێتەوە. كە بەڵگەنامەی جۆر بەجۆری هەموو سەردەمو سەرجەمی بوارەكانی ژيانی سياسيیو حكومەتيیو فەرهەنگیو ئەدەبيی نەتەوەكەمان بگرێتەوە...

بەدەستپێشخەریی خەڵکی بیانیی نەك خۆمـان، گـەلێك لـەبڵاوکراوەکانی سـەردەمی کۆمار کەوتنە بەردەستمان وەك لەپێشەوە ئاماژەم بۆ کردوون، بەتایبەتی ڕۆژنامەو گۆڤارەکـان. کـە لەئەرشـیفەکانی لـەندەن‌و کتێبخانـەی کۆنگـرە لەواشـنتۆن‌و ئـەو ژمارانـەی ڕۆژنامـەی کوردستان کەلەئەرشیفی (سەوەن)دایە لەلەندەن کەکاتی خـۆی کۆنسـوڵی ئینگلـیز، دیـارە هـەر لەسـەردەمەکەدا، دوابـەدوای یـەك (30) ژمـارە لـەو ڕۆژنامەیە دەنێرێت بۆ (دەنگی گێتـی تـازە) ئەو گۆڤارەی کـەئینگلیزەکان، بۆ زیـاتر پڕوپاگەندەی خۆیان لەعیراق، بڵاویان دەکـردەوە، دوای سـود وەرگرتـن دەنێردران بـۆ لـەندەن. بـەو جـۆرە ئـەو ژمارانـەمان بـۆ پـارێزراو کۆپییـەکانی کەوتنـە دەسـت ئێمەومانان... ڕەنگە ئەو ژمارانەش کەلەکتێبخانـەی کۆنگرەدا لەواشنتۆن هـەن، هـەر بەشێوەیەکی لـەو بابەتـە گەیشـتبنە ئـەو کتێبخانەیـە کەژمارەکـەی وەك لـەبیرم مابـێ زیاتر لە(20) دانەیـە*. کاتی خـۆی دوکتـور ئـەمیری حەسـەنپوور لەسـەر میکرۆفیلـم دانەیەکی بۆ سوید بۆ ناردم.

مێژوی ئەزمونەکەی مەهاباد، کەدەڵێم ئەزمونەکەی مەهاباد، مەبەستم لـەو کەش‌و ئاووهـەوا نیمچـە ئازادەیـە کـەدوای ئـەوەی لەشـکری سـوری سـوڤیەت ناوچـەکانی سەروی ئێرانی داگیرکرد، بەهـەندێ ناوچـەی کوردستانیشـەوە، بەتایبـەتیی موکریـان کـە تادامـەزراندنی کۆمـار، چـوار ساڵ‌و بەتەمـەنی کۆماریشـەوە نزیکـەی پێنـج سـاڵی خایاند. ئیتر دوای ماوەیەکی کەم لەبوژانەوەی بیری ئازادیی‌و جوڵـەی ڕۆشنبیران بـۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد، کۆمەڵەی (ژ.ك) دامەزراو کەوتە چالاکیی‌و پێوەندیی‌و گۆڤـارو بـەیان دەکـردن‌و ، دواییـتر لەجێگـەی ژ.ك، حزبـی دیموکراتـی کوردسـتان دامەزرێنراو، زۆری نەبرد، جەمهوریەتی کوردستان بەوەڵـەدبوو ، کـەمتر لەساڵێك ژیـا (22–1 تا 17–12–194)و لـەدواییداو بـۆ جـارێکی‌تر ئـەو بەشـە داگیرکرایـەوە.. جـا مەبەسـتم لەئەزمونەکـەی مـەهاباد سـەرجەمی ئـەو ڕۆژگارەیـە کەدەکەوێتـە نێـوان دامەزراندنی ژ.ك و ڕوخاندنی جەمهوریـەتی کوردسـتان.. چونکـە باسـکردن لـەمێژوی کۆمـار نوقسـان‌و نـا کـامڵ دەردەچێـت ئەگـەر پێشـەکیی لـەو ڕووداوە گرنگانـەی

---

* زۆر جار چ کۆمارو چ زاراوەی ئەزمون لەگەڵ مەهابادا بەکاردەهێنم‌وهەندێ کەس نـاڕەزایی دەردەبڕن، ئەو بەکارهێنان‌و بۆچونەکەی من لەوەوەیە کە مەهاباد دڵی موکریان‌و لەو سەروبەندەشدا دڵی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو، بیروچالاکی‌و کارو ئەرکەکانیشی، لەڕووە سەرەکییەکانییەوە، هەر لەو دڵەوە بوو.

کەزەمینـەی لـەدایکبوونی کۆمارەکـە بـوون، تێنەگـەین و وردەکارییـەکانیان تۆمـار نەکەین. بەتایبەتیی مێژوی ژ.ک و حزبی دیموکرات و کۆمار، وەك ئەزموونێکی گرنگ و زینـدو، جێگایـەکی دیـارو رۆشـنی لـەمێژوەی نەتـەوی کـورددا هەیـە کـەدەتوانرێت بەپلەیەکی تازە لـەمێژوی نوێی گەلی کورد دابنرێـت، بگرە هەیە کەدامەزراندنی ژ.ك بەسەرەتای ناسیونالیزمی نوێی کورد دادەنێت*

لەگەڵ ئەوەشدا کەنوسین و لێکۆڵینـەوە لەسـەر مێژوی کۆمـار، لەگـەڵێك رۆژنامـەو گۆڤاردا بڵاوکراوەتـەوە، گـەلێك بەرهـەم و تێزی دکتـۆراو ماسـتەر کەوتنـە بەردەسـتی خوێنەر کەتیایاندا چەندین باس و راو بۆچوون ئامـاژەی پێکراوە، سەرەڕای رووناکیی خستنەسـەر گـەلێك لایـەنی شاراوەی ئەزمونەکـە، بەتایبەتیی دوای بەدەستگەیشـتنی ئـەو بڵاوکراوەو بەڵگەنامـەو میکرۆفیلم و فیلمانـەی چیرۆکـەکانی سـەردەمەکەمان بـۆ باسدەکەن.. لەگـەڵ ئەوانەشدا تائێستا نـەتوانراوە وەك پێویسـت، راستیی سـەرجەم رووداوەکانی ئەو ئەزمونە تۆماربکرێن، نهێنییە حەشاردراوەکان بخرێنەبەر روناکیی، تائێستاش گەلێك بۆشایی لەمێژوی کۆماردا ماوەتەوە بەتایبەتیی لێکۆڵینـەوە لەسـەر بارودۆخـەکانی کوردسـتان و ئێران لـەپێش و لـەکاتی کۆمـاردا، هـۆ یارمـەتیدەرەکانی دامەزراندنی کۆمار بەسـەرەکیی و ناسـەرەکیی، راسـتەوخۆو ناڕاسـتەوخۆوە، راستیی رۆڵـی یـەکێتی سـۆڤیەت و ئازربایجـان لەدامـەزراندن و روخاندنەکەشـدا تـەموومژیان لەسـەرە.. لوجیکانـەی هەڵسـەنگاندنی سـەرکردایەتیی حـزب و کۆمـار، رۆڵـی هەریەکـەیان، شـەڕو پێکادانـەکان، نهێنییـەکانی چـواردەوری بەشێکیان، سروشـت و سـیمای کۆمـار، خودموختـاربوون یـان سـەربەخۆبوونی کۆمارەکـە، ئاشـتیی-و بەسـتراوەیی لـەڕوی ئـابوریی و سیاسـییەوە بـەکۆماری ئازربایجانـەوە، رۆڵـی ناسیۆنالیزمی ئـازەریی لەوانـەدا، راسـت و دروسـتیی نـاوی کۆمارەکـەو هـەبوونی بڕیاری رەسمیی یـان نـەبوونی لەسـەر ئـەو نـاوەو لەسـەر دامـەزراندنی ئەنجومـەنی وەزیران، رۆڵـی بارزانیی و هێزەکـەی لـەکۆماردا، بۆچـی ئـەو هـێزەو بـارزانیی خۆیـان گەیاندە ئەوێ، رۆڵی جەنراڵەکانی تـری کۆمـار بەتایبـەتی حەمەرەشیدخانی بانـە، بۆچی کۆماری بەجێهێشت.. گەشەکردنە هەمەلایەنەکان، رۆڵی لەپرۆسەی خەمڵاندنی ناسیونالیزمی کوردیدا لـەو بەشـەو بەشـەکانی‌تردا، رۆڵـی پارچـەکانی‌تر، رۆژنامـەو

---

* بڕوانە نوسینەکانی دوکتۆر عەباس وەلی-لەگۆڤاری گزینگ دا.

رۆژنامەنوسیی، شیعرو شاعیران و نوسەران و چیرۆك نوسان.. لایەنی ئابوریی و بازرگانی، حکومەت و سیاسەتی ئابوریی، کردنەوەی کۆمپانیاو سینەماو... رۆڵی پێشەوا قازی محەمەد لەژ.ك، دامەزراندنی ح.د.ك، رۆڵی قازی محەمەد لەوانەداو لەشەرو نەبەردییەکاندا، لەقوتابخانەو کاری رۆشنبیریی و کێشە کۆمەلایەتییەکانماندا، لەدوا بڕیار بۆ خۆبەدەستەوەدان و لەسێدارەدانی. ئەوانەو گەلێك باس و خواسی‌تر پێویستییان بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە.

لەگەڵ ئەو نوسین و لێکۆڵینەوانەو ئەو چالاکییە بەربلاوەی کەهەیەو سالانە لەگەلێك جێگەو شاری دنیا، یادی دامەزراندنی ئەو کۆمارە دەکرێتەوە، بیرەوەرییەکانی سەردەمی ئازادیی و ئینجا لەسێدارەدانی پێشەواو هاوڕێکانی بەسیمیناری پەنێل و کۆڕو کۆبوونەوەو ئاهەنگ دەبوژێنرێتەوە.. لەگەڵ ئەوانەشدا گەلێك تەگەرەو کۆسپ هەن کەرێگری زیاترو بەرفراوانترو بابەتی و زانستیانەتری مێژوی ئەزمونەکەن کەپێویستە هەوڵی نەهێشتنیان بدرێت. جگە لەوانەی ئاماژەم بۆ کردن:

-هەرچەندە گەلێ زانیاریی و چالاکیی ژ.ك لەناو ئەرشیفەکانی دەوڵەتانی هاوپێوەند بەڕوداوەکەوە کەوتونەتە بەردەست، بەتایبەتیی پێوەندیی چەند لێپرسراوو کەسێتیی وەك (عەبدولڕەحمان زەبیحی و قاسمی ئیلخانیزادە) لەگەڵ کۆنسوڵی روسیا لەورمێ و تەورێزو هەندێ شاری تر، بەمەبەستی روونکردنەوەی کێشەی کوردو داخوازیی و ئامانجەکانی ژ.ك و رۆڵی سیاسیی رێکخراوەکە، جگە لەو زانیارییانەی تر کەپەیوەندییان بەکۆمەڵەکەوە هەیە بەتایبەتیی لەڕوی رێکخستن و فراوانبوونی بنکەکانی جەماوەر، ژمارەکانی گۆڤاری نیشتمان و چاپکردنەوەیان گەلێك بەیان و زانیاریی لەمەڕ چاپەمەنی‌تر.. تاد لەگەڵ ئەوانەشدا تائێستا رووداوەکانی سەردەمی ژ.ك هەر لەدامەزراندنییەوە تا ونبوونی لەسەر شانۆی سیاسیی، دامەزراندنی گەلێك داموو دەزگای بەڕێوەبردن و هێزی چەکدار، پێوەندییە نیشتمانییەکان لەگەڵ نیشتمانپەروەرانی پارچەکانی‌تری کوردستان.. تاد، ئەوانە کەمتر روناکییان خراوەتەسەر بەڵکو هەندێکیان لەتاریکاییدا ماونەتەوە.

-زۆر لەبەڵگەنامەو بلاوکراوەکانی سەردەمەکەو کاروانی ژیانی کۆمار نەکەوتونەتە بەردەست، بۆ نمونە نزیکەی (50) ژمارە لەرۆژنامەی کوردستان،

نەبینراوە، بەتەواوی‌و دڵنیایی نازانرێ ژمارەی بڵاوکراوە لەگۆڤارەکانی کوردستان، هەڵاڵە، گڕوگاڵی منداڵانی کورد، هاواری کورد گۆڤاری وا هەیە لەرۆژنامەکەدا باسکراوە کەلەدەرچوندایە وەك گۆڤاری (مرۆڤ) تائێستا نازانرێ ئایا روناکیی بینیوە یان نە.. دیسان لیستی تەواوی دامەزرێنەرانی (ژ.ك)و سەرکردایەتییەکەی‌و کۆمیتەی ناوەندیی ح.د.ك ولیستی وەزیران بڵاونەکراونەتەوە، ئەوانەی لەبەردەستدان جیاوازیی بیرورا لەسەر چەند ناوێك هەن‌و ساغ نەکراونەتەوە جیاوازیی بیروڕاش لەسەربوونی هەندێ ناوو نەبوونی هەندێکی تر هەیە... پرۆتۆکۆڵ‌و نهێنییەکانی زۆر لەوتوێژەکان، گەلێك نهێنیی هاوپێوەند بەهەندێ شەڕەوە، ناکۆکییەکان لەگەڵ ئازربایجان شاراوەن‌و کەمتر لێکۆڵینەوەیان لەسەرکراوە.

-هەیە دەڵێت پێشەوا دوو وەسێتنامەی بەجێ‌هێشتووە، یەکێکیان شەخسیی‌و ئەوەکەی تر سیاسییە* کەچی تا ئێستا تەنها شەخسییەکە بڵاوکراوەتەوە کەراستەوخۆ پێش لەسێدارەدان نوسراوە ئەوەش وەك لەشوێنی خۆیدا دەبینرێت لەم دواییەدا بڵاوکرایەوە.

-رووداوەکانی رۆژگاری روخاندنی کۆمارو خۆ بەدەستەوەدانی سەرانی، پرۆسەکانی دادگایکردن‌و لەسێدارەدانی لێپرسراوان‌و تێکۆشەرانی حزب‌و کۆمارەکە، وەك پێویست روناکییان لەسەر نییەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکراوە.

نوسین‌و زمانی قسەکردن‌و نوتق‌و وتارو ئیملاو رێزمان‌و ئاستی گەشەکردنی لەسەردەمەکەدا، رۆژنامەو رۆژنامەنوسیی، نوسەرو شیعرو شاعیران‌و رۆڵیان لەسەردەمەکەدا، لایەنی ئابوریی‌و ژیانیی فەرمانبەرو کاربەدەستان‌و موچەو مانگانەیان، بازرگانیی‌و کشتوکاڵ‌و ئاستی گەشەکردنیان.. تاد. وەگەلێك لایەنی تر کەپێویستییان بەنوسین‌و لێکۆڵینەوە هەیە.

کاتی ئەوەش هاتووە کەنەهێڵرێت سۆزو خۆشەویستیی‌و عاتیفەی نەتەوایەتیی کاربکەنە سەر لایەنی بابەتیی‌و رێبازی زانستییانەی نوسینی مێژوو، نابێت ئەو

---

* وەك دوکتۆر رەحیمی قازی باسی کردووەو لەجێگەی خۆیدا روناکیم خستۆتەسەر.

** وەك (عەلی کوڕی پێشەوا قازی محەمەد-کوڕی رەش) باسی کردووەو لەجێگەی خۆیدا ئاماژەم پێکردووە.

نوسینانەی وەك گوتاری سیاسیی، بەمەبەستی هاندانو جۆشدانی خەبات، تێکەڵ بەراستیی روداوەکان بکرێن، پێویستە رێبازی تایبەتیی هەریەکەیان بپارێزرێت.. کاتی ئەوە هاتووە هەوڵی زیاتر بدرێت بۆ دەرهێنانی زانیاریی ناو ئەرشیفەکان، کۆکردنەوەی بەڵگەنامەو شوێنەوارەکانی کۆمار، کاتی ئەوە هاتووە ئەرشیف بۆ سامانی مێژویی نەتەوە چی تایبەت بەئەزمونێکی وەك جەمهوریيەتی کوردستان بێتو چی بۆ هەموو بوارەکانی ئەرشیف بێت، لەناوەوەو لەدەرەوەی وڵات دابمەزرێنو بکرێنە مەڵبەندی لێکۆڵینەوە.. تا دوژمنەکانمان چیتر زەفەرمان پێنەبەنو لەوە زیاتر لەسامانی مێژویمان نەفەوتێنن.. کاتی ئەوە هاتووە کەهوشیاریی ئەو لایەنانە زیاتر بکرێت تا بەدەستی خۆشمان، وەك لەروخاندنەکەی کۆماردا کرا، تۆمارو بەڵگەنامەو بڵاوکراوەکان لەناونەبەین.

من ناڵێم ئەم بەرهەمە نوێیەی مێژوی کۆمار هەموو ئەو لایەنانە بەسەردەکاتەوە، هەموو کەلێنو بۆشاییەکان پڕ دەکاتەوە، دیسان ناشڵێم بێکەموکورتی نابێت، بەڵام ئەتوانم بڵێم دوای زیاتر لەسیی ساڵ لەئەزمونی نوسینو لێکۆڵینەوەم لەسەر جەمهوریەتی کوردستانو بڵاوکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی کەکەلێنێکی گەورەیان لەبواری کۆمارناسییو لەئەرشیفو کتێبخانەی کوردییدا پڕکردۆتەوە.. ئەم چاپەی جەمهوریەتی کوردستان لەزۆر رووەوە نوێیە، چەندین باسو لێکۆڵینەوەی گرنگو زانیاریی زیاتر خراوەتە سەر باسەکانیتر، لەناو دیدێکی نوێو زانیارییەکی زۆر دەوڵەمەندترەوە سەرنجم لەباسەکانی کۆماری میللی مەهاباد داوەتەوەو کراویشن بەبناغەی ئەم بەرهەمە نوێیە تا ئەو ئاستەی کە هەروەك چۆن بۆ چاپی یەکەمی کۆماری میللی مەهاباد گوتومە ئەوە یەکەم کتێب بووە کەکوردێك لەسەر کۆماری مەهابادی نوسیوەو دوای بەرهەمەکەی ولیام ئیگلتن-یش دووەم بەرهەم بووە.. لێرەشدا دەڵێمو بێهیچ دوو دڵییەك ئەمە یەکەم بەرهەمێکە کەتائێستا بەو بابەتو زانیاریو بۆچوونی نوێو توێژینەوە بابەتییەوە، لەدووتوێی کتێبێکدا لەسەر ئەزمونەکەی مەهاباد روناکیی ببینێتو کەوتبێتە بەردەست خوێنەرانی.

## بەشی دووهەم

# سەرنجێك لەكۆمەڵگەی كوردەواریی و سروشتی گەشەكردنی

پاری یەكەم: كوردستان، مەیدانی شەڕو داگیركردن

پاری دووهەم: پرسی ناسروشتیی گەشەكردنی كۆمەڵایەتی لە كوردستان دا

پاری سێهەم: كوردستان و سیاسەتی دەوڵەتە داگیركەرو ئیمپریالیستەكان

# پاری یەکەم

## کوردستان مەیدانی شەڕو داگیرکردن

لێکۆڵینەوەو نوسین و شیکردنەوەو بیرورا دەربڕین لەسەر هەر رووداوێك، پێویستییان بەباش تێگەیشتنی بارودۆخە بابەتیی و خۆییەکان و بەزانینی هۆو هەلومەرجە جوڵێنەرو قودرەتە رۆڵبینەرەکانەوە هەیە، ئەبێت رەخنەو بەراوردو دەستنیشانکردنی دیاردەی هەڵەو پیادەکردنی کارە نامۆو دژ بەرەوتە ئاساییەکان، نرخاندنی روداوو هەڵسەنگاندنەکان بەپێی کات و سات و شوێن و سەردەمی روداوەکان بن، دەبێ لەیاساکانی گەشەکردنە هەمەلایەنەکانی کۆمەڵ، گەشەکردنە کۆمەلایەتی و سیاسیی و ئابوریی و ئاینی و مەزەبی و فیکرییەکان بگەین ئەوسا دەتوانین زەمینەی وێنەگیریی بۆ رووداوێکی مێژوویی بخولقێنین.. لەبەرئەوانەو بۆ تێگەیشتنی بارودۆخی سەرەتا، سەرەتای رەخساندنی زەمینەی باس و لێکۆڵینەوە لەئەزمونەکەی مەهاباد، دەبێت لەگۆڕانە هەمەلایەنەکانی موکریان و کوردستان و ئێران بگەین، لەرەوتی کاروانی سیاسیی و ئابوری و گوزەرانی خەڵك لەناوچە جۆر بەجۆرەکان بگەین.. لەکێشەی سیاسیی کورد وەك میللەت، لەسەرتاسەری ئێراندا بکۆڵینەوەو بزانین چۆن روداوەکانی ناوخۆو ناو ئێران و هەرێمەکە کاریان لەسەر یەك کردووە، چۆن بەرژەوەندییە ناکۆکەکانی نێودەوڵەتان بونە هۆی داگیرکردنی زۆر لەناوچەکانی ئێران لەلایەن هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو لەدوایشدا هێزەکانی ئەمریکاوە، چۆن بەرژەوەندییەکانیان رووبەڕوو بوون و مانۆڕە سیاسییەکان و گوشارە سەربازییەکان رۆڵیان بینیی.. چۆن ئەوانە کاریان کردە سەر نەتەوە ژێردەستەو چەوساوەکان.

جەمهوریەتی کوردستان لەبەشێکی بچوکی کوردستانی ئێراندا لەناوچەی موکریان و ناوەندی مەڵبەندەکەی کەمەهاباد بوو دامەزرێنرا، لەپانتاییەکی بچوکی ئەو بەشەی کوردستاندا بوو کەلەسەداسیی رووبەری کوردستانی ئێرانی دەگرتەوە [1] موکریانیش، بەتایبەتی مەهاباد، هەر لەزووییەکەوە بەبەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردستانی رۆژهەڵاتدا، سەنتەری رۆشنبیریی و شاعیران و بیری نیشتمانپەروەریی و کوردایەتی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەرووی گوزەرانی خەڵك و لایەنی

ئـابوریی‌و خسـڵەتەکانی کۆمەڵگـەی کوردەوارییــەوە، بەشـێکی تەواوکــەری ئــەو پارچەیـەی کوردســتان بــوو، نــەخوێندەواریی‌و دواکــەوتوویی‌و هــەژاریی ســەرجەم ناوچــەکانی گرتبــۆوە.. هۆکارەکــانیش، زیــاترو راســتەوخۆ بــۆ داگــیرکردن‌و دابەشکردن‌و جیاوازیی رەگـەزو مـەزەب‌و کولتـور دەگەڕانـەوە.. هـەر لەدێرزەمانـەوە رژێم‌و دەسـەڵاتە جۆراو جۆرەکانی ئێران، گوشـاری ئابوری‌و سیاسیی‌و رەگـەزی‌و مـەزەبییان خستبووەسـەر کۆمەڵگـەی کـورد، بەتایبـەتی لـەو سـاڵانەوە کەدەوڵـەتی سەفەوی دامەزراو کەوتـە بەرەنگاربوون لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمانیی سوننە مـەزەب.. چونکە کوردستان بوو بەمەیدانی شـەڕو ئاژاوەو لەشکرکێشـی.. لەسـەر داگیرکردنی ئەو ناوچانەو گەیشتنە مەزارو شارە پیرۆزەکان‌و ناوچە ستراتیجییەکان، بۆ دەست بەسـەراگرتنی سـامان‌و کۆکردنـەوەی بـاجی زیـاترو سـەپاندنی حوکمـی نـاوەندیی بەسەر وڵاتەداگیرکراوەکاندا.. ئەو ناکۆکیی‌و پێکدادانانە تا دەهات رویەکی سامناکی بەخۆوە دەگرت، ئیتر ململانێ‌و جەنگەکـە بـوو بـەزۆرانبازیی سـەربازیی نێوان دوو قودرەتی گەورە کەمەیلی مـەزەبی‌و ئابووری‌و داگیرکردن زیاتر رۆڵـی گـەورەیان تێدا دەبینـی، هـەوڵیان دەدا گـەلانی ناوچەکـەش بخەنـە نـاو جەنگەکـەوە، هـەم بکرێنـە سوتەمەنیی شەڕو تەماعەکانیان‌و هەم وڵاتەکانیشیان داگیربکەن.

کوردسـتان یـەکێك بوو لـەو وڵاتانـەی کەلـەو جـەنگ‌و زۆرانبازییانـەدا گـەورەترین زیانی بەرکـەوت، نـەك هـەر لەبەرئـەوەی کـە بـەهۆی جێگـەی جوگرافییـەوە مـەیدانی لەشکرکێشــی‌و شــەڕەکان بــووەو زۆر لەناوچــەکانی دەکەوتنــە نێــوان ئــەو دوو دەوڵەتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەش کەکورد خاوەنی هێزێکی یەکگرتوو دەوڵـەتێکی خـۆی نەبوو کەبتوانێ بەرگریی لەخۆی‌و نیشتمانەکەی بکات. هەر لەسـەرەتای بەهێزبوون‌و پەلهاویشـتنی ئـەو دوو دەوڵەتـەوە، کوردسـتان کرابـوو بەدووبەشـەوە، رۆژهـەڵات‌و باشور لەژێردەستی سەفەوییەکان‌و باکوریش لەژێردەستی عوسمانییـەکاندا بـوون. بەڵام لەشەڕی (چاڵدێران)دا (*1514* ع) [2] هێزەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی لەشکری شا ئیسماعیلی سەفەوییان شکاند، تێیدا شا ئیسماعیل بریندارکرا، سوڵتان سـەلیم-یـش گـەورەترین سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا، وەك یـەکێك لەسـەرەنجامە گرنگـەکانی ئـەو شـەڕەو ئـەو سـەرکەوتنەی عوسمانییـەکان، زۆربــەی ناوچــەکانی کوردســتان، هــەر لەدیاربـەکرو ماردینــەوە تاهــەموو کوردســتانی باشــور، بــەپێی رێککەوتننامــەی

چاڵدێران، کەوتنە ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانییەوە، هەر بەپێی ئەو پەیمانە، جۆرێك لەسەربەخۆیی میرنشینەکانی کوردستانی ڕاگەیاند، وەك پاداشتی کوردەکان کەبەهەوڵی مەلا ئیدریسی بتلیسی یارمەتیی هێزەکانی عوسمانیاندا. لەو سەردەمانەدا کورد خاوەنی دەیان حکومەتو میرنشین بوو کەهەندێکیان هەر لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە دامەزرابوون، بێئەوەی بتوانن یەکبگرن یان حکومەت یا میرنشینێکی وا بەهێز هەڵبکەوێت کەبتوانێت ئەو میرایەتییانە یەکبخاتو دەوڵەتێکی یەکگرتوو پێکبهێنێت.. بۆیە ئەو میرنشینو حکومەتانە، سەربەخۆییو نیمچە سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو، بەڵام ئەوانە، زیاتر لەو ماوانەدا بوو کەئەو دوو زلهێزەی هەرێمەکە بەشەڕو شۆڕی یەکترییەوە خەریك بوونو هەریەکە هەوڵی ڕاکێشانی ئەم میرو ئەو میریان ئەدا.

دوای سەرکەوتنەکەی چاڵدێران، سوڵتان سەلیم کەوتە نەخشەدانان بۆ ڕاکێشانی میرانی کورد، پێشەکیی کەوتە هێمن کردنەوەیان بەدڵنیاکردن لەپاراستنی موڵكو ماڵو حوکمڕانییان، ئینجا لەسەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی *1515* ع دا سوڵتان سەلیم فرمانێکی بڵاوکردەوە تێیدا ددانی نا بەسەربەخۆیی میرنشینەکانی کوردستان لەکاروباری ناوخۆیاندا، بەوەش میرنشینە سوننە مەزهەبەکانی بەرەسمی خستەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانییەوە.. بۆ زیاتر دڵنیاکردنی میرەکانی کورد لەبڕوانامەیەکیدا، سوڵتان سەلیم بەڵێنیدا کە:

*1*–پارێزگاری سەربەخۆیی میرنشینەکانی کورد بکات.

*2*–حوکمڕانیی میرنشینەکان لەباوکەوە بۆ کوڕ بمێنێتەوە (بەوەرەسە بێت).

*3*–عوسمانییەکان یارمەتی کورد بدەن لەهەموو شەڕێکدا کەتووشیان دەبێت، هەر بەوجۆرە کوردەکانیش یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی بدەن.

*4*–زەکاتو باجی شەرعی بدرێت بەخەزێنەی دەوڵەتی عوسمانی.

لەو سەردەمانەدا نزیك بە (*46*) میرنشینی کورد هەبوون، جۆری پێوەندیی ناوخۆو ڕێکخستنی جۆری مامەڵەیان لەسەر شێوەی نیمچە فیدراڵییەك بوو.. بەڵام سوڵتان سەلیم بەو نەخشەیە ئەو پێوەندییەی تێکداو هەریەکەیانی بەستەوە بەدەسەڵاتی ناوەندییەوە، ئەوەش بووە هۆی زیاتر لاوازبوونی ئەو میرنشینانەو ڕێگە خۆشکردن بۆ ڕوخاندنیان.

لەدرێژەپێدانی زۆرانبازییە خوێناویو جەنگە وێرانکەرەکەی عوسمانییەکانو سەفەوییەکانداو زیاتر بەهێزبوونی دەوڵەتی عوسمانیو سەپاندنی دەسەڵاتی لەناوچەکەدا، دوای ئەوەی، بەکاتیی، مەترسیی بەرەنگاربوونەوەیەکیتر لەئارادا نەما، سەفەوییەکان ناچاربوون مل بۆ داخوازییەکانی تورکە عوسمانلییەکان دابنەوێنن، ئەوەبوو ململانێی ئەو پلەیە لەساڵی (1639 ع)دا بەمۆرکردنی پەیمانێك لەنێوان سوڵتان مورادی چوارەمو شا عەبباسی سەفەویدا وەستێنرا... لەو پەیمانەداو بۆ یەکەم جار بەرەسمیی سنوری هەردوو دەوڵەتەکە لەکوردستاندا دیاریکراو بەپێی پەیمانەکە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەرەسمیی کەوتنە ناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییەوە.. دەسەڵاتی سەفەوییەکانیش لەپشت چیاکانی زاگرۆزدا مایەوە.

دوای ئەوەو بەسەپاندنی خواستەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر ئێرانییەکانداو لاوازبوونی لەڕووی سەربازییەوە.. وەدوای لەشکرکێشییەکانی تورکە عوسمانییەکان لەئەوروپاداو رووبەڕووبوونەوەی ئەوروپاییەکانو شکاندنی هێزەکانیان لەنزیك ڤییەنا، ئیتر هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەناچاری کشانەوەو پاشەکشێیان لەو مەیدانانەدا کرد.. بۆیە کەوتنە زیاتر چەسپاندنی دەسەڵاتو هێزەکانیان لەرۆژهەڵاتدا بەنەخشەی روخاندنی میرنشینەکان.

ئەم سیاسەتەش لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی دووهەمدا پیڕەوکراوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی مەترسیی هێزەکانی (محەمەد عەلی پاشا)ی لابەلاکردو رێگەی هێرشو پەلاماردانی خۆش کرد.. ئیتر یەکەیەکە میرنشینەکانی کورد دەڕوخێنراو حوکمی پایتەخت دەسەپێنرا.. بۆیە سەردەمێکی رەش لەمێژوی ناوچەکەدا، دەستیپێکرد.. زیاتر هێزو توانای کورد بۆ خزمەتی داگیرکەر بەکاردەهێنرا، دەرەبەگو سەرەك عەشیرەتە دواکەوتوو زۆردارەکان بەهێزدەکرانو دەکرانە پایەگای چەسپاندنی حوکمی بێگانە.. بێئەوەی بتوانرێت سوود لەو هەلو دەرفەتانە وەربگیرێت کەناو بەناو دەڕەخسان، بۆ نمونە حوکمڕانیی (کەریم خانی زەند 1746-1774 ع) [3] کەزیاتر لەچارەکە سەدەیەك حوکمی سەرتاسەریی ئێرانی کرد، بێئەوەی لەڕوی سیاسییەوە هیچ سودێك بەکورد بگەیەنرێت.. دیسان حوکمڕانییەکەی (عەلی خانی زەند 1774- 1790 ع) نمونەیەکی ترە لەو هەلە هەڵکەوتووانە.

# پاری دووهەم

## پرسی ناسروشتیی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لەکوردستان دا

ئەو شەڕو شۆڕو داگیرکردن و دابەشکردنانە، سەپاندنی حوکمی داگیرکەرو بەهێزکردنی پایەگاکانی لەناو سەرەك خێڵ و دەرەبەگە هاوکارەکانیدا، شەڕی ناوخۆی میرنشین و خێڵ و دەرەبەگەکان، سەپاندنی یاسای جەنگەڵ و باجو سەرانەی هەمەجۆر، روخاندنی میرنشینە سەربەخۆبون، یان کەجۆرێ لەحوکمی خۆمالی و جیاواز لەحوکمی داگیرکەریان هێنابووە ئاراوە.. ئەوانە بەشێك بوون لەو هۆکارانەی کەرێگەیان لەگەشەکردنی ئاسایی کۆمەڵگەی کوردەواریی گرت، گۆڕران و گەشەکردنەکان بەرێگە سروشتی و مێژوییەکانی خۆیاندا نەبوون، دەسەڵاتە دەرەبەگییە دواکەوتوو وابەستەکە بپارێزرێ، ئەو دەسەڵاتەی کەنەیدەتوانی تەنانەت ئاوەدانیی بخاتە ناوچەو بگرە ماڵەکەی خۆشییەوە، بۆیە دەبینین. بەپێچەوانەی پاشماوەو شوێنەواری سەردەمی دەرەبەگایەتیی ولاتانی ئەوروپاو بگرە لەولاتانی هەرێمی رۆژهەلاتیش، ئاوەدانی و پێشکەوتن لەسنورێکی زۆر تەسك و لەجێگەی نەبوواندابووە.. ئیتر گەشەکردنە کۆمەڵایەتییەکان، سەردەرهێنانی چینە کۆمەڵایەتییەکان نائاسایی و دوور لەیاسا مێژووییەکانی پەرەسەندن و گەشەکردن دەجولان، بۆیە چینەکانی بورجواو سەرمایەداریی و چینی کرێکارو جوتیاران، گەشەی سروشتییان نەدەکرد، بەگشتیش خرابوونە خزمەت دەسەڵات و دەستکەوتی داگیرکەرەوە. لەبەرئەوانە رووە سیاسییەکەی کوردایەتیی نادیارو دروشمە نەتەوەییەکان کەمتر دەهێنرانە بەرباس و ناو هەوڵدانەوە، لەناو بازنەیەکی تەسکدا قەتیسکرابوون، هەم گوشاری داگیرکەران و هەم لاوازییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی و هەست و نەستە نەتەوەییە پێنەگەییووەکان شورەیەکیان لەدەوری بزوتنەوەی کوردایەتیی دروستکردبوو.

لەگەڵ ئەوانەشدا پرۆسەی گەشەکردن و پەرەسەندن کەسست و کۆسپ لەبەردەمدا بوون، لەجوڵە نەکەوتبوو، لەگەڵ ئابووریی کشتوکاڵ و سامانی مەڕداری و ئاژەڵ و باڵندەدا، پیشەسازیی دەستکرد، دابەشبوونی کارو دەرکەوتنی جیاوازیی نێوان دێهات و شاروشارۆچکەکان، لەڕوی بازرگانیی و مانیفاکتۆرە، زیاتر چاوێنی دەبوون،

بازاڕ لەگەشەکردندابوو، زیاتر روخساری بەستنەوەی کوردستان بەبازاڕی وڵاتی پێوە بەستراوو لەویشەوە بەوڵاتە پیشەسازە پێشکەوتووە سەرمایەدارەکان دەردەکەوت، لەگەڵ ئەوانەشدا کۆمەڵگەی جوتیاری‌و ئابووریی کشتوکاڵ‌و مەڕومالات بەخێوکردن‌و گەرمیان‌و کوێستان کردنی زۆر لەخێڵە گەورەکان، روخساری کۆمەڵی کوردەواریی بوون، سیستمی پاتریارکیی خێڵەکی‌و موتوربەکراو بەمەبەست لەپرنسیپەکانی ئایین‌و مەزەبی زاڵ‌و پێڕەوکراو بەردەوام بوو، ئەوانە پایەکانی دەرەبەگێتیی زیاتر توندوتۆڵ‌و باڵادەست دەکرد، هەر بەو پێیەش چین‌و توێژاڵە جۆراوجۆرەکانی جوتیاران، چەوساوەترو هەژارو نەخوێندەوارتر دەبوون. خێڵ‌و سیستێمی خێڵایەتیی‌و رۆڵی سەرەك خێڵ‌و باوك سالاریی، بەتێهەڵکێش لەگەڵ جوتبوونی بەرژەوەندییەکانی خێڵ‌و دەرەبەگایەتیی.. زیاتر سیستێمی دەرەبەگیی بەهێزتر دەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی رژێمە داگیرکەرەکان زەوی‌و زاریان بەسەر سەرەك خێڵەکاندا دابەش دەکرد، تا لەپاراستنی سنوری قەڵەمڕەوو شەڕی سنورفراوانکردندا سود لەهێزو توانایان وەربگرن، ئیتر بەرەبەرە دەبوونە خاوەن موڵکی گەورەو دروستبوونی ناوچە دەرەبەگییەکان بەزەوی‌و زاری حکومەتیی‌و لەوەڕگاو پاوانکردنیانیشەوە، بۆیە ئەمان دەبوونە چینی باڵادەست، جواتیاران، چینی چەوساوە، کرێکاری زەوی‌و پیشەکانی‌تر لەگەڵ پیتی بورجواو چینی بورجوا لەپەراوێزی کۆمەڵگەدا دەژیان‌و دەجولان.

ئەوە روخسارو خسڵەتە تایبەتمەندە گشتییەکانی کوردستان بوە، بەرۆژهەلات‌و ناوچەی موکریانیشەوە. هەرچەندە ئێران خۆی وڵاتێکی دواکەوتو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەبەراورد لەگەڵ زۆر لەناوچەکانی‌تریدا، کوردستان کۆلۆنییەکی داگیرکراوو دواکەوتووتر بوو، لەو سەردەمەدا کوردستان لەدواکەوتووترین ناوچەکانی ئێران دەژمێرردرا، لەڕوی دواکەوتنەوە دەتوانرا تەنها بەبلوجستان بەراوردبکرایە، چونکە لەپێشکەوتنی پیشەسازیی‌و هۆی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ‌و مسۆگەرکردنی تەندروستیی‌و فەرهەنگیی‌و رێگەوبان‌و شتی‌تر دواکەوتووە [4] کوردستان وڵاتێکە بناغەی ئابوریی لەسەر کشتوکاڵ بوو، گەنم‌و جۆو توتن‌و میوەو بەخێوکردنی مەڕومالات‌و ئاژەڵ‌و سودوەرگرتن لەبەرهەمی دارستانی سروشتکرد، سەرچاوەی دەستکەوت بوون بۆ زۆربەی زۆری خەڵك، ئامرازی بەرهەمهێنان: گاسن‌و هەوجارو

جەنجەڕو ئامرازە کۆنەکان‌و گاو ئێسترداری بوو. هەرچەندە سامان‌و کانگەی مەعدەن زۆر بووە، بەڵام ئەوانەی تا سەردەمی ئەو هەلە مێژووییەش بەکارهاتبن، هەر لەبەرژەوەندیی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان بون، دەرهێنان‌و کێشکردنیشیان بۆ بازارەکانی دنیای خۆرئاوا بەشێك بووە لەنەخشەی داگیرکەرو دەوڵەتی سەرمایەدار.. بارودۆخەکانی کوردستان‌و ئەو بەشەی کۆمارەکەی لەسەر پێکهێنرا بەو جۆرەبوون.

کۆمەڵگەی کورد، وەك هەموو کۆمەڵە دواکەوتووەکانی تری ئەم جیهانە بووە، شێوەیەکی تایبەتیی‌و لەوێنەنەبووی بەخۆیەوە نەگرتووە، لێرەدا مەبەستم لەیاساکانی گەشەکردن‌و گواستنەوە بووە بۆ قۆناغە کۆمەڵایەتییەکان‌و جۆری دابەشبوونی کۆمەڵگەکەیە بەچین‌و بەش‌و توێژاڵە جیاجیاکانەوە، بەڵام رێبازی تایبەتیی خۆی لەنائاسایی گەشەکردن‌دا هەبووە، کەئەو هۆکارانەی لەسەرەوە باسکران خوڵقێنەری ئەو دیاردەیە بوون، کەجۆرێك لەتایبەتێتی‌و خەسڵەتە تایبەتییەکانی پێوە دیارو رەخساو بوو، زیاتر سەرەنجامی ئەو نائاساییبوونە بووە، بۆیە دەتوانرێ چین‌و بەش‌و توێژاڵەکان لەکۆمەڵگەی کوردەوارییدا بەم جۆرە پۆلین بکرێن:

دانیشتوانی دێهات‌و شاروشارۆچکەکان: جوتیاری هەژارو مامناوەندیی، پرۆلیتاریای کشتوکاڵ‌و زەوی، دەرەبەگ‌و خان‌و بەگ‌و ئاغاو خاوەن موڵکەکان.. بەگشتیی دوو چینی سەرەکیی پێکهاتەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەبوون، دەوڵەمەندو چینی خاوەن قودرەت‌و پایەی کۆمەڵایەتیی کەبەپێی ناوچەکان دەگۆڕدران، بۆ نموونە: لەناوچەکانی کرماشان‌و بەشەکانی باکوری لاجان کودا، دەرەبەگ‌و خاوەن موڵکی گەورە هەبوون، لەدەوروبەری سەردەشت‌و ناوچەکانی باشوری موکریان ئاغای گەورەو مامناوەندیی هەبوون کەیەکەمیان بەژمارە کەمبوون.. کەچی لەزۆر ناوچەی‌تردا ئاغاو خاوەن موڵکی بچوك بچوك هەبوون.

لەشارە گەورەکاندا.. تا ئەو سەردەمانە، هەرچەندە وردە پیشەسازیی دەستکردو کەسابەت‌و بازرگانیی‌و کرێکاری خشت‌و بیناو مانیفاکتۆرەو پرۆلیتیاری زەوی‌وزار، رووی دەرکەوتووی دانیشتوان بوون، سەرمایەداریی وردە وردەو لەسەرخۆ، بەتایبەتی لەشارەگەورەکاندا، سەری دەردهێناو پێوەندییە سەرمایەدارییەکان تادەهات زیاتر دەبوون، لەگەڵ ئەوانەشدا جیاوازییەکی زۆر گەورە لەنێوان ناوچە

دێهاتییەکان و ئەو شارانەدا دەبینرا، تا ئەو پلە مێژووییانە، روخسـاری خێڵـەکیی و جوتیـاریی، بوونـی دەسـەڵات و نفـوزی سـەرەك هـۆزە گـەورەکان و خـاوەن موڵکـە زلەکان ئاشکرابوو.

هـەژاریی و نـەخوێندەواریی و دواکـەوتوویی سـیمایەکی تـری ئاشـکرای کۆمەڵگەکەبوون.. لەگەڵ ئەوانەشـداو بـەهۆی گۆڕانـەکانی لایـەنی ئـابووریی، زیـاتر هامشـۆ لـەنێوان شـارەکاندا بوژانـەوەی بازرگـانیی مەڵبـەندە پیشەسـازییەکانی دەسـتکردو گردبوونـەوەی خـێزان لـەدەوری هـەر پیشـەیەك زیـاتر دەبـوو، بەرەبـەرە زیـاترو جـۆراو جـۆر دەبـوون. شـان بەشـانی دروسـتبوونی نـاوەندی بازرگـانیی و گەشـەکردنی پیشەسـازیی دەسـتکرد. سـوو سـەلەم زۆر دەبـوو، سـەرمایەدارەکان پارەیان لەم رێگەیەوە دەخستەگەڕ، جگەلـەوەش خاوەن بیناو موڵك و ماڵ لـەو شارە گەورانەدا بەرەو زۆربوون دەچـوون و پـارەو پـول و سـامان لەدەسـتی چینێکـی کـەم ژمارەدا کۆدەبووەوە [5].

ئەو بەشە سەرمایەدارە خاوەن بەرژەوەندییە لەیەکچووانە، بەرەبەرە لەیەك نزیك دەبونـەوەو یـەکیان ئـەگرت و تێکـەڵ دەبـوون، تادەهـات بـەهێزتر دەبـوون، تـاچینی سـەرمایەداری کوردیـان لێپـەیدابوو.. بەڵام لەبەرئەو هۆیانەی باسکران، کزوڵ و لاواز بـوو، بەبـەراورد لەگـەڵ چینـی سـەرمایەداری نەتـەوەی حوکمـڕان و کاربەدەسـت، بێدەسەڵات و بێپایەگای سیاسیی و سەربازیی بوو.. دەرەبەگ و خاوەن موڵکە گـەورە شارنشینەکانیش بەهۆی وەکیـل و سـەرکارەوە سەرپەرشـتیی موڵـك و زەوییـەکانیان دەکرد، دەکەوتنە مەیدانی سوو سەلەم و بازرگانیی و سـەوداو مامەڵـەوە.. زوربـەیان تێکەڵ بەچینی سـەرمایەدار دەبـوون و دەگـۆڕران بـۆ سـەرمایەداری شاریی، لەگـەڵ ئەوەشدا دیسان ئەم چینە هەر بەبەراورد لەگەڵ چینە زەحمەتکێشەکانی کوردستان، بـەهێزو خـاوەن قـودرەت بـوو، کـەچی لەبەرامبـەر چینـی حوکمڕانـی نەتـەوەی کاربەدەسـت و بەبـەراورد لەگـەڵ چینـە سـەرمایەدارەکە، لاوازو کـەم هـێزو قودرەتـی سیاسیی و سەربازیی و بەڕێوەبردن بوو.

لەبەرئـەوەی ئـەم چینـە تـازە پێگەیشـتووە، بەوەڵـەدبووی نـاو ریـزی کارگـەرانی پیشەسازیی فراوان و کارگەو کارخانە گەورەکان نەبوو، بۆیە قودرەتی چونە مەیدانی ئـەو بوارانـەی نـەبوو، چینـی سـەرمایەداری پیشەسـازیی و تکنیـك و ماشـین و

گەشەکردنەکانی لایەنی زانستو زانیارییە پێشکەوتوو بالاکردووەکان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بەپێی گەشەکردنەکانی چینە کۆمەلایەتییەکانو ئەو هەلومەرجە رەخسیوانە، کرێکاری خانوبەرە زۆر دەبوو، رەنجبەرو سەپانو شوانو گاوانو پالەو بێکارەکانیتری لادێ کۆچی رووەو شارەگەورەکانیان دەست پێدەکرد، لەناو تێکەڵییەکی لەسەرخۆو کەمتر دەرکەوتوودا چینێکی نوێی کەم قودرەتتر سەری دەرئەهێنا.. بۆیە شێوەی بەرهەمهێنان، ئالوگۆرێکی بنچینەیی بەخۆیەوە نەدەبینی.. لەگەڵ ئەو گۆڕانانەشدا سروشتی کۆمەڵگەی ناوچەی موکریان وەك هەموو بەشەکانیتری کوردستانی رۆژهەلات بەنیمچە دەرەبەگیو خێڵەکی مایەوە، پێوەندییە دەرەبەگییەکان لەچەندین جۆرو شێوەدا زاڵو بالادەست بوو، کشتوکاڵ بەرهەمهێنان لەناوچە دێهاتییەکانو لەنێو خێڵە نیشتەجێبووەکاندا باوبوو، لەگەڵیشیدا بەخێوکردنی مەڕومالاتو ئاژەڵداریو بەروبوومەکانیی، ئابوورییەکی خێڵەکیی هێنابووە ئاراوە.. لەنێوان ئەو دوو شێوەی بەرهەمهێنانەدا چەشنێکیتر، تێکەڵێك لەهەردووشێوەکە دەرئەکەوتو دیاردەی نیشتەجێبوونی کۆچەرەکان فراوانتر دەبوو.

یاساو دەسەلاتی ناوچەیی بەدەست چینە بالادەستەکەوە بوە، هەرچەندە زۆربەیان وابەستەی چینی حوکمڕانو پایەگای بەردەوامیی داگیرکەر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەناوچەکانی کوردستاندا، هەر ئەو بالادەستی ناوچەیی بوون، یاساو دەسەلات لەودا رەنگیان ئەدایەوە.

فراوانبوونی پەیوەندیی بازرگانیی شارە گەورەکانی ئێران، گەورەو فراوانبوونی پیشەسازیی نەوت، زیاتر بازاڕەکانی ئێرانی بەدەوڵەتە سەرمایەدارە پیشەسازەکانەوە دەبەستەوە، کەلوپەلو کالای ئەو ولاتانە بازاڕەکانی داگیردەکرد، ئەوەش کاری دەکردە سەر پیشەسازیی دەستکرد.. ئەو فراوانبوونەی بازاڕی سەرمایەدارییو زیاتر بەستراوەیی بەولاتانی پیشەسازو سەرمایەدارەوە چەند ئەنجامێکی گرنگیان لێوە خولقا:

یەکەم: هەرچینو تاقمو دەسەلاتدارێکی نەتەوەی خاوەن نفوزو هێز کەوابەستە بەسەرمایەداریی پیشەسازیی زلهێزەکانەوە بووبێت، تاقمی حوکمڕان لەوان بووە،

شاو شالیارو فەرمانبەرە گەورەکانی دامو دەزگا سەرەکییەکان لەوان داتاشراون‌و بونەتە پایەگای چەسپاندنی دەسەڵاتی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان.

دووەم: لەبەرئەوەی ئەو چینانە لەکوردستاندا زیاتر وابەستەی حوکمڕانی نەتەوەی گەورەو کاربەدەست بوون، نەیانتوانیوە راستەوخۆ بکەونە ئەو جۆرە مامەڵەیەوە، بۆیە زیاترو توندتر گرێدراوی پایتەخت دەبوون‌و بەرژەوەندییە ئابوریی‌و سیاسییەکانیان تێکەڵ دەبوون.

سێیەم: ئەو چینە خاوەن نفوزەی کورد، بەهۆی وابەستەییەوە، ئەبووبە ئامرازێکی دەستی داگیرکەرو زۆرجار لەدژی میللەتەکەی خۆی بەکاردەهێنراو دەبوە عامیلی گوشاریی چەوساندنەوەی سێ لایەنیی، بەتایبەتی کۆمەڵایەتیی‌و نەتەوەیی‌و مەزەبی.. بۆیە کۆمەڵگەی کوردستان تا دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان لەژێرسایەی دواکەوتووترین رژێم‌و یاسادا بووە، لەژێر باری قورسی هەژاریی‌و نەخوێندەواریی‌و زوڵم‌و زۆری کۆمەڵایەتیی‌و چەوساندنەوەدا بووە، لەسادەترین مافی مرۆڤ‌و دیموکراسی‌و نیشتمانیی‌و هاوولاتی‌و نەتەوەیی بێبەشکرابوو.. (6)

# پاری سێهەم

## کوردستان و سیاسەتی دەوڵەتە داگیرکەرو ئیمپریالیستەکان

لەگەڵ ئەوەدا کەکوردستان گۆڕەپانی شەڕوشۆڕو لەشکرکێشی داگیرکەران بوو، کەبەهۆیانەوە دووچاری وێرانکاری و دانیشتوانیشی توشی کوشت و کوشتارێکی زۆر بووە، بەزۆری کوتەك کراونەتە سوتەمەنیی جەنگ، کەلەوەدا زیاتر ناکۆکییە مەزهەبییەکان کراونەتە فاکتەری هەڵخەڵەتاندن و تەفرەدانی کوردو راکێشانی بۆ مەیدانی جەنگ.. کەگەیشتونەتە مەرامەکانیان، ئەوسا نەخشەی تواندنەوەی کوردیان داناوە، بەراگوێزان و سەپاندنی ژیان و کولتورێکی نامۆ، بەشێواندنی مێژوو داب و نەرێتە کۆمەڵایەتییەکان، بەگواستنەوەی خێڵەکانی کورد بۆ سەر سنوورەکانیان تا ببنە شورەی پاراستنی ئەو سنورانە.

بەگشتیی سیاسەتێکی رەگەزپەرستانە پێڕەوکراوە بۆ ئەوەی سڕینەوەی شوێنەوارو روخساری کوردو کولتورو زمان و مێژووەکەی ئاسان بکرێت، تا کوردستان ببێتە پارچەیەکی ئەزەلی وڵاتی نەتەوەی باڵادەست و داگیرکەر، تا شوێنەواری کوردی لەسەر نەهێڵرێت.. کەدەنگی نارەزایی و داوای مافەکان بەرزبوبێتەوە ئەگەر لەسادەو ساکارترین شێوەشدا بوبێت، وا بەئاگرو ئاسن وەڵام دراوەتەوە، بۆ بەردەوامیی ئەو داگیرکردنە، سیاسەتی برسیکردن و نەخوێندەواریکردن پێڕەوکراوە، دەرەبەگ و سەرەك خێڵە وابەستەکان کراونەتە مەقاشی دەستیان. ئیتر چەوساندنەوەو زوڵم و زۆری دوولایەنە بەردەوام بووە.

کاتێك ئێران، بەکوردستانیشەوە، کرا بەبازارێکی گەرمی دەوڵەتانی سەرمایەدار، ئیتر سێکوچکەی ئیمپریالیزم و دەوڵەتی داگیرکەرو تاقمە وابەستەکەی ناوخۆ، چەوساندنەوەی هەمەلایەنەی خۆیان سەپاندووەو لەناو بەرژەوەندییە یەکانگیرەکانیاندا درێژەیان پێداوە.

لەبەر تیشکی بەرژەوەندییەکان و بایەخی ستراتیجیی کوردستان، دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان بەردەوام یارمەتیدەرو پاڵپشتی رژێمی داگیرکەربووە، بۆ درێژەدان بەداگیرو دابەشکردن و چەوساندنەوە، هەمیشە لەدژی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بوون بۆ کورد، لەدژی جیابوونەوەو یەکگرتنی کوردستان، بەردەوام

عامیلی هێزو سەرکەوتن بوون بۆ داگیرکەرو بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەکانی کوردستان، تەنانەت دژی بەدەستهێنانی مافی مرۆڤ و هاوولاتی و هاونیشتمانیی بوون.

ئەو تێکەڵبونەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی داگیرکەرو ئیمپریالیزم، ئەو هاوکاری و پاڵپشتیکردنە، بەردەوام هۆی سەرەکیی شکستی و نوشستیی بوون بۆ کوردو بزوتنەوەکانی.

زۆرانبازیی نێوان داگیرکەران بۆ فراوانکردنی سنور، سەقامگیرکردنی قەڵەمڕەو، درێژەدان بەداگیرکردن و نەخشەکان، فراوانکردنی بەرژەوەندیی ئابوری و ناوچە ستراتیجی و بۆ بەئەزەلیکردنی داگیرکردنەکە، سەنتەری سیاسەتی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بووە، لەگەڵ ئەو هەموو ناکۆکی و دوژمنایەتییە کلاسیکیی و هەڕەشانەی بۆ سەریەکتری هەیانە، دیسان بەرامبەر بەکوردو لەدژی ئامانجەکانی، هێزو تواناو نەخشەکانیان یەکبووەو بەردەوام لەیەك بەرەدا کوردیان بەدوژمن و مەترسیی گەورەو عامیلی ئاژاوە داناوە.

دەوڵەتە گەورەکانیش، لەناو بازنەی دەستکەوتەکانیاندا پێڕەوی سیاسەتێکی دوژمنانەیان کردووە، بەتایبەتیی روسیای قەیسەری، بریتانیا، دواییتر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڕادەیەکی کەمتر فەرەنسەو ئەڵمانیا.. لەدوایشدا لەناو سیاسەتێکی تایبەتی و بەناوی بەرژەوەندییە نێونەتەوەییەکانەوە، یەکێتی سۆڤیەت، کەتاڕادەیەك لەگەڵ سیاسەتەکانی روسیای قەیسەریدا زۆر خاڵی یەکانگیریان تیا بەدی دەکرا، چووە ناو ئەو مەیدانەوە.

قەیسەرەکانی روسیا، چییان لەتوانادا بوبێت و چەندیان بۆ لوابێت، هەوڵی جێگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان داوە، پێوەندییەکانیان لەگەڵ کورد راستەوخۆ بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان بووە:

*1*–سەرەتای ئاشکرا بۆ پێوەندیی نێوان نوێنەرانی ئیمپراتۆریەتی روس و سەرکردەی عەشیرەتە کوردەکان دەگەڕێتەوە بۆساڵی *1804*، لەشەڕی روس و ئێران دا (*1804–1813*) ئەمیر جیجیانۆڤ سەرکردەی گشتیی لەجۆرجیا لە *24*ی تەموزی *1804*دا نامەیەکی نارد بۆ حسێن ئاغای سەرۆك خێڵە کۆچەرەکانی کورد لەیەریڤان، کەبداتە پاڵ روسەکان.. هەرچەندە وەرامی ئەو نامەیەی نەدایەوە، بەڵام یەریڤانی

چۆڵ کرد لەوکاتەی سەربازی روس ئابلۆقەی دابوو.. لەساڵی *1805*دا سەرکردەکانی سوپای قەیسەر کەوتنە تەقەلای تازە بۆ راکێشانی کوردەکان..(7)

قەیسەرەکانی روس هەردەم کوردەکانی ئەودیو قۆقاسیان نەك هەر بەپیاوو ژێردەستەیان داناوەو چەوساندویانەتەوە، بەڵکو زیاتر لەوەش هەوڵیان داوە بیانکەنە کوتەکی دەستیان بۆ داگیرکردنی کوردستان و هەموو ناوچەکانی‌تر، بۆ گەیشتنە ئەنجامدانی تەواوی نەخشەو بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان. خۆ ئەگەر ئەو مەبەستەشیان بەدەست نەهێنابێت، وا هەوڵی بێلایەنکردنی کوردەکانیان داوە، جاری واش بووە هەر کەمەترسییان لەجولانەوەیەکدا پێشبینی‌کردبێت وا چییان لەتوانادا بوبێت بۆ لەناوبردنی کردویانە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا لەشەڕی نێوان روس و تورکدا (*1828-1829*) کورد یارمەتیدەری سوپای روسیا بوو، ئەمەش سەرەتایەکی‌تر بوو بۆ روسەکان بۆ راکێشانی خێڵەکانی کوردو بەکارهێنانیان لەکاتی پێویستدا.. گەلێ‌جاریش هاوکاری دەوڵەتی داگیرکەری کوردستان بوون بۆ لێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی، بۆ نمونە لەشۆڕشەکەی شەمزینان دا (*1880-1881*ع) کاتێك بێتوانایی رژێمی قاجار لەبەرەنگاربوون و لەناوبردنی شۆڕشەکە بۆ روسەکان ساغبووەوەو داوای یارمەتییان لێکرا، قەیسەری روس ئەو هەلەی قۆزتەوە، لەژێر فەرماندەی (ئالخازوف)دا لەشکرێکی نارد، شان بەشانی ئەویش قاجار کەوتنە هێرش و پەلامار.. قەیسەر بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو کەوتە هاندانی عوسمانییەکان، ئەوەبوو بەهێزی هەرسێ دەوڵەت، بێبەزەییانە کەوتنە لێدان و پەرەوازەکردنی شۆڕشگێران و لەناوبردنی جولانەوەکە ئەوەش شێخ عوبەیدوڵلای ناچارکرد کە عەریزەیەکی سەد هەزار ئیمزایی کۆبکاتەوەو ئاڕاستەی دەوڵەتە گەورەکانی بکات تاچاری ئاوارەبووانی کورد بکەن.

لەساڵەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەشدا، روسەکان کەوتنە دڵدانەوەی کوردەکان، نیکۆلای دووەم جەعفەر ئاغای شکاك و عەبدولڕەزاق بەدرخان و سەید تەهای نەوەی شێخ عوبەیدوڵلای بانگ کرد (*1889*)و دیدەنیی‌کردن وبەکۆمەڵێك دیارییەوە بەڕێیانی کرد.

لەپەیمانی سایکس بیکۆشدا(*8*) روسەکان توانیان کوردستانی باکور بکەنە بەشی خۆیان.. سەرچاوەی ئەو سیاسەت و ناحەزایەتییەی روسەکان، زیاتر فراوانکردنی

سنورەکان، دەستگرتن بەسەر وڵات و بازاڕەکان، نزیکبوونەوەو گەیشتنە ئاوەگەرمەکان، دەستگرتن بەسەر ناوچە ستراتیجییەکان و لێدانی دوژمنەکانیان بوو..بەڵام شۆڕشی ئۆکتۆبەر جارێکی تر ئەو هەل و دەرفەتەی بێئەنجام کرد، بەڵام بەشێك لەوانەو جارێکی تر دووەم جەنگی جیهان رەخساندییەوە، ئەوەبوو بۆ لێدانی نفوزی ئەڵمان لەئێرانداو بۆ مسۆگەرکردنی رێگەی لۆجستیکی بۆ هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت، دوای ئەوەی لەشکرەکانی هیتلەر پەیمانی دووقۆڵییان شکاندو بەشەپۆلی بەرفراوان، پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتیان دا، دوای ئینزارکردنی شای ئێران و هێزەکانی بریتانیاو یەکێتی سۆڤیەت زۆر لەناوچەکانی ئێرانیان داگیرکردو بارودۆخێکی نوێیان تێدا خولقا.

سیاسەتی ئیمپراتۆرییەتی بریتانیا روویەکی تری هەڵوێستی دەوڵەتە گەورە سەرمایەدارە ئیمپریالیستەکان بوو بەرامبەر بەکورد، بەتایبەتی لەو سەردەمانەوە کەدەوڵەتی عوسمانی لاوازو بێهێزکراو ناوی (پیاوە نەخۆشەکەی) لێنرا، کێشەی رۆژهەڵات بوو بەکێشەو ململانێی زلهێزەکان.. لەبەر گەلێك هۆی تایبەتی، ئینگلیزەکان بایەخیی زیاتریان بەجێگیرکردنی نفوزو دەسەڵاتی خۆیان ئەدا، لەپێش هەموویانەوە مسۆگەرکردنی پاراستن و ئارامیی رێگەوبانی بازرگانیی رووەو هیندستان کەبە(یاقوتی تاجی بریتانیا) ناودەبرا، چونکە گەورەترین بازاڕو مەڵبەندی کرێکاری هەرزان و لەشکرو کەرەسەی خاوبوو، بۆیە هەر لەزوویەکەوە گەریدەو پسپۆڕو شارەزاو ئەفسەرە سیاسییەکانی وەك: ماکدۆناڵد کینیر، کلودیوس جیمس ریچ، فرایزەر، راولینسون، گروفی، شیل، ئینفورس، برانیت، فەرەنسیس رودن جزنی و دەیانی تر، کاری مەیدانییان دەکرد، هەندێك لەوانە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانیان تەیکردبوو، زانیارییەکی زۆریان لەباری کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئایینی و ئابوری و جوگرافی و بازرگانی و رێگەوبان و کەرەسەی خاوو.. تاد کۆکردبۆوە، راوبۆچوون و راسپاردەکانی خۆیان دەگەیاندە حکومەتەکەیان، لەبەرتیشکیان دەکەوتنە سازکردنی پێوەندیی و نزیك بوونەوە لەسەرەك هۆزو خێڵەکان.

ئەمانیش، لەپێناوی ئەو بەرژەوەندییانەدا سیاسەتی (مەمرەو مەژی)یان بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی گرتبووەبەر، هەر لەبەرهەمان ئەو هۆیانە لەدژی زیاتر لاوازکردنی

رژێمی ئێران بوون، لەدژی ئەو جوڵانەوانە دەوەستان کە روخاندنی ئەو دەوڵەتەی لێبەئەنجام بهاتایە. بۆ نمونە، کاتێك (یەزدان شێر) لەبۆتان و هەکاری (*1855*) لەناو ئاژاوەکانی شەڕی (قرم)دا کەوتە سەرکردایەتیکردنی جوڵانەوەیەکی بەرفراوان، بتلیس و موسڵ و زۆر لەناوچەکانی نێوان بەغداو وان–ی خستە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، دوای شکاندنی لەشکری تورك، بریتانیا کەوتە مەترسیی لەبەرژەوەندییەکانی و ئەوەی بەهەرەشە لەسەر نفوزو دەسەڵاتی خۆی دانا، بۆیە کەوتە پیلان دانان. (گرودسام) توانی یەزدان شێر لەخشتەبەرێ و لەخۆی نزیك بکاتەوە، بەبەڵێنی درۆ خۆی دابەدەستەوە [9] .. بەوەش جوڵانەوەکە نەهێڵراو زۆر لەسەرکردەکان دوورخرانەوە.

کاتێکیش ئەڵمانیا جێگە پێی خۆی قایم کردو گەڵێ ئیمتیازی وەرگرت، بریتانیا سیاسەتی خۆی گۆڕی و کەوتە نەخشەدانان بۆ روخاندنی (پیاوە نەخۆشەکە) بۆ دابەشکردنی میراتەکەی.

لەسالانی یەکەم جەنگی جیهان و دواییتردا، جگە لەپەیمانی سایکس بیکۆ، بریتانیا کەوتە لەشکرکێشی و داگیرکردنی ناوچەو هەرێمەکانی سنوری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەرۆژهەلات، لەوانە مسیۆپۆتامیاو دواییتر بێشەڕ کوردستانی باشوریشی داگیر کرد. هەرچەندە کورد یەکەم نەتەوە بوو کەدەوڵەتی خۆی دامەزراندو ئینگلیزەکان بەرەسمیی دانیان پێدانا، بەلام ململانێیەکی دوورودرێژ لەنێوان کوردو ئینگلیزدا دەستی پێکرد. ویلایەتی موسڵ بوو بەکێشەیەکی رووداو وەرچەرخێنەر لەنێوان کوردو ئینگلیز، ئینگلیزو تورك، تورك و عەرەب، کۆنگرەی ئاشتیی لەپاریس کرا بەمەیدانێکی ئەو ململانێیە، پەیمانی سیڤر لەبەرژەوەندیی کوردو دواییتر پەیمانی لۆزان لەدژی کورد مۆرکران، هەرچەندە بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ، کوردستانی باشور بۆ فەرەنسا تەرخانکرابوو، بەلام لوید جورج توانی کلیمەنسۆی سەرەك کۆماری فەرەنسا رازی بکات کەدەست بەرداری ئەو ناوچەیە بێت بەرامبەر بەهەندێ شارو ناوچە لەشام و دانانی بەشی فەرەنسە لەکۆمپانیای نەوتی تورکیا کەلەدواییدا ناوەکەی گۆڕا بۆ کۆمپانیای نەوتی عیراق.

پەیدابونی (کەمال ئەتاتورك) لەناو لەشکرێکی روخاو و دەوڵەتێکی پارچەپارچەکراو، شۆڕشی ئۆکتۆبەر (*1917*)و پاشەکشەی سۆڤییەتەکان لەجەنگ و

دەست بەرداربوون لەپەیمانی سایکس پیکۆ لەباکوری کوردستان، ئەو دەست بەرداربوونەی فەرەنسا لەکوردستانی باشور، سێ دیاردەو روداوی هێندە نامۆو چاوەڕواننەکرابوون کەمێژوی کوردستانیان بەبارێکی نائاساییدا وەرچەرخاندو سەرجەمی کارو پەیمانو روداوەکانی تریان بەدژی کورد ئاراستەکرد..بەتایبەتیی دوای ئەوەی ئەو ئەفسەرە سیاسییانەی ئینگلیز کەکارە سەرەکییەکانیان لەدەستدابوو، لەدژی دامەزراندنی دەوڵەتێك بوون بۆ کورد، هەرچەندە گەلێ ئەفسەریتر، دۆستانە لەگەڵ چارەسەری کێشەی کوردابوون، زۆر لەلێپرسراوو دامو دەزگا دەوڵەتییەکان داوای هێمنییو لەسەرخۆ هەنگاونانیان ئەکرد، لەگەڵ ئەوانەشداو هەرچەندە حکومدارییو مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمود لەباشوری کوردستاندا بەسێ پلەدا گوزەریکرد *1918-1924*، دیسان شۆڕشی چەکداریی، لەماوەکانی نێوان هەردوو پلەیەکداو لەدوای روخاندنی دوا پلەی مەلیکایەتیی باشور، هەر بەردەوام بوو کەدوا پەردەی بەشەڕی ئاوباریك (ئایاری *1931*) کۆتایی هات.

ئەدمۆنز سەرکردەی ئەو رێبازە بوو کە لەدژی دامەزراندنی دەوڵەت بوو بۆ کورد، لەرونکردنەوەی هەڵوێستیدا ئەوەش روون دەکاتەوە کە:

(بۆ جارێکیتر کەپێشنیازی پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی لەشێوەی حوکمیزاتیدا کرا، لەسلێمانیو ناوچە کوردییەکانی نزیکییدا هاتەکایەوە باری سەربازی زیاتر لەهی سیاسی سەپاندی بەسەر حکومەتی بەریتانیادا) "[10]".

لەدوای یەکەم جەنگی جیهانو رووداوەکانی هاوپێوەند بەمەشروتییەتەوە لەئێران ئەو بەشەی کوردستان بەگشتیی لەناو جۆرێك لەخامۆشی دەژیا، تا دووەم جەنگی جیهانو جێگیربوونی لەشکری سور لەهەندێ ناوچەی کوردستان کەئەوەش رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرانی کوردی لەو بەشەدا جوڵاند، بەتایبەتی لەموکریان.. ئیتر ئەوە سەرەتای زەمینە خۆشکردن بوو بۆهەڵە مێژوویەکەو خوڵقاندنی ئەزمونەکەی مەهاباد.

دووەم جەنگی جیهان مەیدانێکی پانو بەرینی بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، رەخساند، وەك گەورەترین قودرەتی خاوەن تەکنیکی نوێو لەشکرێکی پڕ چەكو بەهێزو ئابورییەکی لەبن نەهاتوو هاتە مەیدانەوە، بەیارمەتی هەمەجۆرو

بەلەشکری پۆشتەو پەرداخ و پرچەکەوە، یەکێك لەو مەڵبەدانەی کەهێزی سوپای خۆی تیادا چەسپاند ناوچەکانی خواروی ئێران بوو، هەروەك چۆن بایەخیی بەجێگەی ستراتیجی تورکیا ئەدا بەهەمان شێوە ئێرانیش بووبووە چەقی نەخشەی ئاییندە.. ئەوانەش نەك هەر بەهۆی نەوت و بازاڕو کەرەسەی خاوو ئەو جۆرە خواستانەوە بوو، بەڵکو ئابلۆقەدانی یەکێتی سۆڤیەت و وەستان بەرامبەر تەشەنەکردنی مەترسیی کۆمۆنیزم، یەکێك لەئامانجە ستراتیجییەکانی ئەمریکا بوو.. ئەوەبوو لەسەرەنجامدا وەك گەورەترین دەوڵەتی خاوەن قودرەت لەهەرێم و ناوچەکانیدا بوو بەخاوەن دەسەڵات و دەست بەسەراگرتنی ناوچە نەوتییەکان و مەڵبەندە ستراتیجییەکان.. بۆیە کوردایەتی لەو ناوچەیەدا لاوازو کەم جوڵە بوو، گۆڕانەکان بەو جۆرانە نەبوون کەگەشەکردنەکان ئاسایی و سروشتیی بن.. کۆمەڵگەی کوردەواری هەر بەدواکەوتوویی و هەژاریی و نەخوێندەواریی مایەوە.. لەبەرئەوانە لەسەردەمی جەمهورییەتی کوردستاندا نەیتوانی رۆڵی کاریگەر لەچەسپاندن و بەرگریکردن لێی ببینێت، وەك لەدواییدا لەناو باسەکاندا روناکییان دەخەینەسەر.

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی دووهەم

*1*–دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ لە(کردستان والاکراد)دا ئەڵێت: رووبەری کوردستانی ئێران (*124950*) کیلۆمەتر چوارگۆشەیەو رووبەری گشتیی کوردستان (*409650*) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، کردستان والاکراد، طبعة بیروت *1970* ص *12*.

*2*–چاڵدێران: دۆڵێکە نزیك شاری تەورێزە، تێیدا گەورەترین شەڕ لەنێوان هێزی سەفەویەکان و عوسمانییەکاندا رویدا، لەئەنجامیشدا عوسمانییەکان سەرکەوتن و پەیمانی چالدیران–یان سەپاند، شەڕو پەیمانەکەش هەر بەناوی ئەو دۆڵەوە بوو.

*3*–کەریم خانی زەند لەساڵی *1746*دا خواروی ئێرانی گرت، بەرەبەرە دەسەڵاتی خۆی دەچەسپاند، کەوتە لێدان و لەناوبردنی دوژمنەکانی، دوای ئەوەی زۆربەی زۆری ئازربایجان، ئەسفەهان، شیراز، عیراقی عەجەم، مازندەران و گیلان–ی گرت هەموو ئێرانی خستە ژێر رکێف و دەسەڵاتی خۆیەوە، بەدادپەروەری و عادیل و سوارچاکی ناوی دەرکرد، سوارچاك و زاناو زیرەك و دووربین و لێهاتوو بوو، لە *1774*ع دا کۆچی کردو ئێرانی بۆ کورەکانی بەجێهێشت. لەناو ناکۆکی و شەڕ لەسەر

دەسەڵات، باری وڵات تێکچوو، دوای لوتف عەلی خان 1790ع شەڕو ئاژاوە کۆتایی بەحوکمی بنەماڵەی زەند هێنا کەریم خان ناوی خۆی نا وکیل الرعایا.

4-توودە: گۆڤاری ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی حیزبی توودەی ئێران لەدەرەوەی وڵات. ژمارە (19) ل 72.

5-دکتۆر عبدولڕەحمان قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو، ل 150.

6-بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، مەحمود مەلا عززەت، دیپلۆماسیێتی بزوتنەوەی کوردایەتی، سلێمانی 1973.

-د. عەبدولڕەحمان قاسملو، کردستان والاکراد، طبعة بیروت 1970.

7-دکتور ن.ا، خالفین، الصراع علی کردستان، ترجمە الدکتور احمد عثمان ابوبکر، طبعة بغداد 1969 ل 42.

8-پەیمانی سایکس پیکۆ، یەکێك بوو لەو پەیمانە نهێنییانەی لەنێوان بریتانیاو فەرەنسا، دواییتریش روسیای قەیسەرییدا مۆرکرا (1916) پەیمانەکە بەناوی (مارك سایکس)ی ئینگلیزیو (جۆرج پیکۆی) فەرەنسی ناونرا، بەپێی بەش و بەندەکانی ئەو پەیمانە، نیشتمانی عەرەب، باکورو باشوری کوردستان لەنێوان ئەو سێ دەوڵەتەدا دابەشکرا، هەموو باکوری کوردستان بەشی روسیاو هەموو باشوری کوردستان بەشی فەرەنسە بوو، گۆڕانەکان لەم پەیمانەدا بەهۆی پاشەکشەی روسیاوە بوو دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر، ئەوەش هۆی گرنگیی وەرچەرخانی رووداوەکان بوو، کەسەرەنجام دوو ئیستیعماری دواکەوتوو رەگەزپەرست جێگەی ئەو دوو ئیستیعمارە رۆژئاواییەیان گرتەوەو بوون بەوەیشومەی بەردەوامیی داگیرکردن و چەوساندنەوەو سەپاندنی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی دژ بەنەتەوەی کورد.

9-البروفیسور ف.ف مینورسکی (الاکراد)، ترجمە: الدکتور معروف خزنەدار، طبعة بغداد 1968 ل 27.

10-سی.جی. ئیدموندز، کرد وترك وعرب، ترجمە: جرجیس فتح الله، طبعة بغداد 1970 ل 60.

# بەشی سێهەم

## هۆو یارمەتیدەرەکانی بەهێزبوونی بزوتنەوەی کوردایەتیو دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان

یەکەم :هۆو یارمەتیدەرە خۆییەکان.

دووەم: هۆو یارمەتیدەرە دەرەکییەکان.

دامـەزراندنی جەمهورییـەتی کوردسـتان لەناوچـەی موکریـان، یەکێکـە لـەڕوداوە گرنگ‌و هەستیارەکانی مێژوی نوێی نەتەوەی کورد، ئەم روداوە وەك هـەموو دیـاردەو گـۆڕان‌و هـەر روداوێکـی مێژویـی، بـەبێ پێشـەکی‌و زەمینـەی رەخسـاوو هـەندێ هەلومـەرجی یارمـەتیدەرو هۆکـاری خۆیـی‌و دەرەکـی نـەخوڵقا.. گـەلێك لـەهۆو یارمـەتیدەرەکان پێوەندیی راسـتەوخۆیان هەیـە بـەبارودۆخی نـاوخۆی کوردسـتان‌و بزوتنـەوەی نیشتمانیی کورد، هـەر وەك چۆن بارودۆخەکانی نـاو ئێران‌و ناوچەکـەو جیـهان، بەئاسـتی جیاجیـا، کـاری خۆیـان دەکـردە سـەر رووداوەکـان‌و خولقـانی هەلومـەرجی لـەدایکبوونی ئەزمونەکەهـەر وەك لەشـوێنی خۆیـدا باسـی رەوتـی گەشەکردنە کۆمەڵایەتییەکان‌و گوزەرانی نائاسایی پڕ لـەزوڵم‌و زۆرو چەوساندنەوەی گەلی کورد کرا ئەو داگیرکردن‌و چەوساندنەوەیەی کە کاریگەرییـەکی زۆریان کـردە سـەر کولتورەکـەی بـەڵام نـەیانتوانی خەسـڵەتە تایبەتییـەکانی کـورد وەك میللـەت بسڕنەوە، نەیانتوانی هەوڵ‌و کۆششی کورد یەك بخەن بۆ سەرفرازبوون لەو بارەو بۆ بەدەستهێنانی مافـەکانی لـەرزگاریی‌و دامـەزراندنی قـەوارەی دەوڵـەتیی خـۆی، وەك هـەموو گـەلانی تـری ناوچەکـە، هـەر هـەلێکی بـۆ هەڵکـەوتبێت کـەڵکی لێوەرگرتـووە، بەڕاپەڕینی چەکدارانە یان دامـەزراندنی میرنشـین‌و قـەوارەی کوردیـی، لەسـەردەمی نوێشدا بەدامەزراندنی دەوڵەت‌و حکومەتی خودموختاریی یان شۆڕشی چەکداریی.

لێرەشـدا زیـاتر رونـاکیی دەخەینەسـەر ئـەو هـۆو یارمـەتیدەرە خۆیـی‌و دەرەکییەکانـەی رۆڵیـان بینـی لەبوژاندنـەوەی کوردایـەتیی‌و دامـەزراندنی جەمهورییەتی کوردستان لەموکریانی کوردستانی ئێران‌دا.

# یەکەم

# هۆو یارمەتیدەرە خۆییەکان

-1-

## بوونی نەتەوەی کوردو گەشانەوەی ناسیونالیزمی کوردی

لەسەر زاراوەی نەتەوە، قەوم، هۆز، رەگەز، ناسیۆنالیزم بەتێگەیشتنی سەردەم و مانا سیاسییەکان، گەلێك قسەکراوەو باس و لێکۆڵینەوە نوسراوە، چوونە ناو درێژەی ئەو باسانەو شیکردنەوەی هەر یەکێك لەو زاراوانە مەبەستی ئەم چەند دێرە نییە، ئەوانە چەند باسێکی سەربەخۆو گرنگیان پێویستە*.. مەبەستی سەرەکیمان لێرەدا تێگەیشتەی نەتەوەیە بەمانا کۆن و کلاسیکییە بەکارهێنراوەکە کەپلەیەکی گوێزەرەوەیە لەنێوان نەتەوە بەواتا کۆن و ناسراوەکەی کەزیاتر نزیکە لەچەمکی رەگەز، وناسیۆنالیزمی نوێ بەو گۆڕانە سیاسیی و شارستانیی و دیموکراسییانەی بەسەر رەگەزو نەتەوەدا هاتوون و لەو تێگەیشتن و مانا نوێیەدا خۆی بینیوەتەوە.

وشەی نەتەوە: (*Nation*)ی ئینگلیزیی و (الامە) عەرەبیی و (نەتەوە)ی کوردیی لەتێگەیشتە زانستیی و لێکدانەوە جیاجیاکاندا، گەڵێ پێناسەی بۆ کراوە، پێدەچێ زۆر جار، داڕشتنەکانی هەریەکەو ئەوقکردنی پێناسەکە لەبازنەی بەرژەوەندییە سیاسیی و جوگرافیی و ئابوورییەکانی ناو دەوڵەتی نەتەوەی کاربەدەستەوە بوبێت، بۆ نمونە پێناسەی ستالینیزمیی بۆ نەتەوە لەناو بازنەی ستراتیجی ئاسایشی دەوڵەتە یەککگرتووەکانی یەکێتیی سۆڤییەتەوە بووە.. کەئەوەش گەورەترین ناکۆکیی لەناو هەم پێناسەکەو هەم نەخشەو سیاسەتی دەوڵەتدا بۆ مامەڵەو جۆری بەڕێوەبردنی نەتەوەو گەلان و کەمینەکانی ناو سنوری جەمهورییەتەکان خولقاند، روخانی یەکێتیی سۆڤیەت گەلێك نهێنیی لەو بابەت و سیاسەت و مامەڵانە خستەڕوو، دامەزراندنی جەمهورییەت بۆ دەیان نەتەوە، لەهەمان کاتدا رێککەوتنی رەگەزە

*مەحمود مەلا عززەت، ستراتیجێکی نەتەوەیی لەکوێوە دەستپێبکات، گۆڤاری رێبازی نوێ، ژمارە 21، کانونی یەکەمی 2000

*مەحمود مەلا عززەت، دەوڵەت و ناسیۆنالیزمی کوردی، گۆڤاری نوێکار ژمارە 3.

نەتەوەییەکان لەگەڵ یەکتری، نیشتەجێکردنی رەگەزی روس لەکۆمارەکانی بەلتیك و ئاسیای ناوەڕاست بۆ وابەستەکردنی میللەتانی ئەو وڵاتانە بەروسیاوە، وا مەحکەم پێڕەوکران کەدوای ئەو لێکهەڵوەشانەی یەکێتی سۆڤیەت و سەربەخۆبوونی ئەو کۆمارانەش، نەتوانن سەربەخۆیی ئابووریی و سەربازیی تەواو بەدەست بهێنن.. لەگەڵ ئەوانەشدا پەرتوبڵاوەپێکردنی کەمایەتییەکان. بۆ نمونە: کوردو چیچانەکان، یەك روخساری رەگەزپەرستانەی ناو ئەو نیونەتەوەییەی رژێمە بەناو سۆسیالیستەکە بوون.

دیسان پێناسەی تیۆریست و ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، دیمەنێکی تری لەو بابەتەی بەخۆوە گرتووە.. بەدەر لەوانەو نزیکتر لەپێناسە بابەتیی و زانستییانەکە بۆ کورد وەك هەموو نەتەوەیەکی‌تر، دەتوانرێت بنەماو مەرج و بنچینەکانی بوونی نەتەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دیاریکرێن:

–بوونی کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێ و سەقامگیر لەناوچەیەك، وڵاتێك، کەماوەیەکی مێژوویی واپێکەوە ژیابن کەیەککگرتن و پێکەوە گرێدراوییەکی هەمەلایەنەی لەنێوان خەڵکەکەدا خولقاندبێت و یەکێتییەکی وای هێنابێتە ئاراوە کەئامادەبن بەرگریی لەخۆیان و جێگەو بەرژەوەندییەکانیان بکەن.

–بوونی زمانێکی یەکگرتوو کەئامرازی لەیەکگەیشتنی خەڵکەکە بێت، هەم لەژیانی رۆژانەو هەم لەئاڵوگۆڕی بیروڕاو ئاخاوتن.. زمان بڕبڕەی پشتی نەتەوەیە، هەرچەندە بۆچوونی وا هاتۆتە ئاراوە کەئەو گرنگییەی جاران نادەن بەزمان. بەهۆی گەلێك دیاردەی ئەم وڵات و ئەو وڵات. بوونی چەند شێوەو دیالێکتی جیاجیا، هەرچەندە کەم دوورییەکیش لەنێوانیاندا هەبێت، بەدیاردەیەکی ئاسایی دەدرێتە قەڵەم، لەگەڵ ئەوەشدا دروستبوونی زمانی یەکگرتوو لەنوسین و رێزمان و ئەدەبدا، روخسارێکی گرنگی خەملیویی نەتەوەو سەقامگیربوونی بنەماکانێتی.

–بوونی ئەرزو نیشتمانێکی تایبەتیی ئەوتۆ کەماوەیەکی وا بەسەر ژیانی دانیشتوانیدا تێپەڕبوبێت کەریشەی ئابووریی و هۆگریی کۆمەڵایەتیی و زەمینەیەکی سیاسیی و هاوئامانجی وای رەخساندبێت کەنەتوانرێت سیمای دیمۆگرافی بەئاسانیی تێکبدرێت و بێبەرەنگاربوون رەگەزی تری لەسەر نیشتەجێیبکرێت.. چونکە مێژوی ژیانی ئەو کۆمەڵە خەڵکە، هاو بەرژەوەندیی و چارەنووسێکی وا

دەهێنێتە ئاراوە کەنەتوانرێت بێبەربەرەکانی، گوشارو هێز لەیەکیان جیابکاتەوەو شورا لەنێوانیاندا دروست بکرێت، چونکە پەیوەندییە مێژووییەکان بەجوگرافیاو سەنگی مرۆڤ و تێهەڵکێشییەکان سەقامگیربوون.

—ئەو کۆمەڵە خەڵکەو هاوپێوەندیی بەنیشتمانەکەیەوە، خاوەندارێتیی مێژوویەکی تایبەتیی وای خوڵقاندبێ کەهاوئامانج و بەرژەوەندیی یەکگرتوو، هاوسۆزو هەست و نەستی نیشتمانیی و نەتەوەیی وا پتەوو سەقامگیرکردبێت کەتێکڕا ببنە فاکتەری یەکگرتن لەدژی هەڕەشەکان.

—کەلتورو داب و نەرێتی کۆمەڵایەتیی و خوورەوشت و رەفتار لەجلوبەرگ و بۆنە کۆمەڵایەتیی و نیشتمانییەکاندا، سیماو خەسڵەتە تایبەتییەکانی وا جێگیرکردبێت کەلەمیللەت و گەلانی تری جیابکاتەوە.

—بەرژەوەندییە ئابورییەکان فاکتەرێکی گرنگی یەکبوون و دروستبوونی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی خەڵکە، بەگشتیی و، هی چینە جیاجیاکانی کۆمەڵگا بەتایبەتیی، بەڵام ئەمە، ئەو بۆچوونە ناسەلمێنێت کەبوونی ئابوریی یەکگرتوو لەنێوان نیشتمانێکی پارچەپارچەکراودا بنەمایەکی دروستبوونی نەتەوە نەهێڵێت، بەتایبەتیی ئەگەر پێوەندییە سنورییەکان نەبووبنە هۆکاری دابڕانێکی وا کەکولتورو زمان و داب و نەریتە کۆمەڵایەتیی و ئامانجە نەتەوەییەکان وا لەیەك ترازابێت کەپێکەوەلکاندنیان زەحمەت بێت و خرابنە خانەی دروستبوونی گروپی جیاجیاو دوور لەیەك.

هەرچەندە کورد لەدێرزەمانەوە داگیرو دابەشکراو بووە، چەوساوەو زوڵملێکراو بووە، هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ تواندنەوەو شێواندنی بنەماکانی وەك میللەت، بەتایبەتیی کولتورو زمان و نەرێتە کۆمەڵایەتییەکان.. لەگەڵ ئەوانەشدا، توانیوێتی خۆی و نیشتمانەکەی بەتایبەتێتییە جۆربەجۆرەکانەوە بپارێزێت و لەگەڵ گەل و نەتەوەکانی دراوسێی جیاوازبێت.. هەرچەندە نەیتوانیوە دەوڵەتی تایبەتیی بۆ خۆی دابمەزرێنێت، سەبارەت بەهۆو فاکتەرە زانراوەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەکۆشش و خەباتی بێوچاندا بووە تا بگاتە ئامانجە مێژووییەکەی. هەرچەندە وزەو توانای جوڵانەوەی نیشتمانیی کورد لەکوردستانی رۆژهەڵاتدا وەك باشوری کوردستان نەبووە، دیسان لەدوای یەکەم جەنگی جیهان وەك باکوریش نەبووە، بەڵام

خەڵکی کورد تایبەتێتییەکانی خۆیان پاراستووە، هەرچەندە بۆ زۆربەی زۆر، لەو سەردەمانەدا دەستبەرداری نیشتمانی خۆیان بوون و خۆیان بەئێرانیی و کوردی ئێرانیی داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ گەلانی تری ئێراندا خۆیان بەجیاوازو خاوەن تایبەتێتی لەقەڵەم داوە، هەر هەلێك بۆ ئەو بزوتنەوەیە رەخسابێت، هەوڵی بوون و سەلماندنی داوەو داوای مافی خۆی کردووە، بۆیە لەرەخسانی زەمینە نیمچەئازادەکەدا دوای هاتنە ناوەوەی لەشکری سور، بۆ سەمدانی خۆی، بوونی خۆی، هاتۆتە مەیدانەوەو، بۆ ئامانجەکانی خۆی خەباتی کردووەو، هەنگاوی بەرەو دامەزراندنی کۆمار ناوەو باوەشی بۆ کردۆتەوە.

-2-

## راپەڕین و شۆڕشەکان لەدژی داگیرکردن و چەوساندنەوەو لە پێناوی رزگاریدا

لەبەرئەوەی کورد لەنێوان سێ نەتەوەی خاوەن قودرەتدابووە، کەرابوردوییەکی مێژوویی و لەقۆناغە جیاجیاکاندا خاوەنی ئیمپراتۆرێتی گەورەبوون، بۆیە هەمیشە مەڵبەندی شەڕو داگیرکردن بووە، ئەو هەلومەرجانەی بۆ نەڕەخساوەو نەبۆتە خاوەنی هێزێکی وا کەدەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێت و، هەمیشە چەوساوەی دەستی داگیرکەران بووە.

هیچ بوارێکی ئاشتییانەی لەبەردەمدا نەبووە تا، بەوتوێژ، داواو ئامانجەکانی بەدەستبهێنێت.. بۆیە بەناچاری رێگەی چەك و چەکداریی و راپەڕین و شۆڕشی چەکداریی گرتووە.. هەرچەندە لەو کاروانەدا دووچاری وێرانکاریی وڵات و کوشتاری زۆر هاتووە، دیسان ئەوانە هۆیەکی گرنگی خۆسەلماندن و گەشەکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی بوون، دەیان میرنشین و راپەڕین و شۆڕش لاپەڕەکانی مێژوی کوردیان نەخشاندووە، بۆ نموونە: میرنشینەکانی ئەردەڵان، بابان، بۆتان، سۆران، بادینان، شۆڕشەکانی شەمزینان، شێخ مەحمودو حوکمداریی و مەلیکایەتییەکەی، شێخ سەعیدو دەرسیم و ئارارات و راپەڕینەکانی وان، بایەزید، بەهلول پاشاو یەزدانشێر.. تاد. لەناو ئەوانەشدا شۆڕشی شەمزینان و شۆڕشەکەی باشوری کوردستان بەسەرکردایەتیی شێخ مەحمودی بەرزنجی، شۆڕشی خاوەن خەسڵەتی نیشتمانیی و

ئامانجی نەتەوەیی‌و ستراتیجی‌و سیاسیی‌و سەربازیی بوون. دروشمەکانیان رزگاریی‌و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی کورد بووە، ئامانجەکان لەسنوری ناوچەگەریی دەرچووبوون‌و نەك هەر روخساری نەتەوەییان بەئاشکرا پێوە دیار بووە، بەڵکو راپەرین‌و حوکمداریی‌و مەلیکایەتییەکی نەتەوەیی‌و نیشتمانیی بوون، کاریگەرییان لەسەر رەوتی گەشەکردنی کوردایەتی‌و دانیشتوانی زۆر ناوچەی کوردستان هەبووە. پێشینەیەکی باش بوو بۆ پێکهێنانی کۆڕو کۆمەڵی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی بەتایبەتی لەناوچەی موکریان‌و ناوەندە دەرکەوتووەکەی، مەهاباد.

پێوەندیی نیشتمانپەروەرانی موکریان بەشۆڕشی ئارارات‌و هاوکاریی چەکدارو خەڵکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستانی ئێران لەگەڵ شێخ مەحمودو تێکەڵبونیان لەشەڕو لە رووبەڕوبوونەوەکاندا، رۆڵی خۆیان لەگەشانەوەی بیری نەتەوەیی‌و خەبات بۆ ئامانجەکان بەگشتیی بینیوەو هۆی یارمەتیدەری دامەزراندنی کۆمار بوون.

-3-

## پێکهێنانی کۆڕو کۆمەڵ‌و حزبی سیاسیی بۆ سەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەی نیشتمانیی

ئەزموونەکانی شەڕی چەکداریی بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجەکان، نوشستی‌و شکستییەکان‌و هۆیەکانیان، راپەڕینی سەردارو سەرەك خێڵە نیشتمانپەروەرەکان‌و تێکشکانەکان، گەلێك سەرەنجام‌و دەرس‌و پەندیان لێهەڵهێنجرا، لەپێش هەموویانەوە، نەبوونی ئامرازی یەکخستن‌و یەکێتیی ریزەکان بوو، نەبوونی رێکخراوو کۆمەڵی سیاسیی بوو، کەلەناو یەك رێکخستن‌و یەك سەرکردایەتیی‌و یەك ئامانج‌و دروشمدا جەماوەری گەل کۆبکرێتەوەو رووەو رێبازێکی روونی خەبات سازبدرێت، تا ببێتە ئامرازی هوشیارکردنەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریی‌و سیاسیی.. کەتا رادەیەکی باش گۆڕانی چلۆنایەتی‌و چەندایەتییان لەریزەکانیان‌و لەبزوتنەوەی نیشتمانیدا کردووە کەسەرتۆپی ئەوانە لەدایکبوونی جەمهورییەتی کوردستان بوو رۆڵی بەتەئسیرو پڕ

لەکاریگەری ژیانی سیاسیی ڕێکخراوەیی‌و خەباتی یەکگرتووی خەڵکانی ناو ڕێکخراوو کۆڕو کۆمەڵ کە یارمەتیدەری گەشەو فراوانکردنی بازنەی خەباتن، لەشوێنی خۆیدا بەدرێژی باس دەکرێت.

-4-

## زۆربوونی چەك لەناوچەی موکریان بەهۆی لێکهەڵوەشانی ئەرتەشی شا

دوای جێگیربوونی هێزەکانی لەشکری سور لەناوچەکانی سەروی ئێران، دەستپێکردنی جموجوڵی سیاسیی، داڕوخانی دام‌و دەزگاکانی دەوڵەتی لەگەلێك ناوچەدا، ئەرتەشی تاران دووچاری شپرزەیی‌و حاڵینەبوون بوو لەڕەوتی سیاسیی‌و چارەنووسی رژێمی شا، بۆیە لەگەلێك شوێن سەربازەکان چەکیان فڕێ ئەداو گیانی خۆیان دەرباز ئەکرد. بەهۆی ئەو روخان‌و ئاژاوەیە لەو ناوچانەدا چەکێکی زۆر کەوتە دەست نیشتمانپەروەران، سەربازە کوردەکانیش بەچەکەکانیانەوە دەگەڕانەوە شارو شارۆچکەو دیهاتەکانیان، هەندێکیان تا بیانتوانیایە چەکی تریشیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت، تیرەو هۆزەکانیش عەوداڵی کۆکردنەوەو کڕینی چەك بوون، بەتایبەتی کوڕانی عەشایەر هەر لەمنداڵییەوە عاشقی چەك‌و چەکداریی بوون، ئیتر گیانی چەکداریی‌و خولیای بەکارهێنانیان لەگەڵ خواستی رزگارییدا تێکەڵ ئەبوون، هەرچەندە ئەم دیاردەی چەکدارییە بێ‌زیان نەبوو، بەڵام لەلای دووەمەوە هەوڵی پارێزگاریکردنی شارەکان لەراووڕوتی هەندێ عەشیرەتی چاوچنۆك، پێویستی بەچەك‌و چەکدار هەبوو، سەرەنجامیش لەدامەزراندنی کۆمارو پارێزگاریکردنی رۆڵ‌و کاریگەری خۆیان هەبوو.

-5-

## بوونی کەسێتییەکی وەك پێشەوا قازی محەمەد

یەکخستنی سەرەك هۆزو خێڵەکان لەیەك بەرەو دژ بەداگیرکەر، کارێکی ئاسان نەبوو، کارێکی زەحمەت‌و پڕ لەگرێ‌و گۆڵ بوو، بەتایبەتیی دوژمنایەتییەکی ئاشکرا

لەنێوان چەندین تیرەو خێڵدا هەبوو، لەکۆمەڵگەی وا نەخوێندەوارو دواکەوتوودا گیانی تۆڵەو نەبوونی یاساو سەپاندنی حوکمی خێڵ باڵی بەسەر کوردەواریدا کێشا بوو، بۆیە هەر تەنها کەسێتییەکی بەناوبانگ و خۆشەویست و نیشتمانپەروەرو زیرەکی وەك قازی محەمەد دەیتوانی ئەوانە یەك بخات و ئەوانیش ئامادەبن بەڕابەریی ئەو کوردایەتیی بکەن.. لەبەشێکی تایبەتیدا بەدوورودرێژی قسە لەسەر رۆڵی پێشەوا ئەکەین، لەوێدا خەسڵەتە کۆمەڵایەتی و ئاینیی و سیاسیی، ناسراویی و پلەو پایە تایبەتێکانی، خۆشەویستیی و جێگەی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا، پلەو توانای دارایی کەسەرچاوەی هەندێ هەنگاوی گرنگن کەپارەو پولیان پێویستە، رۆڵی لەسەردەمی سەرەك کۆماریدا... لەوێدا روناکیی دەخرێتە سەر ئەو لایەنانە... لەوێدا کەسێتیی پێشەوا باش دەردەکەوێ بۆیە توانیی ئەو رۆڵە گرنگە ببینێت.

-6-

## رۆڵی شاعیرو نووسەرو روناکبیرو خوێندەوارو سەرەك خێڵە نیشتمانپەروەرەکان

هەر لەسەرەتای رەخسانی ئەو نیمچە ئازادییەی بەهۆی بوونی لەشکری سورەوە خوڵقا، شاعیرو رۆشنبیرانی مەهابادو دەوروبەری، نوسەران و خوێندەواران کەوتنە چالاکیی و وریاکردنەوەی جەماوەری کورد، گۆڤاری نیشتمان و بڵاوکراوەو بەیانەکانی‌تری کۆمەڵەی ژ.ك رۆڵێکی گرنگیان لەو مەیدانەدا بینی، حەماسەتی خەڵکیان دەجولاند، هەوڵی کۆکردنەوەی نیشتمانپەروەرانیان ئەدا لەدەوری کۆمەڵەو بڵاوکراوەکانی، دوای ئەمیش دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان و بڵاوکردنەوەی رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان، گەلێك نووسەرو شاعیرو خوێندەواریان لەدەور کۆبۆوە، بەشیعرو نوسینەکانیان رێنمایی خەڵکی شارو دێهاتیان ئەکرد.. هەرچەندە خوێندەوار کەم بوو دیسان ئەمان بڵاوکراوەکانیان بۆ نەخوێندەواران دەخوێندەوە. گۆڤاری نیشتمان و رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان، هەڵاڵە، گڕوگاڵی منداڵانی کورد، هاواری کورد، بڵاوکراوەکانی وەك هاڵەکۆك نوسین و شیعری دەیان روناکبیرو شاعیریان تێدا بڵاوکراوەتەوە.

-7-

## بۆشایی ئیداریی و پێویستیی پڕکردنەوەی

داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاو یەکێتی سوڤیەتەوە بونەهۆی خولقانی بۆشایی بەڕێوەبردن، ئەوەش لەسەرەنجامی رووداوەکانی جەنگ و شوێنەواری زۆرانبازییەکان لەسەر بەرژەوەندییەکان و بەهۆی داڕوخانی دام و دەزگای رژێمی شاوە بوو هەڵوەشانی زۆربەی دایەرەو دەزگاکانی دەوڵەت، بڵاوەلێکردنی ئەرتەش و راکردنی سەربازەکان، حاڵەتێکی وایان خولقاند کە جگە لە پەککەوتنی کاروباری بەڕێوەبردن و هەڵنەوسورانی ئەرکەکانی سەرشانی دەزگاکان، بەڵکو هەڕەشەیەکی جیدیش لەسەر ئەمن و ئاسایشی مەهاباد خولقا، ئەوەش هاندەرێکی باش بوو بۆ جولاندن و هاندانی لێپرسراوان و دڵسۆزان بۆرێکەو شوێن دانان بۆ پاراستن و راگرتنی هێمنی و ئاسایش، بۆیە بەرپرسان کەوتنە تەگبیر بۆ رێکخستنی کاروباری ناوچەکەو پاراستنی لەکوشتن و تالانیی و شەڕی خێڵەکیی. قازی محەمەد یەکەم کەس بوو کەلەو مەیدانەدا رۆڵی خۆی بینی، گەلێ دام و دەزگا هێنرانە ئاراوە، هێزێکی چەکدار سازکراو ئاسایشی پێدەپارێزرا.. ئەم دەستپێشخەرییانە هەم توانای کوردیان لەخۆ بەڕێوەبردندا دەرخست، هەم بووە زەمینە بۆ دامەزراندنی جەمهورییەتی کوردستان.

-8-

## رۆڵی رێکخراوو روناکبیرانی باشوری کوردستان لە پێکهێنانی رێکخراوو هاوکاریی سیاسیی

حزبی هیواو لێپرسراوە سەرەکییەکانی کەکوردستانیی بیریان دەکردەوەو ئامانجی سەرەکییان یەکخستنەوەی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی

کورد بوو، پێوەندیی خۆیان لەگەڵ گەلێك لەڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەرانی بەشەکانی‌تری کوردستان سازکردبوو، بەتایبەتی لەگەڵ نیشتمانپەروەرانی کوردستانی ڕۆژهەلات، لەوەش تایبەتیتی تر، لەگەڵ ڕۆشنبیرانی موکریان، پێوەندییە سیاسییەکان گەیشتنە ئەو ئاستەی کەهاوبەشیی بکەن لەپێکهێنانی کۆمەڵەی ژ.کدا، ئالوگۆڕی بیروڕاو هاوکاریی ڕۆشنبیریی بەتایبەتیی لەمەیدانی چیرۆکی شانۆو شیعرو نوسیندا.. ئەو زەمینەیە پێوەندییەکانی وا لەبارکردبوو کە هەم هاوبەشیی لەدامەزراندنی ژ.ك-دا بکەن‌و هەم لقی ژ.ك لەکوردستانی باشوردا پێکبهێنن، لەبەوەڵەدبوونی کۆماردا زۆر لەڕۆشنبیرو مامۆستاو ئەفسەران ڕوویکەنە موکریان، جگە لەوەی کەبارزانی‌و هێزەکەی، دوای شکستی ڕاپەرینەکانی بارزان‌و ناچاربوون لەژێر پاڵەپەستۆو گوشاری هێزەکانی عیراق‌و هێزی ئاسمانیی ئینگلیز باشور جێبهێڵن‌و، ڕوویکەنە موکریان، ئیتر لەوێ ڕۆڵێکی گرنگیان لەپاراستنی کۆماردا بینی.

★ ★

★

# دووهەم
## هۆو یارمەتیدەرە دەرەکییەکان

بەپێی تیۆری و لێکدانەوە کلاسیکییەکان کەتا ئێستاش لای زۆر لەنووسەرو مێژونووسان دەوامی هەیە، هۆو فاکتەرە خۆییەکانی هەر رووداوێکی مێژویی بەسەرەکیی و رێباز وەرچەرخێنەرو دەرەکییەکانیش بەناسەرەکیی و لاوەکیی دانراون، ئیتر لەمەیدانی سەرکەوتندا بێ یان شکستیی و ژێرکەوتن.

رەنگە ئەو بۆچوون و لێکدانەوانە بۆ هەندێ رووداوو دیاردە دروست بن، بەڵام نەك بۆ هەموو.. چونکە لەبارودۆخی هەڵکەوتەی ناو هەندێ روداودا، هەلومەرجی وادێنە ئاراوە کەئەو بۆچوونە لەجێگەی خۆیدا ناهێڵێت، بگرە پێچەوانەشی دەکاتەوە.. ئەگەر نمونەی سەلمێنەری ئەو بۆچوونە لەسەرەنجامەکانی یەکەم و دووهەم جەنگی جیهانیی سەرنج لێبدەین، وا لەجیهانی ئەوروپاو ئاسیادا چەندین نمونە بەرچاو دەکەون ئەگەر هەر لەسنووری وڵاتەکەی خۆشماندا بۆ نمونەی سەلمێنەر بگەڕێین، وا روداوەکانی کوردستانی باشور لەبەرچاومان قوت دەبنەوە.. بەتایبەتی پێکهێنانی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمودی نەمر *1918/11/17* و ئینجا دوو پلەیتر لەمەلیکایەتییەکەی *1922–1924*، لەگەڵیاندا بەستنەوەی ئەو پارچەیەی کوردستان بەمیسۆپۆتامیاوە، پێکهێنانی ئەم عیراقەی ئێستا، کەراستەوخۆ دژ بەخواست و ئیرادەی گەلی کوردستان و دەوڵەتە شەرعییەکەی و سەرکردەکەی بووە، وا لەو پرۆسانەدا رۆڵی کاریگەری گەلێك لەئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیزو لەدواییشدا دەوڵەتی بریتانیا، باش روونده‌بنەوە کەچۆن هۆو یارمەتیدەری راستەوخۆی ئەو رووداوانە، فاکتەری گرنگ و سەرەکیی بوون، هەم لەدامەزراندن و روخاندنی دەوڵەتەکەی باشورو هەم لەداگیرکردنی کوردستانی باشوورو سەپاندنی کولونیالیزمێکی دواکەوتوو وابەستە بەخۆی، بەسەر کوردستاندا.

ئەگەر لەوەشەوە بێینە سەر سەرنجدان لەڕوداوەکانی دووهەم جەنگی جیهانیی و سەرەنجامەکانی، لەناوچەکەدا، وا رووداوەکانی ناو ئێران و پێکهێنانی هەردوو کۆماری خودموختاری ئازربایجان و کوردستان دەکەونە بەرچاومان.

لەبەرئەوەی لەبەشەکانیتردا زۆرتر روناکیی دەکەونەسەر ئەو لایەنانە بۆیە لێرەدا هۆو یارمەتیدەرە دەرەکییەکان بەکورت و پوختی باسدەکەین.

هۆیەکی گرنگ و سەرەکیی ناو ئەو هۆیانەی لەناو بازنە دەرەکییەکاندا دادەنرێن، کەلەراستیدا گەورەترین فاکتەری وەرچەرخێنەری رووداوەکان لەئەنجامیشدا دامەزراندنی جمهورییەتی کوردستان، هاتنی لەشکری سوری سۆڤیەت بوو بۆ ناوچەکانی سەرووی ئێران بەناوچەی موکریانی کوردستانی ئێرانیشەوە، کەلەدواییدا، بوو بەهۆیەکی راستەوخۆی ململانێی زلهێزەکان و تەقەلایان بۆ ئەنجامدانی رێککەوتن و پەیمانەکان لەسەر ئێران، بەمەبەستی کشانەوەی لەشکری سوورو سەپاندنی دەسەلاتی خۆیان و دروستکردنی شورایەك بۆ بەربەستکردنی کۆمۆنیزم و ئەوقکردنی سۆڤیەت لەو سنوورەیدا، ئینجا بۆ گەمارۆدانی هەمەلایەنە لەلایەك، وبۆ مسۆگەرکردنی دەست بەسەراگرتنی نەوت و بازاڕو ناوچەی ستراتیجی لەلای دووەم. لەوانەشەوە هەرەشەو گوشارو مانۆڤری سیاسیی دەستی پێکرد..

لەگەڵ ئەوانەشدا گەلێك هۆی دەرەکیی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، کەم و زۆر کاریان لەسەر گەشانەوەی کوردایەتیی و لەدواییشدا پێکهێنانی جەمهورییەتی کوردستان کرد، لەوانە:

جوڵانەوەو شۆڕش و راپەرینەکانی گەلان لەدژی داگیرکردن و چەوساندنەوەو لەپێناوی سەرفرازیی و دەوڵەتی سەربەخۆدا، لەناویاندا راپەرینی گەلی ئازەربایجان و لەدواییشدا دامەزراندنی کۆماری خودموختاری ئازربایجان بوو.

شۆڕشی ئۆکتۆبەرو بلاوبوونەوەی بیریی سۆسیالیستی، دەنگی ئازادیی و بلاوبوونەوەی هەواڵی زلهێزەکانی خۆرئاوا بۆ رزگاریی گەلان و بلاوبوونەوەی چواردە بەندەکەی ولسونی سەرەك کۆماری ئەمریکا، لەگەڵ پەیمان و بەڵێنەکانی بریتانیاو فەرەنسا بۆ سەرفرازیی گەلان، پەیمانی ئەتلەسی و ئەوانەو بڕیاردانی مافی چارەی خۆنوسین و بەڵێنی سەرفرازیی و پاشان لەئەنجامی سەرکەوتنەکانی بەرەی دیموکراسیی لەدژی نازیزم و فاشیزم و گۆڕانە گەورەکان لەدنیاداو خولقاندنی دەیان قەوارەی نوێ و دەوڵەتی سەربەخۆ.. تاد. ئەوانەو چەند هۆیەکی تر، بونە سەرچاوەی خولقانی بیری ئازادیی و گەشانەوەی هوشیاریی سیاسیی و هاتنەکایەی کۆڕو کۆمەڵ بۆ خەبات لەپێناوی ئامانجەکانی گەلدا، دیسان زەمینە خۆشکەریش بوون بۆ بەرزکردنەوەی ورەو تەوژمی هیوا بەپاشەڕۆژ بۆ دامەزراندنی کۆماری کوردستانیش.

# بەشی چوارهەم

**بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسیی لەکوردستانی ئێراندا**

**-کۆمەڵی ئیستخلاسی کوردستان.**

**-کۆمەڵی جیهاندانی.**

**-حزبی ئازادیخوازانی کوردستان، کۆمەڵی ئازادیخوازانی کوردستان.**

**-کۆمەڵەی ژ.ك**

**-حزبی دیموکراتی کوردستان**

# بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسیی

پێویستیی دامەزراندنی کۆڕو کۆمەڵەو ڕێکخراوو حزبی سیاسیی لەسەرەنجامی پێداویستو گۆڕانەکانی ناو کۆمەڵەوە سەردەردەهێنن.. ئارەزوو خواستەکانی کۆمەلانی خەڵك بەگشتیی، یان چینێکی گەشەکردوو، لەدەرەنجامی خواستو پێویستییە هەمەچەشنەکان بۆ سەرفرازبوون لەگوزەرانی خراپو چەوساندنەوەی کۆمەلایەتیی، سیاسیی، ئابوریی، نەتەوەیی، ئایینی، مەزەبی.. تالەهەستکردن بەزوڵمو زۆری ئەو لایەنانەو خواستی سەرفرازبوون لێیان دەخوڵقێنرێنو دەکرێنە ئامرازی خەباتو بەدیهێنەری داخوازییەکان.. تا لەگوزەرانێکی خراپو ژیانێکی دواکەوتووی ژێرباری چەوساندنەوەی نەتەوەییو کۆمەلایەتیی، کۆمەلانی خەڵك سەرفرازبکرێو بگوێزرێنەوە بۆ مەڵبەندێکی باشو پێشکەوتوانەتر.. لەوەشدا بەتەنها بوونی چەوساندنەوەو زوڵمو زۆرداریی بەس نییە، هەر تەنها هەستکردنیش بەوانە هەموو شتێك نییە، بەڵکو بیرکردنەوەو نەخشەدانان رووەو پێکهێنانی ئەو ئامرازی خەباتەش هۆی کاریگەرە، ئەوەش تەنها پابەندی ئەو هەستکردنە بەچەوساندنەوەو زوڵمو زۆردارییەوە نییە، هەرچەندە هۆیەکی گرنگو جوڵێنەرە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە خەڵکانی رۆشنبیرو نووسەرە نیشتمانپەروەرەکان حزوریان هەبێت، چونکە پێش هەمووان بیروبیرۆکەیان لا دەخوڵقێو زووتر دەرك دەکەن بەرێگەو شێوەی سەرفرازبوونو پێویستیی پێکهێنانی ئامرازی خەباتو خوڵقانی زەمینەی دەستپێکردنی کاروانەکە، بۆیە دەبنە ناوکی چالاکیو سەنتەری کۆکردنەوەی نیشتمانپەروەران لەدەوری، دەبنە خاوەنی بیری پێکهێنانی ئامرازو دارشتنی دروشمو داخوازییەکانو دیارکردنی رێگەو شێوەی خەباتو بلاوکردنەوەی هوشیاریی سیاسیی، بەو پێیەی کەلەرێکخراوو کۆڕو کۆمەڵی خوڵقاودا، کۆمەڵە خەڵکێکی خاوەن داخوازییو دروشمی هاوبەشو ئامانجی سیاسییو کۆمەلایەتییو نیشتمانیو نەتەوەیی نزیك لەیەك، یەکدەگرنو دەبنە خاوەن ئیرادەیەکی یەکگرتوو بۆ گەیشتنە داواو دروشمو ئامانجە دەستنیشانکراوەکانیان، لەوناوكو سەنتەرەوە خواستو ئیرادەی کۆمەلانی خەڵك یەکدەخرێو کۆدەکرێنەوەو لەسەر رێبازی

خەبات و لەناو کاروانی بزوتنەوەی نیشتمانیی و رووەو ئامانجەکانیان سەرکردایەتی دەکرێن.

هەرچەندە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا رۆژهەڵاتی کوردستان جموجوڵێکی سیاسیی و چالاکییەکی ئەوتۆی لەو مەیدانەدا بەخۆوە نەبینی، پێکهێنانی کۆڕو رێکخراوی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی وانەبوو کەلەسەر شانۆی رووداوەکان رۆڵێ ببینێ، سەبارەت بەگەلێ هۆ کەلەپێش هەموویانەوە داگیرکردن و چەوساندنەوەو هەژاریی و نەخوێندەواریی و خامۆشبوونی هوشیاریی سیاسیی و هەست و نەستی نەتەوەیی بوون.. لەگەڵ ئەوانەشداو لەبەر خودی ئەو دیاردانە، بەشە هەڵبژاردەو روناکبیرەکە کاری کرابووەسەر، بەپێی هەلومەرج و بارودۆخەکانی ئەو سەردەمە هوشیاربووەوە.

## کۆمەڵی ئیستخلاسی کوردستان

بۆیە (بەر لەشەڕو لەساڵەکانی شەڕدا لەم بەشەی کوردستاندا کۆمەڵی "ئیستخلاصی کوردستان" بەگەرمی کەوتبووە خۆو دروشمی یەکگرتنی کوردو سەربەخۆیی کوردستانی بەرزکردبۆوە)[1].

ئەوەش گۆڕانێکی چاوێنی بوو لەچالاکیی سیاسیی و هەوڵی سازکردنی رێکخراوی بیر نەتەوەیی کەدروشمی یەکگرتن و سەربەخۆیی بەرزبکاتەوە، ئەم بیرو چالاکی و ئامانجە هەم بەسنوورو هەم لەناو تاقمێکی بچووك لەخەڵکانی رووناکبیرو نیشتمانپەروەردابوو کەنەیدەتوانی کار لەڕەوتی رووداوەکان بکات. هۆی سەرەکیی ئەوەش هەر لەبەر ئەو پێکهاتەو ئەو بەسنوریی و خەسڵەتەکانی تری رێکخراوەکە نەبوو، بەڵکو بارودۆخ و ئاستیی گەشەکردیی کۆمەڵگەی کوردەواریی و هەلومەرجە ناسروشتیی و نائاساییەکان، تا ئەو رۆژگارە، بواری کاری لەگەورەتریان نەدەدا، ئاسان کاریان تێنەدەکرا...

# کۆمەڵی جیهاندانی

بەڵام بیرو خواستەکەی کۆمەڵی ئیستیخلاسیی کوردستان ژیاو لەناو قاوغێکی تەسکدا بەردەوام بوو، بۆیە (هەر لەو دەروبەرەش دا ساڵی *1912* کۆمەڵی "جیهاندانی" لەکوردستانی ئێران دامەزرێنرا، ئەم کۆمەڵە دەیویست خەباتی کورد بەرێبازێکی راستدا بەرێ لەچوارچێوەیەکی یەکگرتوودا کۆی بکاتەوە) [2].

ئەو جموجوڵو هوشیاریو چالاکییانە تاقمێ لەڕوناکبیرانی ناو ئەو کۆمەڵانەی تێکەڵ بەبزوتنەوەی (مەشروتییەت) کرد، هەرچەندە ئەوە دیاردەیەکی پۆسەتیڤ بوو لەچالاکیی سیاسیی، بەڵام لەسەرێکی ترەوە بووەهۆی وەرچەرخانی دروشمو ئامانجە کوردستانییەکە بەرەو ئێرانیکردن، لەسەر چالاکییەکانی ئەو سەردەمە دوکتۆر سەید عەزیز شەمزینی نوسیویێتیو ئەڵێ:

"رۆڵەکانی کوردستان هاوبەش بوون لەجوڵانەوەی (مەشروتییەت)، شۆڕشی *1905–1911* لەئێران داو دروستکردنی (ئەنجومەن)ی شۆڕشگێڕ لەشارەکانی مەهابادو سنەو سەقزو کرماشان بۆ بەرگریی لەشۆڕشی ئێران" [2].

شان بەشانی پێکهێنانی کۆڕو کۆمەڵەی سیاسییو وەك کارێکی بەستراوو تەواوکەری مەبەستەکان لەو رێکخراوانە، چاپخانەو چاپو چاپەمەنیو بڵاوکراوە، هۆی گرنگن بۆ بڵاوکردنەوەی هوشیاریی سیاسییو ئامانجەکانی رێکخراوە سیاسییەکەو سوودو دەستکەوتەکانی لێیان.. ئەوانە هۆکارێکی گرنگن بۆ پەروەردەی سیاسییو قوڵکردنی هەستو نەستی نەتەوەییو هاندانی خەڵك بۆ هاوبەشیکردن لەخەبات، بۆیە روناکبیری هوشیارو نیشتمانپەروەر کەلەو سەروبەندانەدازۆر نەبوون، دەرکیان بەرۆڵی چاپەمەنیو بڵاوکراوە کردووەو کەوتوونە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی چاپخانەو چاپو دەرکردنی بڵاوکراوە.

".. . لەم سەردەمەدا عەبدولرەزاق بەدرخان لەساڵی *1913*دا لەشاری خۆی کۆمەڵێکی رۆشنبیریی دامەزراندو نیازی بوو چاپخانەیەکیشی بۆ دابنێو رۆژنامەیەکیش بەو ناوەوە دەربکاو لەژێر سەرپەرشتیی ئەودا قوتابخانەیەکیش بکاتەوە. هەنگاوی هەرە گەورەو پڕ مانای ئەم کۆمەڵە بریتیبوو لەکردنەوەی یەکەم

فێرگە (قوتابخانە)ی کوردیی لەشاری (خۆی) بەپارەی کۆکراوەی دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان.. ." [3].

بوژاندنەوەی فۆلکلۆرو دابە کۆمەڵایەتییەکان، گەشەکردن بەزمان و ئەدەب و نوسینەوەی مێژوو، کارێکی گرنگ و کاریگەری‌تری ئەو مەیدانانە بوو.. زمانی نەتەوە بەتایبەتی لەو سەردەمانەدا، تاکە ئامرازی لەیەکگەیشتن و ئاخاوتن و گەیاندنی بیروباوەڕو مەبەستەکان بو بەکۆمەڵانی خەڵکی، بۆ ئەم لایەنە دیسان بەدرخانییەکان پێشەنگ بوون.

"لەشوباتی *1913*دا عەبدولڕەزاق بەدرخان لەڕێگەی وەکیلی کونسولی روسەوە لە(خۆی) داوای لەروسیا کرد رۆژهەڵات و کوردناسی بەناوبانگ ئۆربیلی بنێرێ بۆ کوردستان بۆ دانانی رێزمان و فەرهەنگ بەزمانی کوردی و وەرگێڕانی بەرهەمی ئەدەبی روس بۆ سەر زمانی کوردی و هەروەها داواشی کرد بەشێکی کوردی لەدەزگای رۆژهەڵاتناسی پترۆگراد دابمەزرێنن کەلەبیری ئەو دەبوو یەکەم فرمانی بریتی‌بێ لەدانانی (ئەلف‌وبێ)ی روسی." [4]. ئەو رۆڵەی بەدرخانییەکان درێژەی یەکەم هەوڵی سەرکەوتووی دەرکردنی رۆژنامەی کوردستان بوو کە میقداد بەدرخان لە *22–4–1898*دا لەقاهیرە یەکەم ژمارەی بڵاوکردەوە.

جوڵانەوەی سمایل خانی سمکۆ جگە لەوەی رۆڵێکی باشی بینی لەبڵاوکردنەوەی هۆش و هەستیی نەتەوەیی، بەهۆی ئەوەوە کەداخوازییە نەتەوەییەکان و سەربەخۆیی، ئامانجی سەرەکیی سمکۆ بوو، سەردانەکەشی بۆ دەوڵەتەکەی باشوری کوردستان و ئەو پێشوازییە گەورەیەی لەسلێمانی لێیکرا، تا رادەیەکی باش خەڵکی کوردی ووریاکردەوە.. چاپکردن و بڵاوکردنەوەی رۆژی کوردو تاریکستانی عەجەم (*1921*)و رۆژنامەی کوردستان–یش لەشاری ورمێ (*1922*) هۆیەکی‌تری بوژاندنەوەی گیانی نیشتمانپەروەریی بوو، جگە لەوەی کەکارێکی لەو جۆرە، ئاستیی بەتەنگەوەهاتنی سمکۆ دەرئەخات لەمەیدانی رۆژنامەگەریی و ئاستی تێگەیشتنی ئەو لایەنە گرنگانە*.

---

* سەردانەکەی مستەفا پاشا یاموڵکی بۆ لای سمایل خانی سمکۆو بڵاوکردنەوەی ئەو دیدارەو پرسیارو وەڵامەکان، زیرەکیی سمکۆو ئامانج و خواستە نەتەوەییەکانی ئەو دەردەخەن. بڕوانە گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە (8).

بەو جۆرە، وردە وردە سەنگی لەخۆگەیشتن و رۆڵی لەجوڵانەوەی نیشتمانیدا باشتر دەرئەکەوت، گەشەکردنە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان و ژیانی سیاسیی و روناکبیریی باشتر دەبوون و خەڵکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەر لەیەك نزیك ئەبوونەوەو دەکەوتنە ئاخاوتن و مشتومڕی سیاسیی و پێوەندیی‌کردن بەروناکبیرانی پارچەکانی تری کوردستانەوە، هۆشیی سیاسیی زیاتر دەگەشاوە، هەرچەندە لەناو گروپێکی بچوکی روناکبیراندا بوو:

"لەساڵەکانی *1927–1930*دا، کۆمەڵێکی زۆر بچوکی سیاسی کورد دامەزرابوو، کەلەگەڵ راپەڕینی (ئارارات)و (خۆیبون) پەیوەندی هەبوەو لەگەڵ کوردستانی عیراقیش جاروبار پەیوەندی رادەگرت، ئەوانەی لەبەڕێوەبەرایەتی ئەم کۆمەڵە بچوکەدا ناسرابن، بریتی‌بوون لە: (قازی محەمەدی شەهید، شێخ ئەحمەدی سیربلادا، قازی کاکە حەمەی بۆکان "مەلا محەمەد سادقی قزڵجی"، مەلا ئەحمەدی فەوزی" [5].

هەیە دەڵێ قازی محەمەدو سەیف-ی قازی و چەند روناکبیرێکی تریش لەمەهابادو دەوروبەری ئامادەبوون، ناوی کۆمەڵەش (کۆمەڵەی ژیانەوە) بووە. ئامانجی سەرەکیی کۆمەڵەکە پاراستن و پەرەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی بوو، کتێب و رۆژنامە کەلەسلێمانیی کوردستانی عیراقەوە دەنێردرا لەنێو ئەندامەکانیدا ئەم دەست و ئەو دەستی دەکرد.

ئەم کۆمەڵە لەقاوغێکی تەسکی کارو فرماندا مایەوەو نەیتوانیی ببێتە رێکخراوێکی جەماوەریی، بۆیە نەشیتوانی رۆڵێکی دیاریکراو ببینێ و جێگەی خۆی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا بکاتەوە، نەیتوانی گەشە بکات، هۆی سەرەکیی ئەو دیاردەیە دیسان نەخوێندەواریی و هەژاریی بوو، کۆمەڵگەیەك کەلەو سەردەمەدا نەخوێندەواریی لەئاستێکی زۆر ترسناکدا بووبێت، رەنگە لەسەدا نەوەدو پێنج زیاتر نەخوێندەوار بووبێت، دەی چی پێشبینیەك لەکۆمەڵگەی وا دەکرێ..

دواییتر بەرەو لاوازیی و هەست بەجوڵەنەکردن و بەرەو نەمان و لەبیرچوونەوە گوزەری دەکرد.بەڵام روناکبیرو نیشتمانپەروەرەکان کەوتنە سەر رێبازی پێکهێنانی رێکخستنی کارامەو باشتر تا سەرەنجام، کۆمەڵی ئازادیخوازانی کوردستان پێکهێنرا.

# کۆمەڵی ئازادیخوازانی کورد

ئەدەب بەگشتییو شیعرو شاعیران بەتایبەتی ئامرازێکی گرنگی روناکبیرو نیشتمانپەروەران بووە بۆ خەبات لەدژی داگیرکردنو چەوساندنەوە، رێگەیەکی کاریگەربووە بۆ هاندانو وورریاکردنەوەی کۆمەلانی خەڵك.. زیاتر لەوەش کۆڕوکۆبوونەوەی شیعریی، هەر لەکۆنەوە رۆڵی خۆیان بینیوە لەکۆکردنەوەی شیعرو ئەدەب دۆستان، لەو کۆڕو کۆبوونەوانەدا شیعر هاندەرێکی باشو هەژێنەرێکی چاوێنیی حەماسی خەڵك بووە، شێوەیەك بووە بۆ چاندنی تۆوی نیشتمانپەروەرییو بزواندنی هەستی دڵسۆزانەی خەڵك.

هێمنی شاعیرو نیشتمانپەروەر، سەردەمی پێش پێکهێنانی کۆمەڵەی ژ.ك بەم جۆرە باسدەکات:

".. جێگایەکی تریش هەبوو کەناکرێ ناوی بێنم، ئەو جێگایە مەکۆی ئەو لاوانە بوو کەهەوای نیشتمانپەروەریان کەوتبووەسەر، زەبیحیو رەسولو میکاییلیو قزڵجیو نانەوازادەو ئیلاهیو سەیدیو زۆر کەسیترم لەوێ ناسین.. ئەو رەفیقانە کۆڕی ئەدەبی بچوکی کوردیان پێك هێناو بەنهێنی شیعری کوردییان دەخوێندەوە.. چەند شاعیریش هەبوون بەنهێنی شیعری خۆیان بڵاودەکردەوە.. بەتایبەتی شیعرەکانی سەیفی قازی..ئاگریان دەکردەوە" [6].

لەگەڵ ئەو چالاکییە بەسودانەدا، روناکبیران لەو چالاکییە بەسنوورەوە، هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیری نیشتمانپەروەرییو تێندێنسی رزگاریخوازیان ئەدا، خولیا دۆزینەوەی رێگەیەك بوون کەرۆڵی خۆیان لەناو خەڵکدا ببینن.. لەناو ئەو چالاکییو بیروبۆچوونانەدا دیسان بیری پێکهێنانی کۆڕو کۆمەڵی سیاسییان لا گەڵاڵە بوو.

لەسەرەتای ساڵی *1938*دا کۆمەڵێکی سیاسیی پێکهێنرا ناوەندیی ئەو رێکخراوە سیاسییە خاوەن ئامانجە نەتەوەییە، ناوچەی موکریانی کوردستانی ئێران بوو، وەك باس دەکرێ لەدامەزرێنەرە دەرکەوتووەکانی ئەم کۆمەڵەیە: مەلا عەبدوڵای داودی،(مەلا حەجۆ)، حسەین فروهەر، عەبدولڕەحمان زبیحیو بەرابەریی عەزیز مەلازەند.. کۆمەڵەکە نێوی (کۆمەڵی ئازادیخوازانی کوردستان) بووە.

ئەم ڕێکخراوە نوێیەی بوو بەچەقی بیرکردنەوەو مشتومڕی روناکبیرانی کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەم، بەدوو جۆر ناوبراوە:

-کۆمەڵەی ئازادیخوازی کوردستان.

-کۆمەڵی ئازادیخوازانی کورد.

سەرنجڕاکێشەر لەمێژووی ئەم ڕێکخراوە ئەوەیە، جگە لەو نوسینەی بەندە کەلەچاپی یەکەمو دووهەمی کۆماری میللی مەهاباددا بڵاوکرایەوە (*1984*و*1986*) بەدەگمەن بەسەرکراوەتەوەو زۆر کەم لەسەری نوسراوە. لەو نوسینە دەگمەنانە کتێبی -کوردستان والحركة القومية الكردية- جەلال تاڵەبانی-یە کەلەو رووەوە دەڵێت: لەساڵەکانی *1939-1942*دا ڕێکخراوێکی بچکۆلە بەناوی (حزبی ئازادیخوازانی کوردستان)ەوە بەڕابەری دکتۆر (عەزیز زەندی) کاری کرد، کەئەم ڕێکخراوە هیچ پرۆگرامو بڵاوکراوەیەکی بەجێنەهێشت تەنها بڵاوکراوەیەك نەبێت، کەئەویش بەبۆنەی هاتنی لەشکری سوورەوە بۆ باکوری ئێران بڵاوکرایەوە کەتێیدا خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر هاتنی لەشکری سوور دەربڕیوەو داوای مافی چارەنووسی بۆ گەلی کورد لەئێران کردووە.

لەگەڵ ئەو نووسینەدا مام جەلال هەندێ زانیاری گرنگی دیکەشی سەبارەت بەو حزبە تۆمار کردووە.

دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لە(دراسات في تاريخ التراث الحديث والمعاصر) هەندێ زانیاری لەسەر ئەو ڕێکخراوە تۆمار کردووە.

هێمنی شاعیر زۆر بەکورتیو تەنها لەیەك دێڕدا ئاماژە بۆ ئەو حزبە دەکات.

دیسان عەبدولڕەحمان زەبیحی لەهەندێ نووسیندا ئاماژەی بۆ حزبی ئازادیخوازانی کوردستان کردووە.

تائێستا زانیارییەکی ئەوتۆ دەربارەی کۆمەڵەکە دەستنەکەوتووە کەئایا خاوەنی پێڕەوو پرۆگرامو بەرنامەو گۆڤار یان بڵاوکراوە بووە یاننە..؟ دەبێ ڕێکخراوەکە بناغەیەکی پتەوو ڕێکخستنێکی نوێی وای نەبووبێ کەتوانای ئەنجامدانی کاری لەو بابەتانەی هەبووبێ. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو کۆمەڵەیە بەسەرەتای ڕێکخستنێکی نوێتر لەوانەی پێشوو دادەنرێ.. هەروەك هاوبەشانی کۆمەڵە لەقسەوباسو گفتوگۆکانیاندا

باسی دەکەن. ئامانجی سەرەکیی رێکخراوەکە نەتەوەیی بووە، لەڕوی کۆمەڵایەتییەوە پێشکەوتووانەتر بوو، باسی رزگاریی کورد دەکرا.

لەسەرەتای پێکهێنانی کۆمەڵی ئازادیخوازانی کوردستان، چالاکییەکانی بەسنوور بوون، چونکە سنوری رێکخستنی بەرتەسك بوو.. . بەڵام کەلەشکری سور، گەیشتە ناوچەکانی سەروی ئێران، ناوچەی موکریانیش بوو بەشێك لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو لەشکرە، چالاکییەکانی رێکخراوەکە زیاتر ئاشکرابوو.. یەکێك لەهەنگاوە گرنگەکانی کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەمیش بوو کەحزبی تودەی ئێران لەهەندێ شاروشارۆچکە لەکوردستاندا رێکخستنی خۆی پێکهێناو کەوتە بەبەرەکانیی بیری نەتەوەیی کوردیی‌و بزوتنەوەی کوردایەتیی.

ئەڵێن حزبی ئازادیخوازانی کوردستان کەلەهەندێ شوێندا بە"کۆمەڵی ئازادیخوازانی کوردستان" ناوبرا بوو، لەمانگی حوزەیرانی ساڵی *1938* لەشاری مەهاباد لەلایەن: عەزیز زەندی کە بەدوکتور عەزیزی زەندی‌و عەزیز ئاڵمانیش ناسرا بوو. مەلای داودی، عەبدولڕەحمان زەبیحی، حوسێن فروهەر (حوسێن رەزگەری)، محەمەدی نانەوازادەو چەند روناکبیرو ئازادیخوازێکی دیکەی ئەو دەمی کوردستانی ئێران‌و ناوچەی موکریانەوە دامەزرێنرا، عەزیز زەندی بەسەرۆکی حزبەکە داندرا.*

ئەم حزبە، هەرچەندە ئامانجی نەتەوەیی بووەو پێوەندیی بەروناکبیرانی پارچەکانی‌ترەوە هەبووە، بەتایبەتی باشور، بەڵام زیاتر لەژێر تەئسیری حزبی تودەدا بوو، پێی وابوو کەپشتیوانیی سۆڤیەت بۆ کورد مەرجی سەرەکیی بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانە، پێدەچێ گوشاری حزبی ئەرمەن‌و ئازەر کاری خۆیان کردبێتەسەر رێبازیی ئەم رێکخراوە. هەر لەو سەردەمانەدا بڵاوکراوەو گۆڤارو رۆژنامەکانی گەلاوێژ، ژین، ژیان، هاوار، دەگەیشتنە موکریان.

ئەم حزبە لەگەڵ حزبی هیوادا پێوەندیی‌و هاوکارییان هەبوو، بەتایبەتی دوای داگیرکردنی ناوچەکانی سەروی ئێران لەلایەن لەشکری سوورەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیی پەرە بەچالاکیی‌و رێکخستنەکانی خۆی بدات، لەوەش زیاتر بیرۆکەی پێکهێنانی رێکخراوێکی نوێ لەمێشکی هەندێ لەروناکبیراندا

---

* بڕوانە ئاوڕدانەوەیەك لەحزبی ئازادیخوازانی کوردستان، ئاڵای ئازادی ژمارەی رۆژی 10/12/1995.

چەکەرەی کردبوو، بەرە بەرەش زۆربەی ئەندامە چالاکەکانیش هاوبەشدەبوون لەو بۆچوون و هەوڵە نوێیانە، لەدامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ك.

یەکێك لە چالاکییەکانی کۆمەڵەی ئازادیخوازان، بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەك بوو کەتێیدا پێخۆشحاڵیی خۆی لەهاتنی لەشکری سور دەربڕیبوو، لەوێدا مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی دەستنیشان کردبوو، تێیدا داوای لەیەکێتی سۆڤیەت کردبوو کەیارمەتیی کورد بدات و دەستگیریی بکات تا مافە ڕەواکانی بەدی دەهێنێ.
زیاتر لەوە، بەپێی قەبارەو سنوری چالاکیی ئەم کۆمەڵەو بەپێی بچوکیی و کەمی بنکەی جەماوەریی، تاڕادەیەك کاری خۆی کردەسەر بەشێ لەجەماوەر، با تەسك و کەم مەوداش بووبێت، کاری کردەسەر بوژاندنەوەی بیروهۆشی نەتەوەیی و هەستی نیشتمانپەروەریی و گیانی تێکۆشان.. لەوانەش گرنگتر هەر ئەم ڕێکخراوەو ڕۆڵە چالاکەکانی ناو ئەم کۆمەڵەیە بوو کەبوون بەهەوێنی پێکهێنانی کۆمەڵەی ژ.ك.

هەرچی چۆنێك بێت ئەم ڕێکخراوە، بەپێی بارودۆخی ئەو سەردەمانەی کوردو بزوتنەوەی کوردایەتی، هەر ئەم کۆمەڵی ئازادیخوازانە بوو کەبوو بەهەنگاوێك بۆ بەرەوپێشەوەچوون لەژیانی ڕێکخراوەیی سیاسیدا، لەگەڵ ئەوەدا دەگوترێت کە(حزبێکیش بەناوی حزبی ئازادی بەبەرنامەیەکی چەپیەوە سەری هەڵداو نەژیا.. "7".

بەڵام جوڵێنەرو روناکیی ڕێگەی گۆڕانەکانی ئایندە بوو، ئەندامەکانی ئەم ڕێکخراوە بوو کەرۆڵی خۆیان بۆ گۆڕانێکی لەبارو گەورەتر بینی. ئەوەش دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ك بوو.

## کۆمەڵەی ژ.ك

هەرچەندە حزبی هیوا رۆڵێکی چاوێنی بینی لەڕێنماییکردنی روناکبیرانی کوردستانی ئێران، بەتایبەتی لەناوچەی موکریان، بەهاندانیان بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی نوێو سەردەمو گونجاو لەگەڵ گۆڕانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا نیشتمانپەروەرانی چالاکی حزبی ئازادیخوازی کوردستانو شاعیرو روناکبیرانی ناوچەکەو بەشە وشیاربووەکەی کۆمەڵگەی کوردەواریی هاوبەشییەکی کاریگەریان لەبەوەلەدهێنانی کۆمەڵەی ژ.ك دا کرد.

جگە لەوانە هاتنی لەشکری سور بۆ ناوچەکە، هەرەسهێنانی ئەرتەشو دامودەزگای رژێم لەو بەشەی کوردستانی رۆژهەلات، بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی دیموکراسییو گەشەکردنی هەستی نەتەوەییو هوشیاریی سیاسیی لەناو بەشە رۆشنبیرەکەدا، نەمانی کۆسپی هاتووچونو رەوینەوەی ترسو دەستپێکردنی پێوەندییو ئاڵوگۆڕی بیروڕاو چالاکیی ئاشکرا.

ئەوانە زەمینەیەکی لەباریان هێنایە ئاراوە، روناکبیرە کورد پەروەرەکان کەوتنە مشتومڕ لەسەر پێکەوەنانی رێکخراوێکی نەتەوەیی، هەستو نەستی نەتەوەیی لای ئەوانە لەو ئاستەدا بوو کەدەرك بەئەرکەکانی سەرشانیان بکەن، پێویستیی پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی سیاسییو نەتەوەیی بەکارێکی مێژوییو ئەرکێکی نیشتمانی بزانن.

تائێستا مێژووییەك نییە کە هەموو مێژوونوسو نوسەرانی رووداوەکانی ئەزمونەکەی مەهاباد، لەسەر ئەو رۆژو مانگو ساڵەی کۆمەڵەی ژ.ك-ی تێدا دامەزرێنرا رێککەوتبن... تەنانەت لەناو دامەزرێنەرانی ژ.ك-یشدا جیاوازیی بیروڕا هەیە... بڵاوکراوەکانی ژ.ك-وحزبی دیموکرات لەسەردەمەکەدا رەسەنترین سەرچاوەن بۆ لابەلاکردنی ئەم ئاڵۆزییە:

-لە رۆژژمێری تایبەتیدا کە ژ.ك لەژمارەی ساڵانی *1322-1323*دا بڵاویکردەوە..نوسراوە کە *25*- ی گەلاوێژ جیژنی سەری ساڵی کۆمەڵەی ژ.ك-ە. مەلا قادری مودەریسی لە دیدەنییەکی سەید محەمەدی سەمەدی، وەك لەنامیلکەکەی ئەمدا "ژێ.کاف، چبوو؟چی دەویست؟ وەچی لێبەسەر هات؟ "مەهاباد-*1981*

تۆمارکراوه: ئەڵێت دامەزراندنەکە لە 25-ی شەهریوەری ساڵی 1321 هەتاوی ڕێکەوتی سیپتامبری 1942 بووه...

سەید محمد سەمەدی...دەڵێ:" ڕۆژی 25ی مورداد(گەلاوێژ) 1321(16ئووتی 1942) واته 16تەممووزی 1942 حیزبی کۆمەڵەی ژ.ك دامەزراو جیژنی ساڵڕۆژی دامەزراندنی لەساڵانی 22 (43) 23(44) 24(45)و 25(46) گیرا.*

هەرچی ئیگلتن-ی کوره(16سیپتامبری 1942) بەڕۆژی دامەزراندن دادەنێت...

بەڵام ڕەحیمی قازی دەڵێت کۆمەڵەی ژ.ك لەمانگی ژووەنی 1938 لەمەهاباد لەلایەن چەند ڕووناکبیریی نیشتمانپەروەرەوه دامەزرابوو..**

ئیدارەی ناوەندیی کۆمەڵەش لەنامەیەکیدا بۆ (مۆلۆتوف)لە 28ی دیسامبەری 1944دا دەری دەخات که "حیزبی ئێمه لەمانگی یونی ساڵی 1938دا دامەزراوه.***

لەڕۆژنامەی کوردستانیشدا، سەید محەمەدی حەمیدی، بەبۆنەی شەهیدبونی محەمەدی نانەوازادەوه دەنوسێت: نانەوازاده ساڵی 1320(1941) داخڵی (حزبی ئازادی کوردستان" بوو..

لەو ڕۆژەدا، چەند کورد پەروەرو دڵسۆزێك کەژمارەیان لە(15) کەس زیاتر نەدەبوو، هەموویان سەربەچینی ناوەڕاستی کۆمەڵێ لەکاسبکارو دوکاندارو بازرگانی بچوك‌و خەڵکی شاری مەهاباد بون.. ئەوانه بەرەو باخی حاجی داود کەلەنزیك چەمی سابلاغەوه بوو، کەوتنەڕێ‌و لەوێ یەکیان گرت، لەوێدا کەوتنه قسەو ئاڵوگۆڕی بیروڕاو مشتومڕ لەسەر بارودۆخی نەتەوەکەیان‌و ڕێگەی رزگاریی لەداگیرکردن‌و چەوساندنەوەو بەدەستهێنانی مافی نەتەوه.. هەموویان گەیشتبوونه ئەو بڕوایه کەبەبێ کۆمەڵێکی سیاسیی‌و ڕێکخراوێکی نوێ ناتوانرێ دەست بەچالاکیی‌و خەباتی ڕێك‌و پێك بکرێ.. بەهۆی پێوەندیی سیاسیی‌و برایانەیان لەگەڵ حزبی هیوا، نوێنەرانی ئەو حزبه ئامادەی ئەو مشتومڕو دانیشتن‌و کاری بەوەڵەدهێنانی ڕێکخراوه نوێیەکه بوون.

---

* بڕوانه: حەسەنی قازی، بۆچوونێك سەبارەت بەتأریخی دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانی کورد، گۆڤاری گزینگ ژماره: 17، پاییزی 1997.

** د. ڕەحیمی قازی لەکتێبێکی دەستنووسدا(قاضی محمد وجنبش رهانی بخش ملی خلق کرد" بڕوانه: حەسەنی قازی هەمان سەرچاوەی ناوبراو.

*** حەسەنی قازی، سەرچاوەی ناوبراو، ئەمیش لەنوسینێکی: حامید گەوهەری وەریگرتووه...

## كۆمەڵەی ژیانەوەی كورد (ژ.ك) لەدایك بوو

لەسەر ناوی ژ.ك كەئایا كورتكراوەی كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردە یان كوردستان..دەمێكە مشتومڕو ئاڵوگۆڕی بیروڕای جۆراو جۆر هەیە، ئەو ناوانەی كەلەناو ئەو مشتومڕانەدا قسەیان لەسەركراوە:(كۆمەڵەی ژیانەوەی كورد) (كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستان)(كۆمەڵەی ژیانی كورد)( كۆمەڵەی ژیانی كوردستان)..

ئەوانەی ناوی كۆمەڵەیان بەیەكەم ناوبردووە ئەمانەن: د.عەزیز شەمزینی، جەمال نەبەز، رەحیمی قازی، عەبدولرەحمان قاسملوو، ژیگالینا، د.گولمرادی مرادی، د.بورهان یاسین، عەبدولرەحمان هەژار، د.عەبدوڵلا مەردوخ، غەنی بلوریان، حامیدی گەوهەری.

بۆ دووەم ناو ئەمانەی خوارەوەن:

عەبدولسەتار شەریف، م. د. جەلائی پوور.

بۆ سێهەم ناو:

روزفیلت ی كوڕ، وەدیع جوعەیدە، قادری مودەریسی، عەلی عەبدوڵلا.

بۆ چوارهەم ناو: ئیگلتن ی كوڕ، تومابوا، حەسەن ئەرفەع، كریس كوچیرا، ریچارد ئا. هوبلی، فەریدەكوهی و كەمالی، روزڤیلت ی كوڕ..*

لەو ناوبردنانەش بەو جۆرە، پێدەچێت بەڵگەنامەیەكی رەسەن و بڕێنەرەوە لای هیچ یەكێك لەو مێژوونوس و نوسەرانە نەبێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و دڵنیاكارە لەو باسەدا ئەو مێژووەیە كە لەڕۆژژمێری تایبەتی كۆمەڵە خۆی و ئەو یادەی یەكساڵ بەسەر تێپەڕبوونی دامەزراندنی حزبی دیموكراتی كوردستان كە بیروەریی ئەو دامەزراندنە بەدامەزراندنی ژ.ك ەوە دەبەستێتەوە.

بەو جۆرە كۆمەڵەی ژ.ك (كۆمەڵەی ژیانەوەی كورد) لەدایك بوو لەدامەزرێنەرانی ژ.ك-دا ئەم ناوانەی خوارەوە هاوبەشبوون:

*1*-حەسن رزگری.

*2*-محەمەد نانەوازادە.

---

* بڕوانە حەسەنی قازی، زنجیرەی كۆمارناسی، گۆڤاری گزینگ ژمارە 18 زستانی 1998.

3-عەبدولڕەحمان ئیمامی.

4-عەبدولڕەحمان زەبیحی.

5-نەجمەدین توحیدی.

6-عەلی مەحمودی.

7-عەبدولڕەحمان کیانی.

8-قاسم قادری.

9-عەبدولقادر مدرسی.

10-محەمەد ئەسحابی.

11-سدیق حەیدەری.

بەڵام ولیەم ئیگلتن، دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ك ئەم ناوانەی خوارەوە دەستنیشان ئەکات: (8)

1-عەبدولڕەحمان حلاوی.

2-محەمەد ئەمین شرفی.

3-محەمەد نانەوازادە.

4-عەبدولڕەحمان زەبیحی.

5-حسەین فروهر.

6-عەبدولڕەحمان ئەمینی.

7-قاسم قادری.

8-مەلا عەبدولڵا داودی.

9-قادر مدرسی.

10-ئەحمەد عیلمی.

11-عەزیز زەندی.

12-محەمەد یاهو.

13-میرحاج لەعیراقەوە.

سدیق حەیدەری ئەڵێ: ئێمەش دەستەیەك لاوی خوێندەوار بووین کەئاوڕێکی بەتین لەدەرونماندا بڵێسەی هەبوو، بەڵام ئەوکات ڕێگەیەکی روناکمان لەپێش نەبوو وەنەمان دەزانی چیبکەین، ئەو تینو مەیلە لە25 شەهریوەری ساڵی 1321ی هەتاوی

ڕێکەوتی *16*ی سپامیری *1942* شکڵی گرت، ئەو ڕۆژە لەگەڵ پۆلێک چووینە باغی ئەمینولئیسلامی نوتفەی تەشکیلاتی ژێ.کاف گۆڕا. ئەو ڕێکخراوە شتێکی سەددەرسەد (*100٪*)ەوە خالیسی نەتەوایەتی بوو، مقیاس و معیارو پەیمان بۆ ئەندامەتی لەو ڕێکخراوەدا تەنیا (کورد)بوون بوو، بناغەدانەرەکان ئەوانەبوو:

*1*-محەمەد نانەوازادە.

*2*-عەبدولڕەحمان زەبیحی.

*3*-حوسێن فروهەر.

*4*-عەبدولڕەحمان ئیمامی.

*5*-قاسم قادری.

*6*-مەلا عەبدوڵلای داودی، مەشهور بەمەلای حەجۆکی.

*7*-محەمەد یاهو.

*8*-بۆ خۆم (مەبەست مەلا قادر).

*9*-سدیق حەیدەری.

*10*-عەبدولڕەحمان کەیانی.

*11*-میرحەج (مەبەستی میر حاجە).

لەسەر جۆری دامەزراندنی ژ.ک، د.عەبدوڵلا مەردوخ دەڵێت:

"کۆمەڵەی ژ.ک کە نوێنەری هەستی نەتەوایەتی پێشکەوتنخوازانەو دیموکراتیکی گەلی کورد بوو، لەڕۆژی *25*ی گەلاوێژی *1321*ی هەتاوی بەرانبەر *16*ی ئووتی *1942*ی زاینی بەچەشنێکی ڕەسمی بەهاندان و بەشداری سێ ئەندامی ناوبراوی هیواو ئەم کەسانە پێکهات:

عەبدولڕەحمان زەبیحی(ع.بیژەن)، عەبدولڕەحمان ئیلخانی زادە(موهتەدی)(مەلاو خاوەن موڵک) لەناو کۆمەڵەدا بەبرای ڕاست و پاشان بەمرۆ ناو دەبرا، محەمەد نانەوازادە(ئەرتەشی جاران و پاشان بەزاز) مەلا قادری مودەڕسی(مامۆستاو پاشان کارمەند)، حوسێن فروهەر(ح. زیرینگەران)، عەبدولڕەحمان ئیمامی(کوڕی ئیمام جومعەی مەهاباد و پاشان کارمەند)، قاسم قادری قازی (مامۆستا)، مەلا عەبدوڵلا داوودی(مەلا حەجۆ) (دووکاندار) مەحەمەد یاهو(کارمەند)، سەدیق حەیدەری، عەبدولڕەحمان کیانی(بەزاز)محەمەد شاپەسندی، مەحەمەد ئەسحابی(مامۆستا)،

نەجمەدین تەوحیدی(کارمەند)، حامید مازوچی، عەلی مەحموودی(مامۆستا)، مەحەمەد سەلیمی، محەمەد سەعید حافزی (لەکرماشان قازی بوو)، سەید تاهیری هاشمی(لەکرماشان مەلا بوو)، نافیع مەزهەر(کارمەند لەسەقز)و عەبدولقادر دەباغی(سیامەك) ئەمانە دامەزرێنەرو ئەندامانی کەرتی دووەمی (ژ.ك)بوون...*

وە رابیتی ژێ.کاف لەگەڵ حزبی هیوای عیراق، سەعیدی حەمە قالەی بێستانچی بوو کەبەڕاستی بێغایەتی زەحمەتی دەکێشا ماوەی دووسالان (حوسێن فروهەر) "حوسێنی زێرینگەران" رئیسی کۆمەڵەی ژێ.کاف بوو**

بەوجۆرە لەسەر دامەزرێنەرانی ژ.ك چەند بیروڕایەکی جیاجیا هەبووە، تائێستاش بەبەڵگەی ژ.ك خۆشی لیستەیەکی متمانەپێکراو نەکەوتۆتە بەردەست.

لەپرس و ڕا لەگەڵ زەبیحی ناوی دامەزرێنەرانی ژ.ك-ی بەم جۆرە نووسیوە:

1-حسەین فروهەر

2-عەبدولڕەحمان زەبیحی. 3-عەبدولڕەحمان ئیمامی. 4-عەبدولقادر مدەرسی. 5-نەجمەدین تەوحیدی. 6-محەمەدی نانەوازدە. 7-عەلی مەحمودیی. 8-محەمەدی ئەسحابی. 9-عەبدولڕەحمان کیانی. 10-سدیق حەیدەری. 11-قاسم قادری.

دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملوش هەر ئەو ناوانەی بەدامەزرێنەری ژ.ك نوسیوە: جەلیل گادانیش، مەلا عەبدوڵڵا داودی، حسەین فروهەر، عەبدولڕەحمان زەبیحی، عەبدولڕەحمانی ئیمامی، عەبدولقادر مدەرسی، نەجمەدین تەوحیدی، محەمەد نانەوازادە، عەلی مەحمودی، محەمەدی ئەسحابی، عەبدولڕەحمانی کیانی، سدیق حەیدەری، قاسم قادری، عەزیز زەندی، محەمەد یاهو، ئەحمەد عیلمی، بەدامەزرێنەرو کارگێڕی ژ.ك داناوە، میرحاج و مستەفا خۆشناویشی بەنوێنەرانی حزبی هیوای کوردستانی عیراق ناونوس کردووە کەبەشدارییان لەدامەزراندنەکەدا کردووە*

* بڕوانە: د.عەبدوڵڵا مەردوخ، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردو کۆمەڵەی هیوا، گۆڤاری گزینگ، ژمارە 14 زستانی 1997(1375)

** بڕوانە: سەید محەمەد سەمەدی، ژێ.کاف چبوو؟ چی دەویست؟ وەچی لێهات؟ مەهاباد 1981.

* بڕوانە کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، جوتیار تۆفیق، کوردستانی نوێ ژمارە 1401ی رۆژی 1997/4/7.

محەمەدی شا پەسندیش هەمان ئەو ناوانەی دەستنیشانکردووە کەمام جەلال لەکتێبەکەیدا "كردستان والحركة التحررية القومية الكردية...." نوسیونی ئەوە نەبێ کەئەم لەقسەو باس لەسەر ئەو ناوانە ناوی (عەلی رەیحانی)ش دەبات* هەندێ کەسیتر لای وایە کەعەزیز زەندی-ش کەدامەزرێنەرو سەرۆکی حزبی ئازادیخوازانی کوردستان بوو *1938-1942* ئەمیش لەلیستی دامەزرێنەرانی ژ.ك دادەنێ*.

محەمەدی شا پەسەندی لەسەر ناوی کۆمەڵە ئەڵێ: (ژ.ك) واتە (ژیانەوەی کورد)** زیاتر لەوانە لەسەر ناوی کۆمەڵەی ژ.ك چەندین بۆچوونی جیاجیا هەیە:

د. عەبدولڕەحمان قاسملو لە "کوردستان و کورد" و، د. کەمال مەزهەر لەدراسات فی تاریخ ایران الحدیث والمعاصر. کەریمی حسامی بە(کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد) ناوی دەبەن. ئارچی روزفلت-یش ئەڵێ (لە*16* ئابی *1943*)دا دوانزە لاوی کورد کەزۆربەیان وردە بازرگان و فەرمانبەری بچووکی ناوشاربوون (کۆمەڵەی ژیانی کوردیان دامەزراند)***

دیارە لەبۆچونەکەیدا: لەلێکدانەوەی ناوو ساڵی دامەزراندنی ژ.ك دا هەڵەی کردووە.

دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ك گۆڕانێکی سیاسیی گەورە بوو لەبزوتنەوەی کوردایەتیی ئەوبەشەی کوردستاندا، رێکخستنێکی نوێ و سەردەم بوو.. بەرزکردنەوەی دروشمی مێژوویی یەکگرتنەوەی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بەپلەیەکی نوێی جوڵانەوەی نیشتمانی کوردستان دادەنرێت. لاخستنی خەباتی چەکداریی و پەنابردنە بەر لایەنی روناکبیریی و هوشیاریی سیاسیی و ورياکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك و خوێندەوارکردنی، رێبازێکی نوێ بوو، نەك هەر تا ئەو سەردەمە، بگرە تا نیوسەدە دوای دامەزراندنەکەشی. لەکوردستانی عیراقدا تەنها مێژوونووسی بەناوبانگ محەمەد ئەمین زەکی بەگ لەسەر زەرەرو زیانی شەڕی چەکداریی بەزەقی و ئاشکرا قسەی کردبوو.. بۆیە:

(کۆمەڵەی (ژ.ك) بەهۆی بەرنامەی نیشتمانی و چەشنی رێکخراوەیی و هەڵسوڕانیەوە، بەخێرایی لەسەرانسەری کوردستان لق و پۆپی هاویشت و کۆمەڵانی زەحمەتکێش و بازاڕی و کاسبکارو عەشیرەتەکانی کوردی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو

---

* بڕوانە: ئالای ئازادی، ژمارە *25*-خولی دووهەم، *1992/5/31* ، لەقسەی (محەمەدی شاپەسەندی)یەوە وەرگیراوە.

** *50* ساڵ خەبات - کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، جەلیل گادانی، بەرگی یەکەم- *1996* ل*20*

*** بڕوانە: دروستبوونی کۆمەڵە، ئارچی رۆزفلت، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە ئەکرەم قەرەداخی، کوردستانی نوێ، ژمارە (*1680*) *1998/8/20*.

لـەبزواندنی هەسـتی نەتەوایـەتیو وریاکردنـەوەی سیاسـیی خـەڵکدا نەخشـێکی گرنگیی هەبوو..)[9].

مـەلا قادری مودەریسـی لەسـەر سیاسـەتو ڕێبازی خـەباتو ستراتیجی کۆمەڵـەی ژ.ك بەم جۆرە قسان دەکات:

*1*–بناغـەی دامـەزراندنی ژێ.کاف لـەروی تەجروبـەو ڕوداوە مێژوییـەکان بۆیـان دەرکەوتووە کەدەس بردن بۆ چەك غەیری چارەڕەشیو بەدبەختی بۆ گـەلی کورد هیـچ بەرهـەمێکی دییکـەی نییـە یـان دیـتن بـەچاوو بـوون لـەتاریخدا ئـەو مەسـەلەی پێسەلماندبووین نەترسەنۆکی.

*2*–بناغـەو ئەساسـی کۆمەڵـەی ژێ.کـاف لەسـەر ئـەو ڕاسـتەقینەیە کـەگرنگترین هەنگاو بردنە سەری سەتحی فەرهەنگی گەلی کوردە.. تاد.

*3*–لەروانگەی دیانەتەوە لەبەرئەوەی کە(دینی ئیسلام) زیاتر لەهەزار ساڵە تێکـەڵ بەژیانی ماددیو مەعنەوی گەلی کورد بوو، بەبەشێك لەفەرهەنگیی گەلی کورد حیساب دەکرێ وە ژێ.کاف ڕیزێکی تایبەت بۆ ئەو ئایینە پیرۆزە دادەنێ.. تاد.

*4*–چوار دەستە (تاقم) دەیـان توانـی ببنـە ئـەندامی ژێ.کـاف، بـەڵام هـەرگیز نـەیان دەتوانی بەپلەی سەرۆکی ژێ.کاف بگـەن، ئـەو چوار دەستەش بریتیبوون لـە: ئاغا، شێخ، مەلا، سەید.. . تاد*

دەرگـای بوونـە ئـەندام لـەژ.ك دا تـا ڕادەیـەك کـراوەو لەسـەر بنچینـەی کـورد بـوون بـوو.. شێوەی وەرگرتنەکـەش لەسـەر بنچینەیـەکی کلاسیکی بـوو، پێویسـت کرابـوو کەهـەر کوردێك بیـەوێ ببێتـە ئـەندام، لەکۆبوونەوەیـەکی نهێنیو لەبەردەمی دووسـێ ئەندامدا سوێند بەقورئان بدرێ کە:

*1*–خەیانەت بەنەتەوەی کورد نەکات.

*2*–کۆشش بۆ خودموختاری کوردان بکات.

*3*–هیـچ ڕازێکـی (نهێنییـەکی) ڕێکخـراو، نەبـەزمان، نەبەقەڵـەم، نەبەئیشـارەت، ئاشکرا نەکات.

*4*–هەتا ئاخری عومری هەر ئەندام بێت.

---

* بڕوانە: سەید محەمەدی سەمەدی، ژێ. کاف چیبوو؟ چی دەویست؟ وەچی بەسەر هات مەهاباد 1981.

5-تەواوی پیاوانی کورد بەبرای خۆی وەتەواوی ژنانی کورد بەخوشکی خۆی بزانێ.

6-بەبێ ئیزنی کۆمەڵەی ژێ.کاف نەبێتە ئەندامی هیچ رێکخراوو دەستەیەکی‌تر. وەغەیری ئەو سێ‌کەسەش، کەسێکی دییکەی نەدەناسی [10].

لەرووی پێکهێنان‌و بوون بەئەندامی کۆمەڵەی ژ.ك هێمن بیرەوەرییەکانی خۆی وا باس دەکات: "تا رۆژی 25ی گەلاوێژی 1321ی (ئابی 1942) کۆمەڵەی ژ.ك دامەزرا، ئەوانی ئەو کۆمەڵەیان دامەزراند دۆستانی پێشوی من بون، من لەو سەروبەندەی‌دا لەتەوریێز بووم‌و لەڕۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەدا حوزورم نەبو، کەهاتمەوە بەهۆی زەبیحی کەلەمێژە ساڵ بو دۆست بووین بەکۆمەڵە ناسێندرام، لەماڵی یەکێك لەدۆستەکانی خۆم کەپاشان زانیم ئەندامی ژمارەیەکی کۆمەڵەیەو بەقورئان‌و ئاڵای کوردستان‌و بەشەرەفی خۆم‌و بەشمشێر سوێندیان دام بەزمان‌و بەقەڵەم‌و بەئیشارەت خەیانەت بەنەتەوەی کوردو ئەندامی کۆمەڵە نەکەم.." [11].

بۆ زیاتر رێك‌و پێکردنی کاروباری کۆمەڵە لەنیسانی 1943 دا لەچیایەکی نزیك شاری مەهاباد (خۆلا پەرستان) کۆبوونەوەیەکی فراوان کرا نزیکەی (100) ئەندامێ هاوبەش بون، بۆیە زیاتر لەشێوەی کۆنگرەدا بوو وەك لەکۆبونەوەیەکی ئاسایی. لەو کۆبوونەوەیەدا پاش لێدوان‌و گفتوگۆ گەلێك بڕیاری گرنگ درا لەوانە:

-گۆڤارێك چاپ بکرێت‌و ببێتە ئۆرگانی کۆمەڵە، بیروڕاو هەڵوێستی تیا رون بکرێتەوە لەژێر ناوی (نیشتمان)دا.

-کۆمەڵە پەیوەندی بەسۆڤیەتەکانەوە بکات بۆ باسکردنی مەسەلەی کوردو داوای یارمەتی‌کردن‌و پشتیوانی‌کردنی بۆ ئەوەی بتوانێ مافە نەتەوایەتییەکان بەدەست بێنێت.

-هەر لەو کۆبوونەوەیەدا کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەڵبژێردرا [12].

-وشەی نهێنی بۆ کۆمەڵەو ئەندامەکانی دابنرێت تا بەهۆیەوە یەکتری بناسن، کەبەوجۆرە بوو: (خواپەرستی شتێکی باشە) [13].. ئامانجی سەرەکیی کۆمەڵەی ژ.ك لەو قۆناغەدا خودموختاری کوردستان بوو.. وەکو لەبڵاوکراوەو نووسین‌و گۆڤاری نیشتمان دا دەرئەخرا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتیەکەی لەو بڕوایەدا بوو کەنابێت

ڕێکخستن لەسنوری کوردستانی ئێران دا قەتیس بکرێت.. بۆ ئەو مەبەستە محەمەد ئەمین شەرەفی بۆ کوردستانی عیراق نێردراو لەدواییشدا بۆ کوردستانی تورکیا*.

ئیسماعیل حەقی شاوەیس و عوسمان دانش بەنوێنەری ژ.ك بۆ مەهاباد نێردران، قەدری بەگ بەنوێنەرایەتی کوردەکانی سوریاو قازی مەلا وەهاب نوێنەری کوردی تورکیا، لەدواییدا کۆبوونەوەیەکی سێ قۆلی ساز کرا، لە: قاسم قادر نوێنەری کۆمەڵە، شێخ عوبێدوڵلا زینۆ نوێنەری کوردەکانی عیراق و قازی مەلا وەهاب نوێنەری کوردەکانی تورکیا لەچیای (دلەنبر) کەکەوتۆتەسەر سنووری سیاسی تورکیاو عیراق و ئێران، وەهەر بەناوی ئەو شوێنەشەوە کۆبوونەوەکە بەکۆبوونەوەی سێ سنوور ناوبرا، دوای لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خەباتی کۆمەڵەو رادەی گەشەکردنی، گەیشتنە ئەو ئەنجامە کەپێویستە سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو بۆ هەرسێ لقەکە دابنرێت تا رابەرایەتیی خەباتی نەتەوەی کورد لەهەر سێ پارچەکە بکات.. هەرچەندە ئەو بیروبڕیارە هەر لەسەر کاغەز مایەوە، بەڵام هەنگاوێکی گرنگ بوو لەبیرکردنەوە بۆ بەکوردستانی کردنی خەبات.. بەتایبەتی لەگەڵ حزبی هیوادا لەسەر ئەوە پێکهاتبوون کەئامانجی سەرەکییان سەربەخۆیی کوردستان بێت.

لەگەڵ ئەوانەشدا نوێنەرە چالاکەکانی کۆمەڵە دەستیان کرد بەپێوەندیی لەگەڵ لێپرسراوانی یەکێتی سۆڤیەت، بەتایبەتی کۆنسوڵی ورمێ و تەورێز، عەبدولڕەحمان زەبیحی و قاسمی ئیلخانزادە لەچەند دیدەنییەکیاندا مەبەستەکانی خۆیان و ڕۆڵ و سەنگ و ئاستی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەیان بۆ ئەو لێپرسراوانە روونکردۆتەوە وەك لەدواییدا بەهەندێ بەڵگەنامەوە ئەو کارە و ڕۆڵی ئەو دوو ئەندامە چالاکەی ژ.ك، باسدەکەین.

بەو جۆرە کۆمەڵەی ژ.ك لەمەیدانەکانی نوسین و ڕێکخستن و پێوەندیی بەنوێنەرانی پارچەکانی‌تری کوردستان و پێکهێنانی لقی ڕێکخستن، پێوەندیی بەلێپرسراوانی سۆڤیەتەوە.. وەك رابەری نەتەوەو سەرکردەی بزوتنەوەی کوردایەتی هاتە مەیدانی خەباتەوە.. لەسەر بنچینەی شانەو بەستنی بنکەکانی خوارەوە

---

* لەسەر ڕۆڵی کوردی عیراق و کاریگەرییان لەسەر ڕووداوە سیاسییەکانی بڕوانە: د. عەبدوڵلا مەردوخ، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردو کۆمەڵەی هیوا، هەمان سەرچاوە.

بەسەروتر بەچالاکیی نهێنییو پارێزگاریکردنی ئەندامەکانی لەشاڵاوی دوژمن، کارەکانی ئەنجامداوە..

ژ.ك بەرهەمێکی گونجاوی ناو هەلومەرجە رەخساوەکانو گۆڕانەکانی ئەو سەردەمە بوو. هەرچەندە هەستو نەستی نەتەوەیی لەناو بەشە خوێندەوارو روناکبیرەکەی کۆمەڵگەی کوردەواریی، تا ڕادەیەك گەشەی کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەڕوی سیاسییو بەرزکردنەوەی دروشمی نەتەوەیی، بەگۆڕانێکی گەورەی ناو هەلومەرجە بابەتییە، تاڕادەیەك، گونجاوەکان دادەنرێت.

هەرچەندە تازەییو قەبارەی رێکخراوەیی کۆمەڵەو بارودۆخی ناوخۆو هەلومەرجە نێونەتەوەییەکان یارمەتیدەری گۆڕانی بنەڕەتیو رادیکاڵانە نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا ژ.ك وەك رێکخراوو وەك رابەرێکی سیاسی نوێی کوردایەتی بووە هەڵگری دروشمە نەتەوەییەکە. لەڕوی نەشونماو بیروباوەڕو بنکەی جەماوەرییو پێڕەوو بەرنامەشەوە، جیاوازییەکی گەورەی بەخۆوە بینی، بەبەراورد لەگەڵ رێکخراوەکانی پێش سەردەمی بەوەڵەدبوونی.

(کۆمەڵە بێجگە لەوەی کۆمەڵەیەکی سیاسی بو کۆمەڵەیەکی کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیش بوو، زوربەی ئەندامانی کۆمەڵە بڕوایان بەو سوێندە هەبوو کەخواردبویانو دەستیان لەئاکاری دزێو هەڵگرتبوو، دزی، خراپەو نێوان ناخۆشی لەکزی دابوو، دەتوانم بڵێم لەهێندێك جیگایان هەرنەما)[14].

یەکێك لە گۆڕانە زۆر گرنگەکان ئەوەبوو کە ژ.ك بەکردار مەیلی ناوچەگەریی خستەلاوە، قاڵبێکی نەتەوەیی دوور لەگۆشەگیریی دا بەکوردایەتی، هۆیەکی گرنگ بوو بۆ بڵاوبوونەوەی گیانی نیشتمانپەروەرییو هەستی نەتەوەیی. لەگەڵ هەموو ئەوانەشداو بەهۆی گەلەك هۆوە، هەر رێکخستنەکانی کۆمەڵەی ژ.ك بوو کەحزبی دیموکراتی کوردستانی لەسەر بیناکرا. زۆر لەهاوڕێیانو لێکۆڵەران ئەو دیاردەو گۆڕانە بەڕێنماییو دەستی لێپرسراوانی کۆماری ئازربایجانی سۆڤیەت دادەنێن، جگە لەوە کەلێپرسراوو گەلێ لەئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵەش ئەو گۆڕانەیان بەباش زانیبوو*

سەرەڕای هەموو ئەوانە ژ.ك بێکەموکورتیو هەڵەنەبووە:

"لەگەڵ پەرەگرتنی جوڵانەوەی نیشتمانی وەبەگوێرەی پێویستو هەلومەرجی رۆژ، کۆمەڵەی (ژ.ك)چ لەعاست پرۆگرامو شکلی رێکخراوەیی، چ لەعاست باری سیاسیی تێکۆشانەوە پێویستی بەدەسکاری هەبوو"[15].

بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکان، رێبەرانی ژ.ك لەو بڕوایەدا بوون کەدەبێ یەکێك لەزلهێزەکانی یارمەتیدەربن، بۆیە لەهەمان ئەو کاتانەی کەدەیانویست پێوەندییەکانی ژ.ك لەگەڵ لێپرسراوانی سۆڤیەت باشو توندوتۆڵ بکەنو پەیتا پەیتا کۆبوونەوەیان دەکرد.. هاوتەریب لەگەڵ ئەوە، ئومێدیان بەرۆژئاوا هەبوو، بۆیە واپێدەچێ لەکۆششیشدا بووبن کەلەگەڵ لێپرسراوانی ئینگلیزدا پێوەندیی بگرن.. ئەوەی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ ئەو نووسینەیە کەلەژمارە 3-4ی ساڵی یەکەمی گۆڤاری نیشتماندا بڵاوکرایەوە کەبەبۆنەی دەرچوونو بڵاوکردنەوەی (دەنگی گێتی تازە) بوو.. لەژێر ناوی (ئەستێرەیەکی تازە لەئاسمانی چاپەکانی کوردیدا جوامێرو مەردوم دۆستی بەریتانیای گەورەدا) نووسراوە: "کورد ماوەیەکی زۆر لەمێژە هەستی بەنەجابەتو مرۆخۆشەویستی بەریتانیا کردووە ئەم حکومەتە گەورەیە بەدرێژایی مێژووی ئیمپراتۆریەتی خۆی هەمیشە پارێزگاری ئازادی سەربەخۆییو پەروەرێنەرو پێگەهێنەریی نەتەوە بچوکەکانی گێتیبووە.."[16].

لەدواییدا پێخۆشحاڵی (نیشتمان) دەردەخات لەدەرکردنی گۆڤاری دەنگی گێتی تازەو ئینجا داوا دەکات: "چۆن ئێستگەی رادیۆ بەناوی کوردستانەوە لە (یافا) هەیە لەلەندەنیش بیکاتەوە.." [17].

تاکۆتایی نوسینەکە بەم جۆرە دەهێنێ.

"بژی ئاڵاهەڵگری ئازادیی گێتیی بەریتانیای مەزن: نیشتمان.." [18].

پێم وایە رابەرانی ژ.ك لەرۆڵی خراپی ئەو دەوڵەتە بێئاگانەبوون، لەڕوخاندنی حوکمداریو مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمودو داگیرکردنی باشووری کوردستانو لکاندنی بەمیسۆپۆتامیاو دامەزراندنی ئەم عیراقەی ئێستا بەئاگابوون.. لەگەڵ ئەوەشداو بۆ مەرامێکی نوێی سەردەمێکی نوێ، چاویان لەوە پۆشیوەو بەو گیانەوە ئاوڕیان لەو دەوڵەتە خاوەن قودرەتە گەورەیە داوەتەوە، بەڵکو بتوانن پێوەندییەکی نوێ بخوڵقێنن ئەوەی زیاتر سەرنجڕاکێشەریشە، بەرپرسانی کۆمەڵە بەئاشکراو بێ

سڵەمینەوەو بێگوێدانەی دۆستەکانی: ئازەربایجان و روسەکان، ئەو بۆچوون و هەڵوێستەیان هەبووە.. کەئەوەش، تارادەیەکی باش سەربەخۆیی داڕێژەرانی بڕیار لەسەرکردایەتیی ژ.ك-دا دەردەخات. جگە لەوە ئەوەشیان بەبەشێك لەبەرنامەکەی ژ.ك داناوە کە ئامرازێکی تری هوشیارکردنەوە بهێنرێتە ئاراوە.

یەکێك لەو هەنگاوە گرنگانەی ژ.ك هەڵیهێنا، ناساندنی کێشەی کورد بوو بەزلهێزانی سەردەمەکە بەتایبەتیی بەڕووسەکان، بەو مەبەستەی کەدەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت ببێت بەپاڵپشتی کورد بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، لەمەشدا سەرکردایەتی ژێکاف لەو راستییە گەیشتبوو کە سەبارەت بەوەی هێزەکانی ئەو دەوڵەتە هاتوونەتە ناوچەکەوە، جۆرە ئامادەیەکیشیان تێدایە کە ئاوڕێك لەکورد بدەنەوە، سەردەمەکەش سەردەمی گەرمەی پڕوپاگەندەی سۆڤیەت بوو کەقەڵای سەفرازیی گەلانە، خۆ دەوڵەتانی خۆرئاواش ئاوڕیان لەکورد نەدەدایەوە، بگرە یارمەتیدەری ئێرانیش بوون، بۆیە ئەو هەنگاوە لەگەڵ ڕەوتی روداوکاندا دەگونجا، بەلام ئەقڵی سیاسیی کوردو کەمی هوشیاریی سیاسیی لەگەڵ سیاسەتی پڕ لەپێچوپەنای روسەکان و گوێ نەدان بەمەسەلەی میللەتانی ژێر دەست، بەپێچەوانەی قسەو دیعایەو بەڵێنەکانیانەوە، ئەوانە هێندە لەیەکدووربوون کەلەیەکگەیشتنێکی جووت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی هەردوولا مەحاڵ بێت... لەم دۆکومێنتانەی لێرەدا دەیانخەینە بەرچاو، رووسەکان خۆیان ئاستیی دڵسۆزیی و متمانەی کورد بە یەکێتیی سۆڤیەت دەردەخەن، لەگەڵیشیاندا بەدگومانیی و گیانی نامرۆڤانەیان ئاشکرادەکەن.

بەهەر حاڵ رابەرانی ژێکاف، بەپێی تێگەیشتنی دوور لەنهێنییەکانی ژێر پەردەوە ئەو رێبازەیان گرتەبەر، بەتایبەتیش میللەتێکی بێپشتوپەناو بێدەرەتانیان سەرکردە دەکرد، دروشم و ئامانجێکیشیان هەڵگرتبوو، هەرچەندە ڕەواو یاسایی و هەق و مێژوویانە بوو، بەلام لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەی سەردەمەکەو ناکۆکیی و ململانێ و بەرژەوەندییە هەمەلایەنەکان و ناکۆکییەکانی نێوان زلهێزەکان و پەیمانە نهێنییەکان نەدەگونجان.

بۆ ئەو مەبەستەش ژێکاف دوو ئەندامیی سەرکردەو کارامە بۆ پێوەندیی بەلێپرسراوانی یەکێتی سۆڤیەتەوە تەرخان کرد کە عەبدولڕەحمان زەبیحی و قاسمی

ئێلخانی زادەبوون ئەوە بەشی هەر لەبەر ڕۆشنایی بڕیارەکەی کۆبونەوە فراوانەکەی(خولاپەرستان) بوو.

بەشێك لەو ئەرشیفانەی ئەو سەردەمەی یەکێتی سۆڤیەت کە کەوتونەتە بەردەست، زۆر لەو پێوەندییانەی خستۆتە ڕوو.. لەیەکێ لەنامەکانی حەسەنۆڤ سەرکۆنسۆلی یەکێتی سۆڤیەت لەتەوریز نەهاتووە:

"9یسیپتامبەری 1944 کوڕی یەکێك لەسەرۆك هۆزەکانی کورد "هۆزی دیبوکری" بەناوی قاسمی ئێلخانی زادە هاتە لامو رایگەیاند کەلەمەهاباد ڕێکخراوێکی نهێنی کوردییان پێکهێناوە کە ئەوو زەبیحی و عەلی ڕیحانی و مەناف کەریمی و... هتد ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەم ڕێکخراوەن. ئەم ڕێکخراوەیە گۆڤارێکی تایبەتی هەیەو ئۆرگانی ناوەندی ئەم پارتییەیە کەتائێستا چەند ژمارەیان لێ بلاوکردۆتەوە..

دوای ئەوەی کۆنسۆل درێژە بەنوسینی قسەکانی ئێلخانی زادە ئەداتو ئینجا دەنووسێت:

"مەبەستی ڕێکخراوی ئێمە گەیشتن بەسەربەخۆیی و ئازادی کوردستانە. ئێلخانی زادە وتی: ئێمەش دەمانەوێ قوتابخانەو چاپەمەنیمان بەزمانی خۆمان هەبێتو بەڕێوەبەرایەتی کوردیو.. هتد مان هەبێت، بەلام ئێمە بەبێ یارمەتی دەرەوە، زەحمەتە بگەینە مەبەستی خۆمان.

کوردەکان لەو باوەڕەدان کەدۆستی گەلانی بچوك، لەوانەش گەلی کورد، یەکێتی سۆڤیەتە، لەبەر ئەوە ئێمە ئازادی گەلی کوردمان لەدەستی یەکێتی سۆڤیەت دەوێت. بۆیە ئێمە داوا لەکۆنسۆلی سۆڤیەت دەکەین کەداواکارییەکانمان بگەیێنێتە دەولەتی یەکێتی سۆڤیەتو، ئێمە دەمانەوێ کە سۆڤیەت کوردان لەژێر بالی خۆی بگرێتو بۆ ئازادی کوردستان یارمەتیمان بدات.

منیش لەوەلامدا گوتم کەئێستا یەکێتی سۆڤیەت لەشەڕدایەو دەرفەتی لێکۆلینەوەی ئەم پرسیارانەی نییە.

ئێلخانی زادە وتی کەلەم بارەوە تێدەگات، بەلام لەبەرئەوەی کەشەڕ خەریکە کۆتایی دێتو بەم زووانە وتووێژی ئاشتیانە دەست پێدەکات، داخوازی ئەوەیە کەدەولەتی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر دامەزراندنو مەبەستی ئەم ڕێکخراوەیە ئاگاداربکاتەوە، لەبەرئەوەی گەلی کورد هیوای بەیەکێتی سۆڤیەت هەیە.

منیش وتم کەداواکارییەکەی ئەو دەگەیەنمە دەوڵەتی خۆمان.

لەوەڵامی پرسیاری من کەئایا ئەو رێکخراوەی ئێوە بەرنامەی هەیە؟

ئێلخانی زادە وتی: بەڵێ و بەڵێنی پێدام کە نوسخەیەکی بەرنامەکەمان بۆ بێنێت.

13سیپتامبر بۆ دووەم جار ئێلخانی زادە ئەمجارەیان لەگەڵ عەبدولڕەحمان زەبیحیدا هاتەوە لام. نوسخەیەك لەپرۆگرامی پارتییەکەی خۆیانی بەزمانی کوردی بۆ هێنام(وەرگێڕاوی رووسییەکەی پێشکەش دەکرێت).

زەبیحی وتەکانی ئێلخانی زادەی دووپات کردەوەو وتی: کە ئەم رێکخراوە نزیکەی دوو ساڵە پێکهاتووەو ناوی پارتی ژێکافەو بەمانای پارتی ژیانەوەی کوردستانە. زۆربەی ئەندامانی ئەم پارتییە لاوانی پێشکەوتوخوازی کوردستانن و نزیکەی هەزارو دووسەد ئەندامی هەیە.

ژێکاف بەتەوای رێکخراوێکی نهێنییەو تائێستا شەش ژمارە گۆڤاری "نیشتمان"ی دەرکردووە. زەبیحی پێنج ژمارە لەم گۆڤارەی پێدام. "نیشتمان" لەتەواوی کوردستاندا بڵاودەبێتەوە. بەڵام ئینگلیزەکان بڵاوکردنەوەی ئەم گۆڤارەیان لەعیراق قەدەغەکردووە. هەروەها زەبیحی وتی: کە ئەم رێکخراوەیە زۆرتر لەکوردستانی ناوەندی چالاکی دەکات و ئەگەر ئێمە دژ نەبین دەیانەوێ نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ عیراق و بۆ باکووری کوردستان بۆ پێکهێنانی ئەم پارتییە.

منیش لەوەڵامدا وتم: کە ئێوە بۆ خۆتان ئەم پارتییەتان دروست کردووەو دەبێ خۆتان بەرپرسی ئیش و کاری خۆتان بن.

زەبیحی وتی: کەدەیانەوێ بەدەستووری ئێمە ئیش و کاربکەن و لەبەرئەوەیە کە داوا لەئێمە دەکات، لەبەرێوەبردنیاندا دەست بەروویانەوە نەنێین.

منیش لەوەڵامدا وتم: کە ئەم پارتییە ناناسم و دەبێ لەپێشدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم.

پاشان زەبیحی رایگەیاند کە کوردەکانی عیراق و ئینگلیز لەسلێمانی رۆژنامەی کوردی دەردەکەن و بەبێ پارەو بەخۆڕایی لەناو خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە. لەم دواییەدا دەوڵەتی عیراق بڵاوکردنەوەی ئەم رۆژنامەیەی بەپۆست لەلایەن کوردەکانەوە یاساغکردووە.

بەڵام ئەو ڕۆژنامەیە، کەلەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەردەچێت، بەپۆست دەگاتە کوردستان. ئینگلیزەکان لەو ڕۆژنامەیەدا لەسەر ڕووداوەکانی شەڕو سەرکەوتنەکانی خۆیان لەبەرەکانی شەڕدا شت بڵاودەکەنەوە، هەروەها دەنووسن کە ئینگلیز دۆستی هەرە نزیکی گەلانی بچوکەو هەمیشە یارمەتی ئەو گەلانەی داوەو دەدات، کە بۆ سەربەخۆیی خۆیان تێدەکۆشن. لەسەر داواکردنی من زەبیحی بەڵێنیدا کە نوسخەیەك لەژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە، کە ئینگلیزەکان بەزمانی کوردی دەریدەکەن، بگەیەنێتە دەستمان"

حەسەنۆڤ

سەرکۆنسوڵی یەکێتی سۆڤیەت لەتەورێز*

بۆ دەرخستنی هەڵوێستی سۆڤیەتەکان لە ژ.ك و لەو داوانەیان بەتایبەتیی و لەکێشەی کورد بەگشتیی، لێرەدا بۆچوونی ماکسیمۆڤ م. باڵوێزی سۆڤیەت لەئێران. لەسەر ڕاپۆرتەکەی حەسەنۆڤ دەخەینە پێش چاو.

"لەڕاپۆرتی ماکسیمۆڤ م. باڵوێزی سۆڤیەت لەئێران

*1944–11–13*

بەپێی ڕاپۆرتی هاوڕێ حەسەنۆڤ کەلەگەڵ قاسمی ئیلخانی زادە سەبارەت بەپارتی ژێکاف ... وادەردەکەوێ کە ئەم پارتییە تاهاتنی سوپای سۆڤیەت بۆ ئێران لەدایکبووە** چالاکترین ئەندامانی بریتین لەئێلخانی زادەو زەبیحی و وەهابی

---

* بڕوانە گۆڤاری ڕابوون، ژمارە 22-1997، هێندێ بەلگەو بۆچون لەسەر کۆمەڵەی ژێکاف، ئەفراسیاو هەورامی لەڕووسییەوە کردویە بەکوردی.- وەرگێڕ لەئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ڕوسیای فیدرالی ف-94، ئو 30، د65، پ348، ل. 149- گەلێك دۆکومێنتی تری هاوڕێنەی ئەمەی دەرهێناوەو کردونیی بەکوردیو بڵاوی کردۆتەوە.

** وەرگێڕی ڕووسییەکە لەتەنیشت ئەم بۆچوونەوە لەدوو کەوانەیەکدا نوسیویەتی (دیارە مەبەست پارتی ئازادیخوازانی کوردستانە)لام وایە، مەبەستی ماکسیمۆڤ ئەوە نەبووە، چونکە قسەکان لەسەر ژێکافە نەك پارتی ئازادیخوازان، جگە لەوە هیچ یەکێك لەو دوو ڕێکخراوە لەکاتی هاتنی سوپای سۆڤیەتدا لەدایك نەبووە، بەڵکو ژێکاف لەدوای هاتنو پارتی ئازادیخوازانیش لەپێش هاتنی ئەو سوپایەدا لەدایکبوون... پێم وایە ئەبێت ڕستەکە بەم جۆرە بێت:" وادەردەکەوێ کە ئەم پارتییە لەکاتی هاتنی سوپای سۆڤیەت بۆ ئێران لەدایکبووە"

بلوریان. پارتی ناوبراو پارتێکەی ناسیۆنالیستەو گۆڤاری نیشتمان ئۆرگانی ئەم پارتییەیە کەبەنهێنی لەتەورێز دەردەچێت.

ئەرکی ئێمە بەرامبەر بەم پارتییە دەبێ ئەوە بێت کەبەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن، هەروەها رێبەرەکان و ئەندامانی چالاکی بناسن و لەئیش و کاری رێبەرایەتی و ئاڵوگۆڕکردنیان دەستتێوەرنەدەن و لەراپۆرتی داهاتوودا زیاتر لەسەر ئەم پارتییە ئاگادارمان بکەنەوە"

لەراپۆرتێکی تردا کۆمیساروٚف-کۆنسوٚلی سۆڤیەت-لەرەزائیە لە *1944*دا دەنوسێت:

"رێکخراوی هەرە جیدی کەبانگەوازی سەربەخۆیی کوردستان دەکات کۆمەڵەی ژێکافە. گەرچی بەداخەوە ئێمە زانیاریمان لەسەر ئەم رێکخراوە کەمە. بۆیە ئەمە کەباس دەکرێت پێشەکییە.

رێکخراوو شانەکانی ئەم پارتییە لەزۆربەی شارو ناوچەکانی کوردستاندا هەیە. هەروا لەتاران و تەورێزیش رێکخراوی ئەم پارتییە هەیە. نیشتمان ئۆرگانی ئەم کۆمەڵەیە کەبەنهێنی لەتەورێز دەردەچێت و تائێستا شەش ژمارەی دەرچووە، لەنیشتماندا وتاری نیشتمانپەروەری دەنووسرێت، کە داوای یەکگرتنی کوردان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی و پێشکەوتن دەکات، هەروەها لەنیشتماندا لەسەر مێژووی شۆرشی ئۆکتۆبەر وتار دەنووسرێت و وێنەی لینین و ستالین و قارەمانەکانی کوردی سۆڤیەت، کەلەشەڕی دووەمی جیهاندا دژی داگیرکەرانی ئەڵمان بەشدارییان کردووە، لەلاپەرەکانی نیشتماندا خۆیان دەنوێنن.

ژێکاف رێکخراوی لاوانی پێکهێناوە. ئەندامانی رێبەرایەتی کۆمەڵەی ژێکاف بریتین لە: قازی محەمەد، مەحمودیان، ئیبراهیمیان، میرزا عەلی ریحانی، سوڵتانیان و...هتد کۆمەڵە دژی راووروتکردنو هەوڵدەدات بایەخێکی سیاسی بداتە بزووتنەوەی کورد.

ئەم رێکخراوەیە بەهەموو توانای خۆیەوە دەیەوێت پشتیوانی و هاوکاری ئێمە بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، دەکرێ بڵێین زۆربەی سەرکردەکانی کورد کەباسی "سەربەخۆیی کوردستان دەکەن" دەڵێن ئەم سەربەخۆییە تەنیا بەیارمەتی یەکێتی

سۆڤیەت بەدەست دێتو بۆ ئەم کارەیش ئەوان ئامادەی هەموو چەشنە هاوکارییەکن لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتداو دەڵێن لەسیاسەتی کۆلۆنیالانەی ئینگلیز تەنیا دەبێ چاوەڕێی کۆیلایەتی کوردان بکرێت. بەڵام ئەم وتانە پێدەچێت مەبەستێکی گلاویان بەدواوە بێت. کوردەکان بەقازانجیانە ئێستا لەگەڵ ئێمەدا بەئاشتی بژین، ئەوان دەیانەوێ خۆیان لەپشت ئێمەدا بشارنەوە. بەڵام هیچ کاتێك سەرکردە گەورەکانی کورد بەدڵسۆزییەوە لەگەڵ ئێمەدا نابنو تاسەر هاوکاری کردنیان لەگەڵ ئێمەدا نامێنێت. سەرکردەکانی کورد لەسەر کێشە سەرەکییەکان(پرنسیپەکان)و قۆناغە گرنگەکانی زیاترکەینو بەینیان لەگەڵ ئینگلیزەکانەو سەربەخۆیی کوردستان لای ئەوان بەمانای بەش نەکردنی ئەو سەرو سامانەیە کەلەچەوساندنەوەدا پێکهاتووە. هەروەها دەیانەوێ ئەم سەروسامانەش بپارێزنو کەمتر لەبەرژەوەندییەکانی گەلی کورد بیر دەکەنەوە. بەقازانجی ئینگلیزەکانیشە کە کوردەکان بەدروشمی سەربەخۆیی کوردستان خۆیان بەئێمەوە ببەستنو بەم چەشنە شكو گومان لەسەر خۆیان لابدەن. بەم چەشنە ئەوان بەباشتری دەزانن لەوەی کەخۆیان بشارنەوە، لەلایەکی ترەوە دەیانەوێ ئێرانییەکان بەم چەشنە دژی ئێمە هانبدەن، ئەم پرسیارە جێی سەرنجەو پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی قوڵی لەسەر بکرێت*.

---

* ئەفراسیاو هەورامی، هەمان سەرچاوە. ف94، نو29، 1965، پ332، ل18-17.

-هەر لەگەڵ ئەم دۆکومێنتانەداو چەند ژمارەیەکی تری گۆڤاری رابووندا گەلێك باسو خواسو مەسەلەی تری گرنگی لەو بابەتانە بلاوکراونەتەوە، کەلەڕاستیدا گەلێك نهێنیو باسی گرنگی وای تێدایە کەڕووناکیی دەخەنە سەر رووداوەکانی سەردەمی پێش دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان، بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە ژمارەکانی: 23-1998، 24-1998، 25-1998، 30-2001ی گۆڤاری رابوون. کە ئەم راپۆرتانە دەگرنە خۆیان:

-راپۆرتی شەریفیۆف بەرپرسی کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتوری سۆڤیەت لەگەڵ ئازەربایجانی ئێران.

-لەیاداشتەکانی ئاشۆف 18ی مارتی 1945.

-لەراپۆرتی کونسولی سۆڤیەت لەماکۆ.

-راپۆرتی وتووێژی جێگری کونسولی گەورەی یەکێتی سۆڤیەت لەتەوریز، کەدیداری قازی محەمەد بەدوورودرێژی باسدەکات دوای گەڕانەوەی لەتاران.

-یاداشتی سەرکونسولی سۆڤیەت لەتەوریز.

لەڕاستیدا ئەو بۆچون و تێنەگەیشتن و تەماعخوازییە بوو کەلەدواییدا روسەکانی خستە بەردەم ئەو بڕیارەی کە گوشار بخەنە سەر کورد بۆ لاخستنی ژ.ك، لاخستنی ئامانجی سەربەخۆییخوازی و یەکخستنەوەی کوردستان.

ئەگینا ژ.ك لەژیانیدا مەیلی سۆڤیەتخوازیی لەحزبی دیموکرات کەمتر نەبوو... ئەو دیدەنی و قسانەی عەبدولڕەحمان زەبیحی و قاسمی ئیلخانیزادە، ئەو راستیانە دەسەلمێنن، بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەو بڕوانە ئەم بەیاننامەیەی ژ.ك لەسەر مەسەلەی ئیمتیازی نەوت:

"رۆژێك لەرۆژەکانی تشرینی یەکەمی *1944* لەمەهاباد کۆبوونەوەیەك لەماڵی عەلی ریحانی رێکخرا، چاوەڕوانی قازی محەمەد دەکرا بۆ ئامادەبوون.. پاش هاتن و ئامادەبوون و قسەو وتوویژ، هەستاو ئەو سوێندەی خوارد کەبەمەرجی ئەندام بوون دانرابوو.. لەم رووەوە ئیگلتن وا دەنووسێت: "لەماڵی ئەحمەدی ئیلاهی (*24*) ئەندامی کۆمەڵە چاوەڕوان بوون.. لەپێش دا قاسم قادری و قادر مودەرسی لەگەڵ قازی محەمەد دەربارەی بەئەندام بوون قسەیان کرد، بێدوودڵی قەبوڵی کرد.. لەدواییشدا هەرچەندە قازی محەمەد ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبوو ئیتر رابەرو دەمڕاستی کۆمەڵە هەر ئەم بوو.." [19].

هەیە دەڵێ هەر ماوەیەکی کەم بەسەر ئەوەدا تێپەڕی، ئیتر بەسەرکردەی کۆمەڵە هەڵبژێردرا.

هێمنی شاعیر لەبیرەوەرییەکانیدا لەسەر ئەو روداوانە بەم جۆرە دەدوێ: "پێشەوا قازی محەمەد ئەندامێکی سادەی کۆمەڵە بوو و ناوی نهێنی (بینایی) بوو.. وسەرۆکی کۆمەڵە کەپیاوێکی زۆر تێکۆشەرو ئازاو پاك بوو لەکادری رابەریدا نەما.. [20].

---

-وتوویژی سەرنوسەری رۆژنامەی فەرمان لەگەڵ ڕێبەری کوردەکان (22دیسامبری 1945).

-وتوویژ لەگەڵ جێگری سیاسی و پارلەمانی سەرۆك وەزیرانی ئێران موزەفەری فیروز- 3ی ژوئیەی (1946).

-یاداشتی وتوویژی سەرکۆنسۆلی یەکێتی سۆڤیەت لەماکۆ سەلومین. وی-22 ئناگۆستی 1946.

-وتوویژی قازی محەمەد لەگەڵ رۆژنامەی ئیران ما(ایران ما)و رۆژنامەی رەهبەر (رهبر).

-لەسەر رووداوەکانی سیاسی لەناو هۆزەکانی کورد لەناوچەی ماکۆ لەیەکی ئەپریل تایەکی ئۆکتۆبر.

دەبێ مەبەستی هێمن لەو تێکۆشەرە حسەینی فروهەر بوو بێت، لەپێکهێنانی حزبی دیموکراتی کوردستانیشدا وەك ئەندامێکی سادە مایەوە، بەڵام لەدامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستاندا، وەك ئەفسەرێکی سیاسیی پلەی سەرهەنگی درایەو ئیتر لەیادو بۆنە جەماوەرییەکاندا جلی سەرهەنگی لەبەرکردووە.

بەرۆڵبینینی قازی محەمەد لەکۆمەڵەی ژ.ك دا ریزەکانی ئەم رێکخراوە بەرین و فراوانتر بوو:

"لەسەروی سەقز حزب فراوان بوو بەناو عەشیرەتەکان دا بڵاوبۆوە.. لەبۆکان ئاغاکانی ئیلخانی زادە چالاکانە دەجولانەوە.. لەنەغەدە حاجی قادری حەریری بوە لێپرسراو بۆ وەرگرتنی ئەندام.. لەشنۆ موسی خان لەخێڵی زەرزا ئەندامێکی چالاك بوو.. شێخەکانی هەرکی هەموو چونە ریزی کۆمەڵەوە.. عەبدوڵڵا قادر مامش بوە چالاکترین ئەندام.. لەناو شکاك دا عومەر خان شەریفی گەورەترین سەرۆکیان بوو بەئەندام.. لەساڵی *1945* دا هەموو سەرکردەی خێڵەکانی کوردو ژمارەیەکی زۆر لەهاوولاتیان بون بەئەندام.. (21)

بەو جۆرە کۆمەڵە فراوان و بنکەکانی بەرین بوو، لەو بازنە نهێنیی و داخراوەی خۆی دەردەچوو... بەڵام سروشتی خێڵەکی بەخۆوەگرت، بەتایبەتی سەرۆك خێڵەکان، هەریەکە لەناوچەی خۆیدا رۆڵی لێپرسراوێتی دەبینی.. رێکخستنەکانی کۆمەڵە زیاتر ئەو ناوچانەی گرتەوە کەلەشکری سوری لێبوو یان ئەرتەش و ئیدارەی رژێمی شایان تێدا نەمابوو.

گرنگترین رۆڵی کۆمەڵە پەیوەندییەسیاسییەکان و لایەنی رۆشنبیریی و لەچاپدانی گۆڤاری نیشتمان بوو کەتا هەڵوەشانی ژ.ك (*9*) ژمارەی لێبڵاوکرایەوە کەئەمرۆ هەر نۆ ژمارەکەی لەبەردەستدان. گەلێ شاعیرو نوسەر لەدەوری گۆڤارەکە کۆبوونەوە، عەبدولرەحمان زەبیحی.. هەم وەك سکرتێری کۆمەڵە، دوای رۆڵی سەرەکیی کەحسەین فروهەر دەیبینی، هەم وەك سەرنوسەری نیشتمان کاریدەکرد.

لەگەڵ لەچاپدانی گۆڤاری نیشمان دا هەندێ کتێب وەکو (دیاری کۆمەڵەی ژ.ك کەشیعرە نیشتمانییەکانی حاجی قادرو مەلای گەورەی کۆیەو هەژارو شێخ ئەحمەدی حیسامی تێدا چاپ کرابوون بڵاوکرایەوە.. داهاتی کۆمەڵە تەنیاو تەنیا مانگانەی ئەندامان و فرۆشتنی چاپەمەنییەکان و داهاتی تیئاترو نومایشەکانی بوو.. کۆمەڵە

هـــەر بـــەو داهاتانـــە توانـــی چاپخانەیـــەکی دەســـتی بکـــڕێو لەمـــەهاباد دایبمەزرێنێ.." (22)*

بۆ دروشمە نەتەوەییە گرنگەکە، سەربەخۆیی هەموو کورد، رۆڵی دیپلۆماسیی ژ.ك، وا ورده ورده ئاشکرا دەبێت، بەڵگەنامەکانی ناو ئەرشیفی کۆمارەکانی یەکێتیی سوڤیەتی روخاوو هەندێك ئەرشیفخانەی تر کە وا وردەوردە دەکەونە بەردەست، ئەو رۆڵـە مەزنـە دیپلۆماسـییە ئاشـکرا دەکـەن، کـە ژ.ك لـەو سـەرەتا زووەدا بـەهۆی رێبـەرەکانیو بەرپرسـان لـەو کاروبـارە پێـی هەسـتان، بەتایبـەتیی عـەبدولڕەحمان زەبیحیو قاسمی ئیلخانیزادە*

لەسەر چالاکییەکانی کۆمەڵەی (ژ.ك) د. عەبدوڵڵا مەردوخ دەڵێت:

".. گەرچی (ژ.ك) زۆر نەژیا بەڵام لەو ماوە کەمەی تەمەنیدا لەبواری رۆژنامەگەری کوردیو ئەدەبو زمانی کوردیشدا هەوڵێکی باشیدا. نۆ ژمارە گۆڤاری نیشتمانو دوو رۆژ ئـەژمێری(سـاڵی 1943-1942و سـاڵی 1944-1943)ی بڵاوکـردەوە، نـاوی دوانزدە مانگەی ساڵ بەزمانی کـوردی بـۆ یەکـەمجار (ژ.ك)بـەکاری هێنـا. هـەروەها دیـاری کۆمەڵـەی (ژ.ك) بـۆ لاوەکـانی کوردیشـی لەسـاڵی 1943-1942دا لـەچاپدا کـە بریتییە لەسێ نامیلکە، دیـاری مـەلا محەمـەدی کۆیـی، گـوڵ بژێرێـك لـەدیوانی حـاجی قادری کۆییو دەستە گوڵێکی جوانو بۆن خۆش لەباغی نیشتمان پەروەری هاتووەتە بەرهـەمو لەگـەڵێك بـەیانی سیاسـی بەبۆنـەی رووداوی سیاسـیو کۆمەڵایـەتی جـۆر بـەجۆرەوە وەك لەپاشـکۆی بەڵگەنامـەکاندا دەبیـنرێن... پێشکەشـکردنی شـانۆگەری دایکـی نیشـتمان... پـەروەردەکردنی چـەندین کـادری سیاسـی، ژمارەیـەکی زۆر لەئەدیبو نووسەرو شاعیری پایە بەرزیشە لەقوتابخانەی ژ.ك دەرکەوتن.."**

---

* لەباسەکانی حزبی دیموکراتو کۆمـاری کوردسـتاندا زیـاترو بـەدووروودرێژی قسـە لەسـەر رۆڵـی گرنگـی پێشەوا قازی محەمەد دەکەین.

* بۆ سود وەرگرتن لەو بەڵگەنامانە سەیری گۆڤاری رابوون، ژمارەکانی ساڵی 1999 بکەن.

** بروانە دوکتور عەبدوڵڵا مەردوخ، هەمان باسو سـەرچاوە.... جگـە لـەچالاکیی سیاسـیو دامـەزراندنی لقی ژ.ك لەکوردستانی عیراق.. کەمامۆستا برایم ئەحمەد گەلێ لەبیرەوەرییەکانی خۆی لەسەر ئەو لقە کەخۆی لێپرسراوی بوو، لەسەر رووداوە سیاسیەکانمان بۆ دەگێڕێتـەوە، بەتایبـەتی لـە: بیرەوەرییـەکانم، دامـەزراندنی لقی ژ.ك، گۆڤاری گزینگ، ژمارە13.

## حزبی دیموکراتی کوردستان

سەرەنجامەکانی دووهەم جەنگی جیهان‌و سەرکەوتنی بەرەی دەوڵەتانی دیموکرات بەسەر نازیزم‌و فاشیزمدا، هاتنەکایەی گەلێ دەوڵەتی سۆسیالیست‌و فراوانبوونی بەرەی سۆسیالیزم‌و خولقانی شورەی ئاسنین‌و دروستکردنی چەکی ئەتۆم لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە، ناچارکردنی ژاپۆن بە زەبری بۆمبای ئەتۆم بەخۆبەدەستەوەدان‌و قبوڵکردنی مەرجەکانی دەوڵەتانی سەرکەوتوو دوای هەردوو رووداوەکەی هیرۆشیماو ناگازاکی، دەستپێکردنی سەرەتای جەنگی سارد، بەربەرەکانی لەسەر دەست بەسەراگرتنی ناوچە نەوتی‌و ستراتیجییەکان، ململانێ لەسەر ئێران بۆ هێزجێگیرکردن تێیداو مانەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی نەوت‌و ناوچە گرنگەکان، مەترسیی بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم... ئەو رووداوو گۆڕانانەو گەلێ دیاردەی‌تر بارودۆخێکی نوێیان لەجیهان‌و لەئێران دا هێنایە کایەوە. گەلانی ئێران بەگشتی‌و گەلی کورد بەتایبەتی وشیاربووەوە، روناکبیرو نیشتمانپەروەرانی کەوتنە چالاکی‌و خەباتی ئاشکرا.. دیارە لەناو شارو ئەو ناوچانەی دەسەڵاتی رژێمیان تێدا نەمابوو، یان زۆر لاواز بووبوو، گەلێ رێککەوتن لەنێوان زلهێزەکان‌و تارانیشدا ئیمزا کرابوو کەتیایاندا چارەنووسی ئێران‌و پارێزگاریکردنی یەکێتی ئەرزو ئاویان بۆ مسۆگەر کردبوو، لەگەڵ چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هەرسێ دەوڵەتە گەورەکەوە، یەکێتی سۆڤیەت، بەریتانیا و ئەمریکا، دوای کۆتایی هێنان بەشەڕ بەشەش مانگ.. بۆیە ململانێیەکی ئاشکراو مانۆڤریی سیاسیی هەمەچەشن‌و شکات‌و شکاتکاری لە*UN* و گوشار دەستیان پێکرد.

ئەو هەلومەرجانە هیوایان لای کورد گەشاوەکردو ئایندەی خۆی روناک دەبینی‌و تێکۆشەرەکانی چالاکانە کەوتنە تەقەلای بەدەستهێنانی ئامانجەکان؛ یەکێك لەو گۆڕانانەی ئەو بارودۆخە نوێیانە دەیانخواست مامەڵەیەکی ئاشکرابوو، هێنانەکایەی زەمینەیەك بوو کەلەگەڵ نەخشەو ئامانجەکانی یەکێتی سۆڤیەت بگونجێ، هەنگاوی گرنگی ئەو مەیدانە، یان سەرەتای هەنگاوە گرنگەکانی ئەو مەیدانە کەزیاتر لەدووەم سەردانی وەفدی کورد بۆ باکۆ دەرکەوت، دامەزراندنی حزبێکی دیموکرات‌و ئاشکراو خاوەن لێپرسراوانی ناسراوبێ، کەجێگەی کۆمەڵەی

ژ.ك بگرێتەوە، بۆچی؟ لەبەرئەو هۆیانەی کەلەدواییدا روناکییان دەخرێتەسەر.. گەلێ لەرابەرانی کورد لەو گۆڕانە حاڵی دەبوون:

"دەستەیەك لەڕوناکبیران و ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ك هاتنەسەر ئەو بڕوایە، کەجێبەجێکردنی بەرنامەی کۆمەڵە لەهەلومەرجی ئێستا، جیهان و کوردستان دا ئیمکان کەمە، بۆیە بەرنامەیەکی کورت و نوێیان کەلەگەڵ هەلومەرجی ئەو سەردەمیدا دەگونجا گەڵاڵەکردو لەرۆژی سێی خەزەڵوەری *1324--1945* یەکەم کۆنگرەی حزبی دیموکراتی کوردستان لەشاری مەهاباد گیراو ئەو بەرنامەیە پەسندکراو رێکخراوی حزبی دیموکراتی کوردستان هەر لەسەر بناغەی رێکخراوی کۆمەڵەی ژ.ك دامەزرا) [23].

بیروڕای لاخستنی ژ.ك و پێکهێنانی ئەم حزبە نوێیە، هەندێ کەس دەیگێڕنەوە بۆ لێپرسراوانی ئازربایجانی سۆڤیەت، ولیەم ئیگلتن یەکێکە لەوانە، لەم رووەوە ئەم دەنوسێ: "ژەنراڵ ئاتاکشیوف سەرکردەی ئەفسەرە سیاسییەکانی روس لەئازربایجان بەقازی محەمەدی گوت: کاتی ئەوە هاتووە کۆمەڵێك لەناسراوانی کورد سەر لەیەکێتی سۆڤیەت بدەن، بۆ باسکردنی پاشەرۆژی کوردستان.." [24].

## هەڵوەشانی ژێکاف بۆچی؟

لەسەر هۆی سەرەکیی دامەزراندنی حزبی دیموکرات بەلاخستن و چاوپۆشین لەبوونی ژێکاف، لام وایە چەند هۆیەکە کە هەندێکیان ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە بۆچوونەکانی لێپرسراوانی روسەکانەوە هەیە لەسەر ئامانج و داخوازییەکانی کورد...

هەرچی لێپرسراوە مەیدانییەکانی سۆڤیەتەکان بوو، بەردەوام جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە دەبێت کورد دەستبەرداری داوای سەربەخۆیی بن..

ئاشمۆڤ عەلی ئەکبەرۆڤ لەراپۆرتێکدا (بەهاری *1945*) دەنووسێت:

"بەپێی دەستوری مۆسکۆ ئێمە لەمانگی ئاب پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی ژێکاف گۆڕیوە. لەچاوپێکەوتنەکاندا لەگەڵ ناسراوەکانیکورد ئێمە بەشێوەیەکی پارێزانە(احتیات) تێمانگەیاندوون کە ئێمە پێمان وایە بیروباوەڕی "سەربەخۆیی بۆ

كوردستان" كاتی خۆی نییەو ریئال نییە، لەبەرئەوە ئەم بیروباوەڕە زیاتر لەلایەن دوژمنانی گەلی كوردەوە پشتیوانی دەكرێتو، هەر ئەوانیش كەمتر لەهەموو لایەك بیر لەئازادیو سەربەخۆیی راستەقینەی گەلی كورد دەكەنەوە. بەمەبەستی باشتركردنی ژیانی گەلی كورد ئێمە بەپێشكەوتنخوازەكانی پارتی ژێكاف پێشنیار دەكەین بۆ مافی یەكسانیی كورد لەچوارچێوەی یاسایی ئێران لەسەر بنچینەیەكی دیموكراتییانەی ولات هەولبدەن.

كوردەكانیش زۆر جار لەلایەن سەركردەكانی پارتی ژێكافەوە درۆیان لەگەڵ كراوەو پارتی بەرەبەرە لەپێش چاوی خەڵك دەكەوێت، پارتی ژێكاف بەبڕیاردانێكی تایبەتی هەڵوەشایەوەو ئەندامەكانی سەرلەنوێ چوونە ریزی پارتی تازە دروستكراو واتە پارتی دیموكراتی كوردستانەوە".*

ئەم راپۆرتە دەری دەخات كەڕوسەكان سوور بوون لەسەر لاخستنی ژێكاف، دوای ئەوەی بۆیان دەركەوتووە كە لێپرسراوە سەرەكییەكانی تری ژێكاف ئامادە نین دەستبەرداری دروشمو داوای سەربەخۆیی كوردستانی گەورە بن. ئەمەش لایەنێكی گرنگ لەهۆی نەمانو هەڵوەشانی ژێكاف دەردەخات..بەلام راستەوخۆو بە بڕیار دەرنەخراوە كەی ئەو بڕیارە تایبەتییە بۆ هەڵوەشانەكەو چۆنو لەكوێو لەلایەن كێوە بوون! رەنگە یەكەم دۆكۆمێنتی بەرگی یەكەمی دەوڵەتی جمهوری كوردستان، كەمە تیشكێك ئاراستەی ئەم لایەنە بكات..**

ئەوە لەكاتێكدا بوو كە رێبەرانی تری ژێكاف جگە لە پێشەوا قازی محەمەد لەو سەرەتایانەدا ئامادە نەبوون كەپاشەكشە لەهەندێ بیری هاوپێوەند بەدروشمی سەربەخۆییەوە بكەن، بۆ نموونە كاتێك زەبیحیو قاسمی ئیلخانی زادە لەفابریوەری *1945*دا دەچنە دیدەنیی بەرپرسی كۆمەڵەی پەیوەندییەكانی كولتووری سۆڤیەت لەگەڵ ئازەربایجانی ئێران "شەریپۆڤ"ئەم مشتومڕەی لە راپۆرتێكدا تۆماركردووە:

---

* بڕوانە: ئەفراسیار هەورامی، هێندێك بەلگەو بۆچوون لەسەر كۆمەلەی ژێكاف- لە رووسییەوە كردوویەتی بە كوردی ، گۆڤاری گزینگ، ژمارە 25، 1998.

** بڕوانە:

-گۆڤاری رابوون ژمارە 23-1988، هێندێك بەلگەو بۆچوون لەسەر كۆمەلەی ژێكاف.

-مەحمود مەلا عززەت، دەولەتی جمهوری كوردستان، بەرگی یەكەم، ستۆكهۆلم 1992.

"لەرێکەوتی دووەمی فابریوەری *1945*، ئەورەحمانی زەبیحی و قاسمی ئیلخانی زادە هاتنە لام داوایان لێکردم کەئیجازەیان بدرێتێ، رێکخراوی پەیوەندییەکانی کولتووری لەگەڵ سۆڤیەت لەکوردستان دروست بکەن و سەربەخۆش بێت. کاتێك ئەم مەسەلەیەم بۆ جەنابی ئەورەحمان زەبیحی روونکردەوەو پێموت کە ئێمە ناتوانین پێشنیاری ئەوتۆ قەبووڵ بکەین، زەبیحی وتی: ئەگەر ئێمە لقێکی ئەم رێکخراوە پێکبێنین و ناوی لێبنێین رێکخراوی پەیوەندییەکانی کولتووری لەگەڵ سۆڤیەت. لەوەڵامی پرسیاری من کە بۆچی ئەوانە نایانەوێ ناوی لێبنێین"کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتووری ئێران لەگەڵ سۆڤیەت"زەبیحی وتی: "ئێرانێکان ئێمەیان خۆش ناوێت و رێزمان لێناگرن و بەچاوێکی خراپ و سوکەوە سەیرمان دەکەن، لەبەرئەوە ئێمە حەزناکەین ناوی بەشی پەیوەندییەکانی کولتوری سۆڤیەت و ئێرانی پێوە بێت، بەڵکو باشترە ناوی "بەشی یان لقی کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتووری سۆڤیەت" بێت.

من جارێکی تر هەوڵمدا بۆ زەبیحی روون بکەمەوە کە بۆچی ئێمە پێشنیار دەکەین ناوی پەیوەندییەکانی کولتووری ئێران لەگەڵ سۆڤیەتی پێوەبێت، لەبەرئەوەیە کە ئێران دەوڵەتێکی دۆستەو ئەمە نابێت ئینکار بکرێت، بەپێچەوانەوە ئەو پەیوەندییە کولتووریانەی کە دروستیان دەکەین هەرچی بڕوات دەبێ بەهێزتر بکرێن.

بەکارهێنانی وشەی "ئێرانی" هەموو جارێك هەم زەبیحی و هەم ئێلخانیزادەی قەڵس و تورە دەکرد، وتی" ئەگەر وڵاتێکی وەك سۆڤیەت، کەسوپاکەی شکستی بەلەشکری ئەڵمان دەهێنێت، لەئێران بترسێت دەبێ دانیشتوانی بەدبەختی کورد کە زۆر بەزەحمەت دەتوانرێت لەسەدا پێنجی دانیشتوانی خوێندەوارو بەکولتووری تێدا بێت، دەبێ چبکات؟ " زەبیحی وتی کە ئێمە چارەڕەشترین گەلین کە هیچ کەس یارمەتێکمان نادات. منیش وتم بۆچ وادەڵێی جەنابی زەبیحی؟ دوای ئەوەی کە شەریپۆف درێژە بەراپۆرتەکەی ئەدات ئینجا دێتەوە سەر ئەسڵی هۆی دیدەنییەکە: لەوەڵامی پرسیاری من کە کێیان بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتووری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دیاری کردووە. زەبیحی وتی: برای گەورە جەنابی قاسمی ئێلخانیزادە. بەرێز ئێلخانیزادە دۆڤێکی زۆر بەکولتوورو خوێندەوارەو زمانی عەرەبی و فارسی و کوردیش دەزانێت و خوێندەواری لەمەدرەسەی کۆنی کوردی

وەرگرتووە. ئەمجار من رووم لەبەڕێز ئێلخانیزادەکردو لێم پرسی: ئایا ئامادەیە ببێتە سەرۆکی لقی کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتووری سۆڤیەت لەگەڵ ئێران لەمەهاباد؟ لەوەڵامدا وتی کە ئامادەیە ببێتە سەرۆکی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندییەکانی کولتووری سۆڤیەت لەمەهاباد.

منیش وتم داوات لێدەکەم بەو چەشنەی کە من ناوی دەبەم ناوی بهێنیت، لەکۆتایی چاوپێکەوتنەکە بەڕێز زەبیحی و ئێلخانیزادە داوای ئەدەبیاتیان بەزمانی ئازەری و کوردی لێکردم و دەیانەوێ کە ئاگاداری ژیانی کوردەکانی سۆڤیەت بن. منیش بەڵێنم پێدان کەئەوپەڕی هەوڵی خۆم، بۆ ئەم مەبەستە بەڕێگای- انجمن سراسری روابت فرهنگی شوروی-بدەم."

بەڵام ژێکاف لەسەر ئەو نەخشەیەی سووربووە کەخەباتی کورد بەرفراوانتر بکات... یەکێك لەنامەکانی هەیئەتی ناوەندی ژ.ك بۆ کۆنسوڵی سۆڤیەت لەتەورێز رووناکییەك دەخاتە سەر ئەو بۆچوونە:

کۆمەڵەی ژ.ك

ئیدارەی ناوەندی

بەروار *7*رەزبەری *1323*-*29* سپتامبر *1944*

بژی کوردو کوردستانی گەورە

بۆ بەڕێز سەرکۆنسوڵی یەکێتی سۆڤیەت لەشاری تەورێز

بەحورمەتەوە رادەگەیەنم چەند رۆژ پێش قشوونی ئێران ویستوویەتی بچێ بۆ "مەریوان" کە "حەمەڕەشید خان" پێشی گرتوون. دوای ئەم رووداوە، ژەنراڵ "هۆشمەند نەفشار" دێتە مەهابادو دەیەوێ قشوونی ئێران بگەڕێنێتەوە ئەو شارەو وەسەر"سەقز"ی بخات.

دوای ئەوەی نامەکە باسی کۆکردنەوەی هێز لەسەقز دەکات، تێیدا هاتووە:

لەنێوان کوردەکانی عیراقدا، عەشیرەتی جاف و شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموودی ناسراو، کەچەند مانگێکە بە *1500* سوارەوە لەسەردەشت جێیان گرتووە، لەگەڵ گرووپێکی سەربەعەشیرەتەکانی "گەورك" و "مەنگوڕ" بەهانای حەمەڕەشیدخانەوە چوون، لەئاکامی تێکهەڵچوونێکی بچووکدا برازای حەمەڕەشۆدخان بریندار بووەو حەمەڕەشید خان لەمەریوان کشاوەتەوەو خۆی

گەیاندۆتە"بانە" لەوە دەچێ قشوونی کۆکراوەی ئێران لەسەقزەوە بچێ شارەدێی بانەش داگیر بکات، بەم بۆنەوە حەمە ڕەشید خان بۆئێمەی نوسیوەو دەڵێ:

".... پۆلکۆنیک (سەرهەنگ) سەلیم ئاتاکشیۆف بەڵێنی پێداوە، هەر کاتێك لەنێوان ناوبراوو ئەرتەشی ئێراندا شەڕ هەڵگیرسێ، دەوڵەتی سۆڤیەت یارمەتی بەحەمەڕەشید خان دەکات یاخود پێش بەچوونی ئەرتەشی ئێران دەگرێ، بەڵگەی ئەو گوتنە لەکۆنسوڵی سۆڤیەت مەوجوودە".

ئێستا حەمەڕەشید خان داواتان لێدەکات پێش بەهێرشی ئەرتەشی ئێران دژی ئەو بگرن، تاکوردەکان لەشوێنی ترەوە بەهانایەوە دەچن‌و یارمەتیی پێ دەگەیەنن. هەروەها ئیزن مەدەن ئەرتەشی ئێران دژی حەمە رەشید خان لەتانك کەڵك وەرگرێ.

ئینگلیسەکان لەعیراق، تفەنگ بەعەشیرەتە کوردەکان دەدەن‌و وێدەچێ دانی ئەو تفەنگانە بۆ شەڕی دژی عەرەبەکان بێ."

هەیئەتی ناوەندی ژ.ك*

## دیسان لەسەر هەڵوەشانی ژێکاف

قازی محەمەد لەدیدەنییەکی رۆژنامەنوسی هەواڵدەری ئاژانسی دەنگوباسی-تاس- راستەوخۆ ئەو راستییە دەدرکێنێت کە چۆن ژێکاف هەڵوەشاو گەلێك شتی تر باسدەکات:

تەورێز *17* ژانویەی *1946*

رۆژنامەنوسی هەواڵدەری تاس لەگەڵ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیمورکاتی کوردستان قازی موحەمەدو سەرۆکی ئەنجومەنی کوردستان حاجی بابەشێخ وتووێژی کرد. قازی محەمەد دوای ئەوەی بەدرێژی باسی گەلێك شۆڕش‌و راپەڕین دەکات تا داڕوخانی ئیدارەی حکوومتیی ... ئینجا وتی:

"لەم ماوەیەدا ئێمە پارتی ژیانی کوردمان(ژیانەوەی کوردستان)مان پێك هێنا کە رێکخراوەیەکی نهێنی بوو، بۆچوونێکی ناسیۆنالیستانەی هەبوو مەبەستی پێك هێنانی دەوڵەتێکی گەورەی کوردستان بوو. دەسەڵاتدارانی ئێرانی بێشك هەوڵی

---

* حامید گەوهەری، هەمان سەرچاوە، 66-67

چاندنی دوژمنایەتی نێوان خێڵەكانی كوردیان دەدا. بەڵام بەكۆتایی هاتنی شەڕ هەموو هەوڵەكان بەڕێگای دیموكراتیدا ڕۆیشتنە پێش. پارتی ژیانەوەی كوردستان لەلایەن ئێمەوە هەڵوەشێنرایەوەو حزبی دیموركاتی كوردستانمان ڕێكخست. بەدروست بوونی حزبی دیموكراتی كوردستان ئێمە بەیەكجاری كۆتاییمان بەدوژمنایەتی نێوان خێڵەكان هێناو داخوازی ڕێبەرایەتی خێڵەكانمان بۆ دەسەڵات وەرگرتن لەناوبرد...*

لەهەمان دیدەنیدا قازی ئەڵێت:

"28ی فیبرییەی 1945 كۆنگرەی نوێنەرانی باكووری كوردستان بەڕێبەرایەتیو سەرۆكایەتی حاجی بابەشێخ ئەنجومەنیان هەڵبژارد. لەڕێكەوتی دەی مانگی دێسامبری 1945 ئاڵای نەتەوایەتیمان لەسەر بینای ئەنجومەنی كوردستان هەڵكردو كوردەكان سوێندیان خوارد كە هەتاكو كوردێك مابێت كەس ناتوانێت ئەم ئاڵایە لابەرێتو ڕۆژی هەڵكردنی ئاڵاكە بووبە جێژنێكی نەتەوایەتی كورد..."

-لەسەر نەمانی ژێكافو پێكهێنانی حدك...

جگە لە روسەكان نەخشەی هەڵوەشانی ئەوو دامەزراندنی ئەم، كۆمەڵێك لاوی ناو سەركردایەتیی كۆمەڵەش هاتبوونە سەر ئەو باوەڕە كە دەبێت گۆڕران لەدروشمەكاندا هەبێت..

لەم ڕووەوە غەنی بلوریان هەمانڕای هەبووەو ئەڵێت:

"دورشمی كۆمەڵەی ژێكاف بۆ هەموومان جێگەی ڕێزەو دەزانین بەتەواوی بەرگری لەمافی گەلەكەمان دەكات، بەڵام ڕۆژگار جۆرێكەو كە هیچ لایەنێكی جیهان داكۆكی لەداخوازەكانی ئەمڕۆژی ژ.ك ناكات، گەیشتن بەو ئامانجە ڕێگەیەكی پڕ هەورازو نشێوەو ئەمڕۆكە ئاسۆیەكی روون بۆ ئەو ئاواتەی بەدی ناكرێ. كەواتە پێویستە ئێمە چاوێك بە داخوازەكانماندا بخشێنینو لەگەڵ هەلومەرج ڕێكیان بخەینو لایەنگریان بۆ بدۆزینەوە. بەڕای من داوای ئەمڕۆمان دەبێ لەچوارچێوەی خاكی ئێراندا هەڵسەنگێندرێو شتێك لەپرۆگرامی خۆماندا بگونجێنین كەدەگەڵ دەقی یاساو دەستوری ئەمڕۆی دەوڵەتی ئێران بگونجێ. بەپێی ئەو بۆچونە پێویستە

---

- بڕوانە:- ئەفراسیاو هەورامی، هەمان سەرچاوە.
- -مەبەستی لەپارتی دیموكراتی كوردستان، حزبی دیموكراتی كوردستانە.

ناوی کۆمەڵەش بگۆڕدرێو قاڵبێکی نوێ دانێن کەلەگەڵ دروشمە تازەکەمان بێتەوە...*

کاتێکیش باقرۆف لەگەڵ نوێنەری کوردان کۆبووەوە:

"باقرۆف کەوتە باسکردنی بزوتنەوەی کوردو ناوەڕۆکەکەی.. ئینجا پەنجەی بۆ ئەوە راکێشا کەکۆمەڵە بەو بارەی ئێستای ناتوانێت شتێك بەدەست بهێنێت، جولانەوەکە پێشناکەوێت ئەگەر بەسەرکردایەتی پارتییەکی دیموکراتو کوردستانی نەبێت.." [25].

عەبدولقادری دەباغی، لەسەر بارودۆخەکانی سەردەمو رۆژگارەکانی پێشو سەرەتای جەمهوریەتی کوردستان، کە بۆ خۆی هاوژیاوو هاوکاروانی خەباتە دورو درێژەکەی بووە، ئاوا قسان دەکات:

"... ئەو باخە خەملیو بوو، هاتبووەبەر، زمانی کوردی کەلەزەمانی رەزا شا قەدەغە کرابوو، ببووە زمانی رەسمی، رۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکان لەچاپخانەی کوردستان چاپو بلاودەبوونەوە، ئەدیبو شاعیرانی وەك: خاڵەمین، سەید کامل، حەقیقی، هەژار، هێمن، شێواو، عەتریو چەندین نووسەری وەك حەسەنی قزڵجی بەشیعرو بەرهەمە هەمەڕەنگو بەنرخەکانیان زمانەکەیان ژیاندەوە.

بەڵی ئەو کۆمارە ساوایە لەماوەی کەمێ نزیك بەساڵێ، بە 7ماشینە کۆنەوەو بەنەبوونی دوکتورو موهەندیسوپسپۆرەوە باخێکی رازاوەی پێکهێنا کەئێستاش پاش پەنجا ساڵو بەدوای رووخانی کۆمارەکە، حیزبەکەی نموونەی نەزمو دڵسۆزیە، رووخانەکەشی تێکشکانی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت لەبەرامبەری سیاسەتی ئەمریکاو بەریتانیا بوو، نەئازایەتی دەوڵەتی تاران"*

لەگەڕانەوەی وەفدەکەدا، ئەو لێپرسراوانەی کورد، ئەو پێشنیازو رێنماییەیان وەرگرتو کەوتنە سەر رێبازی پێکهێنانی ئەو حزبە نوێیە.. لە *15*ی ئابی/ *1945*دا کۆنگرەی دامەزراندنی حزبەکە لەمەهاباد بەستراو نوێنەرانی ناوچەو شارۆچکە

---

* بڕوانە:
-حامید گەوهەری، هەمان سەرچاوە، ل144.
-غەنی بلوریان، ئاڵەکۆك، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی حامید گەوهەری.

* بڕوانە"عەبدولقادری دەباغی، گۆڤاری گزینگ، ژمارە13 ئەویش لەبلاوکراوەی "کوردستان" ژمارە 230-یەوە وەریگرتووە.

ئازادکراوەکان و مەهاباد تێیدا ئامادەبوون.. پاش قسەو مشتومڕو شیعر خوێندنەوەو باس لەبارودۆخەکانی کوردستان و ئێران و جیهان، مافەکانی کورد بەدەستهێنانی خودموختاری دیارکرا.

لەو کۆنگرەیەدا قازی محەمەد بەپێشەواو ئەم ناوانەش بەکۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێرران [26]:

1-حاجی بابەشێخ
2-محەمەد حسەین سەیف قازی.
3-مەناف کەریمی.
4-سەید محەمەد ئەیوبیان.
5-عەبدولڕەحمانی ئیلخانیزادە.
6-ئیسماعیل ئیلخانیزادە.
7-ئەحمەدی ئیلاهی.
8-خەلیل خوسەوی.
9-کەریم ئەحمدیان.
10-حاجی مستەفا داودی.
11-محەمەد ئەمین موعینی.
12-مەلا حسەین مەجدی.
13-مەحمود وەلی زادە.
14-محەمەد رەسوڵ دڵشاد.
15-محەمەد ئەمین شەریف.
16-عەبدولڕەحمانی زەبیحی.

لەسەر لیستی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی، نەڕایەکی برینەرەوە هەیەو نەلیستێکی بێ مشتومڕ لەئارادایە. بۆ نمونە دەڵێن محەمەد رەسوڵ دڵشاد بەسکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێرراوە. کەچی لەهەندێ نامەی رەسمیی حزبەکە ئیمزای (بلوریان) دەبینرێ*

---

* بڕوانە مەحمود مەلا عززەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان ب3 1997.

یەکێك لەکارە گرنگەکانی کۆنگرە بڕیاردان بوو لەسەر ئەو بەرنامە نوێیەی بۆ حزبەکە ئامادەکرابوو، وەك لێرەدا دەقی تەواوی دەخەینە پێش چاو.

لەسەر ئەو دامەزراندنەی حزبی دیموکراتی کوردستان لە 16ئابی 1945 ئەم ئاگادارییەی خوارەوە بەئیمزای (61) کەس لەنوێنەرانی بیرپوناك‌و لادێی‌و بازرگان‌و سەرەك تیرەو دایەرەکانی دەوڵەت‌و پیاوانی ئایینی‌و خاوەن موڵك بەزمانی کوردی‌و فارسی لەشاری مەهابادو دەوروبەری بڵاوکرایەوە.

بیسمیل لاهی رەحمان‌و رەحیم

ئاگاداری حزبی دیموکراتی کوردستان

هاونیشتمانیان.. برایان..

ئاگری شەڕی دووهەمی جیهانی کەلەلایەن وەژێرخەرانی دیموکراتی وەبەدەستی دوژمنانی ئازادی دەست پێکرابوو بەباسکی بەهێزی سەربازانی وڵاتەکانی هاوپەیمان کوژاندراوە، جیهانی دیموکراتی سەرکەوت وەجیهانی فاشیزم کەئەیویست نەتەوەکان‌و گەلانی جیهان بخاتەژێر ئەسارەتی مستیك ریگرو خوێن خۆر بەتەواوی نابوت بوە هەر چلۆنێك کەچاوەڕوان ئەکرا ڕێگەی ئازادی بۆ نەتەوەو گەلانی جیهان ئاوا نەکراوە ئەمڕۆ تەواوی گەلانی گەورەوچکولەی جیهان ئەیانەوێ لەم ڕێگەیەی کەئاواڵە کراوەتەوە سود وەربگرن، ئەوان ئەیانەوێ لەم وادانەی کەلەپاکتی مێژویی ئاتلانتیك دا دراوە سود وەربگرن، ئەوان ئەیانەوێ کاروباری خۆیان‌و چارەنووسی خۆیان بەئارەزوی خۆیان بەجێ‌بگەیەنن.

ئێمە، کوردەکانی کەلەئێران ئەژین بەدرێژایی چەندین ساڵ خەباتمان کردوە وەلەم ڕێگەیەدا قوربانیەکی زۆرمان داوە، بەڵام حاکمە دیکتاتۆرەکانی ئێران هیچ کاتێك بۆ بیستنی پێویستیەکانی ئێمە ئامادەنەبوون وەتەنانەت نەیان هێشتوە لەو مافانەش کەبەگوێرەی قانونی ئەسلی دراوە بەئەیالات‌و ویلایاتەکان سود وەربگرین. ئەوان بەهۆی گوللەو بۆمب‌و تۆپ‌و گرتن‌و تەبعیدو کوشتن‌و یەخسیرکردن وەڵامی ئێمەیان داوەتەوە. بەتایبەتی لەسەردەمی دیکتاتۆری بیست ساڵەی رەزاخان دا ئێمە بۆ لەبەرکردنی جل‌وبەرگی نەتەوایەتی کوردیش ئازاد نەبوین. ئەوان بەهۆی نوکەنیزە، بەهۆی ئەفسەرە درو خاین‌و ڕێگرەکان تەواوی مەوجودیەتی ئێمەیان،

ژیانو ناموسی ئیمەیان خستبوە ژێرپێ. ئەوان بو نابودکردنی ئەسلی ئێمە لەهیچ چەشنە کارەساتێکی دریندانەو بێشەرمانە نەپرینگاونەتەوە. ئاخر ئێمە ئادەمیزادین، ئێمەش میژو، زمان، ریوشوینو دابی تایبەتی خۆمان هەیەو ئەوانەمان خۆش ئەوەی. بوچی ئەبی مافی ئیمە پیشیل بکرێت؟ بوچی ناهیلن کوردستان ببێتە ولاتێکی خودموختار وەلەڕێگەی ئەنجومەنی ویلایەتییەوە کەلەقانونی ئەساسیدا دیاریکراوە کاروباری بەریوە ببردرێت؟

هاونیشتمانانی خۆشەویست، پێویستە ئەمەی بزانین کەحەق نادرێت، بەڵکو ئەستێندرێت. بۆ ئەوەی حەقی خۆمان، دەسەڵاتی نەتەوایەتیو هاوجێگەیی خۆمان وەدەست بهێنین ئەبێ خەبات بکەین. بۆ ئەم خەباتە یەکیەتیو یەك گرتن پیویستە، بۆ ئەمەش تەشکیلاتو دەستەی پیش رەو پێویستە.

دامەزراندنو دەست بەکاربونی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەمەهاباد بۆ ئەم ئامانجە بەرزەیە. ئێوە، هاونیشتمانانی خۆشەویست، ئەبی چاوو گوێی خۆتان ئاوالە بکەنەوە، لەدەوری حیزبی خۆتان وەخەبەربین وەبو وەدەست هێنانی مافی قانونیو نەتەوایەتی خۆتان فیداکاری بکەن. حیزبی دیموکراتی کوردستان سەروكو ریگە نیشان دەری ئیوەیە. بەتەنیا لەژێر ئالای ئەم حیزبەدا نەتەوەی کورد لەخەتەری تیداچون نەجاتی ئەبیت وەمەوجودییەتو ناموسو پیویستەکانی نەتەوایەتی ئەو پارێزگاری لی ئەکرێت. بەتەنیا بەهوی ئەم حیزبە گەلی کورد ئەتوانێت لەنیوسنوری دەولەتی ئیران دا خودمختاری نەتەوایەتی وەدەست بخات.

هاونیشتمانانی خۆشەویست.. ئیمە جیا لەمافی قانونیو ئینسانی خومان شتیکی ترمان ناوی. شوعاری ئیمە لەو بەندانەی ژیرەوەدا بەکورتی نیشان دراوە، ئەم شوعارانە بخویننەوە وەلەهەمو پیاویکی کوردی حالی بکەن.

ئەمانەن شوعاراتی ئیمە

*1*-نەتەوەی کورد لەداخلی ئیران دا بو هەڵسوراندنی کاروباری مەحەللی خوی سەربەخۆو ئازاد بیت وەلەسنوری دەولەتی ئیران دا نەتەوەی کورد خودمختاری خوی بخاتە دەست خویەوە.

*2*-مافی خویندنی بەزمانی زگ ماکی خوی هەبیت وەتەواوی کاروباری دایرەکان بەهوی زمانی کوردی بەریوە ببردریت.

3-لەسەر ئەساسی قانونی ئەساسی ئەنجومەنی ویلایەتی کوردستان بەزوویی هەلبژیردری، بەتەواوی کاروباری کومەلایەتیو دەولەتی رابگا وەچاودیریان بەسەردا بکات.

4-کاربەدەستانی دەولەت ئەبی بەبی قسە لەخەلکی مەحەللی بن.

5-ئەبی لەسەر ئەساسی قانونیکی گشتیدا لەنیوان لادییو خاوەن مولکان دا پیک هاتیک پیک بهیندریت وەدوا روژی هەر دوک لا دابین بکریت.

6-حیزبی دیموکراتی کوردستان تی ئەکوشیت کەلەخەبات دا بەتایبەتی لەگەل نەتەوەی ئازەربایجان وەگەلەکانی تری کەلەئازەربایجان ئەژین (ئاسوریەکانو ئەرمەنیەکانو هتد) یەکیتیو برایەتییەکی تەواوی پیک بهینیت.

7-حیزبی دیموکراتی کوردستان بەئامانجی بەرەوپیش بردنی کشتو کالو بازرگانی کوردستان وەپەرەپیدانی کاروباری فەرهەنگو تەندروستی وەباشتر لیکردنی ژیانی ئابوریو مەعنەوی گەلی کورد دەست ئەکات بەسودوەرگرتن لەسامانەکانی سروشتیو کانگاکانی کوردستان وەلەم ریگەیەوە تیئەکوشیت.

ئیمە ئەمانەوی بەتەواوی گەلەکانی ئیران هەلی تیکوشینی بەئازادی بدریت بو بەختەوەرییو پیش کەوتنی نیشتمانی خویان.

بژی کوردستانی خودموختارو دیموکرات (27)

لەسەر هەڵوەشانی ژ.ك‌ودامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان. رۆڵی ژ.ك لە پرۆسەی دەرکەوتن یان پێگەیویی ناسیۆنالیزمی نوێ، قازانجو زیانەکانی هەڵوەشانی ژ.ك لەڕوی سیاسیو رێکخراوەییو دەروونییو کۆمەڵایەتییەوە چبوون؟ ئەوانەو گەڵێ باسی تر، لەو سەردەمانەوە تائێستا جێگەی باسو مشتومڕن... لەو رووناکبیرانەی کەچەند ساڵێکە لەگەڵ باسو لێکۆڵینەوە لەناسیونالیزمی کوردیو روداوەکانی ناو ئەزمونەکەی مەهاباد خەریکە دوکتور عەباس وەلی-یە کەبەگەلێك دیدو بۆچونی نوێوە تیۆرییو راکانی خۆی بڵاوکردۆتەوەو لەسەریشی بەردەوامە...

ئەم رای زۆر لەمێژوونووسو نوسەرەکان رەتدەکاتەوە* لەقسەکانیدا بۆچوونەکانی من رەت دەکاتەوە کە بۆ پێشەوەچوونی مێژووی ناسیونالیستی

---

* لەرەتدانەوەی بیروبۆچونەکانی [illegible] قاسملودا دەڵێت: [illegible] بەراگوزاری باسی کۆمەڵەی ژیکاف دەکا، وەکو پلەیە[illegible] پرۆسەی خەباتی ناسیونا[illegible]یدا کە گەیشتە پێکهاتنی

کوردی پرۆسەیەکی نەپچڕاو بێت، بەمانا، ئەوەی قوبوڵ نییە کەبەهۆی گەشەکردنە بەردەوامەکانی کۆمەڵگەوە، لەهەموو روویەکەوە گۆڕان روو دەدەن، بنەماکانی ناسیونالیزم سەردەردەهێنن، چەکەرە دەکەن، گەشەدەکەن پێدەگەن‌و کۆی هەمووی پێناسەو هەویەی ناسیۆنالیزم پێکدەهێنن... بەمانایەکی تر ئەو پێی وایە یان رەنگە پێی وابێت کەدامەزراندنی کۆمەڵە، بەوەڵەدبووی زەمان‌و زەمین‌و ساتەکەیەو پرۆسەیەکی سەربەخۆیە، پێوەندیی بەرابوردووەوە نییە.... کەئەوەش بۆ خۆی ئەو بۆچوون‌و لێکدانەوەیە رەتدەکاتەوە، چونکە هەرچەندە هۆی راستەوخۆی لەدایکبوونەکە گۆڕانە نوێیەکە بوو، بەڵام کۆمەڵە لەهەناوی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە خوڵقا، لەناو ئەو هەلومەرج‌و بارودۆخە تێکەڵەدا بیری دامەزراندنی رێکخراوی لەو بابەتە بنجی داکوتاوە. ئەوسا لەدایکبوو سەرەنجامی ئەو کۆمەڵەو رێکخراوانەی تر بووە کەلەوەوبەر پێکهاتوون‌و نەماون. دیارە تیاشیاندا هەبوو کاڵ‌و کرچ بێ توانای بەردەوامیی بووە، وەك رێکخراوە نەك وەك بیرو بیرۆکە. لێکدانەوەیەکی لەوبابەتەی کاك عەباس، پچڕاندنی مێژوی ژێکاف لەمێژووی کۆمەڵگەی کوردەواریی، جیاکردنەوەی کۆمەڵەی ژ.ك لەرێکخراوەکانی پێشووترو دەورو تەئسیریان لەسەر پێکهێنانی، پێچەوانەی رەوتی مێژووە، هیچ پێوانەیەکی زانستیی‌و بابەتیی، بۆچونی لەو بابەتە ناگرنە خۆیان...لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخە نوێیەکە، فاکتەرەنوێیەکان رۆڵی راستەوخۆیان لەپرۆسەکەدا بینی.

حزبی دیموکراتی کوردستان ئامانجە نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و کۆمەلایەتیەکانی ئاشکراو روونتر دەرخستبوو، بووە خاوەنی بەرنامەو پرۆگرامی رێك‌وپێك، جگە لەوەش لەبەردەم گۆڕانێکی گەورەو چاوەروان کراودا بوو.. لەگەڵ ئەوانەش ئەتوانین

---

حدك‌و دامەزراندنی کۆمار...لەسەر بۆچون‌و لێکدانەوەکانی منیش دەڵێت: مەحموودی مەلا عزەت-یش لەلێکۆڵینەوەیەکی تازەیدا سەبارەت بەهەستان‌و رووخانی کۆماری کوردستان هەر بۆچوونێکی ئەوتۆی هەیە، هەرچەندە بەهێندێك جیاوازییەوە، ئەو لەگێرانەوەی کاکلگر(essentialist)ی خۆیدا پێشەوەچوونی مێژووی ناسیونالیستی بەپرۆسەیەکی نەپچڕاو دادەنێ‌و هیچ سەرنج ناداتە سەر ئەو هەلومەرجە سیاسی‌و کۆمەلایەتییانەی وا تەئسیریان کردەسەر هەلوەشانی کۆمەڵەی ژێکاف‌و پێکهاتنی حدك...

- بڕوانە عەبباسی وەلی، دەسەڵاتی سیاسی‌و حاکمییەت لەکۆماری کوردستاندا، گۆڤاری گزینگ، ژمارە13

بڵێین لەدایك بونی حزبەکە لە ئەنجامی گۆڕان و گەشەکردنی بنچینەیی و بنەڕەتی لایەنە سەرەکیەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و پەیوەندی بەرهەمهێنانەوە نەبو، بۆیە دامەزراندنەکە کەلەسەر دارو پەردوی کۆمەڵەی ژ.ك بوو. بەگشتی سەرکردایەتی و بنکەو جەماوەری کۆمەڵە، وەکو خۆیان مانەوەو ناوە نوێیەکەی لێنرا، بەزیاتر فراوان بوون و گەشەکردنی ڕێکخستنەوە.. چونکە حزبی نوێ لەبەردەم گۆڕانێکی نوێدا بو، لەبەرئەوە زۆربەی زۆری کۆمەڵانی خەڵك لەناوچەی موکریان لەدەوری گرد بونەوەو زیاتر چونە ریزەکانەوە.. لقەکانی ژ.ك راستەوخۆ بوون بەبەشێك لە حزبە نوێیەکە. سەبارەت بەوەی حزبی دیموکراتی کوردستان لە تاقیکردنەوە گرنگەکەی دامەزراندنی کۆمار دەورێکی مێژوویی و پڕ شانازی بینی، بۆیە بە پێویستمان زانی لێرەدا وێنەی تەواوی بەرنامەکە بخەینە پێش چاو.. بەتایبەتی یەکەم حزبی کوردستانیش بو کە تا ئەو سەردەمەو، بگرە دوای ئەوەش، بەو جۆرە بە ڕێك و پێکی لە مەیدانی خەباتدا خزمەتی نەتەوەی کورد بکات و بەرنامەیەکی وا ڕێکوپێکی هەبێت.

★ ★

★

# پێڕەو پرۆگرامی

# حزبی دیموکراتی کوردستان[28]

### فەسلی یەکەم

*1*-ناوی حزب(حزبی دیموکراتی کوردستان)ە.

*2*-بینای حزب لەسەر ئەم بنچینانەن:

ڕاستی، دادپەروەری، شارستانێتی، وە پێویستە هەموو پەیڕەوو یاساکانی حزب جێبەجێ بکرێن پاش ئەوەی کۆنگرە بڕیاری لە سەر ئەدات.

*3*-قەڵەمو گوڵە گەنم نیشانەی حزبە.

### فەسلی دووەم

*4*-ئامانجی گەورەی حزب لە قۆناغی ئێستادا پارێزگاری کردنی مافەکانی خەڵکی کوردە لە سنوری دەوڵەتی ئێراندا، مسوگەر کردنو بەدەستهێنانی دەبێت لە هەموو ئەو ناوچانەدا کە بەدرێژایی مێژوو تیایا ژیاوەو زەحمەتی کێشاوە خود موختاری خۆی هەبێت.. ئەبێ لە کوردستاندا دیموکراتیەت لە بنچینەدا بۆ دەستکەوتی خەڵك بێتو هەموو خاوەن ماف بن لەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی شورای میللی بێ ئەوەی جیاوازی نەتەوەییو مەزەبیو ئاینی هەبێت.

*5*-ئامانجی حزب گەشەکردنی دیموکراتیەتە کە بناغەی ئەمەش خەبات کردنە بۆ سەرکەوتنی مرۆڤ.

*6*-حزب لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا هیچ جۆرە دوژمنایەتیەكو ناکوکییەکی نییە، بەڵام خەبات دەکات بۆ چەسپاندنی ئاشتیو گەشە کردنی فەرهەنگیو تەندورستیو کشتوکاڵی خەڵکی کورد، کە ئەوانە هەمووی بەهۆی دەسەڵاتدارێتی چەوسێنەرەوە دواکەوتنو وە بۆ ئەمەش دەبێ مافی خود موختاری هەبێت.

### فەسلی سێیەم

*7*-کۆکردنەوەی داراییو باج ڕێك بخات وەکو پێویست دەرامەت دابەش بکرێت.

*8*-ئەبێت یەکەم هەنگاوی حکومەتی میللی دەستکردن بێت بە ئاوەدان کردنەوەی وڵاتو پێکهێنانی دەستگاکانی ئابوریو سیاسی، بۆ ئەمەش زیاتر لە سێ لە سەدی دەرامەتو دەستکەوت نەدرێت بە حکومەتی ناوەندی.

9- ئەبێت هەموو فەرمانبەرانی بەڕێوە بردن و سیاسی و کشتوکاڵ کورد بن، هەر کاتێکیش پێویست بە شارەزایان بو دەتوانرێت لە دەرەوە بهێنرێن وە دەبێت هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی بەزمانی کوردی بێت.

10- حزب خەبات دەکات بۆ گەشە کردنی کشتوکاڵ و کڕینی مەکینەو بەکارهێنانی، خەبات دەکات بۆ ئەوەی بەروبومی جوتیاران بە باشی بفرۆشرێت.

11- حیزب خەبات دەکات بۆ ئاوەدان کردنەوەو تەندرست باشی دێهات، بۆ نەهێشتنی کۆسپەکانی رێگەی هاتوچۆ کردن لە نێوان دێهاتەکاندا.

12- بەرگری و پارێزگاری کردن لە ژیانی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی و تەندروستی هەموو زەحمەتکێشانی کوردستان بێ ئەوەی جیاوازی میللی و نەتەوەیی و ئاینی لێك بدرێتەوە.

13- بڵاوکردنەوەی زانست و شارستانی لە ناو خەڵکی کوردستاندا بەپەرەپێدانی خوێندن لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی داو بە زمانی کوردی لەو قوتابخانانەدا بخوێندرێت.

14- بەرز کردنەوەی رادەی ژیان و شارستانی خەڵك بەزۆر کردنی مەڵبەندی زانست و کتێبخانەو شانۆو شوێنی یاری.

15- گێڕانەوەی فەرمانبەرە کوردەکان کە لە دەستگاکانی بەڕێوە بردن و لەشکرو شوێنەکانی تردا ئیش دەکەن.

16- پێویستە پەیوەندی ئابوری و فەرهەنگی لەگەڵ دەوڵەتان دا بە تایبەتی دەوڵەتی مەزنی یەکێتی سۆڤیەت ببەسترێت بە رەچاوکردنی بەرژەوەندی میللی.

17- بۆئەوەی دەوڵەتی خودموختاری کورد بتوانرێت داواو مافەکانی خۆی دەربخات بۆی هەبێت لە کۆبونەوەکانی میللەتان دا بۆ سودی ژیانی مرۆڤایەتی ئەبەسترێت ئامادە بێت.

18- حکومەتی خودموختاری کوردستان مافی ئەوەی هەبێت ئەو کانانەی دەرهێنراون و دەرنەهێنرێن بەو لایەی خۆیدا دەیەوێت بیبات.

فەسلی چوارەم

19-بۆ مسۆگەر کردنی پێداویستیەکانی خەڵك و بۆ شت هەرزان کردن و خۆشگوزەرانی ژیان دەبێت دەوڵەتی میللی دژی گرانی و مۆنۆپۆلْ (احتكار)و سوسەلەم بوەستێت.

20-ئەبێت دەوڵەتی میللی ئابووری کوردستان گەشە پێ بدات وە لە هەموو شارەکاندا کارخانە دابمەزرێنێت و دەستی ئیمپریالیزم ببڕێت کە نایەڵێت سامانی نیشتمانی سودی لێوەربگیرێت و مرۆڤایەتیش کەڵکی لێوەربگرێت.

21-پێویستە ئافرەتان وەکو پیاوان مافی خۆیان بەکار بهێنن. لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی یەوە.

22-مافی کەمە نەتەوایەتیەکان لە کوردستان، ئازەرو ئەرمەن و ئاسوری بە تەواوەتی بدرێت.

## حزبی دیموکراتی کوردستان

### أزار1324

### کانونی یەکەمی 1945

پێڕەو پرۆگرامی ئەو حزبە گەلێك داخوازی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابوری دەستنیشان کرد، جۆری بەڕێوە بردن و شێوەی پەیوەندی لەگەڵ تاران و دەوڵەتانی دۆست دیار کرا.. ئەوانەش هەنگاوی گرنگ بوون لەو قۆناغەی بزوتنەوەی کوردایەتی دا. بەڵام بە کردارو لە هەنگاو، هەڵوێستدا ئەو لایەنانەی هەمووی پێڕەو نەکرا، یان هەندێکی وەکو پێویست بایەخی ئەوتۆی پێنەدرا، هەرچەندە تەمەنی کۆمار ئەوەندە کورت بوو.. ڕێرەوی ژیان و بەسەرهاتەکان ئەوەندە تێکچڕەژاوو ئاڵۆز بون کە ناتوانرێت ئەو داوا قورس و پڕ ئەرکە بخەینە سەرشانی کۆمارو سەرکردایەتیەکەی بۆ جێبەجێ کردنی ناوەڕۆکی ئەو بەرنامەیە، بەڵام هەواڵ و چالاکی ئەو تۆ.. یان بیرکردنەوە لەجۆری کارکردن لەسەر بەرنامەیەکی لەو بابەتە نەبووە، نەخشەی جێبەجێ کردنی ئەو بەرنامەیەش دانەنرا تاکۆمەڵانی خەڵك پێی پەروەردە بکرێن و بخرێنە بەردەم ئەو گۆڕانانە.. سەرەرای ئەمانەش روو سیمای

حزب، نوێو ئاشکراو لەبارو زەمینەی خەبات گونجاوتر بون، گەشەکردنێکی تری بزوتنەوەی کوردایەتیو پلەیەکی نوێ بو لە جولانەوەی رزگاریی نەتەوەی کوردا دا، بەتایبەتی بزوتنەوەی جوتیاریو تا رادەیەکیش کرێکاری سەری دەرهێنا هەرچەندە لاوازبوون، جگە لەوەش فراوان بوونی بنکەی حزب بە زوربەی عەشایرەکان.. بوو بە هۆی دەسەڵات پەیدا کردنی سەرۆکەکانیان نەك هەر لە ناوچەی خۆیاندا بەڵکوئە دەزگای حزبیشدا شوێنی خۆیان کردووەو جێگەیان بەچەند سەرکردەیەکی چالاك لێژ کرد.

(هەرچەندە بەداخەوە وەزعی سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەو وەختەی کوردستان، بو بەهۆی ئەوە، کە هێندی دەرەبەگی هەلپەرستو ملوموکەر، خۆ بخزێنێتە ناو سەرکردایەتی حیزبەوە، بەڵام سەرۆکایەتی قازی محەمەد وەك پیاوێکی زاناو تێکۆشەرو خۆشەویستی خەڵك کارێکی وای کردبوو کە زوربەی خەڵکی کوردستان بە وەرزێرو کرێکارو کاسبکارو ڕووناکبیرو هی دیکە لە دەوری حیزب کۆببنەوە)*29*

بەو جۆرە ریزەکانی حزب شەپۆلێکی گەورە لە وەرزێرو کرێکارو کاسبکارو رۆشنبیرو فەقێو مەلا ڕووی تێکرد، زوربەی زۆریان دڵسۆزیو سۆزی نیشتمانپەروەری پاڵی پێوە نابون..

یەکێك لە کارە گرنگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، کە تەواوکەری هەنگاوەکەی کۆمەڵەی ژ.ك بو.. بەربەرەکانی کردنی ناوچەگەریو عەشایەری بو.. زۆر لە سەرکردەکان بەپەرۆشەوە هەوڵی یەکێتی ناو ریزەکانی گەلیان ئەداو چیان لە دەست بهاتایە بۆ قەلاچۆ کردنی ناکۆکیو دوبەرەکی لە نێو خێڵو ناوچە عەشیرەتەکانداو پەروەردەکردنی جەماوەر بەگیانی نەتەوەییو نیشتمانپەروەریی، دەیانکرد.

خەباتی حزب دژی ئیمپریالیزمو داگیرکەران.. گۆشکردنی جەماوەر بەو باوەڕە، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ گەلانی براو ئازادیخواز.. ناسینی دۆستو دوژمن بەجەماوەر.. ئەوانە لەنوسینو رۆژنامەو قسەی زۆر لەسەرکردەکان بایەخیان پێدەدرا.. بەربەرەکانی فاشیزمو نازیزمیان بەئەرکێکی گەورەی سەرشانیان دەزانی.

رەنگە ئەو حزبە یەکەم حزبی کوردییو کوردستانی بووبێت کە لە پرۆگرامەکەیدا باسی دیموکراسیی و مافی مرۆڤ بکاتوبەو جۆرە بە زەقیی بیکاتەبەشێك لە

پرۆگرامەکەی‌و بایەخبدات بە مافی ژنان‌و بەپێویستکردنی مافی ئافرەتان کە وەك پیاوان بەکاریانبهێنن. دیسان داواکردن بۆ ئامادەبوونی نوێنەرانی کورد لە"کۆبونەوەی میللەتان"دا هەم داوایەکی رەواو هەم ئازایانە بوو.

لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە، گەورەترین هەنگاوی ئەو حیزبە بەپیرەوەچوونی دامەزراندنی کۆمارو پێکهێنانی دام‌و دەزگاکانی بوو وەکو لەشوێنی خۆی‌دا قسەیان لەسەر دەکەین.

هەر پێش دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان بەچەندین ساڵ بەرێوەبەرایەتییەکەی لەشێوەی خودموختاردا دامەزرێنرا بوو، تاپارێزگاریی ئاسایش‌و هێمنی‌و ژیانی خەڵك بکرێت‌و کاروبارەکانیان بەرێوەببرێن...بۆ ئەنجام دانی ئەو کارو ئامانجانە، چەند دەزگایەك دامەزرێنرا لەوانە (هەیئەتی رئیسەی میللی) کەلەسەرەتاداو تابانگەشەی پێکهێنانی کۆمار پێشەوا قازی محەمەد سەرۆکی بوو، هێمنی شاعیر بەسکرتێر هەڵبژێررا، وە "کومسیونی تەبلیغاتی حیزب" بۆ سەرپەرشتی کردنی چاپەمەنیەکان. (*30*).

بۆیە.. دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردایەتی وەکو حیزبێکی نیشتمانیی بۆ هەموو چینە سەرفرازخوازەکان، لاپەڕەیەکی گەش بوو لەجولانەوەی نیشتمانی‌و رزگاریخوازی گەلی کورد لەکوردستانی ئێراندا.

# پەراوێزو سەرچاوەکان

1–د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، چاپی بەغدا 1975–ل 36.

2–د.ع. شەمزینی، الحركة القومية التحررية للشعب الكردي، صحيفة خەبات بغداد 1960.

3–د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، سەرچاوەی ناوبراو، ل37، 38.

4–د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل39.

5–کەریمی حیسامی، کاروانێك لەشەهیدانی کوردستانی ئێران، چاپی 1971، ل10و 11.

6–هێمن، تاریکو روون، چاپی 1974، ل15.

7–هێمن، هەمان سەرچاوە، ل20.

*8-William Eagleton, The Kurdish Repulic 1946 London 1963, p.133.*

9–کەریم حیسامی، سەرچاوەی ناوبراو، ل13.

*10-William Eagleton, op, cit, p.34.*

11–هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل20.

*12-William Eagleton, op,cit, p.35.*

*13- William Eagleton, lbid, p.35.*

14–هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل21.

15–کەریمی حیسامی، سەرچاوەی ناوبراو، ل 13.

16و17و18–گۆڤاری نیشتمان، ژمارە 3و4 ساڵی 1322، ل27و 28.

*19- William Eagleton, op. Cit, 35.*

20–هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل 23.

*21- William Eagleton, lbid, p35.*

22–هێمن، هەمان سەرچاوە، ل21و 22.

23–هێمن، هەمان سەرچاوە، ل 22، 23.

*24- William Eagleton. Op.cit, p.45.*

*25- William Eagleton, lbid, p.45.*

*26- William Eagleton, lbid, p.134.*

27-دەقی ئەو ئاگادارییە کاك کەریم حەداد پێی گەیاندم: ئەویش لەبرادەرێکەوە وەری‌گرتبوو کەلەئەسڵدا لەدوکتور رەحیمی قازییەوە وەرگیراوە... کەئەم تێبینیەی لەسەر نوسیوەو منیش بەپێویستم زانی کەتێبینییەکە وەکو خۆی بنوسم کە بەم جۆرەیە: (کاکە، ئەم ئاگادارییە ئیمزای قازی‌و سەرۆکەکانی تری کۆمەڵەی "ژ.ك"ی پێوە نی‌یە چونکە هێشتا ژ.ك خۆی لەخۆنەکردبوو، بەڵام ئەم ئاگادارییە لەلایەن قازی‌یەوە نوسراوە وەلەکۆبوونەوەی نهێنی کۆمەڵەی ژ.ك پەسەندکرابوو.

ئەم ئاگادارییە لەسەر پارچە کاغەزێکی جیاوازدا چاپ کرابوو، لایەکی بەکوردی‌و لایەکیشی بەفارسی. بەعزە وشەیەکی کەکوردی نەبون لەلایەن بەندەی فەتیرەخورەوە کوردراوە، لەماناادا هیچ دەستکاری نەکراوە.

برات

رەحیمی قازی..

بۆ ئەو تێبینیەی رەحیمی قازی کە دەڵێت ئەم ئاگادارییە لەکۆبونەوەی کۆمەڵەی ژ.ك-دا پەسندکراوە، هیچ سەرچاوەیەکی تر باس لەوە ناکات. زیاتر لەوەش هیچ بەڵگەنامەیەکی تر بەدەستەوە نییە کەباسی ئەو چارەنوسەی کۆمەڵەی ژ.ك بکات کەئەوەش جێگەی سەرنجە رەنگە زیاتر هەر لەدامەزراندنی حزبی دیموکراتدا بێدەنگیش لەو کرابێت، یان بەجێگرەوەی ئەو دانرابێت.بەڵام وەك لە شوێنی خۆیدا باسکرا پێشەوا قازی محەمەد باسی ئەوەی کردووە کەخۆیان ژ.ك یان هەڵوەشاندۆتەوە، دیارە خوێنەری بەڕێز سەرنجی لەوەش داوە کەچۆن رووسەکان هانی کوردەکانیان ئەدا بۆ دامەزراندنی حزبێکی نوێ! ئەو بەڵگەنامانەی ناو ئەرشیفەکان کەلەشوێنی خۆیاندا باسکران روناکیی دەخەنە سەر لایەنێك لەچارەنوسی ژ.ك.

28-دەقی ئەو پێڕەو پرۆگرامە لەگۆڤاری تودە (ئۆرگانی رێکخراوی شۆڕشگێڕی حیزبی تودەی ئێران لەدەرەوەی وڵات) ژمارە 19 ل30 لەفارسی‌یەوە وەرگیراوە، ئەو گۆڤارەش لەدەقە کوردیەکەوە وەری گرتووە.. وەلەبەرئەوەی کوردیەکەی دەست نەدەکەوت، بۆیە ناچاربوم سەر لەنوێ لەفارسی‌یەکەوە وەری گێڕمەوە سەر کوردی.

29-کەریم حیسامی، سەرچاوەی ناوبراو، ل 24.

30-هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل 23و 24.

ئەمە وێنەی یەکێك لەبڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ژێ کافە کەهەڵوێست و بۆچوونەکانی لەسەر روداوەکان دەرئەخات و چۆن ویستویەتی بەو جۆرە کارانە لایەنگیریی سۆڤیەت بۆ مەسەلەی کورد بەدەستبهێنێت.




به‌ ناوی یه‌زدانی گه‌وره‌ و به‌رز

به‌یان نامه‌ی ژماره‌ ۳۱۲ رۆژی دووه‌می خه‌زه‌ڵوه‌ری ۱۳۲۲

آ . ل . ب . هه‌یئه‌تی ناوه‌ندی کومه‌ڵه‌ی ژ . ك

# بەشی پێنجەم

# دامەزراندنی
# جەمهوریەتی کوردستان

## پاری یەکەم

سەرەتای وتووێژو هەڵوێستی سۆڤیەت لەدروستکردنی قەوارەیەکی کوردی.

دوابیروڕای سۆڤیەتو لایەنگیرکردنی دامەزراندنی کۆماری خودموختاریی.

دامەزراندنی جمهوریەتی کوردستان.

## پاری دووهەم

جەمهوریەتی کوردستان:

ناوی مێژوویی قەوارەکە

خودموختاریی و سەربەخۆیی لەجەمهوریەتی کوردستاندا

جەمهوریەتی کوردستان خودموختار بوو

# پاری یەکەم

لەسەر سەرەتای وتویژی کورد لەگەڵ ئازەرو سۆڤیەتەکاندا، لەسەر جۆری مشتومڕو ڕا سەرەتاییەکانی لێپرسراوانی ئازەربایجان لەهەر دوو دیووی سنوری ئیران–سوڤیەت، لەسەر جۆری پێوەندییە هەمە لایەنەکانی کوردستان لەگەڵ ئازەربایجان، لەسەر بڕیاری دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان.. قسەکراوەو نوسین و لێکۆڵینەوە بلاوکراونەتەوە، وادەزانم تائێستا ئەو لایانانە هەقی خۆیان نەدراوەتێ، جگە لەوەی تەمومژ لەسەر ئەو پەیوەندییانەو پرۆسەکانی گفتوگۆو هەڵوێست و شێوەی قەوارەیەك بۆ کورد بووەو زۆر باس و خواسی بەنهێنیی ماونەتەوە، تائێستا وەك پێویست قسەیان لەسەر نەکراوە، بۆیە دەبێ و پێویستە روناکیی زیاتر بخرێتە سەر ئەو باسانە، ئەو نهێنیی و زانیارییانەی لەسەرچاوە جیاجیاکانەوە بەردەست کەوتوون، بکرێنە هەوێنی لێکۆڵینەوە نوێیەکانی ئەم سەردەمە...

## سەرەتای وتووێژو هەڵوێستی سۆڤیەت
## لە پێکهێنانی قەوارەیەك بۆ کورد

رووداوو گۆڕانەکانی سالانی دووهەم جەنگی جیهان و شێوەی کۆتایی پێهێنانی داگیرکردنی بەشەکانی سەروو سەروی رۆژئاوای ئێران، بەبەشێکی گرنگی کوردستانی رۆژهەلاتیشەوە، لەلایەن لەشکری سوری سۆڤیەتەوە، داڕوخانی ئەرتەش و دام و دەزگای دەولەتی شا، گەشەکردنی بزوتنەوەی کوردایەتی، ئەوانە دەسەلاتی رژێمی شایان وا لاوازکرد کەڕەزا شا ناچار بکرێ لە *16*ی ئەیلولی *1941*دا تەختی شایەتی بۆ کوڕەکەی (حەمە رەزا) بەجێ بهێڵێت، بەو نیازەش کە بتوانێت بەو هەنگاوە رژێمی شایەتی و دەسەلاتی بنەماڵی پەهلەوی بپارێزێت.

لەگەڵ ئەوانەشدا، چالاکیی خوێندەوارو روناکبیرو نیشتمانپەروەران، سەردەرهێنان و گەشەکردنی بیری دیموکراسی و گیانی سەرفرازی و خواستی بەدەستهێنانی مافەکان، بوژاندنەوەی بازرگانی و کەسابەت و بازاڕو رێگەی هاتنوچون، تێکەڵبون بەنوێنەرو لێپرسراوانی سەربازی و سیاسی روسەکان کە مەیلی

زیاتر لەوانەش ، هەر لەکۆنەوە سوڤییەت و روسەکان کەم و زۆر بایەخیان بەکێشەی نەتەوەیی کورد نەدابوو، مەسەلەی کورد لای ئەوان شتێ نەبوو کاری لەسەر بکەن یان کارێکی بۆ بکەن.. لەم ئامادەبوونەی لەشکری سوریشدا گۆڕانێکی چاوێنی نەبوو، بەڵام جۆرێك لەهیواو چاوەڕووانی هەبوون... کەئاوڕیش لەرابوردوو دەدرایەوە، نمونەی پێچەوانە دەکەوتنە بەرچاو، نمونەی دژایەتی کوردو یارمەتیی داگیرکەرانی کوردستان زۆرن لەوانە:

-بێدەنگی روس و سۆڤییەتەکان لەڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد، مامەڵەی خێڵ و هۆزیان دەکردو تەنها بۆ دەستکەوتی خۆشیان.

-لاخستنی پێوەندییەکانی کورد بەڕوسەکانەوە بۆ یارمەتی و سەرفرازیی.

-بێدەنگیی رادیۆو گۆڤارو رۆژنامەکان لەو زوڵم و زۆرانەی لەکورد دەکران...

-بێدەنگیی لەکۆڕو کۆبونەوە جیهانییەکاندا...

-وەڵام نەدانەوەی سێ نامەی شێخ مەحمودی نەمر کەسەرکردەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی لەکوردستانی باشوردا دەکرد(*1918-1931*).

-یارمەتی و هاوکاریی مستەفا کەمال ئەتاتورک لەدژی خواست و داوا ڕەواکانی کورد.

-بەناڕاستەوخۆش گەورەترین زیانی لەکێشەی کورددا کاتێ بەکشانەوەی لەبەرەی جەنگی دژ بەئەڵمان، دەست بەرداربوو لەپەیمانی سایکس- پیکۆ کە بەوە گەورەترین پارچەی کوردستان- کوردستانی باکور- کە بۆ ئەو دانرابوو کەوتەوە دەست تورکەکان.

سەرەتای داگیرکردنەکان لەئێراندا، بەکوردستانیشەوە بێ نەخشەی دابەشکردن بوو، بۆیە لەکشانی هێزەکانی بەریتانیادا تا مەهاباد نەوەستا، بەڵام ماوەیەکی کەم لەو ناوچەیەدا مایەوەو لەدواییدا کشایەوە دوواوە رووەو سەقزو ناوچەکانی خوارووی رۆژئاوا..

بۆیە لەشکری سور زیاتر جێگیر بوو، لێپرسراوانی کەوتنە پێوەندیی و باشکردنی لەگەڵ سەرەك هۆزو خەڵکانی ناسراودا، مەبەستی سەرەکییان لەوانە راگرتنی هێمنیی ناوچەکە بوو، پاراستنی ئاسایش و زیاتر جێگیرکردنی شوێن پێی خۆیان

بوو.. بێ ئەوەی هیچ جۆرە بەرنامەیەکی سیاسیی و نەخشەیەکی ئامادەکراویان هەبێت.. بۆیە سەرەتای پێوەندییەکان هیوایەکی ئەوتۆی لێ سەوز نەدەبوو.

کاتێکیش دوای چەند مانگێ لەبوونی لەشکری سور لەناوچەکەدا( لەئەیلولی *1941*)دا ئاگاداری سەرۆك و ناودارانی خێڵ و هۆزەکانی ناوچەی موکریان کرا کە وەفد پێك بهێنن بۆ سەردانی یەکێتی سۆڤیەت. وەفدێکی نزیك (*30*) کەسی بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە رووەو تەورێزو لەوێشەوە رووە باکۆ بوونەوە.

لەناودارەکانی هاوبەش لەوەفدەکە:

قازی محەمەد، حاجی بابەشێخ، زیرۆ بەگی هەرکی، حاجی قەرەنی ئاغای مامش، کاکە هەمزەی مامش، مەجید خانی میاندواوی، حەسەن تیلوی شکاك، رەشید بەگی هەرکی.. و چەند کەسێکی تریش کە هەریەك و دوان لەخێڵ و هۆزێك دانرابوون....(*2*)

لەسەردانەکەدا گەلێ شوێنی کشتوکاڵی و کارگەی پیشەسازی و سینەماو شانۆگەریان پێنشیان دان کەلەگەڵ جەعفەر باقروفی، سەرەك وەزیرانی ئازربایجانی سۆڤیەت، کۆبوونەوە، ئەم بەگشتیی، باسی باری جیهان و یەکێتی سۆڤیەتی و ئازربایجان و کوردی کرد بێ ئەوەی کەموزۆر باسی ماف و داخوازییەکان و مەسەلەی کورد بکات، بۆیە کوردەکان بەبێ ئەوەی کارێکیان بۆ کورد کردبێت و بەبێ ئەوەی بەڵێنێکی وایان بدرێتێ هەروا گەڕانەوە، دەشگوترێ کە هەندێ داوای خێڵەکی بۆ هێشتنەوەی چەك و چەکدارییی کراوە رەنگە کە ئەو لێپرسراوە بەوانە رازیی بووبێت، دیسان باسی ئەوە دەکرێ کەبایەخێکی تایبەتییان بەقازی محەمەد داوە، جگە لەوە هەندێ دیاری دراوە بەئەندامانی وەفدەکەو هەندێکیان تفەنگی راوییان بەپارەی خۆیان کڕی و بەبیرێکی وا گەڕانەوە کە سوڤیەت یارمەتی کورد ئەدات..(*3*)

جعفر باقروف لەسێ سەرەوە بەمەسەلەی کوردو ئەگەری باس لە داواکانی وەفدی کورد ناکۆك بوو، یەکەم وەك سکرتێری پارتی کومونستی کۆماری ئازربایجانی سوڤیەت. دووهەم: وەك ئازەرییەکی بەدڵ و گیان ناسیونالیست. سێیەم: وەك شیعە.. زیاتریش لەوە لەلێپرسراوە بەدەسەلاتەکانی نزیك بەستالین بوو، توندڕەوو بەزەبریش بوو*

---

* لە 1954دا لەگەڵ لاڤرنتی‌بیریا [illegible] ناوانی خیانەت ئیعدام کران.

هەرچەندە دۆزی کورد لای سوڤیەت بریتی بوو لەکێشەی خێڵ و خێڵگەری و هەر بەم جۆرەش لەو سەرەتایەدا وەك سەردەمەکانی رابردوو، مامەڵەی دەکردو لەسەری بەردەوام بوو.

دوور نییە ئەو هەڵوێستەی یەکێتیی سوڤیەت لەبەرتیشکی ئەمانەی خوارەوە بوبێ:

یەکەم : راپۆرت و راوبۆچونەکانی حزبە کومونیستەکان کەراستەوخۆ دژ بەبزووتنەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد بوون.

دووهەم: سەرچاوەیەکی تر داموو دەزگا تایبەتەکان بوو کە زیاتر بۆ کاروباری جاسوسی و کۆکردنەوەی زانیارییەکان کاریان دەکرد. شارەزایانی ناو ئەم جۆرە دەزگایانەش کەپێوەندییان لەگەڵ کورد هەبوو، بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی ئەم تاقمەش زیاتر هەواڵی چەواشەکەریان لا کۆدەبووەوە.

لەبەر ئەوانەساڵەکانی *1941-1945* تێدەپرین بێئەوەی هەنگاوێکی وا رووە داواو داخوازییە نیشتماننییەکانی کورد بنرێت.

لێرەشدا ناکرێ کێشە گرنگەکانی بەردەمی یەکێتی سوڤیەت ئاماژە بۆ نەکرێن کە گرنگەکانیان:

-شوێنەواری دووهەم جەنگ بەتایبەتی ئەو هەموو وێرانکاری و ئابوری روخاویی و کوشت و کوشتارەی دووچاری ئەو وڵاتە بوو..

-ململانێی نێوان هەردوو بەرەی خۆرئاواو خۆرهەڵات، بەرەی سوسیالیزم و کاپیتالیزم و سەلمینەوەی سەرکردایەتی حزبی شیوعی و حکومەتی سوڤیەت لەرووبەڕووبونی جەنگێکی نوێ...

-لەدایکبوونی گەلێ لەوڵاتانی سویالیست لەئەوروپای رۆژهەڵات و خواستی سوڤیەت بۆ چەسپاندنیان، وەك رژێمی سوسیالیستی و وەك دەوڵەت.

-ئەمریکاو دروستکردنی بومبای ئەتۆمی و دەرکەوتنی توانای روخێنەری، دوای بەکارهێنانی لەهێرۆشیما و ناگازاکی..

-تەقەلای روسەکان بۆ دەستکەوتنی هەندێ بەرژەوەندیی و ئامادەنەبوونی بۆ قوربانی دانی گەورە لەو پێناوەدا..

-مۆرکردنی گەلێك پەیمان و ڕێکەوتن بەمەبەستی، هەم پاراستنی یەکێتی ئەرزو ئاوی ئێران و هەم چونە دەرەوەی لەشکری هەرسێ زلهێز: یەکێتی سوڤیەت-بەریتانیا وە ئەمریکا لەئێران دوای بڕانەوەی جەنگ و لەماوەی شەش مانگدا..

## دوا بیروڕای سۆڤیەت و
## لایەنگیریی پێکهێنانی خودموختاری

ڕۆشنبیرە نیشتمانپەروەرەکانی موکریان لەسەر ئەو زەمینە ڕەخساوو کەشە نیمچە ئازادە، بەبێئومێدیی نەمانەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی ژ.ك پێکهێنراو گۆڤاری نیشتمان بڵاوکرایەوە، بەرپرسیارانی کۆمەڵە کەوتنە پێوەندی بەلێپرسراوانی روسەکانەوە، لەم بوارەدا عەبدولڕەوحمان زەبیحی و قاسمی ئیلخانیزادە ڕۆڵێکی چاوێنی و چالاکانەیان بینی، کەئەرشیفەکانی چەند کۆمارێکی "یەکێتی سوڤیەتی روخاو" بەشێکی گرنگ لەو پێوەندیانەیان تۆمارکردووە، دیارە بەهۆی ڕاپۆرتی کۆنسوڵەکانیان لەتەوریزو ورمێ... وەك لەجێگەی خۆیدا ڕووناکیی خراوەتەسەر کەمێکیان.

زیاتر لەوانە کورد بۆ خۆی جۆرێ لەئیدارەی خۆیی دامەزراندبوو، تەنانەت هێزێکی چەکداریشی پێکهێنابوو تا ئاسایشی مەهابادو دەوروبەری بپارێزرێت، هەیئەتی ڕەئیسەی میللی بەسەرۆکایەتی قازی محەمەدو گەلێ بەڕێوەبەرێتی پێویست پێکهێنرا.. لەگەڵ ئەوانەشداو تا کۆتایی جەنگ هیچ جۆرە گۆڕانێکی وا لەهەڵوێستی سوڤێتیەکان روی نەدا... دوای ئەوەش سەرکەوتنی دەوڵەتە دیموکراتەکان بەسەر نازیزم و فاشیزمدا، ڕێگەی ململانێی لەبەردەم زلهێزەکاندا کردەوە، بەربەرەکانێیەکی ئاشکرا لەسەر: جێبەجێکردنی پەیمان و ڕێکەوتنەکان بۆ چۆڵکردنی ئێران کەوتە روو تازلهێزەکانی خۆرئاوا دەست والآتر بن لەدانانی نەخشەی هێز جێگیرکردن لەئێران، هەر یەکە بەشێوەی خۆی:

بۆ روسەکان:- وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت، ئەگەر نەتوانرێت دەست بەسەر ناوچە کۆنترۆڵکراوەکانی ئێراندا بگیرێت. سەردەرهێنانی شەڕی ساردو ململانێی ئایدۆلۆجی و سنوری قەڵەمڕەوی بلۆك فراوان کردن. بەتایبەتی ئێران بۆ هەردوو بلۆکی خۆرهەڵات و خۆرئاوا ناوچەیەکی ستراتیجی و ئابوریی زۆر گرنگ بوو.

بۆیە روسەکان کەوتنە فراوانکردنی پێوەندییەکانیان لەگەڵ کوردو ئازەردا.

دوای ئـەوەی رۆژبـەرۆژ گوشـاری سیاسـیی لەسـەر سـۆڤیەت زیـاتر دەکـرا، هەرەشـەی شـیکایەت کـردن لـەUN، لەبـەر ئـەو هۆیانـەی تـر کەباسـکران .. ئەوانـە هەلومەرجێکی وای هێنایە ئاراوە کەهەڵوێستەکە وەك جاران نەمێنێت، دەبوو کار بۆ مـانۆڤری سیاسـیی و دۆزینـەوەی کـارتی گوشـار بکرێـت تاببنـە بەشـێکی گرنـگ لەململانێی ئایدۆلۆجیی و سنوری قەڵەمڕەوی بلۆك فراوانکردن.

روسـەکان کەوتنـە فراوانکردنـی پێوەندییـەکانیان لەگـەڵ کـوردو ئـازەردا، بۆیـە لـەنیوەی دووەمـی سـاڵی 1945دا جەنـەڕاڵ سـەلیم ئەتاکشـیوف(3) کـە لێپرسـراوی سیاسیی بـوو لـە تـەورێز، ئاگـاداری قـازی محەمـەدی کـرد کـە کـاتی ئـەوە هـاتووە نوێنـەرانی کـورد سـەر لەلێپرسـراوانی سـۆڤیەت بـدەن و سـەر لـەنوێ داواو داخوازییـەکانی خۆیـان و مافـە نەتەوەییـەکان بخەنـە پێـش چاویـان و داوای یارمەتییان لێبکەن.

ئەم داواو هەڵوێستە نوێیە سەرەتایەکی باش و جوڵێنەر بوو بۆ کورد، لەسەر ئەو داوایە وەفدێك بەم جۆرەی خوارەوە پێکهێنرا(4)

1-قازی محەمەد-سەرۆکی وەفد

2-سەیفی قازی

3-مەنافی کەریمی

4-عەلی رێحانی

5-قاسم ئیلخانیزادە

6- عەبدوڵلا قادر ماش

7-کاکە هەمزەی ماش

8-نوری بەگی بەگزادە

لە 21ی خەرمانانی 1324دا وەفد بەرەو باکۆ کەوتەڕێ. لەگەیشتنیدا پێشوازییەکی گـەرم کـرا، لەلایـەن لێپرسـراوانی کۆمـاری ئازەربایجـانی سـۆڤیەتەوە چەپکـەگوڵ پێشکەشی ئەندامانی وەفدەکە کرا، دواییتر گەیەنرانە شوێنی حەوانەوەی تایبەتیی.

لەڕۆژی دووهەمدا (لایوف) لەگـەڵ مـەنافی کـەریمی دانیشـت و داوای کـرد کـە هـەر داخوازیی و پێشنیارێك هەیە ئامادەی بکەن تا بیگەیەنێتە جەعفەر باقروف تائەویش

لەگەڵ لێپرسراوانی سەرو خۆی باسیان بکات و قسەی لەسەر بکەن، دوای ئەوەی ئەندامانی وەفدەکە داواکانیان دەسنیشان کردو قاسمی ئیلخانیزادە. روونوسی کردن، بەهۆی (لایوف)وە گەیەنرایە باقروف.

هەر ئەو رۆژە لەئێوارەدا ئاگاداری ئەندامانی وەفد کرا کە خۆیان ئامادەبکەن تا بچنە دیدەنی جەعفەر باقروف.. ئەندامان کەوتنەرێ تا گەیشتنە بارەگای باقروف.. دوای دانیشتن و بەخێرهاتن.

ئەم کەوتە قسەکردن، لەیەکتر گەیشتنی هەردوولا زەحمەت نەبوو، چونکە خەڵکی مهاباد جۆرە ئاشنایەتییەکیان لەگەڵ زمانی ئازەری هەبوو بەهۆی نزیکی و بوونی هەندێ دێ و شارۆچکەی تێکەڵ لەکوردو ئازەر، جگە لەئاشنایەتی لەگەڵ تورکانی تەورێزدا، بۆیە لەیەك دەگەیشتن..

جەعفەر باقروف لەقسەکانیدا هەڵوێستی یەکێتیی سوڤیەتی شیدەکردەوەو دەیویست ئەندامانی وەفدەکەی کوردیان پێ حاڵی بکات. بەتایبەتی هەڵوێستی یەکێتی سوڤیەت بەرامبەر کەمینە نەتەوەییەکان و شێوەی یارمەتیدان و هاوکاریکردنیان تا بگەنە مافە نەتەوەییەکانیان...

ئەو بیروراو هەڵوێستەی باقروف، زەمینەی ئایدۆلۆجیی و نەتەوەیی خۆیان هەبوو کە لەناو بۆچون و بەرژەوەندییەکانی حزبی شیوعی ئازەربایجانی سۆڤیەت لەلایەك و هەڵوێستی ناسیۆنالیستانەی ئازەریی، لەلای دووهەم، هەرچەندە دژ بەیەك بوون، بەڵام بۆ باقرۆف هەم بەهەل وەرگرتن و هەم وەك دڵسۆز بەحزبەکەی لەناو مەرامەکانیدا پێکەوە گرێی دەدان و کاری لەسەریان دەکرد، زیاتر لەوەش ئەو سیاسەتێکی داڕێژراوی مۆسکۆی پیادەدەکرد کە ئەم هەڵوێستەی باقروف ئاوێنەکەی بوو. بۆیە بایەخدان بەپرسەی ئازەربایجان و هەوڵی بەستنەوەی پرسەکەی کورد پێیەوە، بووە نەخشەیەکی سازکراو، کاتێکیش لەقسەکانی ئەو دانیشتنەدا گەیشتە سەرباسی مەسەلەی کورد وتی:

(ئێران لەچوار گەل: فارس کەبەفارسی قسەدەکەن، گیلەکی کەبەزمانی گیلەکی، ئازەربایجانی بەزمانی تورکی وە کورد بەزمانی کوردی قسە دەکەن، لەئایندەدا هەر گەلێك لەمانە دەگەن بەمافی خودموختاری، دەبێت یەکەم جار ئازەرەکان پێی بگەن.. جارێ پێویست بەوە ناکات کورد پەلە لەوە بکات کە خودموختاری وەربگرێت..

تارەخساندنی هەلی لەبار، لەبەرئەوە چاکتر وایە جاریّ هەموو گەل یەك بخریّ، بۆیە پێویستە جاریّ کورد لەچوارچێوەی خودموختاری ئازەربایجاندا بمێنێتەوەو بەوەرازیی ببێت...(5)

نوێنەرانی کورد بەو بۆچونو داوایە رازی نەبوون، بیریشیان لەوە نەدەکردەوە کە کورد بەئازەربایجانەوە ببەسترێتەوە، سووربوون لەسەر داوای رەواو مافی خۆیان کە وەك ئازەرەکان ببنە خاوەن خودموختاری، وەك گەلی ئازەری برا بەیەك چاو سەیر بکرێن، لەو مشتومڕانەدا قازی محەمەد زۆر لەسەرخۆو هێمنانە کەوتە قسەکردن، بۆ باقروف-ی روونکردەوە کە کوردیش دەیەێتو مافی خۆیەتی کە خودموختار بێتو سووریشە لەسەر وەرگرتنی ئەو مافەی خۆی.

دوای ئەوەی جەعفەر باقرۆف هەوڵیدا کە وەفدەکەی کورد بەخواستەکەی خۆی رازی بکات، کە لەوە گەیشت ناتوانێ کورد رەزامەند بکات، نوێنەرانی سوورن لەسەر خودموختاریی بۆ کوردستان، ئەوسا:

"مشتێکی بەسەر مێزەکەیدا داو بەدەنگێکی بەرز گوتی لەبەرئەوەی یەکێتی سوڤیەت لەئارادایە، کورد سەربەستیی خۆی وەردەگرێت.. قازی محەمەدیش بەهەمان دەنگی بەرز گوتی : گەلی بێ دەسەلات پێخۆشحاڵە بەو دەستەی بۆی درێژ دەکرێت، وە نەك هەر ئەو دەستە دەگوشێت بەڵکو ماچیشی ئەکات..(6)

دوای ئەو ساتە مێژووییانەی خەونی دێرینی کوردی تێدا دەبینرا.. هیلاکییو دڵتەنگیو نائومێدیی گۆڕران بۆ خۆشیو شادیو ئومێدو خۆشەویستیی دۆستی هاوکارو یارمەتیدەر..

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کورت بەسەر ئەو دڵخۆشییو سەرمەستییەدا، چا خورایەوەو دانیشتوان حەوانەوە... ئەوسا کەوتنە سەر باسی داواو پێویستییەکان بەتایبەتیی: چەكو جبەخانەو ماشینو پارەوپولو ئازوقەو... تاد.. دەبوو یەکێتیی سوڤیەت ئەو پێویستیانە بۆ دامەزراندنی خودموختاریو پارێزگاریکردنی، دابین بکات.. بۆ ئەم مەبەستانە قازی محەمەد هاتە قسەو ئەم سەرگوزشتەیەی گێڕایەوە:-

(ئاغایەك تانجییەك بەلادێیەك دەبەخشێت، بۆ رۆژی دووەم کابرای لادێی دێتەوە لای ئاغاو سوپاسێکی زۆر زۆری ئاغا دەکات، بەجۆرێ ئەو سوپاسە ئەکات کە ئاغاکە چاوەڕوانی ئەو هەموو ستایشەی نەدەکرد، بۆیە سەری لەوە سوڕ دەمێنێتو ئەڵێت:

باشە تۆ پێم ناڵێیت ئاخۆ خەڵاتێکی وابچوك ئەم هەموو سوپاسە ئەهێنێت؟ لادێیەکە وەڵامی ئەداتەوەو ئەڵێت: لەبەرئەوەی تانجییەکت پێبەخشیوم، تانجی بۆ راوەو راویش کەرەسەی راوە نێچیری پێویستە، کەوابوو ئەسپیشم ئەدەیتێ، دیارە ئەسپەکەو خاوەنە نوێیەکەی بێ لانەو بێ خواردن ناژین، بۆیە ئەوانەشم بۆ دابین دەکەیت... جامن ئەو هەموو شتانەم ئەدرێتێ ئیتر چۆن ئەوەندە رەزامەندو بەم جۆرە خۆشحاڵ نابم...[7]

بەو شێوەیە، بەو بیرە قوڵەوە سەرۆکی وەفدی کورد دانیشتوان دەخاتە ناو قوڵایی رووداوەکەوە، ئاشکرای ئەکات کە کارێکی وا گرنگ، دامەزراندنی خودموختاری، هێندە ئاسان نییە کە هەر بەو بەڵێن و قسانە دوایی بێت و تەواو بکرێت، قازی محەمەد ئەو راستییەی خستە پێش چاوی باقرۆف کە کورد هەمان داوای لادێیەکەی لەوان دەوێت، بۆی دەرخست کە چۆن یەکێتی سوڤیەت ئامادەیە یارمەتی بدات بۆ خودموختاری، ئەبێت هەر بەو جۆرە پاڵپشتیی بکات و یارمەتی بدات، کەرەسەی دامەزراندن و ژیان و بەرێوەبردن و پارێزگاریکردنی بۆ مسۆگەر بکات..

دوای ئەو کورتە چیرۆکە، وەك (ئیگلتن) بۆمان باس ئەکات، باقرۆف بەڵێن ئەدات، بەڵێنی ناردنی هەموو پێویستییەکی شەرو بەرگری ئەدات، بەتانك و تۆپ و رەشاش و تفەنگ و یارمەتی پارە، بەوەرگرتنی قوتابی لەدانیشتگای سەربازیی لەتەورێز بەناردنی چاپخانە بۆ مەهاباد.

بەو هیواو بەڵێنانەوە نوێنەرانی کورد گەڕانەوە مەهابادو کەوتنە سەر رێبازی بەدیهێنانی بەشێکی گرنگ لە ئاواتە دێرینەکەی کورد.[8]

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ و پێویستی بەوەڵامدانەوە هەیە:

دەبێ بۆچی و لەو رۆژگارە درەنگ وەختەدا یەکێتی سوڤیەت کەوتبێتە سەر ئەو بیروبۆچوونە کە ئازەرو کورد خودموختاریی خۆیان دابمەزرێنن و دوای تێپەڕبوونی ئەو ماوە زۆرە بەسەربوونیدا لەناوچەکەو بەسەر سەردانی یەکەم وەفدی کورد بۆ باکۆ...؟ دوای تێپەڕبوونی نزیکەی چوار ساڵ بەسەر زەمەنی ئەو بڕیارەدا کە دەبوو لەمێژەوە ئەو بڕیارە بدرایە...

ململانێی هەردوو زلهێزی ئەمریکاو بەریتانیا لەگەڵ یەکێتی سوڤیەت لەسەر ئێران، نەوت، ناوچەی ستراتیجی، هەڕەشەی کۆمۆنیزم. نەخشەی هەردوو دەوڵەتە

ڕۆژئاواکە بۆ ناچارکردنی سوڤیەت بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکان و بۆ کشانەوەی لەشکری سور لەئێران، وە مەترسی بەرپابوونی جەنگێکی نوێ و هەڕەشەی چەکی ئەتۆمی تاقیکراوە لەهێرۆشیماو ناگازاکی، ئەوانە ناوەڕۆکی گۆڕانی سیاسەتی سوڤیەت بوو لەئێران. سیاسەتی ململانێ و هەڕەشەی بەرەنگاربوونی سەربازی بەمانۆڤری سیاسیی لەدەری خۆی و لەناو ئێران بەهەل وەرگرتنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حزبی تودەو گەلی کوردو گەلی ئازەر کەلەشوێنی خۆیدا زیاتر ڕوناکی دەخەینە سەر ئەم لایەنە.

بەو جۆرە نیوەی دووەمی ساڵی *1945* بوو بەسەردەمی چالاکی و هەوڵی ڕێکخستنی ریزەکانی کوردو کۆکردنەوەی تواناکان. دەستکرا بەجموجۆڵ و چالاکی و هاتووچون، بەوتوویژو بیروڕا گۆڕینەوە.. گەلی کورد کەوتە بەردەم گۆڕانێکی گەورە، ئەوەش یەکەم جار بوو یەکێتی سوڤیەت، هەرچەند لەناو مەرامی سیاسی و مانۆڤری دیپلۆماسیی ناو مەبەستەکانی خۆیدا بوو، ئاوڕ لەکورد بداتەوەو یارمەتی دامەزراندنی خودموختاری بدات.

## دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان

بارودۆخی نوێی کوردستان و ئێران و هەرێمەکە، هەڵوێستی یەکێتی سوڤیەت و ناکۆکییەکانی لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیا، وشیاریی روناکبیرانی کوردو بوونی حزبی دیموکراتی کوردستان و زۆر لەسەرەك عەشیرەتە نیشتمانپەروەرەکان و بوونی قازی محەمەد وەك پێشەوای گەل کە زۆربەی تیرەو خێڵەکان ئامادەبوون لەژێر رابەریی ئەودا ببنە هاوکار بۆ رەخساندنی پلەیەکی نوێی ژیانی سیاسی لەکوردستان...

لەناو ئەو هیواو بارودۆخ و چالاکی و جموجۆڵانەدا لە *11*-کانونی یەکەمی ساڵی *1945*دا جەعفەر پیشەوەری سەرۆکی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لەشاری تەورێزدا دامەزراندنی کۆماری خودموختاری ئازەربایجانی راگەیاند، ئەوەش بوو بەهاندەری راستەوخۆ کە کورد بیر لەهەمان هەنگاو بکاتەوە...

بۆیە سەرەتای کار لەپێش راگەیاندنی دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستاندا هەڵکردنی ئاڵای کوردستان بوو لە مەهاباد، لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەریی گەورەدا لە

*17-12-1945* ئالای سێ ڕەنگی کوردستان لەمەهاباد هەڵکرا.. لەو کۆبونەوە مێژووییەدا قازی محەمەد نوتقێکی دا. بەو جۆرە ناوچەی موکریان بەشارو شارۆچکەو دێهاتییەوە بووە ناوچەیەکی پڕ لەجموجۆڵ و هاتوچۆو چالاکیی سیاسیی و روناکبیریی..

سەرەتای ساڵی *1946* خەڵکی کورد لەشارو شارۆچکەو دێهاتەکاندا لەموکریان لەکەش و هەوایەکی نوێدا دەژیان، کەوتبوونە ناو پلەیەکی نوێ لەژیانی سیاسیی و ئامادەیی بۆ ڕووداوو گۆڕانێکی نوێی پڕ لەهیوا، چاوەڕوانی هەڵهاتنی ڕۆژی نوێی کوردستان- یان ئەکرد... حزبی دیموکراتی کوردستان بانگی سەرجەمی دانیشتوانی کرد بۆ کۆبونەوە لەسابلاغ، ڕۆژی دووی ڕێبەندان(*22-1-1946*)، سەرەتای چوارەم حەفتەی یەکەم مانگی ساڵی *1946*، زەمین شاری مەهابادو شوێن مەیدانی چوارچرایە...

جەماوەری کورد بەجوتیارو هەژارو کاسبکارو دەوڵەمەندو شێخ و مەلاو ئاغاو سەرەك خێڵ، بەژن و منداڵ و لاوو پیرەوە چەند ڕۆژێك پێش کاتی دانراو، بەرەو مەهاباد کەوتبوونەڕێ... ئەو ڕۆژە هەور ئاسمانی مەهابادی سەرانسەر گرتبوو، سەهۆڵ شەقام و کۆڵانەکانی داپۆشیی بوو، ڕۆژێکی وای مانگی ڕێبەندان نائاسایی بوو، چونکە لەساڵانی ترو هەمان کاتدا، بۆ خەڵك زۆر ئاسایی نەبوو بڕژێنە سەر شەقام و کۆڵانەکان و دێهات و ماڵی خۆیان بەجێ بهێڵن، بێ ئەوەی گوێ بدەنە بێجێگەیی و ساردو سەرماو سەهۆڵبەندان.. چونکە شەپۆلی خەیاڵی خۆشیی، بەدیهێنانی ئامانجی سەدان ساڵەی باوو باپیریان وا لەبەردەمدا...

لەڕۆژی دووی ڕێبەنداندا مەهاباد بەگشتی و مەیدانی چوارچرا بەتایبەتی بەرگێکی نوێیان پۆشی بوو، هەر لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەوە هەروەك خەڵك لەخەوێکی دوورودرێژ ڕاپەڕێنرابن، بەبەرگی نوێ و بەهیوای گەشەوە بەرەو مەیدانی چوارچرا ئەکەوتنەڕێ لەمەیدانی چواچرادا دەرزی هەڵبدرایە نەدەکەوتە سەر زەوی.. کۆمەڵانی خەڵك چاوەڕوان بوون، چاویان بڕیبووە شوێنی نوتقدان، چاوەڕوانی دەنگی نوێ و هەواڵی نوێ بوون.

"لەم کاتەدا پێشەوای خۆشەویست لەنێو سەلامی نیزامی و چەپڵە ڕێزان و هوراو ئیحساسات و شەوق و شەغەف فەوقولعادەی کۆمەڵ دا وەدەرکەوت و پێشەوای بەرز لە

كاتێكدا كە ئەندامەكانی كۆمیتەی مەركەزی لە پشت سەری دەهاتن‌و ئالآی سێ ڕەنگی كوردستان لەڕاست‌و چەپی تریبون لەئیهتیزاز دا بوو ئەستۆی بەرزی بۆ ئاسمان هەڵینا بۆ نزولی ئیجلالی فەرموو. موتابیقی بەرنامەیەك كەلەپێش دا سازكرابو بەتەواوی حوزار ڕۆژباشی فەرموو پاشان تەشریفی لەتریبون هاتە خوارێ‌و بەپیش تەواوی گوردان‌و گردهان‌و دەستەی سەربازان‌و پیشمەرگەكانی كوردستان دا هات‌و هەموی تەماشاكردن‌و بەهەموان ڕۆژباشی فەرمو، لەم كاتەدا بەدەستوری معاونی فەرماندەی هەمو هێز لەلایەن سەربازان‌و پیشمەرگەكان‌و توپخانەی كوردستان دە دەقیقە بیوچان بەئیفتیخاری سەربەستی كوردستان‌و ناساندنی ڕەئیس جمهوری كوردستان شیلێگ كرا.

پاشان لەكاتێك دا كەدەنگی هورا دەچو بۆ ئاسمان‌و لەقەلبی میتینگ دا موزیك‌و سرودی میللی كوردستان لێدەدراو دەخوێندرایەوە برای خۆشەویست غنی خسروی شەهرداری مەهاباد بەپێی دەستور هاتە پێشەوەو بەتەرتیبی ژێرەوە میتینگی ئیفتیتاح كردو وتی:

"ئەمن غنی خسروی شەهرداری مەهاباد ئەو موفەقیەتە گەورەیەی كەمیللەتی كورد لەپاش هەزاران قوربانی دان ئەورو لەنەتیجەی فەعالییەت‌و كارزانی‌و میللەتپەروەری فەوقولعادەی پیشەوای موعەضەمی كوردستان جەنابی قاضی محمد نصیبی بووە پیروزی‌و موبارەكبادی بەمەقامی گەورەی پیشەوای مەزن‌و میللەتی ڕەشیدی كورد عەرض دەكەم وە میتینگ‌و جەلەسەی ئەورو بەنیوی شاری مەهاباد ئیفتیتاح دەكەم‌و بەدلیكی خاوین‌و پاكەوە دەلیم بژی پیشەوای موعەضەمی كوردستان."

لەدوایە ئاغای خسروی بەرنامەی میتینگی بەتەرتیبی ژێرەوە بەئیطیلاعی حاضران گەیاند:

1-دوعای جەنابی مەلا حسین مجدی

2-نوطقی جەنابی پیشەواو ڕەئیس جمهوری كوردستان

3-نوطقی جەنابی حاجی بابە شیخ

4- نوطقی ئاغای محمد حسین خانی سیف قاچی

5-ئەشعاری ئاغای هەژار شاعیری میللی

6-ئەشعاری ئاغای هیمن شاعیری میللی

7-خیطابەی ئاغای سید محمد بەگزادە

8-نوطقی ئاغای شیخ حسنی شمس الدینی

9-نوطقی ئاغای عمرخان

10-نوطقی ئاغای زیروبەگ

11-نوطقی ئاغای محمد امین معینی

12-نوطقی ئاغای سید عبدالعزیز

13-نوطقی ئاغای ابراهیم ادهم

14-نوطقی ئاغای محمد فیج الله بەگی

15-خیطابەی ئاغای نانەوازادە

16-سرودی مەدرەسەی کوردستان

17-سرودی مەدرەسەی پەروانە(کچان)

18-خیطابەی یای ویلمە صیادیان

19-خیطابەی یای خدیجەی حیدری

20-سرودی مەدرەسەی گەلاویژ

21-سرودی مەدرەسەی سەعادەت

22-خیطابەی ئاغای احمدی ئیلخانی زادە

23-خیطابەی ئاغای محمد قادری[2]

پێشەوا گەیشت وکەوتە قسەکردن:

نوتقی جەنابی پێشەوا قازی محەمەد * :

---

* بڕوانە رۆژنامەی کوردستان ژمارە 10و11 رۆژی 4و1946/2/6 کەمانشێتی ژمارە(10) بەم جۆرە بوو: جیژنی سەربەخۆیی‌و ئیستیقلالی کوردستان یادرەوشینی ئەستێرەی خۆشبەختی کوردان سەرنج راکێشەر لەبلاوکردنەوەی ئەو هەواڵ‌و رواداوە مێژوویی‌و رۆژە نەتەوەییە کە پرسیارێکیش دەهێنێتە ئاراوە، ئەوەیە کە بۆچیی لەرۆژەکانی پێش ئەو ژمارانەدا، لە 22-1تا 3-1946/2بلاونەکرایەوە؟ بۆچی نزیك بەدوو هەفتە ئەو بلاوکردنەوەیە دواکەوت...؟

بەسەریەكەوە سكوونەتیان تێیدا هەیەو دارای مالیكییەتی میللیی دەوێدا بەسەرهات و سەوابیقی تاریخییان یەكەو عوموومەن تێیدا شەریكن. خاوەنی ئاداب و عادات و رسوومی میللییەكی وان كە هیچ جۆرە سەدەمەو حەوادسێك نەیتوانیوە سستییەك لەبناغەی میللییەتی ئەواندا پەیدا بكا.

كورد لەقەدیم دا هەزاران پادشاو حوكمدارو تەشكیلاتیان بووە. هەر لەم كوردستانی ئازادی ئێستادا بنەماڵەی ئۆمەرای موكری كە سەر سلسلەی ئەوان ئەمیر سەیفەدین بووە تا (1020ی كۆچی)بیلئیستیقلال یەك لەدووی یەك ئەمیر سەیفودین. سارم بەگ، شێخ حەیدەر، ئەمیر بەگ، ئەمیر پاشا، تادەگاتە قوبادخان بەدەستەڵات و قودەرەتەوە حكوومەتیان كردووە.

میللەتی رەشیدو بەغیرەتی كورد لەهەموو دەورو زەمانێكدا هەر كەس خەیاڵی ئیستیلای نیشتمانی ئەوانی بوو بێ بەرەنگاری بوون و بەربەرەكانییان كردووەو لەهیچ فیداكارێك دەستیان دانەنەواندووە. لەپاش لەدەستچوونی حوكمداریشیان بۆ وەگیرخستنەوەی ئازادیدا وچانیان نەداوە، بەدڵێكی ئەوەندە بەهێزو عەزمێكی هێندە سابیتەوە تێكۆشاون تائێستا هێزێكی وا پەیدا نەبووە بتوانێ تێكڕا خەفەیان بكا، میرە كوێرەیان كوشتووە بابان سەریان هەڵداوە. بابانیان بێدەنگ كردووە ئەردەڵان بڵیند بوون. ئەوانیان لەعەرزی داوە بتلیسی بەرز بوونەوەو هەزاری دیكەی وەك ئەوان.

تا لەو دواییانەدا لەپاش شەڕی بەینولمیلەلی پێشووەوە كە دیكتاتۆری ئێران و توركیا هاتنە سەر كارو زمان و عادات و مەزهەب و خسووسیاتی میللی كوردیان بەجارێك لاوازو كزو كەنەفت كرد. لەهیچ وەحشییەت و درندەییەك رانەوێستان، خوێندن و نووسینی زمانی كوردی مەمنووع و پۆشینی لیباسمان قەدەغە بوو.

نەیان دەهێشت لەهیچ جۆرە مەزایاو حقووقێكی بەشەرییەت بەشمان ببێ. رێگای فێربوونی عیلم و سەنعەتیان لێبڕیبووینەوە، هەر رۆژە بەهانەیەك و هەر دەمەی بەتەشقەڵەیەك دەستە دەستەو پۆل پۆل كوردی هەژارو بەدبەختیان حەبس و تەبعید دەكردو دەیان كوشتن و لەبەینیان دەبردن حاسڵ و دەسڕەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و رووت و قووت دەهێشتەوە.

تالەشەهریوەری *1320*دا فریشتەی ئازادی دەستگای دیکتاتۆری و فاشیستی رەزاخانی تێك شکاند، کورد سەری لەو هەموو فشارو ئەزییەتە کەمێ فارغ بوو، فەوری ئیحساسی کرد، چۆن دەبێ لەفورسەت ئیستیفادە بکات، و رێگای سەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چییەو چبکا، پیاوانێکی بەبیرو هۆش و بەشەرەف کە زۆر لەمێژ بوو خوێناوی دڵی خۆیان دەخواردەوەو بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دووکەڵ لەدەروونیان دەهاتە دەرێ زۆر زوو تەشخیسیاندا کەوەختی کارەو لەو فورسەتە دەبێ بەهرە وەرگیرێ و ئەوە تەواو ئەو رۆژەیە کە پشتاو پشتمان چاوەڕوانی بوون. یەکجارو خێرا. بێوچان و راوێستان. دەستیان بەکار کرد حزبی دیموکراتی کوردستانیان تەشکیلداو بەدەستوبرد خەریکی کاروباری میللی بوون و بەچاوێکی وردو بەدیققەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیس داو بەدی کرد.

لەپێش هەموو شتێکدا ئیختیلاف و دووبەرەکانی عەشایری کە بەدەسیسەو حیلەبازی ئیستیعمارچی و دیکتاتۆران بۆ ئیستیسمارو خواردن و کرووساندنەوەی ئەو میللەتە بەقەولی خۆیان: "تەفرەقە بییەندازو حوکوومەت کون" دەبەینی خستبوون و تا ئەندازەیەك ئەو ئاورە بلێسەی ساندبوو برای دایکو بابی لەیەك بەزاندبوو یەکەتی لەگۆڕێ هەڵگیراوو نیوی عەشیرەت و... هەرچی کەئەسبابی ئەم نیفاق و پرش و بلاوییە بوو فرێدراو عوموەن لەژێر عینوانی حزبی دیموکراتی کوردستاندا.. یەك دڵ و یەك زمان.......... چەند مدرەسەی کچان و کوڕانمان کردەوە. مەدرەسەی شەوانەمان دایرکردو کتێب بەزمانی کوردی تەرجمە کران..

کورو کچ و پیاوی گەورە لەمەداریسی شەوانەو رۆژانە بەزمانی کوردی دەخوێنن لەجیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربوونی فارسی بن لەمانگێك و دوو مانگدا دەبنە خوێندەوارو هەموو شتێك دەخوێننەوەو دەنووسن.

بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کوردو بۆ راگەیاندنی هاواری خۆمان بەگوێی دنیای بەشەرییەت و عەدالەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بلاوکردنەوە بووین، چاپخانەی زۆر چاك تەئیسیس کراو دانرا لەشاری خۆماندا بەزمانی خۆمان بەچاپخانەی خۆمان گۆڤارو رۆژنامە دەردەچێ و بیرو فیکرو داخوازی ئێمە لەدنیادا بلاو دەکاتەوە.

حاسڵ و بەربووی ئێمە کە میقدارێکی زۆرو زەوەندو بەقیمەت بوو بەفیڕۆیی لەدەستیان دەردەهێناین و دەستی ئیستعمار سەددێکی لەپێش ئێمەو بازاڕی دنیا دروست کردبوو. ڕێگای حەلمان دییەوەو تیجارەت و ئیقتیسادی کوردستان زۆر باش تەئمین کرا.

لەزەمانی دیکتاتۆریدا کە هەموو عەواریزێکیان لێ دەستاندین، کەم و زۆر وەسیلەی لەشساغی و موعالەجە، نەحەکیم، نەدەرمان نەمەریزخانەی بۆ ساز دەکردین. ئێمە بۆ خۆمان مەریزخانەی زۆر باش بەو زووانە دایر دەکەین و لەشساغی ولاتمان تەئمین دەبێ.

هێزێکی میللیمان تەشکیل داوە کەبەشەجاعەتێکی تەواو حازرە دیفاع لەنیشتمان بکا.

دیارە موفەقییەتی ئێمە سەراسەر لەعەینی مەرامی دیموکراسی و لەنەتیجەی فەعالییەتی حزبی دیموکراتی کوردستان و بەپشتیوانی عالەمی دیموکراتە لەبەرئەوە... دەڵێین: بژی موئەسیسینی دیموکرات.

میللەتی کورد هەزاران سەدو بەرهەڵستی سەخت و سەهەندەی لەڕێدا بوو دەستەو دایەرەی دیکتاتۆری بێوچان کارشکێنی ئێمەیان دەکردو لەهیچ نامەردییەك رانەدەوەستان. ئیختیلافاتی عەشایر بۆ داخڵیش ئیشکالێکی گەورە بوو بۆ ئێمە. ئەمما ئەوانە هیچ کامێکیان نەیان توانی پێش بەئێمە بگرن بەدڵێکی بەهێز پایەداریمان کردو ئیدامەمان بەفەعالییەتی خۆماندا تا ئیستقلال و ئازادی نەتەوەی کوردمان بەدەست هێنا.

دیارە بەقایاەکی ئەو خەتەراتەش کە ماوە چ لەداخڵداو چ لەخاریجدا میللەتی کورد موبارەزەی خۆی لەگەڵیان ئیدامە پێ دەدا بەپشتیوانی خودا موزەفەرو مەنسوور دەبێ.

ئەوڕۆ لەتومایەبەندەگانی تەواوی نەواحی و نوقاتی کوردستان بێ راعیەتی تەبەقات ئەعەم لەئاغاو لەرەعییەت و گەورە بچوك، کۆبوونەوەو یەك دڵ و یەك زمان هاواری دێموکراسی دەکەن و بەڕێی دێموکراتدا دەڕۆن قودەرەت و قوەتی دێمۆکرات نیشان دەدات"*.

---

* بڕوانە رۆژنامەی کوردستان ژمارە: 10و 11 رۆژانی 4و1946/2/6

سەرنج راکێشەر لەو بەرنامەیەی دووی ڕێبەندان و پێشکەشکردنی کەسایەتییەکان و نوتقدان لەلایەن غەنی خوسرەوی یەوە.

لەگەڵ نوتقی پێشەوا، هیچ جۆرە بڕیارو ئاماژەیەك نەبووە بۆ بانگەشەی دامەزراندنی جەمهورییەتەکە، بۆ ناو لێنانی کۆمارەکە، بەڵکو هەر لەسەر زارو لەناوەخنی قسەکاندا ناوی جەمهوریەتی کوردستان دەبرا، لەڕۆژانی دوای ئەوەش گەلێ ناوی تر دەکەوتنە سەر زارو سەرلاپەڕەکانی کوردستان، وەك لەشوێنی خۆیدا زیاتر رووناکی ئەخەینە سەر ئەو دیاردەیە.

دوای نوتقی پێشەوا سەرجەمی ئەو کەسایەتییانەی ناویان دیاری کرابوو یەك یەك نوتقی خۆیان پێشکەش بەجەماوەرەکە کرد...

بەهەر حاڵ ناوبردنی ئەو قەوارەیە کە وەفدەکەی کوردو باقروف لەسەری پێکهاتن کە خود موختار بێت، ئەو ناو هێنانەی بەجەمهورییەتی کوردستان جۆرێ لەبڕیاری یاسایی و رەسمی دەدات بەناوی قەوارەکەو دەکرێ هەر ئەم ناوە بەڕەسمیی لەقەڵەم بدرێ و بەکار بهێنرێ...

دوای ئەوەی پێشەوا لەناو دەنگ و هاوارو چەپڵەڕێزاندا شوێنی نوتقدانی بەجێهێشت*.

دەستکرا بەتەقە هەر دەمانچەو تفەنگ بەشانە لەشوێنی خۆیەوە لەناو زرمەی تەقەدا خۆشحاڵی و کامەرانیی خۆی دەردەبڕی، هەروەك هەریەکەلە ئامادەبووان لەلای خۆیەوە دامەزراندنی کۆمارەکە رابگەیەنێت.

هەنگاوی گرنگ لەدوای ئەو کۆبوننەوەو ئاهەنگ و راگەیاندنەی پێشەواو سەرەك جەمهوریەتی کوردستان پێکهێنانی دام و دەزگاو وەزارەتەکان، گەورەترین ئەرکی سەرشانی رەئیس جمهورو لێپرسراوانی تر بوون، پێش ئەوەی بکەوینە ناو درێژەی ئەم باسەوە.

باشتر وایە تیشك بخەمە سەر سێ لایەنی گرنگ کە هاوپێوەندن هەم بەراگەیاندنی دامەزراندنی کۆمارو هەم بەپێکهێنانی ئیدارەو وەزارەتەکانەوە.

---

• تێبینی: لەنوتقەکەی پێشەوادا هەندێ وشە هەیە روون نییە یاناخوێندرێنەوە، ئەوەش بەهۆی نەبونی نوسخە ئەسڵییەکە لەبەردەست و خراپیی نوسخەی کۆپییەکەیە، بۆیە لەو شوێنانەدا چەند نوختەیەك دانراوە.

یەکەم: لەکۆبونەوە(میتینگ) بیست هەزار کەسییەکەی لەهەمان رۆژدا کرا، هەر وەك لەئیستفتایەکی گشتیدابن، بەنونێنەری نەتەوەی کورد دانرابن. چەند بڕیارێکی زۆر گرنگیان راگەیاند کە لەشوێنێکی تردا دەیبینن...

دووەم: پێش دامەزراندنو راگەیاندنی کۆمار، بۆ ماوەی نزیك بەچوار ساڵ ئەو ناوچەیەی سنوری جەمهوریەتی کوردستان دەیگرتەوە جۆرێ لەخودموختاری رانەگەیەندراوی خۆی هەبوو، هەر وەك پێشەوا لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ هێندێ لەمودیرانی جەرائیدی تاران: ئاغای تەفەزولی خاوەنی رۆژنامەی (ئێرانی ما)، ئاغای عەبباسی شاهەندە خاوەنی رۆژنامەی (فەرمان)، ئاغایانی بوزورگی عەلەویو هورموز نووسەرانی دوو رۆژنامەی (رەهبەرو ئێرانی ما)لەوەڵامی پرسیارەکانیاندا گوتی:

"... لەبەرئەوەی کە ئێمە لەدەوڵەتی ئێران ئیجرای قانوونی ئەساسیمان دەوێو دەمانەوێ بەخودموختاری لەژێر بەیداغی ئێراندا بژین، خودموختاریشمان وەگیرکەوتووە."

کە لێی پرسرا: چەند وەختە ئەنگۆ خودموختارن؟ وەڵامی داوە کە:

"چوار ساڵە خودموختاری داخلیمان هەیە"

لەپرسیاری: چلۆن خودموختاری خۆتان هەڵدەسورێنن؟ گوتی:

"لەو وڵاتەی کە توانیومانە خودموختاری نێو خۆمان دەکار بکەین دەگەڵ نوێنەرانی گەورەی میللەتی کورد کە چەندێك لەوەی پێش لەمهاباد حازر بوون ئینتخاباتمان کردو هەیئەتێکی (9) نەفەری بەنێوی هەیئەتی میللی هەڵبژێردرانو سەرۆکی ئەو هەیئەتە بەخۆمە..."*

سێهەم: هەر وەك لەومەبەر ئامارەم بۆ کرد، پێش وەخت ئاڵای کوردستان بەرزکرایەوە، (1945-12-17)ئەوە لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەرییدا بوو کە پێشەوا ئامادەی بوو بەوتارێکی گرنگو مێژوویی و لەناوچەپڵە رێزاندا ئاڵاکە هەڵکرا.. قسەو باسیش لەسەر ئەو ئاڵایە زۆرە، لێرەدا چەند تیشکێك دەخەینە سەر بۆچوونە سەرەکییەکان...

ئاڵای کوردستان جیاوازییەکی زۆر گەورەی لەگەڵ ئاڵای تاراندا نەبوو، دوور نییە ئەمەش هەر بۆ جەخت کرد بووبێت لەسەر نەبوونی خولیای جیابوونەوەو

* بڕوانە رۆژنامەی کوردستان، ژمارەی1و 2-ی رۆژانی 11و1946/1/12

خۆبەستنەوە بەخودموختارییەوە.. گەلێ راوبۆچوون و نوسین هەیە کەنەخشەکێشانی ئالاکە دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمێکی زووتر لەپێکهێنانی جەمهوریەتی کوردستان...

دارِشتەی ئالای کوردستان وەك دەردەکەوێ گۆڕانی بچوکی بەسەردا هێنراوە،ئالاکە چوار گۆشەیەکی لاکێشی: سوور لەسەرەوە، سپی لەناوەڕاست، سەوز لەخوارەوە، رۆژێکی زەرد لەناوەڕاستی سپییەکەدایەو بەگوڵە گەنمێك بەبازنەیەکی دانەخراو دەوردراوەو لەپشتیەوە قەڵەمێك هەیە.

ولیام ئیگلتن دەربارەی ئالاکە ئەڵێت:(9)

"کوردەکانی ئێران بەیارمەتی براکانیان لەعیراق ئالایەکی سێ رەنگیان هەبوو، لەسەرەوە سوور، لەناوەڕاستدا سپی، لەخوارەوە سەوز، وەلەناوەڕاستیدا رۆژێك هەبوو کە گوڵە گەنم دەوری گرتبو، لەپشتیەوە چیایەك و قەڵەمێك هەبوو...

ئەحمەد شەریفی لەو رووەوە ئەڵێت:(10)

"ئالای سێ رەنگی ئێران لەسەر بیناکانی دەوڵەت داگیرا بەپێچەوانەی ئەو ئالایە بەزیادکردنی گوڵە گەنمێك بەرزکرایەوە بەناوی ئالای ئازادیی کورد)

بەڕای ناوبراو ئالای کوردستان هەمان شێوەو جۆری پێکهاتنی ئالای ئێران بوو، بەسەروخوارکردنی هەردوو رەنگی سەرو خوارو زیادکردنی گوڵە گەنمێك".

عەلائەدین سەجادی ئەڵێت:(11)

"سەرەتا پارچەیەکی سور، پاش ئەو، سپی کەبەئەندازەی چوار ئەوەندەی سورەکە، پاش ئەو سەوز بەئەندازەی بەشێ لەچواربەشی سپی‌یەکە لەناوەڕاستی پارچە سپی‌یەکەدا نیوکورە رۆژێك، بەسەر رۆژەکەوە قەڵەمێك، لەم لاو لەولای رۆژەکەوە دوو گوڵە گەنم بەڕەنگی زەرد لەسەراوردی هەموانەوە بەشەکلی چەنبەر نوسرا بوو دەوڵەتی جمهوری کوردستان"

ئەوەی کەبەوێنە لەسەر لاپەڕەی بلاوکراوە دەبینرێت. ئالاکە بەدوو جۆر دەردەکەوێ:

یەکەم سێ رەنگی سورو سپی و سەوز کەلەدرێژی و پانیدا بەقەدەر یەکن لەناوەڕاستیدا ئارمی کوردستان دانراوە، واتە لەناوەڕاستی بەشە سپییەکە. ئارمی کوردستانیش بەو جۆرەیە کەلەوێنەکەدا دەبینرێت..ئەوە لەسەردەمی جەمهوریەتداو لەوێنەکانی سەرەتادا بەوجۆرە دەبینرێت.[12]

ئەوەی دوای کۆمارو لەم سەردەمانەشدا دەبینرێو بۆتە ئاڵای نەتەوەیی، ئەو سێ رەنگەیە/لەسەرەوە سوورو ناوەڕاست سپیو خوارەوە سەوز کە هەر سێ بەشەکە بەقەدەریەکن؛ لەناوەڕاستی سپییەکەدا رۆژێکە بەڕەنگی زەرد...

دیاردەیەکی تری نادیار، نەدۆزینەوەی بڕیاری پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیرانو وەزارەتەکانە، وەك لەمەوبەر وتم، پێش دووی رێبەندانو بۆ ماوەی چوار ساڵ ئیدارەیەك هەبوو بەناوی (هەیئەی رەئیسەی میللی) کەلە کارو فرمانو ئاستی یاساییدا، لەجێگەی ئەنجومەنی وەزیران بو. وادیارە دوای راگەیاندنی دامەزراندنی کۆمار ئەو هەیئەتەیان فراوان کردبێت، چونکە تائێستا، لەهیچ بەڵگەنامەیەك، لەهیچ ژمارەیەك لەو ژمارانەی رۆژنامەی کوردستان کەتائێستا کەوتونەتە بەردەست. کە هەم رۆژنامەی حزبو هەم رۆژنامەی حکومەت بوو، بڕیارێکی لەو بابەتەم نەبینیوە کە باس لەپێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیران بکات، زیاتر لەوەش هەندێ لەدەزگاکان بەوەزارەت ناوبراوە، لەهەمان کاتدا ئەوانی تر هەر بەناوی ئاسایی خۆی ناوبراوە...

دەگوترێ کەلە *11*شوباتدا ناوی وەزیرەکان بەم جۆرە بڵاوکراوەتەوە:

| | |
|---|---|
| *1*-حاجی بابە شێخ سەرەك وەزیران | (رەئیسی هەیئەی رەئیسەی میللی کوردستان) |
| *2*-محەمەد حسەین سەیفی قازی | وەزیری جەنگو یاریدەدەری سەرەك کۆمار |
| *3*-محەمەد ئەمین معینی | وەزیری ناوخۆ |
| *4*-ئەحمەد ئیلاهی | وەزیری ئابوریی. |
| *5*-کەریم ئەحمەدیان | وەزیری پۆستەو تەلەگراف |
| *6*-حاجی عەبدولڕەحمان ئیلخانیزادە | وەزیری تەگبیر(مشاور) |
| *7*-مەناف کەریمی | وەزیری فەرهەنگ |
| *8*-سدیق حەیدەری | وەزیری تەبلیغات |
| *9*-خەلیل خسروی | وەزیری کار |
| *10*-حاجی مستەفا داوودی | وەزیری بازرگانی |
| *11*-محەمەد وەلی زادە | وەزیری کشتوکاڵ |
| *12*-ئیسماعیل ئیلخانیزادە | وەزیری رێگەوبان |
| *13*-مەلا حسەین مەجدی | وەزیری عەدل |
| *14*-سەید محەمەد ئەیوبیان | وەزیری تەندروستی |

بۆ ناوبردنی وەزیرەکان کەمە جیاوازییەك دەربارەی چەند ناوێك هەیە، بۆ نمونە عەلائەدین سەجادی، لەلیستکردنی ناوەکاندا باسی مەلا حسەین و وەزارەتەکەی نەکردووە.

ولیەم ئیگلتن، ناوی سدیق حەیدەری و وەزارتەکەی نەخستۆتە لیستی وەزیرو وەزارتەکانەوە. عەبدولڕەحمان ئیلخانی زادەی بەوەزیری دەرەوە داناوە.(13)

مێژوونوسی تر هەیە باسی وەزارەتی بازرگانی، تەبلیغات ناکەن.

نەجەفقلی بسیان، باسی وەزارەتی دادو وەزارەتی تەندروستی نەکردووە.(14)

سەید محەمەد ئەیوبیان و مەلا حسەین مەجدی لەلیستی وەزیراندا دانەنراون.

جگە لەپێکهێنانی وەزارەتەکان ناوی ئەم کەسانەش وەك بەڕێوەبەری گشتی بەم جۆرە ناوبراون:

| | |
|---|---|
| عەلی ریحانی | بۆ تۆمارکردنی زەوی‌وزار |
| عەلی خسروی | کاروباری لاوان |
| سەید پیرە | کاروباری شارەوانی |
| ئەحمەد عیلمی | دەرامەت و دارایی |

جگە لەگەڵ ناوی تر کەجێگەو پایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەشیرەتی گرنگیان هەبووە، لەوانە قاسمی ئیلخانی زادە کەلەسەردەمی ژ.ك دا لەگەڵ زەبیحی رۆڵێکی گرنگی لەپێوەندییەکانی دەرەوەی کۆمەڵەدا دەبینی.

ولیەم ئیگلتن ئەم ناوانەش وەك بەڕێوەبەری گشتی دەست نیشان کردووە:(15)

سدیق حەیدەری، هەژار، هێمن، عەبدولڕەحمان زەبیحی:

لەچاوپێکەوتنێکمدا لەگەڵ میرزا عەلی خسروی لەهاوینی 1997دا بەدرێژی لەرۆڵی خۆی و رێکخراوی جەوانان دووا، ئەوەشی دەرخست کە ئەم یەکەم کەسێ بوو کەلەرادیۆی مەهابادەوە قسەی کرد...

سەید پیرە وەك لەهەندێ سەرچاوەدا باسکراوە لێپرسراوی بەندیخانە بووە*.

سوپای چەکدار، هەر لەسەرەتای خودموختارییە چوار ساڵییەکەوە، زەمینەیەکی هەبوو. کەسەیفی قازی بەوەزیر هێزی دیموکرات دانرا گەڵ هەنگاوی گرنگ نرا.(16)

* بڕوانە: میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی، بەسەرهاتی کورد، بەرگی یەکەم

شێوەی ڕێکخستنی هێزو فەرماندەکان لەسەر بنچینەیەکی سەربازیی تاڕادەیەك مۆدێرن بوو، بەتایبەت ئەو هێزانەی کە دەیان ئەفسەری کوردی باشوور لەگەڵ بارزانیدا، دوای شکستی شۆڕشی بارزانی 1945- سنوریان بەزاندو خۆیان گەیاندەمەهابادو ڕۆڵێکی گرنگیان لەو سوپایەی کۆماردا بینی لەوانە:

-کۆلۆنیل مستەفا خۆشناو سەرکردەی لکی 1 لەهێزی بۆکان و مەنتیقەی لەسەرا

-کولونیل میرحاج ئەحمەد سەرکردەی لکی2 لەهەمان فەرماندەیی

-کاپتن بەکر عەبدولکەریم سەرکردەی لکی 3 لەهەمان فەرماندەیی.

-مولازم نوری ئەحمەد تەها سەرکردەی لکی 4 لەهەمان فەرماندەیی.

-وەهاب ئاغا جوندیانی یاریدەدری سەرکردەی لکی 4 کەلەڕاستیدا ئەم ڕۆڵی ئەکتیف و پراکتیکانەی لەلکی چواردا دەبینی.

-میجەر خەیروڵلا عەبدولکەریم

-کاپتن (محەمەد قودسی) کە وەك نوێنەری مەلا مستەفا لەبۆنە تایبەتییەکاندا وتاری لەبری ئەو دەخوێندەوە.

-کۆلۆنێل عزەت عەبدولعەزیز.

-مولازمی یەکەم جەلالی ئەمین بەگ.

-کۆلۆنیل سەید عەزیز شەمزینی.

-پلەی جەنراڵ -یش بەم ناوانە بەخشرا

-محەمەد حسەین سەیفی قازی

-عومەر خانی شەریفی- ڕەئیسی ئیلی شکاك

-مەلا مستەفا بارزانی

-حەمە ڕەشید خانی بانە- فەرماندەیی چوار لکەکەی هێزی بارزانیان بەم سپێردرابوو تا ئەوکاتەی کۆماری بەجێهێشت.

جگە لەوانە گەلێك کەسی تر پلەی سەربازیان بەم جۆرە درایە:

-میجەر جەعفەری کەریمی

-کۆلۆنێل محەمەدی نانەوا زادە.

-میجەر محەمەد ئەمین شەریف.

-میجەر عەلی بەگ شیرزاد.

-میجەر ئیبراهیم سەلاح.

-کاپتەن خەلیل موەفەقی.

-کاپتەن حەسەن رەحیم زادە.

-کاپتەن حەمید مازوچی.

-کاپتەن خانان.

-کاپتەن عەزیز سدیقی.

-کاپتەن سدیق ئەسعەدی.

-محەمەد حەیدەری سەروەر.

-حەمزە حەیدەری ناودار یەك.

-عەباس حەیدەری ناوداریەك

-ئەمیر حەیدەری ناودار-2- لەگەڵ گەلێك کەسی تر.

وەك نمونەی بڕیاردان لەسەر کارو فرمانی سەربازیی و سەرچاوەی بڕیار لەهێزی جەمهوریەتی کوردستاندا لێرەدا چەند نمونەیەك دەخەینە پێش چاو...

ژمارە: *380/15*

بروار: *325-3-1*

هێزی دیموکراتی کوردستان

ستادی ناوندی

بەخشنامە وزارت*

پات پولکونیك اغای محمد نانوازادە، کەبەهۆی حکم ژمارە *307/29-2-25* بەمعاوینی سیاسی وزارت هێزی کوردستان انتصاب کراوە بەرامبەر بەو بەخشنامەیە لەغیابی وزیری هیزدا دەتوانی لەجەلەساتی سیاسی و غیرەی مشکلەی وزراتخانان و هەیئەتی بەرزی میللی‌دا شیرکەت بکا.

وزیر هیزی جەمهوریەتی کوردستان

سیف قاضی

ژمارە: *386/15*

---

* بڕوانە: مەحمود مەلا عزەت، د.ج.ك ، ب1 1992، بەڵگنامەی ژمارە: (83)و(84).

بروار: 3-2-25

هێزی دیموکرات کوردستان

بەخشنامە وزارت*

مایور جعفر کریمی کەبەهۆی حکم ژمارە 306 بەمعاوینی حەربی وزارتی هێزی کوردستان انتصاب کراوە بەرامبەر بەو بەخشنامەیە لەغیابی وزیردا دەتوانی لەجەلەساتی حربیو عەشایەریو سایر جەلەساتی دیکەی مربوط بەقسمەتی حەربیو دەرەوەی هێز لەوزارتخانانو هەیئەتی بەرزی حزب بوافد تعلیماتو مشاوەرە دەدریە شیرکەت بکا. و ئەلبەتە پیك هینانی تەواوی اموراتی هیز بۆ قسمەتی سیاسی بەناوبراوی سەرەوە اسپاردراوە.

وزیر هیز جمهوریەتی کوردستان

سیف قاضی (17)

بریاری دانانی محەمەد نانەوازادە بەمعاوینی سیاسی وەزارەتی هێزی کوردستانو رۆڵی لەوەزارەتەکەدا، لەبەخشنامەکاندا دەردکەوێ کە فرمانی دامەزراندنی ئەفسەرو پلە پێبەخشین یان بەرزکردنەوە، وەزیری هێز دەری کردوە وە یەکێك لەمعاوینەکانی، حەربی یان سیاسی یان سەرۆکی دەفتەری وەزارەت جێبەجێی کردوە.

بۆ زیاتر شۆڕبوونەوە بۆ ناو ئاستی ڕێکخستنی هێزی دیموکرات، بەشو یەکەکانی هەر لقو فەرماندەییە، جۆری چەكو تەقەمەنییەکان، شێوەی ئەنجامدانی فرمانە سەربازییو کارو بریارو راسپاردەکان، ئازوقەو خواردەمەنیو جۆری دابەشکردنو قنیاتی هەر پێشمەرگە یان چەکدارێك، ژیانو گوزەرانو دەرامەتی چەکدارەکان، جلو بەرگو نیشانەی پلە جیاجیاکانی کەسانی ناو هێزی دیموکرات، سەرچاوەی داهاتو یارمەتییو جۆری ڕێکخستنیان، شەڕو نەبەردییەکانی بەرەکانی جەنگو درێژەی ڕووداوەکانی ناویان، خەسڵەتە عەشایرییەکانی ناو سوپاو رۆڵیان لەکارکردنە سەر ڕووداوەکان... رۆڵی سەرەك عەشیرەتەکان لەسوپاو هێزەکانی دیموکراتو لەبەرەکانی جەنگدا، شێوەی فرمان دەرکردنو راگەیاندن، ئاستی جێبەجێکردنیان، رۆڵی وەزیری هێزو جەنراڵەکانو سەرەك کۆمار لەئاراستەکردنی

ڕووداوەکانو خوڵقاندنی زەمینەی بەربەرەکانیی دوژمن، دیدوبۆچونە جۆربەجۆرەکان لەسەر ڕوداوە سیاسیو سەربازییەکان.. تاد ئەوانەو گەلێ باسو خواسو ڕووداوی زۆر گرنگ لەبەرگەکانی یەکەمو دووەمو سێیەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستان 1992و 1995و 1997 لەسوید بەچاپم گەیاندوون، بڵاوکراونەتەوەو بەپێویستم نەزانی لێرە درێژەیان پێبدەم.

## پاری دووهەم

### جەمهوریەتی کوردستان

سەبارەت بەو بارودۆخە ئاڵۆزو پڕ لەگرێوگۆڵانەی کە جەمهوریەتی کوردستان)ی تێدا بەوەلەد بوو، ئەو دۆخە نالەبارەی پڕبوو لەناکۆکیو ململانی لەسەر ئێرانو بەرژەوەندییەکان لەو سەر زەمینەدا ، لەبەر ئەوانە حکوومەتەکەی لەسەر زەمینەیەکی پتەوو هەلومەرجی ڕەسیو دانەمەزرا، بێ پێناسەی یاساییو سیاسییو ناوچەییو هەرێمیو نێودەوڵەتی(نێو نەتەوەیی) هاتە ئاراوەو مایەوە، لەناو ئاووهەوای نەشەڕو نەئاشتی یان ڕووبەڕووبونی ڕۆژانەو پێکداداندا، کاری دەکرد، بەجۆرێ کەدەتوانین حکوومەتەکە بە حکوومەتی جەنگ ناو ببەین، بەتایبەتی زۆربەی هەرە زۆری لێپرسراوو کاربەدەستان، لەگەڵ کاری سەربازیو مسۆگەرکردنی پێداویستییەکانی بەرەکانی شەڕ خەریك بوون.

لەبەر ئەوانە، هەرچەندە کۆمەلێ کارو هەنگاوی بەسوودو باشو جێگر لەمەیدانەکانی سەربازیو سیاسیو ڕۆشنبیریو یاساییو کۆمەلایەتییو بەڕێوەبردندا ئەنجام دران، دیسان دیاردەی جۆرێ لەئاڵۆزیو بێ نەخشەیی لەکاروباریدا هەبوو، بوونی فرە سەرچاوە لەیاسادانانو جێبەجێکردنیاندا، هەمە جۆر(ناو) بەکارهێنان لە(شێوەی دەوڵەتیو حکوومەتی) نەبوونی بڕیاری ڕەسمیو یاسایی بۆیانو بۆ گەلێ کاری گرینگی تر بەرچاو دەکەون.

لام وایە ئەوانە لەناو ئەو ئالۆزیانەدا، بۆ ئەو سەردەمو رۆژگارەی کورد زۆر نامۆ نەبن، بەرەخنەی زۆر گەورە دانەنرێن. بەڵام نامۆو سەیر لەوەدایە کەلەم سەردەمەشدا ئەوانە بەردەوام بن و زیاتریش بشێوێندرێن، ئەوەی هەبووە وەك خۆی باس نەکرێ و ئەوەی نەشبووە بۆی بخوڵقێنرێ و پێوەی بلکێنرێ. حەزو خواستی ناو بۆچوونی بێبەڵگە بخزێنرێتە ناو مێژووەکەیەوە، ئەوەی یارمەتیدەری ئەم جۆرە دیاردە نائاساییەیە، نەبوونی لێکۆڵینەوەی بابەتی و زانستییانەی گەلێ لایەنی مێژووی سیاسی، سەربازیی، بەڕێوەبەرایەتی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و دیپلۆماسیی ئەزمونەکەیە. بۆیە کاتی ئەوە هاتووە، ئەوەندەی لەبەردەستبوونی بەڵگەنامەو شوێنەواری مێژوویی سەردەمەکە یارمەتی دەدەن، بژاری ئەو هەڵەو بۆچوونانە بکرێ و، لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر ئەو لایەنانە بکرێ... لێرەدا هەوڵدەدەم رووناکیی بخەمەسەر دوو لایەنی هاوپێوەند بەوانەوە کە(ناوی قەوارەکە) و مەسەلەی خودموختاری و سەربەخۆیی)یە. لەجەمهوریەتی کوردستاندا.

باش وایە پێشەکیش ئامارە بۆ چەند پرنسیپێکی رێبازی مێژوونووسین بکەم کەنووسەرو مێژووناس لەنوسین و لێکۆڵینەوەیاندا خۆیانی پێوە دەبەستنەوە.

*لەنووسین و باس و خواس لەسەر هەر رووداوێکی مێژوویی، پێویستە پەنا بۆ بەڵگەنامەو شوێنەواری سەردەمی باسەکە ببرێت، تابەهۆیانەوە راو بۆچوونەکان بسەلمێنرێن، بابەتی و زانستییانە لێکۆڵینەوە بکرێت و دابرێژرێت. لەوەبەدەر نابێ بۆچوون و راو تیۆری نەسەلمێنراو دابنرێن و بسەپێنرێن.

*لەتوێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا، دەبێ مێژونووس بۆچوون و راکانی خۆی لەسۆزو حەزو خواست و ویستی شەخسی لابدات و تێکەڵی راستییە مێژووییەکانی نەکات، شەڕی سیاسی و کۆنەقین.. ململانێ و ناکۆکی حزبایەتی بخاتە لاوەو نەیەڵێت کار لەرەوتی بیرکردنەوەی ئاسایی و زانستیانە بکەن رێگە نەدا رق و کینەی رەوا بەرانبەر بەدوژمنی داگیرکەر کار بکەنە سەر هەڵێنجانی راستییەکان.

*هەوڵدان بۆرووناکی خستنەسەر رووداوو دیاردەی مێژوویی، وەك هەبوون و روویانداوە،کە هیچ پێوەندییەکی بەخواست و بۆچوونی نەئەو سەردەمەو نەسەردەمی نوسین لەسەر رووداوەکە نییە، کاری لەو بابەتە مانای لایەنگیریی بۆچوونێکی جیاواز

یان دژ بەوە نییە، دووره لەڕەواج پێدانی سیاسەتی ئەم پارتیو ئەو رێکخراو، دووره لەهەڵسەنگاندن بەکێش‌و پێوانەی ئەمڕۆو ئەم سەردەمە، دەبێ بەتێگەیشتنی قووڵی هەمەلایەنەی رووداوەکان، هەڵە دەستنیشان بکرێت‌و رەخنە بگیرێت‌ونرخاندن‌و هەڵسەنگاندن ئەنجامبدرێت.

*لەباسی سەربەخۆ یان خودموختاربوونی جەمهوریەتی کوردستاندا، دەبێ پێناسەی رەزامەندی هەر یەکەیان لەبەرچاو بگیرێ. لەبنەماو زەمینەو پایەگاکانی رەخساندنی هەریەکەیان بگەین. ساغکردنەوەی ئەم یان ئەویان نابێ بۆ مەبەستی سەردەم، بۆ شانازیکردنی بێبناغە، دەستکەوتی تەسکی حزبایەتی بن. نابێ بۆ ئەو مەبەستانە، راستییەکان لابخرێن‌و ناڕاست بخرێنە جێگەیان.

*هەوڵدان بۆ سەلماندنی خودموختاری-بوونی جەمهورییەتەکە لەناو سنووری ئێرانداو سەربەخۆبوون لەئازەربایجان مانای ئەوەنییە کەنووسەر لەگەڵ ئەو خودموختارییە دایەو دژ بەسەربەخۆییە یان بەپێچەوانەوە.

کاتێ مرۆڤ دێتە سەر هەڵسەنگاندن‌و بەراوردکردن‌و رەخنەو کەم‌و کورتی دەرخستن، ئەمە دەبێتە باسێکی جیاوازو پێویستە پێوانەیان لەگەڵ بارودۆخ‌و هەلومەرجە رەخسیوەکانی ئەو سەردەمەدا بگونجێن‌و بکرێنە سەنگی جیاوازیی نێوان دیدو بۆچوونی ئەو سەردەم‌و ئەم سەردەم.

## ناوی مێژوویی قەوارەکە ؟

### ریشەی ناوی قەوارەکە

یەکێ لەو باسانەی دوور لەو پرنسیپانە شێوێندراوە، ناوی ئەو قەوارەیەیە کەلەموکریانی کوردستانی رۆژهەڵات دامەزرێنرا،[2] بە بێ لێکۆڵینەوەو گەڕانەوە بۆ سەردەمەکەو تێگەیشتنی روداوو دیاردەکان ناوی لێنراوە، بێ هیچ بەڵگەنامەیەك، (ناو) داتاشراوەو بەکاردەهێنرێ، دەخوازرێ بسەپێنرێ‌و بخرێتە جێگەی ناوە مێژووییەکە، هەیە ناوی کتێب‌و بەرهەم‌و سەرباسی لێکۆڵینەوەی نووسەران بەناوی قەوارەکە وەردەگرێ یا تێکەڵ بەناوە مێژووییەکانی دەکات... بەبێ ئەوەی خاوەن بەرهەم یان نوسەر خواستی ئەوە بێت کەسەرباسی کتێبەکەی، بەناوی مێژوویی

دانـابێت! لـەناو ئـەو ناوانـەدا کـە بـۆ نموونـە دەهێنرێنـەوە: کۆمـاری دیمۆکراتـی کوردستان، کۆماری کوردستان، کۆماری خودموختاری کوردستان، کۆماری میللی مەهاباد، کۆماری مەهاباد.3

هەیە نـاوێك لـەناو ئـەو ناوانـەدا هـەڵدەبژێریو داوا دەکـات هـەر ئـەوە بـەناوی قەوارەکە دابنرێتو دەبێ بەکاربهێنرێت. بێ ئەوەی بەلای ناوێك لەناو مێژووییەکاندا بچێـتو لـەوەش بگـات کـەناکرێو ناگونجـێ نـاوی ڕووداوێکـی مێژوویـی وەك جەمهوریەتی کوردستان کە سەرەنجامی ئەزموونەکەی مەهاباد بوو، کە چەندین ناوی تایبـەتیی خـۆی هـەبووە، ئـەمڕۆ نـاوی بـۆ دابتاشـرێو دوای زیـاتر لـەنیو سـەدە لەجێگەی دابنرێتو بویسترێت بسەپێنرێت.

لەباسـی نـاوی ئـەو قەوارەیـەدا، ئـەوەی تائێسـتا لای بـەندە ئاشـکرایەو پێچەوانەکەییم بەرچاو نەکەوتووە: هەر لەدامەزراندنییەوە تا ڕووخاندنی، هیچ جۆرە بڕیارێکی رەسمـیو یاسایی تایبـەت بەناولێنان نـەدراوەو نـەبووە. لـەناو ڕۆژنامـەی کوردسـتانو گۆڤـاری کوردسـتانو هەڵاڵـەو بڵاوکراوەکـانی تـرو سـەرجەمی بەڵگەنامـەکانی سـەردەمەکە، کەئـەمڕۆ لەبەر دەستدان، بڕیـاری لەو بابەتە وەبـەرچاو نەکەوتووەو ناکەوێ. لـەگوتارو نوتقـی لێپرسـراوان لـەڕۆژی ڕاگـەیاندنی دامـەزراندنی جەمهوریەتی کوردستاندا ئاماژە بۆ بڕیارو کارێکی لەو بابەتە نەکراوە...

وەك دیاردەیـەکی هـاوپێوەند بـەو نـەبوونی بڕیـارەوە، هـەر وەك سـەلمێنەرێکیش بۆی، چەندین ناوی دەوڵەتیو حکوومـەتی لـەئارادا بوون، کـەمو زۆر لەسـەرزاربوونو بەکارهێنراون کەلێرەدا هەوڵ دەدەم لەناو بەڵگەنامەو ڕۆژنامەو گۆڤارو وتارو نوتقی لێپرسـرواندا ڕاسـتییەکانی تایبـەت بـەو ناوانـە هەڵبـهێنجم تـا هیـچ جـۆرە گومـانو دوودڵییـەك لەسـەر ئـەم باسـە نـەهێڵرێو جێگـەی بۆچوونـی بێجـێ نەمێنێتـەوە. وەك ئامـاژەم بـۆ کـرد، گـەلێ نـاوی حکوومـەتیو دەوڵـەتی لەسـەردەمەکەدا لەئارادابوونوبـە کـارهێنراون کـەهێندێکیان جێگـەی مێژوویی خۆیـان هەیـەو دەکرێت لەبـەر نـەبوونی بڕیـاری تایبـەتی بـۆ نـاو لێنـان، بەیاسـاییو رەسمـی دابـنرێن، وەکـوو لـێرەدا ڕووناکییان دەخەمە سەر.

**یەکەم: ناوی حکوومەتی:**

*حکومەتی میللی کوردستان: لەڕۆژی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان، لەکۆبوونەوە مێژووییە بیست هەزار نەفەرییەکەی دووی ڕێبەندانی 1324دا، لەناو داواو ڕاسپارەکاندا، ناوی قەوارەکە بەمجۆرە هاتووە:

((... ئەوڕۆ ئارەزوی عمومی خۆمان ئیزهار دەکەین و لەکۆمیتەی مەرکەزی حزبی دێمۆکرات و ئەنجومەنی خۆمان خواهیش دەکەین و ئیختیاری دەدەینێ:

1-لەو جێگایانەدا کەئێستا کوردی تێدا دەژین بەئیستیقلالی تەواو بگا.

2-ئینتیخاباتی مەجلیسی شورا دەست پێ بکەن.

3-حکوومەتی میللی کوردستان و وەزیران وئیدارەکانی ساز بکەن...هتد)4.

لەڕاستییدا ئەم ناوە حکوومەتییە لەگەڵ دروشم و داخوازیی خودموختاریدا جووت دەبێت، بۆیە بوون و بەکارهێنانی لەخۆوەو بەڕێکەوت نەبووە، جا ئەگەر ناوی تری قەوارەکە، چی حکوومەتی و چی دەوڵەتی، لەئارادا نەبوونایەو باس نەکرابانایە، وادەتوانرا ئەم ناوە حکوومەتییە بەڕەسمی و یاسایی و بڕیاری تایبەت بەناوی قەوارەکە دابنرایە. بەتایبەتی هەر ئەم ناوە بوو کەهەر پێش بڵاوکردنەوەی دامەزراندنی جەمهوری کوردستان حزبی دێمۆکراتی کوردستان لەیەکەم کۆنگرەی دامەزرانیداو لەبەرنامەکەشیدا بەمجۆرە ئەو ناوەی دیاری کردبوو:

"ئەبێت یەکەم هەنگاوی حکوومەتی میللی دەستکردن بێت بەئاوەدان کردنەوەی وڵات و...هتد).5

جاری واش بووە(پێشەوا) خۆی ئەو ناوەی لەقسەو وتاردا بەکارهێناوە.6

کەوابوو ئەم ناوە هەر وا بەڕێکەوت لەسەر زاران نەبووەو بەکارنەهێنراوە. هۆی بەڕەسمی و یاسایی وەرگرتنی ئەم ناوە حکوومەتییە هەر لەوانەدا نییە، بەڵکوو لەوەشدایە کەلەڕووداوێکی گرینگی وەك بەستن و مۆرکردنی پەیمانی یەکییەتی و برایەتی حکوومەتی کوردستان و ئازەربایجانیشدا ئەو ناوە بەکارهێنراوە، لەنووسینی ناوی ئەندامانی وەفدەکەی کورددا بەمجۆرە دەست پێکراوە:

(جەنابی قازی محمد رئیسی حکوومەتی ملی کوردستان )

دیسان ناوی سەیفی قازی بەم جۆرە نووسراوە: محمد حسین خانی سەیفی قازی(وەزیری هێزی حکوومەتی ملی کوردستان)7

لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم ناوە لە نووسین و لەسەر زار کەمجار بەکارهێنرا، ئەوەی سەرنج دەدرێ، زیاتریش لێپرسراوانی پلەی یەکەمی حکوومەتەکەو حزبی دێمۆکرات بوون بەکاریان دەهێنا. بۆ نموونەی زیاتر لەوەی ئاماژەی بۆ کرا: معاوینی کۆمیتەی مەرکەزی حزبی دیموکراتی کوردستان.8

دیسان لەسەر ئەو کاغەزانەی ژمارەیەك لەدام و دەزگاکانی حکوومەت بۆ نامەنووسین بەکاریان دەهێنا کلێشەیان لەبەشی سەرەوەی ئەوکاغەزانەدا داڕشتبوو، لەگەڵ ئەو کلێشەیەدا(حکوومەتی میللی کوردستان) لەسەرووی نووسینەکانەوە نوسرابوو.9

*حکوومەتی کوردستان:

نزیك بەو ناوە حکوومەتییەی باسکرا، یان لەوانەیە هەر ئەو ناوە بەم جۆرە بەکورتکراوەیی بەکارهێنرابێت مەبەست (حکوومەتی کوردستان)بووە... ئەوەی زیاتر بایەخی ئەم ناوە دەردەخات، لەلایەن بەرزترین دام و دەزگای دەوڵەتەوە بەکارهێنراوە، واتە (هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان) کەلەدواییدا، مەبەستم دوای ڕووخاندنی قەوارەکەیە، نووسەران بە(ئەنجومەنی وەزیران) ناویان بردووە، چونکە لەسەردەمی ئەزموونەکەدا ئەم ناوە بەکارنەهاتووە. نموونەی شێوەی بەکارهێنانی ئەم ناوە لەلایەن هەیئەتەوە:

ڕۆژنامەی کوردستان لەمردنی (کالینین)دا، دوای ئەوەی باسی مردنەکە دەکات ئەم بڕیارەشی بڵاوکردبۆوە:

(...بەم بۆنەیەوە ڕۆژی 14-1325/3/15 مجلسی تزکرو عزاداری لەلایەن حکوومەتی کوردستانەوە گیرابو ئاڵای کوردستان لەسەربانی تەواوی ئیدارەکانی کوردستان نیو ئەفراشتەبوون)10

-حکوومەتی میللی دێمۆکراتی کوردستان:

ئەم ناوە بەدەگمەن لەسەر زار بووەو بەکارهێنراوە، بۆیە هەر بە دەگمەنیش لەڕۆژنامەی کوردستاندا دەکەوێتە بەرچاو. پێدەچێ زیاتر لەحەزی شەخسییەوە لەلایەن یەکدوو نوسەرەوە بەکارهێنرابێت و نووسرابێت.

***هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان**

ئەم ناوە بە تایبەتی لە رۆژنامەداو پێش راگەیاندنی جەمهوریەتی کوردستان، پێکهاتووەو قازی محەمەد سەرۆکی بووە داوای ئەو راگەیاندنەش پێکهاتووەو قازی محەمەد سەرۆکی بووە داوای ئەو راگەیاندنەش زیاتر لەهەموو ناوە حکوومەتییەکانی تر بەکارهێنراوە.

لەدوای دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان، سەرۆکایەتییەکەی بە حاجی بابەشێخ" سپێردراو ئیتر بە(رەئیسی هەیئەتی میللی کوردستان، یان رەئیسی هەیئەی رەئیسەی میللی کوردستان"[11] ناودەبرا، هێندێ جاریش لەبری (رەئیس) سەرۆك بەکاردەهێنرا. جار جار هەر بە(هەیئەتی میللی)ناودەبرا دیارە ئەمەش هەر بۆ کورتکردنەوەو ئاسان لەسەر زار بەکارهێنان بووە.*12*

کارو ناوی ئەم دەزگای بەرێوەبردنە، وەك(ئەنجومەنی وەزیران) بووە...کە لە دوای روخاندنی جەمهوریەتەکە، زۆر لەنوسەرو مێژوونووسان ئەمیان بەکارهێناوە. زۆربەش هەر وایان زانیوەو وادەزانن کەلەسەردەمەکەشدا ئەنجومەنی وەزیران)بەکارهاتووە کەوەك لەپێشتر گوتم هەرگیز ئەم ناوە بەکارنەهێنراوەو نەنووسراوە هەر وەك رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان و بەڵگەنامەکان بۆمان رووندەکەنەوە.

بەڵام خودی ئەم ناوە (هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان) بۆ سەردەمە نوێیەکەی دوا دامەزراندنی کۆمار شتێکی تازەو داهێنراو نەبوو، چونکە هەر پێش ئەوە بۆ بەرێوەبردنی ئەو(خودموختاری)یەی چوار ساڵ بووبەردەوام ئەو دەزگای بەرێوەبردنە بەو ناوەوە هەبووە. هەر وەك پێشەوا قازی محەمەد ئاماژەی بۆ کردبوو، کاتێ لێیدەپرسن: (چلۆن خودموختاری خۆتان هەڵدەسووڕێنن؟" بەمجۆرە وەڵام دەداتەوە:

"لەو وەڵاتەی کە توانیومانە خودموختاری خۆمان دەکاربکەین دەگەڵ نوێنەرانی گەورەی میللەتی کورد کەچەندێك لەوەی پێش لەمهاباد حازر بوون انتخاباتمان کردو هەیئەتێکی *9* نەفەری بەنێوی هەیئەتی میللی هەڵبژێردران و سەرۆکی ئەو هەیئەتە بەخۆمە.."*13*

واتەپێش راگەیاندنی دامەزراندنی کۆمار، پێشەوا خۆی سەرۆکی هەیئەتی رەئیسەی میللی بووە. ناوەکەش بەمجۆرە لەژمارەکانی رۆژنامەی کوردستاندا کەلەپێش راگەیاندنی کۆمار چاپدەکراو بڵاودەکرایەوە، وەبەرچاو دەکەوێ.

لەباسی ئەم هەیئەتی رەئیسەی میللییەدا (ئەنجومەنی وەزیران) دەبێ ئاماژە بۆ دیاردەیەکیسەیر بکرێ ئەوەش بڵاونەکردنەوەی لیستەیەکی تەواوی وەزیرو سەرۆکی ئیدارەکانی حکوومەتەکەیە، نەلەرۆژنامەی کوردستانو گۆڤاری کوردستانو هەڵاڵەدا ئەو لیستەیە دەبینرێ وەنەلەهیچ شوێنێکی تردا... بۆیە بۆچوونی جیاجیاو جیاواز لەدەستنیشانکردنی لیستەی ناوی وەزیرو وەزارتەکانو سەرۆکی ئیدارەو ناوی ئیدارەکاندا هەیە ناوبردنی هەیئەتەکەش بەئەنجومەنی وەزیران، هەر لەبەر ئەوەیە کەلەراستیدا هەیئەتەکە هەر ئەو رۆڵەی بینیوە، رەنگە هەر بۆ دەرخستنی نیەت لەخودموختاریو نەبوونی مەیلی جیابونەوە ئەو ناو هێلراوەتەوە.

**دووهەم - ناوی دەوڵەتی:**

دیسان بۆ ناوی دەوڵەتیش بەهەمان شێوەی ناوی حکوومەتییەکە، چەند جۆرێك ناو بەکارهێنراوەو نووسراوە کەئەمانەن:

***دەوڵەتی جمهوری کوردستان:**

هەرچەند ئەم ناوە زۆر کەم بەکارهێنراوە، بەڵام بایەخو جێگەی مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە لەو تابلۆیەی کە بۆ وەزارەتی فەرهەنگی کوردستان سازکرابوو کەبریتی بوو لە: ئارمێك، کەلەسەرەوەی بەشێوەی چەنبەر"دەوڵەتی جەمهوری کوردستان" لەژێریشەوە(وەزارەتی فەرهەنگ)نووسرابوون. *14*

تائێستاش لام روون نەبووتەوە کەیو چۆنو کێ ئەو تابلۆیەی دارشتووە؟ ئەوە نەبێ کەلەبەرنامەکەی حزبی دیمۆکراتی کوردستاندا، کەلەپێش دامەزراندنی جەمهوریەتەکەدا بلاوکرابۆوە. ئاماژە بۆ نیشانەی حزبەکە بەمجۆرە کراوە: "قەڵەمو گوڵە گەنم نیشانەی حزبە". *15*

ئیتر بێنەوەی باسی ئەوە بکرێت کەنووسینو گوڵەگەنمەکە چۆن بووە، یان قسە لەسەر نیوکورە رۆژەکەی ناو ئارمەکە بکرێ. بۆیە روون نییە کەئایا حزبی دیمۆکراتی کوردستان مەبەستی لەوە، ئارمو تابلۆکە بووە یان نە؟ چونکە دەکرێ هەر قەڵەمو گوڵەگەنم، بێدارشتنی ئارمو تابلۆ، بکرێتە نیشانە یا سیمبوڵ، دوای ئەوەش

حزبەکە هیچ زانیارییەکی تری لەو ڕووەوە بڵاونەکردۆتەوە.لەوانەش گرینگتر ئەوە بوو کەئارمەکە لەسەرەتادا لەناوەڕاستی ئاڵاکەی کۆماردا دانرابوو، وەك لەو وێنەیەی بەبۆنەی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لەمەهاباد-ڕۆژی *1945/12/17*دا هەڵکراوە، وادەردەکەوێ کەئارمەکە لەسەر ئاڵاکە دانراوە... هەرچەندە لە ماوەیەکی نادیاردا لەیەك جوداکراونەوە... (ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵا لەمەهاباد، لەژمارە *2*ی ڕ.ك (*21*ی دیسامبری *1945* ) ئەو مێژووە بە *1324/9/27* نوسوراوە کەچی لە ژمارە *3*-دا مارسی *1946* بە *1324/9/26* نووسراوە، کەبەگوێرەی ئەم ژمارەیەیان دەبێ لە *1945/12/16*دا بووبێت).

### *دەوڵەتی میللی کوردستان

ناوێکی تری دەوڵەتی کەکەم بەکارهێنراوە. پێشەوا لەوتاری ڕۆژی *1325/2/20*یدا باسی دەکاتو دەڵێ: "ئەوڕۆ دەوڵەتی میللی کوردستان زۆر بەهێزە...هتد"*16*، ڕەنگە هەروا وەك وەسف، ناوەکە لەسەرزار بووبێتو ناوی هێنابێ، نزیکیشە هەر مەبەستی حکوومەتی میللی کوردستان بووبێت. هەروەك جۆری تێکەڵیی هەردوو ناوە حکوومەتیو دەوڵەتییەکە، دەبێ ئەو جۆرە بەکارهێنانەش نائاسایی نەبووبێت، یان بێ لێکدانەوەی قووڵ بووبێت.

### *دەوڵەتی میللی دیموکراتی کوردستان.

ئەم ناوەش زۆر بەدەگمەن لەچاپەمەنییەکانی سەردەمەکەدا دەکەوێتە بەرچاو. ئەحمەدی عیلمی لەنوسینێکدا بەسەر باسی (زوڵمو ئەیستیعمار نەتیجەی بەکوێ دەگا)ئەو ناوەی تیا بەکارهێناوە.*17*

### *دەوڵەتی خودموختاری کوردستان:*18*

سەید محەمەد حەمیدی مدیرو سەردەبیری ڕۆژنامەی کوردستان لە وتارەکەیدا کەبەبۆنەی پێنەسپاردنی ئەم کارە ڕۆژنامەگەرییە، لەو کۆبوونەوەیەی بۆ ئەم مەبەستو کارە سازکرا، ئەم ناوەی بەکارهێناوە. زۆر دەگمەن ئەم ناوە بەبەرچاو دەکەوێ. بەکارهێنانی ئەم ناوەش لەکۆبوونەوەیەکی واداو لەلایەن لێپرسراوو ڕۆشنبیرێکی واوە جێگای سەرەنجە.

***جمهوری كوردستان( جەمهوریەتی كوردستان )**

لەناو سەرجەمی ناوە حكوومەتی و دەوڵەتییەكاندا، ئەم ناوە بەشێوەیەكی فراوان بەكارهێنراوەو زاڵ بووە بەسەر ناوەكانی تردا، زیاتریش لەوە جۆرێ لەڕەسمیی و یاسایی بوونیشی بەخۆوە گرتووە، سەبارەت بەگەڵێ هۆ لەوانە:

–زۆربەی زۆری وتاربێژانی رۆژی راگەیاندنی قازی محەمەد بەپێشەوای كوردستان و دامەزراندنی جەمهوریەتی كوردستان لەدووی رێبەنداندا(جمهوری كوردستان)یان (جەمهوریەتی كوردستان) بەزار گوتووەو لەرۆژنامەی كوردستان‌دا نووسراوە.*19*

–دیسان لەسەرجەمی ئەو ئاهەنگانەی بەم بۆنەوە سازكران، وتاربێژان هەر ئەم ناوەیان بەكارهێنا.

–لەو سوێندە مێژووییەی كەپێشەواو هەموو لێپرسراوو پێشمەرگەكان سوێندیان پێخوارد، ناوی قەوارەكەی بەجمهوری كوردستان "جەمهوریەتی كوردستان"براوەو نوسراوە.*20*

–لەتەواوی بەڵگەنامەكانی بەرگەكانی دەوڵەتی جمهوری كوردستاندا"جەمهوریەتی كوردستان"نوسراوە *21*

–لەپلەی یەكەمی ژیانی جمهورییەتەكەدا، لەرۆژنامەی كوردستان و گۆڤاری هەڵاڵەو كوردستان‌دا، زیاتر "جمهوری كوردستان" بەكارهاتووەو نووسراوە.

–نووسەران و شاعیران زیاتر "جمهوریەتی كوردستان"یان نووسیوە.*22*

یەكێ لەدیاردە سەرنجڕاكێشەكە لەبەكارهێنانی ئەم ناوە دەوڵەتییەدا ئەوەبوو كەدوای ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر جەمهوریەتی ئازەربایجاندا هات، دوای پێكهاتنەكەی لەگەڵ تاران– كەسێ دیاردەی: مۆركردنی پەیمانی نەوت، كێشانەوەی لەشكری سور، ئیمزاكردنی پێكهاتنەكەی تەورێز–تاران بەپلەی وەرچەرخانی دادەنێم، ئەم ناوەو ناوی سەرەك یان رەئیس جەمهوریەت زۆر كەم و بەدەگمەن بەكاردەهێنرا، بەتایبەتی دوای سێهەم دیاردە. لەمانگەكانی دوایی تەمەنی كۆماردا ئەم ناوەو هەموو ناوەكانی تر لەرۆژنامەو گۆڤاری كوردستان و هەڵاڵەدا بەكارنەدەهێنران یان دەگمەن بوو.

بەو جۆرە لەڕێڕەوی باسەکەدا دەردەکەوێ کەناوی (کۆماری دیمۆکراتی کوردستان)و (کۆماری کوردستان) لەسەردەمی جەمهوریەتی کوردستاندا لەدامەزراندنییەوە تاڕووخاندنی لەئارادا نەبون، لەناو ژمارەکانی رۆژنامەو گۆڤاری کوردستانو هەلاڵەدا بەکار نەهێنراونو نەنووسراون.

تەنانەت بۆ یەکجار چییە وەبەرچاو ناکەون، دیسان لەکۆی هەموو بەڵگەنامەکانی ناو بەرگەکانی دەوڵەتی جمهوری کوردستاندا ئەو دوو ناوە نابینرێنو هەرگیز بەکار نەهاتوون، بەڵکوو خودی وشەی (کۆمار) لە سەردەمی جەمهورییەتدا هەر بەکار نەهاتووە.دوای رووخانو بەسەرچوونی سەردەمەکە ئەو وشەیە هێنرایە ناو قاموسی سیاسی هاوپێوەند بەو جەمهورییەتەوە. کەوابوو وشەی کۆمار لەگەڵ وشەی دیمۆکرات یان نووساندنیان بەکوردستانەوە هەر لەئارادا نەبووە.

بۆیە ناوی (کۆماری دیمۆکراتی کوردستان) ئەسڵێکی مێژوویی نییە، سەپاندنی وەك ناوی مێژوویی، شێواندنی مێژووی ناوەکەیەو هەڵەیەکی زەقە. چونکە ناکرێ دوای زیاتر لەنیو سەدە لەو رووداوە مێژووییە خاوەن چەند ناوە، تازە بەتازە ناوێ دابتاشرێو بەمێژوویی دابنرێو داوا بکرێت کە بخرێتە جێگەی ناوە مێژووییەکان. دیارە ناوەکە وەك ناوی کتێبو بەرهەم، بۆ نوسینو ئاسایی ناوهێنانو بۆ خۆلادان لەوشەی بێگانە(کارێکی ئاساییەو هەموو کەس سەربەستەو ئازادە لەبەکارهێنانو نووسینی هەر ناوێکی تریشدا.

کەوابوو ناوی مێژووییو رەسەن هەر ئەو ناوانەن کەباسکران، لاشم وایە، لەبەر رووناکی باسەکە، شیاوو گونجاوتر لەناوی دەوڵەتیدا جمهوری کوردستان(جەمهوریەتی کوردستان)ە، دەکرێ (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)یش بەکاربهێنرێت.

بۆ ناوی حکوومەتیش"حکوومەتی میللی کوردستان" کەدەکرێ (حکوومەتی کوردستان)یش بەکاربهێنرێت.

دەمێنێتەوە چەند ناوێکی تر کەلەسەردەمەکەو دواتریش لەسەر زار بوون، لەوانە: دیمۆکرات، کۆمەڵە، جەمهوریەتی مەهاباد...هتد، ئەوانەش هەر یەکە چیرۆكو باسێکی تایبەتی خۆی هەیە.

دووەم:

*خودموختاری و سەربەخۆیی لەجەمهوریەتی کوردستاندا

خودموختار یان سەربەخۆبوونی جەمهوریەتی کوردستان باسێکی تری شێوێندراوو ئاڵۆزکراوە، سەبارەت بەگەلێ هۆ، لەوانە:

-ئاڵۆزی و تێکچڕژاویی بارودۆخەکە.

-یاری و مانۆڤری سیاسی زلهێزەکان و تاران.

-باش حاڵینەبوون لەکاروانی سیاسی و دیپلۆماسی ئەزموونەکەو سەرکردایەتی کوردو بازنەکانی دەوری و ئاستی مامەڵەی ناچار لەساتوکاتی پێویستدا.

-ئاسان حاڵینەبوون لەسیاسەت و هەڵوێست و قسەو وتاری پێشەوا، بەتایبەتی لەپلە جیاجیاکانی ناو پێچو پەنای وەرچەرخانە پڕ لەمەترسییەکان و رووداوە ئاڕاستەکراوەکاندا.

-باش ساغنەبوونەوە لەسەر ناوەڕۆک و بنەماو ماناو واتای خودموختاری و سەربەخۆیی و جۆری هەڵسەنگاندن و بەراوردیان لەگەڵ جەمهوریەتی کوردستاندا.

-باش حاڵینەبوون لە: مۆلەقەیی و هەڵواسراوی ئەزموونەکەی مەهاباد، بۆشایی و کەلێنی یاسایی و سیاسی، بێ ددانپێدانانی ناوچەیی و هەرێمی و نێو نەتەوەیی، وەنەبوونی هەلومەرجی دامەزراندنی لەبار بۆ جەمهورییەتێکی تەواو سەربەخۆ.

-باش حاڵینەبون لەهەڵوێستی روسەکان، ئازەرەکان، تاران و خواست و داوای هەریەکەیان.

-تێکەڵکردنی حەزو خواستی خۆو سۆزی خۆشەویستی، شەڕی سیاسی و کۆنەقین و ناکۆکی و ململانێی کۆن و نوێ و پێچانەوەیان لەناو باس و خواسی خودموختاری و سەربەخۆییداو گەلێکی تر...

زۆر لەشارەزاو نووسەران، بێ درێژەپێدان و چوونە ناو مەبەستی ساغکردنەوەی باسەکە، خودموختاریی جەمهورییەتەکەیان سەلماندووە، بەم لایەدا خۆیان ساغکردووەتەوەو گومانێکیان لەوە نییە. هەشە بەپێچەوانەوە بێئەوەی تا ئێستاش لێکۆڵینەوەو باسێکی تێروتەسەل و سەلمێنەر کرابێ، یان بڵاوکرابێتەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هۆیەکی گرینگی تری ئەو شێواندنەیە.

لاشم وایە هیچ لێکۆڵینەوەیەك ساغکەرەوەو سەلمێنراو نابێت تا ئەو خاڵانەی سەرەوەو ئەم لایەنانەی خوارەوە روون و یەکالآ نەکرێنەوەو بەگشتی تابلۆیەکی سەرجەمی بارودۆخ و هەلومەرجەکانیان لێ وێنەگیر نەکرێ:

یەکەم) کوردو جەمهورییەتەکەی و لایەنەخۆییەکان و هاوپێوەندییان بەرووداوەکانەوەو بۆچوونی هەر لایەك و ڕادەی دوورو نزیکیان لەواقیعەکەوە:

-لایەنی ڕەسمی: لەناو مامەڵەی حکوومەتەکەدا، راو بۆچوونی سەرەك جەمهور کە سیاسەت و ئامانجەکان بەرانبەر بەلایەنەکانی هاوپێوەندو چارەنووسساز بەئەزموونەکە دەردەخەن.

-نووسەرو شاعیران بە تایبەتی و جەماوەری کورد بەگشتی.

-ئاستی ئامادەیی کورد لەو مەڵبەندە بچووکەدا بۆ کارێکی وا گەورە.

دووهەم) تاران و هەڵوێستی بەرامبەر بەجەمهوریەتی کوردستان و نەخشەو ستراتیژی.

سێهەم) کۆماری ئازەربایجان وراستیی هەڵوێستیی بەرانبەر بەجەمهوریەتەکە، بەتایبەتی نەخشەو کاریان، گرفتی سنوورو ناوچە تێکەڵەکان.

چوارهەم)یەکێتی سۆڤێت و سیاسەتی بەرامبەر کورد، هەڵوێستی لەسەربەخۆیی کۆمارەکە بەپێی نەخشەکانی بۆ ئێران و ئاییندەی ناوچەکە.

پێنجهەم) بریتانیا و ئەمریکا و هاوکارییان لەگەڵ تاران، نەخشەیان بەرامبەر بەکوردو ئازەرەکان، هەروەها دەوڵەتی تورکیا و عیراق و ڕۆڵیان لەهاوکاری و پیلاندا لەدژی کوردو کۆمارە ساواکەی.

شەشهەم) باری جیۆپۆلیتیکی کوردستان و رۆڵی لەخوڵقاندنی کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم خواستیی سەربەخۆییدا.

حەوتەم)لایەنی ئابووری و نەبوونی جێپێگەی خوڵقاندنی ئابوورییەکی زەمینە پتەو کەدەوڵەتی سەربەخۆی لەسەر دابمەزرێ و بەردەوام بێت.

ئەوانەی لەسەر سەربەخۆبوونی جەمهوریەتی کوردستان ساغبوونەتەوەو ئامادەنین هیچ بووچوونێکی تر گوێ لێبگرن، سەبارەت بەچەند بنەماو دیاردەیەکی ئەو قەوارەیەیەکە کراونەتە بەڵگەی سەلمێنەری بۆچوونەکەیان، ئەگەر روناکیی

بخرێتە سەر ئەو بنەماو هۆکارانەی دەبنە سەرچاوەی ئەو جۆرە بیروبۆچوونانە، وا لەمانەدا دەبینرێنەوە:

–بوونی بیرو ئامانجی سەربەخۆیی لەمێشکی زۆربەی خەڵکی کورددا، بەتایبەتی خوێندەوارو رۆشنبیران و ئینجا یەکێ لەراسپاردە گرینگەکانی کۆبونەوە بیست هەزار نەفەرییەکەی دووی رێبەندان:(لەو جێگایانەدا کەئێستا کوردی تێدا دەژین باستقلالی تەواو بگا.)(*23*)

–دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییەکی خۆماڵی ئازاد لەدەستێوەردانی رژێمی داگیرکەر، بەناوی جەمهوریەتی کوردستان، هەڵبژاردنی سەرەك کۆمار، دامەزراندنی وەزارەتی هێزی دێمۆکراتی کوردستان، دارشتنی ستروکتوری سپایی و ئیداری.

–هەڵکردنی ئاڵای سێ رەنگی کوردستان، بوونی ئارم و تابلۆ، مۆسیقا و سرودی میللی و رێورەسمی سەردان و یادو پێشوازیی جێژنە نەتەوەیی و ئایینییەکان.

–نەمانی شوێنەواری دامودەزگا و ئەرتەشی داگیرکەرو زوڵم و زۆرو چەوساندنەوە.

–بووژانەوەی کولتوورو ئەدەب و زمانی کوردیی، بوونی میدیای ئازاد تاڕادەیەك(رادیۆورۆژنامەو گۆڤار...)

–سەربەستیی نوسین و قسەو هاتوچۆو کردنەوەی قوتابخانەو خوێندن بەزمانی کوردی.

–مامەڵەی دیپلۆماسی لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان و تاڕادەیەکیش یەکێتی سۆڤێت، گفتوگۆکردن لەگەڵ تاران وەك لایەنێکی خاوەن ئامانجی دوور لەزۆرکاری و فەرمانی داگیرکەرانەی رژێم.

–مامەڵە لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستان و بوونی هێزێکی گرینگ کەلەکوردستانی عیراقەوە گەیشتبوونە ناوچەکە.*24*

–بەکارهێنانی زاراوەی سەربەخۆیی، استقلالی تام و تەمام، سەربەخۆیی و یەکخستنەوەی کوردستان و.. لەلایەن پێشەواو لێپرسراوانی ترو رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان و بڵاوکراوەکانی تر، دیسان لەوتارو نوتقدا، بەتایبەتی لەپلەی یەکەمی مێژووی جەمهوریەتی کوردستاندا.

لێرەدا دەکرێ بپرسین ئایا ئەوانە بەس بوون بۆ سەربەخۆبوونی قەوارەکە؟ سەربەخۆ بەمانای وشە، واتە جیابوونەوە لەلەشی ئێران و پچڕاندنی هەموو جۆرە

پێوەندییەکی داگیرکەرانەو ژیانی ناو سنووری ئێران لەڕووی بەڕێوەبردن، جوگرافی، سیاسی و یاساییەوە.. جگە لەوە، لاخستنی هەڵوێست و بڕیاری لاکانی هاوپێوەند بەسەربەخۆیی جەمهوریەتی کوردستان، کەلەڕاستیدا خاوەن و سەرچاوەی بڕیاری چارنووسساز بوون، نەکە هەر بۆ کورد، بەڵکوو بۆ کۆی مەسەلەکانی هاوپێوەند بەئێران و ناوچەکەوە، مانای تێنەگەیشتن لەماناو هەلومەرج و پێداویستییەکانی بوونی جەمهورییەتێکی تەواو سەربەخۆیە.

مانای دوورییە لەزانیارییەکانی هاوپێوەند بەبوونی چەندین دەوڵەت و وڵاتی فرەنەتەوە لەشێوەی فیدراڵی و کۆنفیدراڵیدا کەهەریەکەیان چەندین قەوارەو کۆماری خاوەن هەلومەرج و دیاردەی وەکوو بوونی سەرەك کۆمار، ئەنجومەنی وەزیران، ئاڵاو ئارم تا ئەندامەتی *UN* بووە بەپێناسەی یاسایی ناوخۆو هەرێمیشەوە، کەپێناسەی ناو دەوڵەتیش دەگرێتەوە، کەئەگەر لەوانەی ناو جەمهوریەتی کوردستان زیاترنەبووبن وا کەمتر نەبوون. رووخانی یەکێتی سۆڤێت، کەلای لاوازی دێموکراسی و لای سەقامگیریی هێزی داپلۆسەری دیکتاتۆری یەك چینی بوو، بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی تردا بۆمان دەردەخات کەجەمهوریەتەکانی ناو سنورەکەی لەچی ئاستێکدا بوون، چونکە بەڕووخاندنەکە هەر یەکە وەك دەوڵەتی سەربەخۆ، بەبوونی زۆر لەهەلومەرجە گرینگەکانییەوە، هاتنەئاراوە، تەنها پێناسەی نێودەوڵەتیان گەرەك بوو کەزۆر ئاسان دەستیان کەوت،دیارە لەڕووی یاسایی و سیاسییەوە، بۆیە ئەودەوڵەتەشم بەنموونە هێنایەوە تا دیمەنی هەلومەرجی دامەزراندنی جەمهورییەتەکەو هێندێ دیاردەی وەکوو ناوو ئارم، کەنامۆ نەبوون بەو کۆمارانەی ناو یەکێتی سۆڤێت، بهێنرێنە بەرچاو. یوگوسلاڤیاش نموونەیەکی ترە بۆ ئەو بۆچوونە.

ئەگەر وردتر سەرنج بخەینە سەر ئەو لایەنانەی رەخساندنی هەلومەرجی سەربەخۆییان پێوەبەسترابوو، ناوچەیی و هەرێمی و نێونەتەوەیی، جگە لەلای بەرامبەر کەکورد خۆی بوو، وا تابلۆ سیاسییەکە بەمجۆرە دێتە بەرچاو:

-رژێمی تاران، راستەوخۆ لەدژی جەمهورییەت و سەربەخۆیی نەتەوەی کوردو هەموو جۆرە مافێکی نەتەوایەتی و دێموکراسی و مرۆڤی بووە...

-دەوڵەتانی تری سەرسنوور، تورکیاو عیراق، راستەوخۆ دژبوون، باری جیۆپۆلیتیکیان تەواو دژوارترکردبوو، هاوکارییان بۆ رووخاندنی جەمهوریەتی کوردستان دەکرد، پەیمانی سەعد ئاباد(*1397*) بەڵگەیەکی ئەو بۆچونەیە.

-ئەمریکاو ئینگلیز راستەوخۆ لەدژی جەمهوریەتی کورد بوون، نەك هەر لەبەر سەربەخۆیی، بەڵکوو وەك خودموختاریش، بۆیە بەهەموو جۆرێ لەگەڵ رژێمدا بوون.

-ئازەربایجان یەکەم دۆستی ستراتیجیو هاوچارەنووس بوو، هەرچەند لەمامەڵەی ئاشکرایدا دۆستی یارمەتیدەر بوو، بەڵام گەرەکی بوو کوردستان بەپاشکۆی خۆیەوە ببەستێتەوە، هەر وەك بەشێك لەئازەربایجان سەیری دەکرد.

-یەکێتی سۆڤێت، لەدژی سەربەخۆیی بوو، بگرە کارێکی واشی نەکرد کەوەك خودموختاریش بمێنێتەوە، لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا ئامادەی هەموو جۆرە هاوکارییەك بوو لەگەڵ تاراندا، بۆیە لەئاکامی مانۆڤرە سیاسییەکەی، لەپێناوی ئەوتدا، سێ ستراتێجی خنکێنەری بەسەر سەرکردایەتی کورددا سەپاندبوو، مەبەستم: ستراتێجی بەرگریو نەجوولان، ستراتێجی گفتوگۆو نەرمو نیانی لەبەرانبەر تاران، سێیەمیش: دروشمو ئامانجی خودموختاریو مانەوە لەناو ئێراندا لەهەر بارودۆخێکدا بێت.هەروەك لە شوێنی خۆشیدا رووناکیی خراوەتە سەر راپۆرتی کۆنسوڵەکانی سۆڤیەت لەناوچەکە، کە زۆر بەروونی بەنوێنەرانی ژ.ك یان گوتووە کە ئێران دۆستیانە،ئەوەشی دەرخست کە لایەنگری ئێرانن نەك کورد چونکە کوردیان هەر بۆ گەمە سیاسییەکە دەویست..

بۆیە هەموو زلهێزەکانو تاران لەچەندین پەیمانو رێککەوتنو کۆبوونەوەدا بریاریان دابوو کە: ((رێزلەیەکێتی ئەرزو حاکمیەتو سەربەخۆیی ئێران بگرن. پەیمانێ نەبەستن زەرەری یەکێتی حاکمیەتو سەربەخۆیی سیاسی ئێرانی تێدابێ. کارێ نەکەن زیان لەو یەکێتییەی ئێران بدات، دوای شەش مانگ لەبرانەوەی جەنگ ئێران چۆڵ بکەن.))*25*

سەرەرای هەموو ئەمانە جەمهوریەتی کوردستان هیچ کاتێ بەنامەو یادداشت داخوازی جیابوونەوە لەئێرانو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆو ئازادی ئاراستەی تاران، مۆسکۆ،زلهێزەکانی ترو *UN*نەکردبوو، بە رەسمی داوای ددانپێدانانو پێناسینو پێوەندیی دیپلۆماسی نەکرد، بەڵکوو تەواوی تەقەلای لەسەر ئەوە چڕ

کردبوو کە وەك حکوومەتێکی خودموختاری خوڵقاوی ناو بارو هەلێکی سیاسی، پێناسینی یاساییشی بۆ بخوڵقێ. تەنانەت ئەو رستەیەی کەلە بەرنامەکەی د.ك دا دانرا بوو، کەهەوڵدانە بۆ هاوبەشیی کردن لەکۆبوونەوەی دەوڵەتان، بیر لەجێبەجێکردنی نەکرایەوە.

## جەمهوریەتی کوردستان خودموختار بوو

پێش ئەوەی لەناو کرۆنۆلۆجی وتارو دیدەنیی رۆژنامەو پرۆتۆکۆڵی پەیمان و نوسینەکانی(ڕ.ك)و بەڵگەنامە سەلمێنەرەکانی خودموختاربوونی جەمهورییەتی کوردستان بچینە ناو سەلماندنی خودموختاریبونی جەمهوریەتی کوردستان، باش وایە لەوەبگەین و بزانین بیری "خودموختاری)ومەبەستی"سەربەخۆیی" لەناوچەکەدا چۆن پەیدا بوون و لەکوێوەسەریان دەرهێنا...

لەپێش دامەزراندنی جەمهورییەتی کوردستان و حزبی دێمۆکرات و بگرە کۆمەڵەی (ژ.ك)یشدا، بیرو دروشمی سەربەخۆیی کوردستان لای خوێندەوارو بەشێك لەخەڵکی شارو رابەڕو سەرکردەکانی کورد جێگەی خۆی گرتبوو... تا ئەو سەردەمە ئامانجی سەرجەمی راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد هەر سەربەخۆیی بوە...

بەڵام لەو پلەیەی سەردەمی داگیرکردنی ئێراندا، لەو بەشەی رۆژهەڵاتی کوردستان، بیری دامەزراندنی قەوارەیەکی خودموختار هاتەئاراوەو زیاتر لەڕووسەکانەوە دەستپێشخەری کرا. هەرچەندە ریشەی بیری خودموختاریی، بۆ کورد، دەگەڕێتەوە بۆ سالانی *1918-1924*، دوای یەکەم جەنگی جیهانی، ئینگلیزەکان، لەسەرەتادا دەیانویست کوردی باشووری کوردستان بەوە رازی بکەن تا دەستبەرداری سەربەخۆیی بێت، بۆیە مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمودی نەمریان بەزۆری هێز رووخاند. لەدواییدا لەوەش پەشیمان بوونەوە کە حکومەتی تایبەتی خۆی لەناووڵات و دەوڵەت وسنوری جوگرافییە بەزۆر دروستکراوەکەدا هەبێت، ئیتر رووسەکان و ئازەرەکان، وەك بڕیارێکی سەقامگیر، سووربوون لەسەر ئەوەو، کوردیشیان پێ ڕازی کردبوو، بەڵام بەلای گەورەی سەرەتا ئەوەبو کە دەویسترا کورد بە ئازەربایجانەوە ببەستنەوە. بۆیە کەوتنە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی لەو جۆرە.

پێشەوا قازی محەمەد ئاماژە بۆ بوونو دامەزراندنی ئەو قەوارە خودموختارە تەمەن چوارساڵییە دەکات کەلەپێش دامەزراندنی جەمهورییەتەکەدا پێکهێنرابوو بێئەوەی ئاوڕی لێبدرێتەوەو یارمەتیی بدرێت، وەك لەدواییدا ئاماژەی بۆ دەکەم، دیارە رووسەکان نمونەی کۆمارەکانی ناو سنووری یەکێتی سۆڤیەتیان بۆئازەربایجان دەخواست، ئەوەبوو دوای بگرەو بەردەیەکی زۆر لەناو جەختو سووربوونی یەکلایەنەی کورد خۆیدا... بۆ ئەمیش ڕەخسا. بەڵام لەڕووی پراکتیکو یارمەتیو نەخشەی سیاسی جۆرێکی تر بوو، ئەو خودموختارییە سەبارەت بەو هەلومەرجانە، هەر لەسەرەتاوە کرا بە ئامانجی حزبی دێمۆکرات، لەجێگەی ئامانجەکەی (ژ.ك) کەسەربەخۆیی هەموو کورد بوو.

لەسەفەری دووەمی وەفدەکەی کورددا بۆ باکۆ(سێپتامبری *1945*)، جەعفەر باقرۆف سەرەك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت، زۆر هەوڵیدا لەناو کۆماری خودموختاری ئازەربایجاندا، کورد بەخودموختار رازی بێت، بۆ ئەوە نموونەی ژیانی گەلو نەتەوەکانی ناو سۆڤیەتی بۆ باس کردن*26*...

بێ ئەوەی ناوبراو بتوانێت نوێنەرانی کورد بەوە رازی بکات، کورد سووربوو لەسەر سەربەخۆیی بۆ کوردستان... کەمەبەست لەوە سەربەخۆیی بوو لەئازەربایجانو قایلبوون بو بەخودموختاریی لەناو ئێراندا، هەر وەك خودموختارییەکەی ئازەربایجان. لەدواییدا لەناو قسەو وتارەکانی سەرەك کۆماردا دێمەوە سەر ئەم لایەنە. بەڵام ئازەرەکان لەهەردوو دیوی سنوور، بەکردەوە خواستی خۆیان دەسەپاند، چونکە کوردیان ئەوقی کۆماری ئازەربایجان کردبوو، لەڕووی ئابووریویارمەتی چەكو لایەنی سیاسیو گفتوگۆو هاتووچۆوە، بەرانبەر بەوە لەڕووی قسەو هەڵوێستی سیاسییەوە کوردیش سوور بوو لەسەر ئەو سەربەخۆییە تاسەردەمی وەرچەرخان..

راستییە هەڵهێنجراوەکان.

لام وایە زیادەڕەوی نابێت ئەگەر بڵێم پێشەوا قازی محەمەد، وەك یەکەم لێپرسراوی سیاسیو سەربازیی، شارەزاو ئاگادارکراو لەهەندێ لایەنی نهێنی، تێگەیشتوو لەگەڵ گرفتو کۆسپو لەڕەوتی ڕووداوەکانو هەندێ لایەنی مانۆڤرە سیاسیو سەربازییەکان..دیپلۆماسییانە دەجووڵاو مامەڵەی دەکرد. لەساتی گۆڕانو

وەرچەرخاندنە بەزیانەکاندا، لەکاتی پێویستدا، پاشەکشەی ناچارو سەپاوی دەکرد، هەڵوێستی خۆسازدانی بەناچاری وەردەگرت، زیرەکانە دژەکرداری بەرامبەر هەنگاوی خراپی دۆستە هاوپەیمانەکە ئاشکرا دەکرد... وردەکاریی وشەو رستەکانی ناو وتارەکانی گەڵێ مەسەلەی هاوپێوەند بەوانەو بەو خودموختاری و سەربەخۆییەوە روونەدەکەنەوە... لەڕاستیشدا هەندێ لەو ڕستانەی هاوپێوەند بەو باسەوەن، جۆرە تێهەڵکێشی و تێکەڵاوییەکیان تێدا هەیە کەهەڵێنجانی مەبەست لێیان ئاسان نییە.

بۆ پەنابردنە بەر بەڵگەنامەو هەڵوێست و قسەو وتاری لێپرسراوان، بۆ سەلماندنی خودموختاری بوونی جەمهووریەتی کوردستان، باشتروایە لەحزبی دیمۆکراتی کوردستانەوە دەستپێبکەین کە، تەنها چەند مانگێك پێش بڵاوکردنەوەی دامەزراندنی جەمهووریەتی کوردستان، پێکهێنراو(16ی ئاگوستی 1945) بووە رابەرو دامەزرێنەری ئەو قەوارەیە(22-جانیوەری1946)

-لەڕاگەیاندنی دامەزراندنی حزبەکەدا ئامانجەکەی وا دارێژرابوو:

"نەتەوەی کورد لەداخلی ئێراندا بو هەلسوڕاندنی کاروباری مەحەللی خوی خودموختاری خوی بخاتە دەست خۆیەوە"

-بەرەبەرەش ئەو ئامانجی خودموختارییە لەناو سنووری ئێراندا بەرەو سەقامگیربوون دەچوو، تالەبەرنامەکەشیدا بەمجۆرە دەستنیشان کرا:

بەندی دووەم-ئامانجی گەورەی حزب لەقۆناغی ئێستادا پارێزگارکردنی مافەکانی خەڵکی کوردە لەسنوری دەوڵەتی ئێراندا وەمسۆگەر کردن و بەدەستهێنانی دەبێت لەهەموو ئەو ناوچانەدا کەبەدرێژایی مێژوو تیایا ژیاوەو زەحمەتی کێشاوە خودموختاری خۆی هەبیت ئەبی لەکوردستاندا دیموکراتیەت لەبنچینەدا بۆ دەستکەوتی خەلك بیت...هتد"27

بەو جۆرە ئامانجی حزبەکە بەڕوونی و بێ تەمومژ دەستنیشان کراوە...

لێرەوە تا ئەو کاتەی جەمهورییەت دامەزرێنرا، هیچ جۆرە گۆڕانێك بەسەر ئەو ئامانجەی حزبەکەدا نەهات و نەکرا. سەلمێنەری ئەو بۆچوونەش، ئەو دیداری رۆژنامەنووسییەیە کەخاوەنانی رۆژنامەی (ایران ما)و(فرمان)ی تارانی لەگەڵ پێشەوادا ئەنجامیان‌دا...کاتێ لێی دەپرسن:(لەتاران دەلێن کوردان بەرەهبەری جەنابت جوی بوونەوەو استقلالی کوردستانیان دەوێ! ایا راستە؟" لەوەڵامدا :(خێر

راست نیە، لەبەرئەوەی کە ایمە لەدەولەتی ایران اجرای قانونی اساسیمان دەوی‌و دەمانەوی بەخودموختاری لەژیر بەیداغی ایراندا بژین‌و خودموختاریشمان وەگیرکەوتووە."

پ: چەند وەختە ئەنگو خودموختارن؟

و:چوار ساڵە خودموختاری داخلیمان هەیە...*28*

تائیرە، ئەوەی پەیوەندیی بەسەرکردایەتی حزب‌و کۆمارەوە هەیە، ئەوەی ناوی سەربەخۆییە لەئێران، ئەوەی ناوی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانە، نەباسکراوە، نەبیری لێکراوەتەوە، بەڵکوو بەدرۆش خراوەتەوە، بۆیە لەبەردەم خۆئاماکادەکردن بۆ بڵاوکردنەوەی دامەزراندنی ج.ك هیچ جۆرە گۆڕانێك نەکراو نەهاتە ئاراوە، بەڵام وەك بیرو وەك ئامانج لەمێشکی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەراندا هەبووەو دەگەشایەوە.

لەدامەزراندنی جەمهووریەتی کوردستاندا ئەگەر بڕیاری سەربەخۆیی درابایە، وادەبوو پێشەکی(ح.د.ك) پرۆگرامەکەی بگۆڕیبایە، یان دەبوو دوای ئەوە ئەو گۆڕانە بکرابایە، یاخود لەدووی ڕێبەنداندا سەرەك کۆمار بلاوی بکردایەتەوە، یان لەو رۆژەدا بڵاودەکرایەوە، وە یا رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان تۆماریان دەکرد. جگە لەوە، ئەو سوێندەی لەو رۆژەدا لەبەردەم (قورئانی مقدس‌و نقشە والای کوردستان)دا پیشەواو هەموو لێپرسراوان‌و ئامادەبووان سوێندیان پێخوارد... جۆرێ لەڕاگرتنی بەڵانسی سیاسی لەگەڵ ئازەربایجاندا وەبەرچاو دەگرێ کەبەمجۆرە بوو:

(ئەمن بەخودا، بەکەلامی عەزیمی خودا، بەنیشتمان‌و بەشەرافەتی ملی کورد، بە الای مقدسی کوردستان سویند دەخوم کەتا اخر هەناسەی ژیانم‌و رژاندنی اخر تنوکی خوینم بەگیان‌و بەمال لەری راگرتنی سەربەخۆیی‌و بەرزکردنەوەی الای کوردستاندا تی بکوشم‌و نسبت بەرئیسی جمهوری کوردستان‌و یەکەتی کوردو ازەربایجان متیع و وەفادار بم)*29*

لەبەرامبەر ئەو سەربەخۆییە-دیارە لەئازەربایجان-ئەو "یەکیەتی‌و موتیعی‌و وەفادارییە" بۆ راگرتنی بەلانسەکە پێویست‌و گرینگ بوو.چونکە ئازەرەکان بەردەوام خواستی خۆیان لەمەبەستەکەیان بەرامبەر بەکورد نەدەشاردەوە، ئەوەی سەرکردایەتی کوردی ناچار دەکرد بۆ ئەو جۆرە بەلانس راگرتنە، بەو جۆرە رستەو

زاراوانە، بەستنەوەی کۆمارەکە بوو بە ئازەربایجانەوە، نەك هەر لەڕوی ئابورییەوە بەڵکو لەڕووی سیاسیشەوە، چونکە رووسەکان زیاترو راستەوخۆ مامەڵەی تەوریزیان دەکرد ئەمەش بووە هۆی ئەوە کەپێشەوا لەهەندێ بۆنەی تردا قسە لەسەر ئەو جۆرە کێشەو دیاردەو لەو جۆرە بابەتە بکات. بەرامبەر بەوە سەرکردایەتی ئازەربایجان بێگوێدان بەوانەو بەردەوامیش لەناو قسەو کرداردا، گوشاری خۆیان دەخستە سەر سەرکردایەتی کورد.. هەر لێرەشەوە، وەدوای ئەو سووربوونە، پێشەوا ناچار بوو کەئەو راستی هەڵوێستو خواستەی کۆماری ئازەربایجان بەئاشکرا بەجەماوەر بگەیەنێتو بەڕوونی باسی سەربەخۆو ئیستیقلالی کوردستان لەئازەربایجان بکات، لێرەدا تەنها دوای دە ڕۆژ لەبڵاوکردنەوەی دامەزراندنی جەمهورییەت وە لەجێژنو بانگهێشتنی جەعفەر کەریمی بەبۆنەی سەربەخۆیی و ناساندنی پێشەوای کوردستان(*12ی ڕێبەندانی 1324*)لەناو وتارەکەیدا پێشەوا بەمجۆرە پەنجە بۆ ئەو مەسەلە سیاسییە درێژ دەکات:

"...ئەورو کە استقلالمان دەوی پیویستە کەهەموو کاریك خومان جیبەجی بکەین اولی ادعای خومان کرد کەلەحدودی دەولەتی ایراندا خودموختاریمان دەوی یانی ایران احتیاجی مە رفع بکاو ملت کاری بکا.

دوو دفعە لەلایەن ازربایجانەوە بو تەوریزیان بانگ کردم کەلەازربایجاندا گریمان هەبی ئەمن پیشنهادی وانم قبول نەکرد چون ملتی کورد چوار سالە کەخودموختارەو داوای استقلالو تیك خستنەوەی تەواوی خاکی کوردستان دەکا. زورم پی گران بوو کەلەو حقەی دەست هەلبگیریو احساساتی ئیوە مانعی ئەوەی بو کەایمە بەخودموختاری راضی بین چونکو کە مدەی ئەو چەند رۆژەی کەجیژن گیراوە احساساتیکی ایوە نواندوتانە وینەییکی حساسو کاملە دەبی دنیا بزانی کە کورد لیاقتی استقلالو سەربەخویی هەیە."*30*

لێرەدا خواستو چاوتێبڕینو گوشاری ئازەرەکان بۆگرێدانی کورد بەخۆیانەوە دیارە، بەرامبەر بەوە پێشەوا سوربووە لەسەر سەربەخۆیی، لێرەدا واتەی سەربەخۆییو سەربەخۆبوون... روونە، چونکە راستەوخۆ قسەکەی بەرامبەر ئازەربایجانو داواکەیتی، خۆ ئەوەش دەزانین کەئازەربایجان خودموختار بووەو داوای سەربەخۆیی نەکردووە، کوردیش لەو سەروبەندەدا خۆی بەهاودەردو شەریکی

ئازەرەكان زانیوە. كاتێ باسی خودموختاری لەناو ئێراندا دەكات، هیچ جۆرە دژایەتییەك، ئەلترناتیفێك یاگۆڕانێك باس ناكات، ئەمەش هەر نكوڵی نەكردنە لەو خودموختارییە. كەباسی یەكخستنەوەی تەواوی خاكی كوردستان دەكات... لەبەر ئەوەی خودموختارییەكەی رەتنەكردووەتەوە. دەكرێت هەر بەڕۆژهەڵاتی كوردستان دابنرێت. بەتایبەتی لەوتارەكانی ئاییندەیدا ئەو راوبۆچوونانە زیاتر جەخت لەسەر دەكات، دەبێ ئەوەش لەبەرچاوبێ كە.. دیاردەیەكی گرینگ لەوتارەكانی پێشەوادا بۆ تێگەیشتنیان، ئەوەیە كەدەبێ ورد سەرنج بدرێتە پاش و پێشی ئەو رستانەی(سەربەخۆیی)و (استقلالی تام و تەمامی)تیا بەكارهاتووە، سەرنجی كۆی وتارو نوتقەكان بدرێ. ئینجا دەبێ بەوردی لەبارودۆخ و رەوتی رووداوەكان و هۆی قسەونوتقەكانی بگەین، ئەوسا لەمەبەستی سەرەكی و مانای رستەكانی دەگەین.

یەكێ لەڕووداوە هەستیارو گرینگەكانی ئەو پلەیەی مێژووی تەمەن كەمتر لە یەكساڵەی جمهوریەتی كوردستان، بەستنی پەیمانی برایەتی و یەكیەتی نێوان كوردستان وئازەربایجان بوو كەتیایا خۆبەستنەوەی كۆمار بەسنووری ئێرانەوە زۆر بەڕوونی لەدیباجەی پەیمانەكەدا جەخت لەسەر دەكات:

متنی پیمانی یەكەتیو برایەتی حكومەتی ملی كوردستان و ازربایجان".

((چونكە ملتی ازربایجان و كوردستان و هەمو كاتیك لەقازانج و زیاندا پیكەوە شریك بوون و لەعینی حالیشدا...هتد).

ئینجا بەمجۆرە هاوپێوەندی لەگەڵ ئێراندا باس دەكات:

"ئەو دو ملتە برایانە نەك هەر بو جیكردنەوەی آزادی خویان بەلكو بو دامەزراندنی ازادی لەسەرتاسەری ایران بو هەمو وەختیكی دەستیان داوەتە دەستی یەكدی جا لەبەرئەوە لەرۆژی سی شەممو 3ی بانەمەری *1325* ساتی 5ی ایواری لەشاری تەوریز لەعمارتی ملی ازربایجان بە حزوری سەرانی حكومەتی ملی كوردستان...

رئیسی حكومەتی ملی كوردستان جنابی قازی محمد...هتد)). *31*

دیارە ئەگەر جەمهوریيەتی كوردستان سەربەخۆ بوایە، خۆی نەدەبەستەوە بەئازادیی سەرتاسەری ئێران، ئەم خۆ بەستنەوەیەش مانای رازی بوون بووە بەوخودموختارییەی بڕوای پێی هەبووە، كەتەواو دوور بووە لەسەربەخۆیی ئەو

بەشەی رۆژهەڵاتی کوردستان. دیارە مەبەستم سەربەخۆیی تەواوە لە ئێران و جیابوونەوەیە لەوڵات و دەوڵەت، ئەوەش مانای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتیی ئازادە لەهەموو روویەکەوە.

کەمتر لەسێ هەفتە دوای ئەو پەیمانە، لەکۆبوونەوەی *1325/2/21*دا جارێکی تر بۆچوونی تایبەتی پێشەوا بۆ(سەربەخۆیی)یەکە لەو وتارەی ئەو رۆژەیدا بەمجۆرە دەردەخات:

".. دەنا لەپاش ئەوەی کەئەمە استقلالی تام و تەمامی خوشمان بەدەست هینابو وەلی لەحکومەتی مەرکەزی مەعلوم بکەین و بەدنیایەش نیشان بدەین کەئەمە کە ئەو کارانەمان کردوە لەبەر مەخالەفەت لەگەڵ دەستگای دیکتاتوریە نەئینکی کورد لەبرایەتی فارسان حاشا بکا یا بە ایرانیەتی خوی افتخار نەکا...."*32*

حاشا نەکردنی کورد لەبرایەتی فارسان، ئیفتیخارکردنی کورد بەئێرانییەتی خۆی، تەواو دوورو پێچەوانەی سەربەخۆیی بوونە، رستەی "ئەمە استقلالی تام و تەمامی خوشمان بەدەست هینا" لەگەڵ ئەوانەدا نەك هەر یەك ناگرنەوە بەڵکو تەواو دژ بەیەکن، ئەگەر مەبەست لەو رستەیە بەسەربەخۆبوون لەئێران دابنرێت . بۆیەو لام وایە کە مەبەست لەوە هەر سەربەخۆبوون بووە لەئازەربایجان.. چونکە ناکرێ پێشەوا لەیەك وتاردا بۆ یەك مەبەست لەچەند رستەیەکی پێکەوە بەستراودا، دوو بیرو دوو واتاو دوو رستەی تەواو دژ بەیەك کۆبکاتەوە.

هێنانەوەی ئەو نموونانە بۆ سەلماندنی خودموختاربوونی جەمهورییەتی کوردستان، تەنها بۆروونکردنەوەی حەقیقەتی ئەو قەوارەیەیە کەهەبووە.

دیسان قسە لەسەر سەربەخۆ نەبوونی کۆمارەکە لەئێران هەر بەو نیازەیە، نەك بۆ مەبەستێکی تری پێچەوانە کەگوایا لابردنی دروشمی سەربەخۆیی و جێگیرکردنی خودموختاری، نابەجێ و ناڕەوا بووە! چونکە لەو سەردەمەدا، وەلەناو ئەو بازنەی کێشەو ئاڵۆزیانەی دەوری قەوارەکەی کوردیان دابوو.. هەر دەتوانرا ئەوە بکرایەو هەر بۆ ئەو ئامانجە خەبات بکرابایە. بۆ بەردەوامی تێکۆشان بۆ چەسپاندنی ئەو خودموختارییە، لەناو کێشەکانی بەردەمی جەمهورییەتەکەو تێگەیشتن لەئاڵۆزییەکانی نێو دەوڵەتان کەڕاستەوخۆ کاریان لەسەر ڕەوت و پاشەڕۆژی دەکرد.

پێشەوا هەوڵی لابەلاكردنی ئەو كۆسپانەی دەدا كەدەهاتنە بەردەم سیاسەت‌و دیپلۆماسییەتی هاوپێوەند بەو ڕێبازەوە... تێگەیشتنی ئەو كۆسپانەو ڕێگەی خۆلادان لێیان لەم نامەیەی سەرەك كۆماردا باش یەكالادەبنەوە كەدەیەوێ كاربەدەستانی كوردی لێ حاڵی بكات:

*1325/4/13*"

اغای فرماندەی هیزی بوكان‌و منتقەی سرا

وەجواب نامە ژمارە *1325-3-10/471*

هەر كاریكی جزئی ئەلان دەبی لەگەل ئەوزاعی بین المللی تتبیق بكری چە جای كاری مە كە كلیە لە بو ئەوەی ئەمە مجبورین لەری صلحەوە تاممكن بی ناتوانین بەری‌دی‌دا بروین، ئەو تاخیرە ای وەیە دەنا ئەمن لەتو بەپەلەترم....*33*

بەو جۆرە پیشەوا قازی محەمەد لەگرێ‌وگۆڵی ناوو چواردەوری جەمهورییەتی كوردستان گەیشتبوو..دەیزانی كەكارە بچووك‌و گەورەكان ئەوقی بارودۆخی نێودەوڵەتان كراون، كێشەی كورد گشتیی بووە، دابڕاوو بێ پێوەندی نەبووە، بەستراوەی بەرژەوەندییەكانی زلهێزی خاوەن بڕیار بووە مەبەستم یەكێتی سۆڤیەتە. بۆیە بەڕێگەی گفتوگۆ بۆ خودموختاری لەناو سنووری جوگرافی‌و ساسیی ئێراندا خەباتی خۆی درێژە پێداوە... كەشەڕوپێكدادان روویداوە، نەترس‌وئازایانە هەڵوێستی خۆی‌و لەسەر حەقبوونی هێزی جەمهورییەتی كوردستانی ئاشكراكردووە، بە ئامادەبوونەوە بۆ ڕاگرتنی ئارام‌و ئاسایش‌و پێكهاتن لەبەرەكانی شەڕیشدا.

كەوابوو تائێرە خودموختاری‌و مانەوە لەناو سنووری سیاسی‌و جوگرافی ئێراندا وەكوو خۆیان ماونەتەوە، بێ هیچ گۆڕانێك.. با لێرەشەوە بچینە ناو ڕووداوەكانی هاوپێوەند بەگفتوگۆو سەفەری پێشەواوە بۆ تاران.

لەكۆتایی مانگی *1325/4*دا كاتێ ئەندامی هەیئەتی نووسەرانی (ڕەهبەر) دیدەنی سەرەك كۆمار دەكات‌و لێی دەپرسێ:

(چە رابیتەیەكی مەعنەوی لەنیوان نهزتی كوردستان‌و ازربایجاندا هەیە؟ لەوەڵامدا دەڵی: هەردوك لامان بو ئامانجیك كە ازادی‌و سەربەخۆیی حقیقی‌و بەراستی ایرانە كار دەكەین"*34*

ئـــەم قســـەو ڕاو هەڵوێســـتە زۆر ئاشـــكراو ســـنووردارە.. نـــاكرێ لەگـــەڵ جەمهورییەتێكی سەربەخۆدا یەكدی بگرن، بەتایبەتی پێش ئەم دیدەنییە لەنوتقێكدا هەمان ڕاو هەڵوێستی بەمجۆرە دەرخست:

"...وەهـــەردوكمان خـــەریكی بەرقـــەراری ازادی لەسەرتاســـەری ایرانـــ...و ئومیدەوارم كەبەیارمەتی خودای‌و فیداكاری عەشایرو كورانی كورد بەزوویەكی زوو الای ســی ڕەنگــی كوردســتان لەسەرتاســەری كوردســتان‌و هــەتتا تــەواوی ایــران بلەرێتەوە..."35

لێرەدا دەسەلمێت كەمەبەستی پێشەوا لەتەواوی كوردستان هەر كوردستانی ژێر دەستی ڕژێمی شـا بـووە. بەتایبـەتی ئـەوەش ڕوونـە كەكوردسـتانێكی سـەربەخۆی تـەواوو بـەمانای وشـە، لـە(سەرتاسـەری كوردسـتان)وەك دەوڵـەتی ئـازادو یـەكگرتوو، لەهیچ ڕوویەكەوە لەگەڵ (تەواوی ئێراندا) یەكناگرنەوە. بەڵكو تەنها لـەناو مەبەسـتی خودموختـاری‌و خۆبەستنەوە بەئێرانێكی دیمۆكـرات‌و ئـازاددا یەكدەگرنـەوە، وهـەر لێكدانـەوەو بۆچوونێكـی تـر بـۆ ئـەوەبكرێت وا هەڵـە دەبـێ‌ودوور دەبـێ لەئەسـڵی مەبەستەكانی سەركردایەتی كوردو جەمهورییەتی كوردستان.

سـەرەك كۆمـار لەدیدەنییەكـەی پـەیامنێری(ئاژانســی فرانـس پریـس)دا لـە 1946/6/1دا لـــەوەلامی پرســـیارێكی نـــاوبراودا بـــەمجۆرە مەبەســـتەكانی زیـــاتر شیدەكاتەوە:

".. كـورد رازی ئـەبی ئەگـەر حكومـەتی نـاوەندی بریـاربدا قـانونی دیموكراتـی لەهـەمو ایرانـدا جی‌بـەجی‌بكری‌و دان بنـی بـەو قانونـەدا كـە ئیسـتا لەكوردسـتاندا سەبارەت بەخویندنی كوردی‌و ئوتونومی بەریوەبەرایـەتی ناوچـەیی‌و لەشكر كاریـان پـی ئـەكری...).(كیشـەی كوردستان بەتـەواوی مەسـەلەیەكی ناوخوییە ئـەبی لـەنیوان كورد خۆی‌و حكومـەتی ناوەندنی‌دا لابەلا بكـری ئەگـەر ئیمـە ئـەمرو پـی دائـەگرین لەسـەر داوای ئوتونومیـەكی جوزئـی بـو ولاتەكـەمان گونـاهی حكومـەتی ناوەندی‌یـە كـەهیچی نـەكردوە بـو باشـتركردنی وەزعـی ئیمـە بەراسـتی حـەز ئەكـەین ریگـای پێشكەوتن بگرین.

ئیمـە حـەز ناكـەین لاسـایی ئـەمریكا یـا روسـیا بكەینـەوە، بـەلام ئـەوەش رەت ئەكەینەوە كەوەكو ئاژەلی ولاتانانی شارستانی بژین.)36

وابزانم ئەو قسەو بۆچوون و هەڵوێستانەزۆر روونن و پێویستیان بە هیچ لێدوانێکی تر نییە ئەوە نەبێ کە بڵێم ناکرێ ئەوەی چاوی بەمجۆرە رستانە کەوتبێ و بکەوێ، لەوەنەگات کەجەمهورییەتی کوردستان بۆ خودموختاری خەباتی کردووە کەتەنانەت سەرەك کۆمار لەوێدا بەخودموختارییەکی جوزئیش ناوی دەبات، بۆیە ئەو کۆمارە دیفاکتەیەی ناو ئەوبارودۆخانە بوو کە لەجێگەی خۆیاندا باسکران، خەباتی سەرکردایەتیی کورد بۆ ئەوە بوو کە ئەم دیفاکتۆیە بکرێتە "دیژۆر" وبڕوای سیاسیی و یاسایی پێبکرێت. لام وایە لە سەرەتای پلەی وەرچەرخاندا ئاماژەکردنی پێشەواش بۆ گۆڕانەکە هەر لەخۆوە نەبووە، بەڵکوو لەو تێگەیشتن و دەرککردنەوە بووە کە کوردو کۆمارەکەی لەناو پلەی وەرچەرخاندا دەژی و مامەڵەی واقیعەکەی دەکات، پلەیەك کە کورد بەو خودموختارییەشەوە لەبەردەم گێژەڵووکەی چاوەڕوانکراودا خۆی ئامادەی پاشەکشەی زیاتر دەکرد. دەکرێت سەردەمی تەمەنی کۆمار، تائێرە، بەڕۆژگاری زێڕین و پلەی پڕ لەهیوا دابنرێ، چونکە ئیتر لێرەوە گۆڕان هاتە ئاراوەو سەردەمی هیوا ڕووەو بەسەرچوون دەچوو.

پلەی وەرچەرخان

پلەی وەرچەرخان: مەبەستم ئەو گۆڕانە رووداو وەرچەرخێنەرانە بوو کە ئیتر سەرکردایەتی جەمهورییەتی کوردستان لەوە دڵنیا بوو کە نەئەو خودموختارییەی لەناو چوارچێوەی ئێران هەیبوو، نەبیری سەربەخۆییەکەی لەئازەربایجان، بەپێچەوانەی پەیمانی یەکێتی و برایەتی کوردستان و ئازەربایجان، لەهەلومەرجی ئەو کاتەدا مانەوەیان لەئارادا نەماوەو وردە وردە سەردەمەکەیان بەسەردەچێت و مانەوەو پارێزگاری کردنیان دەبوە مەحاڵ. ئەمەش لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە کۆماری ئازەربایجان بە پێچەوانەی یەکێتیی و برایەتیی لەگەڵ کورد و دژ بەرێکەوتنی کوردوئازەر جووڵایەوە..لەپەیمانەکەدا نووسرا بوو:

"هەر کاتێك پیویست بی لەگەل حکومەتی تاران قسەبکری دەبی موافق نزری حکومەتی ملی ازربایجان و کوردستان بیت.. 37"

بەڵام کاتێك وەفدێکی تاران بەسەرۆکایەتی (مزفر فیروز) گەیشتە تەورێز بۆ وتووێژ. ئەو وتووێژە نەك هەر (موافق نزری حکومەتی ملی کوردستان) نەبوو، بەڵکە تەواو پێچەوانەشی بوو، زیاتر لەوەش، لەناو (15)خاڵی پەیمانە ئیمزاکراوەکەی

نێوانی تەورێزو تاراندا تەنها لە خاڵی(*13*)میندا بەمجۆرە ناوی کوردو مافەکانی هاتبوو:

"حکومەت موافەقەت ئەکا کوردەکانی ئازەربایجان لە(مەزایای)ئەم ریکەوتنە کەلك وەربگرن، تا پولی پینجەمی سەرەتایی بەزمانی خویان بخوینن، کەمایەتییەکانی دانیشتووی ئازەربایجان، وەکوو ئاسوری‌و ئەرمەنی مافیان ئەبی تا پولی پینجەمی سەرەتایی بەزمانی خویان بخوینن..."*38*

بەمجۆرە خواست‌و تەماعەکانی ئازەربایجان، هەرچەندە بەکاتیی بوو، هاتەدی‌و کوردستان خزێنرایە ناو ئازەربایجانەوە، لەخاوەن جەمهورییەتێکی(خودموختار)و (سەربەخۆ)وە خرایە ریزی کەمایەتییە بێ نیشتمانەکانی وەك ئەرمەنی‌و ئاسوری، مەبەستم نیشتمانی نەتەوایەتییە لەو ناوچانەدا، لەبیرو هەوڵی یەکخستنەوەی سەرجەمی رۆژهەلاتی کوردستان‌و شادبوونی بەو ئازادییە، کەوتە ناو تەقەلای پاراستنی ئەوەی دەلوێ‌و دەتوانرێ بهێلرێتەوە.

لەوانەش خراپتر ئەوەبوو کەکورد هیچ رێگە چارەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو کەدژ بەو رێککەوتنە بوەستێ، تەنها ئەلتەرناتیڤ رازی بوون بوو، هەوڵی خۆ گونجاندن بوو لەگەڵ ئەم گۆڕانە پڕ لەمەترسییە، سەرەتای دژەکردار لەجەمهورییەتی کوردستاندا بەنووسینی رۆژنامەی کوردستان دەرکەوت. لەیەکەم ژمارەی دوا رێککەوتنەکەی تاران‌و تەورێز کەئەو رووداوەی تیدا خرایە روو، لەژێر سەردێری ( حلی اختلافات لەنیوان نوینەرانی تاران‌و ازربایجان)دەنووسێ:

(شەوی *1325/3/24* رادیو خەبەری‌دا کە اختلافات لەنیوان حکومەتی تاران‌و ازربایجان‌دا لە *15* مادەدا حل کراو پەیمان لەلایەن اغای مزفر فیروز معاونی نخست وزیری تاران‌و اغای پیشەوەری سەرەك وەزیری ازربایجان شەوی نیوبراو بەامزا گەیشت‌و بەم بونەیە اغای مزفر فیروز لەرادیوی تەوریز نوتقی کرد..."*39*

بۆ ژمارەی ئاییندەی ر.ك لەیەکەم لاپەرەدا لەژێر سەرباسی(دەنگ‌و باسی حەفتە)دا دوای ئەوەی باسی رێککەوتنەکە دەکات، بەشی یەکەمی دەنگوباسەکە واکۆتایی پێدەهێنێت:

"...بەگوێرەی ئەم اتفاقیەیە حکومەتی خودموختاری ازربایجان لەشکری ملی خوی دەبی بەلام بەناوی امنیە بو موحافەزەی داخلی دەناسریت..)*40*

ئینجا بەشی دووەمی دەنگوباسەکە لەژێر باسی (مسئلەی کورد)دا وا دەست پێدەکات:

(بینه سەروکاری مسئلەی کورد خوینندەوارە خوشەویستەکان هەر وەکو دەزانن مسئلەی کوردی بەرامبەر دنیای شتیکی بەترسە پیشوای معزممان لەبەرئەم نقتەیە بەسیاسەتی حەکیمانەی خوی مسئلەی کوردستانی ایران بەمسئلەی ازربایجانی بەستوەوە لەوەشدا ماعدای قازانج هیچ زرریکمان نەکردوە چونکە میللەت ازربایجان هەر وەکو میللەتی کورد لەژیر چەنگالی استعمارو چەپوکی دیکتاتوری رزا خان دەنالی لەهەرچی ناحیەیك نقصانیان بوبی میللەتی ازربایجانیش نقصانیان هەبو لەبەرئەوە رەهبەری داناماں پیشەوای خوشەویست هیچ مانعیکی نەدیوە بەلکو بەزروری زانیوە امرو مسئلەی کورد دەبی*41*(بە) مسئلەی ازربایجان بکریت دەلیلیشم هەر وەکو دەبینین لەرۆژی ئەوەلی ازربایجان هەرچی شتیك بو میللەتی ازربایجان کرابی بو میللەتی کوردیش کراوە لەهەر قسمتیك دەست پرکردنەوەی نقصانیان کراوە...هتد، نووسینەکە لەسەر باسەکە دەڕوات تادەگاتە (تتبیق قانون اساسی ایران‌و اصولی دیموکراسی مەزەنەی خویندن بەزمانی کوردی لەسنەو کرماشان، وەمەسەلەی ئەنجومەنانی ولایەتی کوردستان...هتد) کە (وا دەردەکەوی شارەکانی کوردستان چونکە هەموی بەزبانیك گفتوگو دەکات تابعی یەك مرکز دەبن...هتد)*42*

بەو جۆرە لەو پلەی وەرچەرخاندنەدا کە، بەرهەمی پیلانی فێڵبازانەی تاران‌و بەرژەوەندی خۆخوازی یەکێتی سۆڤیەت‌و بەڵێن‌و پەیمان شکاندنی ئازەربایجان بوو، بۆ دەستکەوتنی تەماع‌و خواستەکان، کورد کەوتە ناوداوی دوژمن‌و دۆست‌و ناحەزانییەوە، بۆیە بەناچاری پاشەکشەو سازشی سەپێنراوی دەکرد، دەبوو بیکات. مەبەستی سەرەکیش پارێزگاریکردنی ئەوەی دەلویٚ‌و دەگونجیٚ بۆ کورد هەوڵی بۆ بدریٚ. ئیتر لێرەشەوە ناوی جەمهورییەتی کوردستان، سەرەك جەمهورییەت، سەربەخۆیی‌و خودموختاری تادەهات کەمتر بەکار دەهێنران... چونکە لەگەڵ گۆڕانەکاندا یەکیان نەدەگرتەوە. ئەگەر سەرەنجێك لەو رۆژنامانەی کوردستان بدەین کەلەبەردەستدان، ئەو راستییە بەڕوونی دەردەکەویٚ. لەوەش زیاتر، لەوە بەدواوە لێپرسراوانی کۆماریش کەم‌و بەدەگمەن ئەو ناوانەیان بەکار دەهێنا، هەوڵ دەدرا

لەناو بارودۆخی تازەدا خۆ بگونجێنن، بەزاراوەی نوێ خۆیان رابێنن، زیاتر باسی ئەو بابەتو لایەنانە بکرێن کە پێوەندییان بەئێران ویەکێتی ئێرانەوە هەیە.

سەیفی قازی کەلەهەموو لێپرسراوانی کۆمار زیاتر لەقسەکانیدا ناوی جەمهورییەتی دەهێناو باسیدەکرد، لەرۆژی جێژنی چلو یەکەمین ساڵی مەشرووتەی ئێراندا نوتقێکیدا، بەمجۆرە دەستی بەقسان کرد:

(برایانی خوشەویست بەسلامەتی پیشوای بەرزو برایانی خوشەویست جیژنی چلو یەکەمین ساڵی مشروتیتی ایران دەکەمەوە..) دوای ئەوەلەسەری دڕوات تادەڵێ:(ایستا لەسایەی نهزتی مقدسی کوردستانو ازربایجاندا سەرلەنوی وەخبر هاتین مەشروتیتمان بەتەواوی معنا لەایراندا دامەزراندوە..هتد، ئینجا بەدووروودرێژی لەسەر قسەکانی دەڕوات تادەڵێ:(قانونی اساسی ایران مهمترین قانونی ئێمەیە کەبەهیچ وجهیك گورران قبول ناکاو حتی مجلسی شورای ملیو دەولەتو پاشاش ناتوانن هیچ یەك لەموادو اصولی ئەو بگورن..هتد"43

زیاتریش لەوانە: پێدەچێ لەگەڵ مۆرکردنی پەیمانەکەی نێوان تارانو تەورێزدا، ئازەرەکان کەوتبنە هەوڵی بەئازەریکردنی ناوچە تێکەڵەکان کەجێگەی ناکۆکیو ململانێی هەردوو کۆمار بوون، پیشەوا لەوتارێکدا بەدرێژی باسی سەردانی بۆ ئەو شوێنانە دەکات تاخەڵکەکەی ئارام بکاتەوە. کەدەبێ لەلایەن ئازەربایجانەوە فەرمانیان پێدرابێت کە ئیتر ئاڵای کوردستان بەرزنەکەنەوە، چونکە پێشەوا لەباسی سەفەرەکەو قسەی بۆ خەڵکەکەو وەڵامی دانیشتووان دەڵێ: خەڵکەکە گوتیان:(ئیمە الای مقدسی سی رەنگی کوردستانمان هەل کردوە کەلەسیبەریدا خومانو هەمو کوردیکی دیکە بحەسینەوە، هەتا قەترەیەك خوین لەبدنی ایمەدا بی الای مقدسی ایمە نابی نەوی بیت...) ئینجا پێشەوا لەسەر قسەکانی دڕواتو باسی بینینی پیشەوەریو گلەییەکانیو وەڵامی خۆی دەکات کەچۆن (حدوداتی خارجی کوردستانو ازربایجان لەترف کوردانەوە....) دەپارێزێ 44 .

ئا لەم رۆژگارەدا، وەك دەردەکەوێ. نەك هەر باسی کۆماری سەربەخۆ، بەڵکو باسی کۆماری خودموختاریش لەئارادا نامێنێت، تەنانەت دروشمی خودموختاریش بەرەبەرە دەخرایە لاوە. قسەکانی رۆژنامەی کوردستان بەڕوونیو ڕەوانی ئەوانەی یەکالاکردۆتەوەو بەڵگەی سەلمێنەری بێ مشتومڕ ئەو بۆچانانەن.

بۆ زیاتر رووناکی خستنەسەر هەڵوێستی کورد لەو بارودۆخە بەدواوە، باش وایە ئامـاژە بـۆ ئـەو تەلگرافـەی پێشـەوا بکـەین دەربـارەی پێکـهێنانی ئیئتیـلاف کەبەم جۆرەیە:

تاران- جنابی اشرف قوام رەهبەری حزبی دیموکراتی ایران.

روونوس- جنابی اغای دکتور کشاورز رەهبەری حزبی تودەی ایران.

روونوس- جنابی اغای صالح رەهەبری حزبی ایران.

روونوس_ تبریز جنابی اغای پیشەوری رەهبەری فرقەی دیموکراتی ازربایجان.

روونوس- تاران اغای پادگان معاونی صدری فرقەی دیموکراتی ازربایجان.

بەاحترامەوە حزبی دیموکراتی کوردستان امادەیی خوی بو ائتلاف دەگەل احزابی ازادیخـواز(دموکـرات ایـران، تـودە ایـران، دیموکراتـی ازربایجـان، حزبـی ایـران) رادەگەینی و ئەم ائتلافە موجبی سعادت و عزمتـی ملـت ایـران دەزانم و بـەم وسـیلە جنابی اغای صدری قـازی لەلایـەن حزبـی دیموکراتـی کوردسـتانەوە بـو گفتوگـوی پیویست و امزای ائتلاف نامە بەنمایندەیی معرفی دەکەم.

رەهبەری حزبی دیموکراتی کوردستان

محمد قازی*45*

بەو جۆرە لەدوا مانگەکانی کۆتایی ساڵەکەو بەرەو خواربوونـەوەی شانسی مان و ژیانی جەمهورییەتی کوردستان، سەرجەمی هـەوڵی پێشـەوا قازی محەمـەدو سـەرانی هوشیاری حزب و جەمهورییەت، بۆ ئەوە چڕ دەکرا کەئەوەی ماوەو دەتوانرێ بهێڵرێ بپـارێزرێت، ئـەو حکوومەتـە خودموختارییـە کەلەوەوبـەر هـەوڵ دەدرا وەك حکوومـەتێکی(دی فاکتۆ) بهێڵرێ تادەکرێتە(دیژۆر)، سەردەمەکەی تێپەڕبوو. بۆیـە ئەگـەر هـەوڵ بـدرێ لەسـنووری جـۆرێ لەبەڕێوەبەرایـەتی و زمـانی کـوردی بەکارهێنانیشدا بهێڵرێتەوەو وا هەر لەبەرژەوەندیی کورددا بووە، بۆ ئـەو مەبەسـتە پاشەکشەی ناچاریی دەکات بۆ دەستکەوتە لواوەکەو بۆ خۆلادان لەکارەسات.

بۆ سەلماندنی ئەوە، چاك وایە رووناکی بخەینە سەر سەفەرێکی تری پێشـەوا بۆ تاران کەلەنیوەی دووەمی ئوکتوبەردا بوو:

"لە*16*ی ئوکتوبەر حکومەتی ئیران چەند کەسیکی لەپیاوە ناسراوەکانی موکریان بو گفتوگو لەسەر هەلومەرجی ئەوسـای کوردسـتان بـانگ کـرد... قـازی بـەهیوا بـو

حکومەتی ئێران هەندی کاری باش لەکوردستان بکا وەکو: کردنەوەی قوتابخانە بەزمانی کوردی، نەخوشخانەو ریگاوبان.."46

وەك دەشزانین لەوە بەدواوە بارودۆخەکان ئالۆزتر، بێ ئومێدتر دەبوون... تاران بەو مافە سادەو ئاساییانەش رازی نەدەبوو، ئیتر مەڵبەندەکەی جەمهوریەت لاواز دەبوو، ژمارەیەك لەسەرەك عەشیرەتەکان ئاغاو خانو خەڵکانی لاواز، دوور دەکەوتنەوەو دادەنیشتن، هەبوو دڵسۆزیی خۆیو ئامادەی هاوکاریشی بۆ ئەرتەش نیشان دەدا... بەڵام پێشەواو زۆر لەسەرکردەکانی حزبو جەمهوریەتی کوردستان، بەهیواوەو بەئومێدی مانەوە، بەرگری، لەسەرهەڵدانی سۆڤیەت، هاوپەیمانی لەگەڵ ئازەربایجان، دەژیانو چاوەڕوانی ئاییندەیەکی نادیارن دەکرد.

لەباسی سەربەخۆ یا خودموختاربوونی جەمهورییەتی کوردستان-دەبێ ئەوەش بڵێم کەدامەزرێنەرو میراتگرەکەی، مەبەستم حزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێرانە، زۆر بەئاشکراو بێ پێچوپەنا خودموختاربوونەکە دەسەلمێنێت. لاشم وایە ئەو حزبە، نەدوێنێو نەئەمڕۆ، نەیویستووەو هەوڵی نەداوە ڕاستییەکانی هاوپێوەند بەم باسە بشێوێنێو بەجۆرێکی تر لەسەری بنووسێ، دیارە ئەمەش بۆ خۆی دەلیلو بەڵگەیەکی گرینگە بۆ ئەو باسەو بۆ گەیشتنە مەڵبەندی راستیی.

لەقسەکردن لەسەر ئەو باسەو نەبوونی بڕیارێکی رەسمیو یاسایی بۆی، وەلەناو بیری تۆ بڵێی لەسەرەتای دامەزراندنەکەدا بڕیارێك لەسەر سەربەخۆبوون_ بەمانای جیابوونەوە لەئێران_درابێو تائێستا نەکەوتبێتە بەر دەست یا فەوتابێت وەیاخود بڕیارێکی زارەکی هەبووبێو تۆمار نەکرابێت، ئەوەم وەك پرسیاری ئاڕاستەی مامۆستا (شێخ عزەدین حوسەینی) کرد کە بەمجۆرە ڕاکانی دەرخست:

مامۆستا شێخ عزەدین حوسەینی دەڵێت:[1]

"لەڕاستیدا بیری سەربەخۆبوون کۆنە، بەتایبەتی لەسەردەمی شێخ عوبەیدوڵڵاوە بەرەبەرە جێگەی خۆی دەگرت.کاتێ ئەرتەشی سوور هاتە ناوچەکەو دامودەزگای ڕەزاشا رووخا فەزایەکی ئازاد خولقاو خەڵکی بەئاشکرا باسی سەربەخۆیوونو ئازادییان دەکرد، کەکۆمەڵەی (ژ.ك)یش دامەزرا زیاتر جێگیرو بەربڵاوتر بوو، چونکە

---

[1] - ئەو پرسیارە راستەوخۆ خۆم ئاڕاستەی مامۆستا-م کردو بەوجۆرەوەلامی دابەوە.

ئامانجی(ژ.ك) سەربەخۆیی هەمووکوردو دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووی کوردستان بوو، ئەوە تەئسیرێکی گەورەی لەسەر بیری دامەزرێنەرانی جەمهورییەتی کوردستان کرد، لەناو دڵودەروونی خەڵکدا جێگەی خۆی کردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا سەربەخۆبوون بەمانای جیابوونەوە لەئێران نەبووە، چونکە دامەزرێنەرەکەی کە(ح.د.ك) بوو، هەر لەسەرەتاوە لەبەیانی دامەزراندن و لەپرۆگرامەکەشیدا ئامانجی خودموختاریی تەسپیت کرد. لە هیچ کاتێکیشدا ئەو ئامانجەی نەگۆڕیوە، ئەو ئەسڵانەی لەسەرەتاوە گوترا گۆڕانیان تیادا نەکرا، بەڵام حزبی دێمۆکرات و جەمهورییەتەکەش بەدوایدا، لەناو دوو ئەندێشەی کۆن و نوێ، سەبارەت بەو ئامانجە دەژیاو لەگەڵیشیدا بەردەوام بوون، ئەوەش هەر سەبارەت بەگۆڕینی ئامانجی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووی کوردستان بوو کە(ژ.ك) کردبوویە ئامانجی خۆی و خەباتی بۆ دەکرد کەکرا بەخودموختاری لەناو سنووری ئێراندا".

دوا وشە بۆ ئەم باسە بۆ روونـاکی خستنەسەر هەڵوێست و دیدوبۆچوونی جیاجیای یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتانی خۆرئاوا تەرخان دەکەم: لام وایە سۆڤیەت بۆ ئەوە کاری دەکرد کەلەئێراندا بمێنێتەوە، کەگوشارو فشاری تاران و هەردوو زلهێزە هاوپەیمانەکەی، هێنایانە سەر بڕیاری چۆڵکردن... تەقەلای لەسەر بەرژەوەندیی نەوت و مۆرکردنی پەیمانێ چرکرد، ئەم راستییە لەدامەزراندن و رووخاندنی جەمهورییەتی کوردستاندا باش رەنگ دەدەنەوە.

خۆ ئەگەر یەکێتی سۆڤیەت جۆرە بەرژەوەندییەکی لەکوردستان و لەسەر مەسەلەی کورددا هەبووبێ، کەبەلای منەوە ئەگەر هەشیبووبێ وا هەر لەخەیاڵدا بووە- وا وەك دیپلۆماتە ئەمریکاییەکان بۆی دەچوون لەکوردستانی تورکیا و عیراقدا بووە. هەر وەك نموونە، ئەم دوو دیپلۆماتە لەسەردەمەکەدا باسی جموجۆڵی سۆڤیەتەکان دەکەن، لەو دووتەلگرامەی ئاڕاستەی وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەیان کردبوو:

*1*)لەتەلەگرامی کونسولی ئەمریکایی(*Rossow*)لەتەورێز بۆ وەزیری دەرەوەی وڵاتەکەی ، دوای ئەوەی باسی جموجۆڵی هێزەکانی سۆڤیەت دەکات، دەگاتەسەر:(سەرەرای ئەوەش لەمەهابادەوە راپۆرت هاتووە کە کوردەکان خۆیان

ئامادە دەکەن بۆ ئیعلانکردنی مافی خۆیان لەکوردستانی تورکیادا وەپلان دادەڕێژن بۆ دەسپێکردنی کاری سەربازی بەم زووانە.."47

بەلای ئەوەوە، تەقەلاو خۆئامادەکردن هەر بەدەستی ڕووسەکان بووە.

2)دیسان بەڕێوەبەری کاروباری سەفارەتی ئەمریکا لەیەکێتی سۆڤیەت(*Kennen*) لەتەلەگرامی 17ئازاری 1946یدا بۆ وەزیری دەرەوە دەڵێ:

"..دەربارەی عیراق، هەڵوێست زۆر ڕوون نییە، لێرە چەند بەڵگەیەك هەن کەنیشانی بوونی جووڵانەوەیەکی کورد دەدەن کەلەلایەن سۆڤیەتەوە ئاراستەکراوەو چەکی پێدراوە، ئەمەش بۆ گرتنی ویلایەتی موسڵە لەگەڵ هێزە ئامادەکراوەکانی سۆڤیەتدا بۆ پشتگیریکردنی یاخی بوون لە هەلومەرجی لواودا...هتد"48

زۆری تر لەو دیپلۆماتانە لەنامەو تەلگرامەکانیاندا ئەوەش ئاشکرا دەکەن کە چۆن ڕووسەکان لەسەرەتادا گوێیان لەهیچ جۆرە داوایەك نەدەگرت کەپێوەندی بەناردنی ئەرتەشی تارانەوە هەبووە بۆ هەندێ لەو ناوچانەی کوردستان. وەڵامەکەی ستالین بۆ پیشەوەری کەلەشوێنێکی تردا باسکراوە، دەلیلێکی تری ئەو بۆچونانەن.

بۆ ئەم باسە، دەیان بەڵگەو نموونەی تر بەدەستەوەن‌و بە پێویستم نەزانی ئەم باسە لەوە درێژتر بێت.زیاتر لەوە سەرجەمی پرۆسەی وتووێژ لەگەڵ تاران تەنها لەناو داوای مافی کورد لەناو سنوورو چوارچێوەی ئێراندا بووە. وەلەهیچ بەڵگەنامەیەکدا پێچەوانەی ئەو ڕاستییە باس نەکراوەو نەبینراوە کەئەمەش خۆی باس‌و لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی گەرەکە.

مەبەستم لەوە دەرخستنی ئەو ڕاستییەیە کە سۆڤیەت بۆ کورد، وەئەمریکاو بریتانیاو ئێران بۆ یەکێتی ئەرزو میللەتی ئێران، خاوەن بڕیاری چارەنووسساز بوون کەهیچ کامیان ئامادە نەبوون ئەو خودموختارییەش قەبوڵ بکەن، نەك سەربەخۆیی، بگرە دژیشی بوون‌و هەر ئەوانیش هۆی سەرەکی‌و ڕاستەوخۆی ڕوخاندنی کۆمار بوون. کەوابوو باسکردنی سەربەخۆیی کۆمارەکە بەدەر لەوانە، بێماناو دوور لەڕاستی دەبێت. وە هەروەك لەناو کرۆنۆلۆجی ڕووداوو باسەکانی لەمەڕ خودموختاری لەناو سنووری ئێران‌و سەربەخۆیی لەئازەربایجان دەردەکەوێت، بێ ئەوەی بتوانێت تاسەر هیچ کامیان بەدەست بهێنێت.

# پەراوێزو سەرچاوەکانی پاری یەکەمی بەشی پێنجەم

1-هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل 17و18.

2- William Eagelton, OP. Cit, p.23

3-ژەنراڵ سلیم ئەتاکشیوف. فەرمانبەرێکی سیاسی سۆڤیەت بو، لەسەرەتای هاتنی لەشکری سور بۆ کوردستان... بەلێپرسراو لەپەیوەندی نێوان ئازەربایجان‌و کوردستان لەگەڵ یەکێتی سوڤیەت دانرا. شوێنی دانیشتنی تەورێز بو، بۆ سەرپەرشتی کارەکانی زوو زوو سەری لەمەهاباد ئەدا. ئەمیش لەگەڵ جعفر باقرۆفدا لەسێدارە درا.

4- William Eagelton,op. Cit, p.33

5- William Eagelton,Ihid, p.44

6- William Eagelton, Ihid, p. 45

7- William Eagelton, Ihid,p 45

8-هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمار... چی لەسەر زارو چی بەنوسین بەچەند ناوێك ناوبراوە وەکو: کۆماری دیموکراتی کوردستان، کۆماری میللی مەهاباد، کۆمەڵە...، هتد

بەڵام لەرۆژنامەی رەسمی‌و لەسەر رۆژنامەی کوردستان بەجەمهوریەتی کوردستان ناوبراوەو نوسراوە. لەدروشمی(وەزارەتی فەرهەنگ) دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نوسرا بو.

9-بڕوانە : William Eagelton,OP. Cit

10- بڕوانە: احمد شریفی، عشائری بارزان‌و رهبران انها

11-علاء الدین سەجادی، شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عیراق بەغدا 1959.

12-علاء الدین سەجادی، هەمان سەرچاوە.

13-بڕوانە: William Eagelton. Op. Cit.

14-نجفقلی بسیان، سەرچاوەی ناوبراو،.

15-بڕوانە: William Eagelton. Ibid.

16-بۆ زانیاریی لەسەر ئەم لایەنە بڕوانە : مەحمود مەلا عززەت، بەرگەکانی د. ج. ک - بەرگی یەکەم‌و دوهەم‌و سێهەم (1992و1995و1997).

17-دیسان بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، هەمان سەرچاوە ، بەرگی یەکەم.

## پەراوێزو سەرچاوەکانی پاری دووهەمی بەشی پێنجەم

1)لەبەرئەوەی ئەم باسە بۆ راستکردنەوەی دوو بۆچوونی هەڵە دەربارەی (ناو)و مەسەلەی خودموختاریو سەربەخۆیی جەمهوریەتی کوردستان تەرخان کراوە، بۆیە لێرەدا لەناوبردندا ئەو ناوە مێژووییە بەکارهێنراوە.

2)22-1-1946تا 17-12-1946.

3)لام وایە زۆر لەنووسەران کەئەو ناوانەیان لەبەرهەمەکانیان ناوە، هەر بۆ ناوی بەرهەم‌و نووسین بووە، نەك وەکوو ناوی مێژوویی، بۆ نموونە بەندە هەر کتێب‌و باس‌و لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر ئەو ئەزموونە بەناوێکی تایبەتییەوە سەردێرو باس کردوە، لەوانە: کۆماری میللی مەهاباد، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، جمهوری مەهاباد، کۆماری دێمۆکراتی کوردستان، کۆماری مەهاباد...تاد.

لێرەدا زیاتر قسەم ئاراستەی دوو ناوە: (کۆماری دێمۆکراتی کوردستان)و (کۆماری کوردستان). چونکە نووسەری واهەیە دەیەوێ وەك ناوی مێژوویی قەوارەکە بیسەپێنێ‌و داواش دەکات کە هەر ئەوە بەکاربهێنرێ، گوایە هەر ناوێکی تر هەڵەی مێژووییە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:کتێبی دەوڵەتی جمهوری کوردستان‌و هەڵەی سەرنجەکانی رەخنەگرێك، رۆژنامەی کوردستانی نوێ هەولێر، ژمارە 539و 540و 541، رۆژانی 18-21/11/1993.

4)بڕوانە: رۆژنامەی کوردستان. ژمارە 8، 28-1-1946.

تێبینی: لێرەوە لەهەر جێگەیەکدا ناوی رۆژنامەو گۆڤاری کوردستان بەبڕێ بە(ڕ.ك)، (گ.ك)ناویان دەهێنم کەلەسەردەمی جەمهوریەتی کوردستاندا بلاوکرانەوە، گۆڤاری (هەڵاڵە)ش هەر لەو سەردەمەدا بووە.

5)بڕوانـە: مـەحمود مـەلا عـززەت، کۆمـاری میللـی مـەهاباد، 1984، 1986، ل79، فەسڵی سێیەم خاڵی 8.

6)بڕوانە: ڕ.ك، ژمارە5، 6ی جۆزەردانی 1325.

7)گۆڤاری هەڵاڵە ژمارە 3 بانەمەری 1325.

8)بڕوانـە: مـەحمود مـەلا عززەت، دەوڵـەتی جمهوری کوردسـتان، بـەرگی سـێهەم، بەڵگەنامەی (453).

9)بڕوانە: مەحمود مەلا عزەت، هەمان سەرچاوە، بەڵگەنامەی ژمارە(552).

10)ڕ.ك، ژمارە 56،11ی ژوێنی 1946.

–میخـائیل ئیوانۆڤیـچ کـالێنین، ئـەندامی مەکتـەبی سیاسـی سـەر بەکۆمیتـەی ناوەندیی حزبی کومونیستو سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شورای یەکیتی سۆڤێت ی پێش سەردەمی کۆمار بوو.

–بـۆ زیـاتر سـەرنجدان لـەجۆرو سـەرچاوەی بـەکارهێنانی نـاوی(حکوومـەتی کوردستان) بۆ نموونە بڕوانە: ڕ.ك، ژمارە 19، 20، 23، 27، 28، 53، 56، 58...

11)ڕ.ك ژمارە 53و54_ 4،6ی ژوئێنی 1946.

12)بۆ نموونە بڕوانە:

–ڕ.ك ژمارە 17، 19، 21، 43، 52، 53.

–گ.ك، ژمارە 3، خاکەلێوەی 1946.

–گۆڤاری هەڵاڵە، ژمارە 1، ڕەشەمەی 1324.

13)ڕ.ك، ژمارە 1و2ی 11–1946/1/13.

14)بڕوانە:

–مەحمود مەلا عززەت، د.ج.ك بەرگی 2، 1995، ڕووی دەرەوەی بەرگی دواوە.

–نجفقلی پسیان، از مهاباد خونین تاکرانەهای ارس، آذرماه 1328، تهران.

–لەزۆربەی زۆری بەڵگەنامەکانی دووتوێی بەرگەکانی د.ج.ك دا ،ئەو ئارمە لەسـەر نامەکان دەبینرێ.

15)مەحمود مەلا عززەت، ك.م.م ل 79.مێژووی داڕشتنی نیشانەکەو جۆری، هەر ئەوەندەی باسکراوە، پێدەچێ ئەوە سەرچاوەی سازکردنی ئەم ئارمو تابلۆیە بێت کەتا ئێستا ڕووناکی نەخراوەتە سەر مێژووی سازکردنو هونەرمەندەکەی.

16)ڕ.ك، ژمارە 47–25ی بانەمەڕی 1325.

17)ڕ.ك، ژمارە 15.54ی جۆزەردانی 1325، دیسان ژمارە 53و 57.

ئەحمەدی ئیلاهی سەرۆكی ئیدارەی مالییەی كوردستان(وەزیری مالییە)بوو.

18)ڕ.ك ژمارە2،13ی ژانویەی 1946، لەو كۆبوونەوەیەی بۆ ناونیشانكردنی بەڕێوەبەرانی چاپخانەو ڕۆژنامەو گۆڤاری كوردستان سازكرا، ئەو كارەش بەسەید محەمەدی حەمیدی سپێردرا، سەبارەت بەوە وتارەكەی خوێندبۆوە.

19)ژمارەی وتاربێژان19 كەس بوون، بڕوانە : ڕ.ك، ژمارە 10، 1946/2/4.

20) ڕ.ك ، ژمارە 14، 1946/2/13. دەقی سوێندەكە لەشوێنی خۆیدا دەبینرێت.

21) بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، د.ج.ك بەرگی 1و2، بۆ نموونە بەڵگەنامەی ژمارە 22،24،25، 32، 54، 80،83،87، 95، 116، 160، 161، 171...

22) ڕ.ك، بۆ نموونە ژمارەكانی : 8تا 17، 20، 27، 29، 30، 31، 56.

23) ڕ.ك، ژمارە 8،1946/1/28.

24)هەرچەند ئەم هێزە ڕێكخراوترین‌و بەئومێدترین هێزەكانی جەمهورییەت بووە، بەڵام دیسان ناكرێ ئەو ڕاستییە لابخرێت كەكشانەوەی ئەو هێزە بۆ ئەو بەشەی كوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێران، لەناچاری‌و گوشاری هێزی سەربازی‌و ئاسمانی عیراق بەپاڵپشتی بریتانیا بوو كە بارزانی ناچار كرد كوردستانی عیراق بەجێبلێ... نەك لەو دیدە نەتەوایەتییەی هێندێ كەس پێیان خۆشە باسی بكەن، چونكە ئەگەر بارزانی دەرفەتی ئەوەی بۆ بلوایە كەلەسەر شەڕی دژ بەداگیركەر بەردەوام بوایە واناوچەو بەشە كوردستانەكەی خۆی بەجێ نەدەهێشت‌و لەسەر شۆڕش بەردەوام دەبوو... ئەو ڕاستییەش لەڕۆڵی مێژوویی بارزانی‌و ئەفسەرەلێزان‌و بەتواناكانی ناو ئەو هێزە كەم ناكاتەوە، وەك هێندێك بەهەڵە بۆی دەچن.

25) بەتایبەتی لەپەیمانی (اتحاد) 1942/1/22، كۆنگرەی (تاران) 27–/1943 12/29، كۆبوونەوەی (پۆتسدام) 17/7تا 1945/8/2. بڕوانە:

مەحمودمەلا عززەت، تێڕوانینێكی سەردەم لەكۆمارەكەی مەهاباد، ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ، هەولێر، ژمارە 592و 593،20—1994/8/21.

نەوشیروان مستەفا ئەمین، حكوومەتی كوردستان، كورد لەگەمەی سۆڤیەتی–دا 1992، ل 24و 25.

26) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە.

William Eagleton, The Kurdish Repabiic 1946, London 1963. P.44.

-مەحمود مەلا عززەت. ك. م.م 1984، 1986، ل94.

27) بڕوانە:

-مەحمود مەلا عززەت، هەمان سەرچاوە، ل 77و 79.

-عبدالرحمن قاسملوو، چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، 1985، ل 23.

-نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی ناوبراو، ل 87.

28)بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ڕ.ك، ژمارە 1و 2، 11و 13-1-1946.

29)ڕ.ك، ژمارە 14،13-2-1946.

30)ڕ.ك ژمارە30، 12خاكەلێوەی 1325.

31)گۆڤاری هەڵاڵە، ژمارە 3، بانەمەڕی 1325، ل4-7.

32)ڕ.ك، ژمارە 5،6 جوزەردانی 1325.

33) بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، د. ج.ك، بەرگی 1، بەڵگەنامەی ژمارە 132، ل 149. مێژووی نامەكە 13-4-1325 بووە، نامەكە ئاڕاستەی جەنەڕاڵ حەمەرەشید خان كراوە كەفەرماندەی هێزی بۆكان و مەنتقەی بوو، یەكێك بوو لەو كاربەدەستانەی كەلەسەر یەك خەت دژی كاربەدەستانی تاران بوو چونكە هیچ جۆرە متمانەیەكی پێیان نەبوو.

34)ڕ.ك، ژمارە 69، 20-4-1325. پێشەوا بۆ وتوێژ سەفەری تارانی كردبوو، بە پێی ڕۆژنامەی كوردستان لە 28ی پووشپەڕی 1325دا لە(دەربەند) دیدەنییەكە كرابوو، تەواوی گفتوگۆی دیدەنییەكە هەر لەناو بازنەی پێوەندی كورد بەئێران و ئازادی و دێمۆكراتییەوە بووە.

35)ڕ.ك، ژمارە 47، 6 جوزەردانی 1325.

36)بڕوانە:

*نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی ناوبراو، ل 234-233.

-Howell, Jr. Wilson N, The Soviet Union and The Kurds A Study Of National Minotry, 1965, p. 188

-ڕ.ک، ژمارە 52، ڕۆژی 2ژوین 1946 باسی (پەیام نوسی ئاژانسی فرانس-زیکیل ناپلیون) ی کردووە بەبێ ئەوەی دیدەنییەکانی پێشەواو ئەو باسەی بلاّوکردبێتەوە، تەنها ئاماژە بۆ دیدەنییەکانی پێشەواو لێپرسراوان دەکات.

37)بڕوانە: گۆڤاری هەلاّلە، ژمارە 3، سالّی یەکەم بانەمەڕی 1325،ل7.

38) بڕوانە:

*جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قوام السلطنة، تهران، چاپی دوم، تابستان 1366. ل339.

*نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی ناوبراو، ل227.

39) ڕ.ک، ژمارە 59، 18 ژوین 1946.

40) ڕ،ک ژمارە 60، 20 ژوین 1325.

41)وشەکە هەر ئاوا نوسراوە.

42) ڕ.ک. ژمارە 60.

43) ڕ.ک، ژمارە 75، 11-8-1946، ل 1و2و 4.

44)ڕ.ک، ژمارە 76، 22 گەلاویژ1325.

45)ڕ.ک، ژمارە 85، 21 خەرمانان 1325(11-9-1946).

46)بڕوانە:

*نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی ناوبراو، ل 232.

*فریدە کوهی-کمال دیهکردی، کوماری کوردستان، دامەزران وڕووخانی، 1986، ل45-46، ئەمانیش لەئەرکیڤی بریتانیا دەریان هێناوە.

47)ژمارەی تەلەگرام: 546-9/3-761، تەورێز، 5ی ئازار، 1946، 1ی دوای نیوەڕۆ(6ی ئازار، 25،6ی پاش نیوەڕۆ).

48) ژمارەی تەلەگرام: 861, 24591/3-1746، مۆسکۆ، 17ی ئازار، 1946، 9ی دوای نیوەڕۆ(17ی ئازار، 37، 5 د.ن).

*"Foreign Relation Of The United States Diplomatic Papers 1946,Volume VII."*

# بەشی شەشەم

# توێژینەوەی سروشتو خەسڵەتە تایبەتیەکانی جەمهوریەتی کوردستان

## پاری یەکەم:

-هەڵسەنگاندنی چینایەتیی سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات و جەمهوریەتی کوردستان.

1-قازی محەمەد لەناو روناکیی مێژودا..

2-رۆڵی مێژویی سەرکردە.

3-گفتوگۆو خودموختاری.

4-دیپلۆماسیەتی کورد لەناو سیاسەتو نوتقەکانی پێشەوادا .

## پاری دووهەم:

-سەرەك وەزیران و لێپرسراوانی تر.

## پاری سێهەم:

-سروشتو خەسلەتە دیارەکانی جەمهوریەتی کوردستان.

# پاری یەکەم
# هەڵسەنگاندنی چینایەتیی
# سەرکردایەتی حزبی دیموکراتو جەمهوریەتی کوردستان

داگیرکردنو دابەشکردنی کوردستانو سەپاندنی حوکمێکی دواکەوتووی بێگانەی وابەستە بەدەوڵەتە ئیمپریالیستەکانەوە، رەوتی ژیانی ئاسایی کۆمەڵگەی کوردی تێکدابو، گەشەکردنە کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و سیاسیی و ئایینیی و فیکرییەکانی لەسەر رێبازی خۆیان لادابوو، وەك گەلو نەتەوە مامەڵە نەدەکرا، لەسادەترین ماف بێبەریی کرابوو، چەند جۆرە چەوساندنەوەی بەسەردا سەپێنرابوو، ئێران کرابووە بازاڕی دەوڵەتانی سەرمایەدار، بەبازاڕی کوردستانیشەوە، لەگەڵیشیدا ئیرادەو بەرژەوەندییەکانی چینە ئورستوکراتییە فەرمانڕەواکەی تارانیشی بەسەردا سەپێنرا بوو، دەرەبەگێتیی و سیستێمی خێڵەکیی کرابوونە پایەگای درێژەدان بەداگیرکردنو بەو دیاردانە... بەوەش دووچاری سێ جۆر وابەستەیی و چەوساندنەوە کرابوو...

لەگەڵ ئەوانەشدا بەشو چینە کۆمەڵایەتییەکان لەسەرخۆو وردە وردە لەناو هەناوو منالانی کۆمەڵگەی کوردستاندا دەخولقانو سەریان دەردەهێنا، بێهێزو تواناو بێ دەسەلات دەجولانو نەیاندەتووانی جێگەی ئاسایی خۆیان لەناو کۆمەڵدا بگرنو رۆڵی مێژووکردیخۆیان وازی بکەن.

بۆیە چینی دەرەبەگو سستێمی خێڵەکیی بەبەهێزییو وەك خاوەن دەسەلاتی سیاسییو نوێنەری رژێمی پایتەخت بوون، ئاغاو بەگو خانو میرو بەگزادەکان بالادەست بوون، لەئاست داگیرکەریشدا وابەستەو نۆکەر بوون بۆ چینی خاوەن دەسەلاتی نەتەوەی سەردەست. بۆیە سەرەك هۆزو خێڵو تیرەو خاوەن موڵکەکان، هەم دەستیان بەسەر ئەو لایەنانەی ژیانو هەم کۆسپی سەرەکیی ژیانی کوردەواریی بوون، لەگەڵیشیاندا هەوڵیان ئەدا مەلاو مزگەوت بۆ سودو بەرژەوەندیی خۆیان بەکاربهێنن..

لەبەر ئەوانە بوو کە زۆربەی زۆری پانتاییەکانی زەوی بەدەست ئەم چینەوە بووە، (لە 66–70٪ زەوی کوردستانی ئێران لەدەست دەرەبەگەکاندا) بووە(1)، زۆربەی زەوییە نەرمانەکانی هی چەند کەسێکی غەیرە کوردە کەلەتاران و پاریس و لەندەن دائەنیشن)*

لەبەرامبەر بەوە چینی جوتیار بەهەموو بەش و توێژاڵە هەژارەکانەوە کە زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵی کوردەواری بوون...(زیاتر لە 60٪ی خێزانە جوتیارەکان، نەکەم و نەزۆر زەوی‌یان نییەو لە 33٪یشیان کەمتر لەهێکتارێکیان هەیەو لە 56٪ زەوییەکان لەدەست لە 1٪ی دانیشتوانی لادێدایە..)(3) ئەو لە 15٪یەی کەدەمێنێتەوە وا زیاتر لەهێکتارێکیان بووە، لەم بەشە ناوەڕاستەی ئەم چینە کەم کەسیان زیاتر لە دە هێکتاریان هەبووە.

بۆیە ئەم چینە، خاوەن دەسەڵاتی ئابووری بووە، نوێنەری دەسەڵاتی سیاسیش بووە بۆتە پایەگای دەسەڵاتی چینی کاربەدەست. دەستبەسەراگری پێوەندی و ئامرازی بەرهەم هێنەرو خوڵقێنەری چەند جۆر پەیوەندیی دەرەبەگیی بووە بەتایبەتیی لەشێوەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ، بەخێوکردنی مەڕومالاّت و ئاژەڵ، وەشێوەی تێکەڵ لەو دوو جۆرە بەرهەمهێنانە.

لەئەنجامی بوژانەوەی بازاڕی شارو شارۆچکەکان و گەشەکردنی بازرگانیی، چینی بورجوا سەری لەقاپیلکەی خۆی دەردەهێناو لەناو منالاّنی سستێمی دەرەبەگیدا بەرەو خۆدەرخستن و سەلماندنی بوونی خۆی دەچوو، دوابەدواشی چینی کارگەریش بەپێی گۆڕانە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ئەجولاّو لەگەشەکردنێکی زۆر لەسەرخۆدا بوو، بەلاّم هیچیان ئەو هەلومەرجانەیان بۆ نەدەخوڵقا کە وەك چینەکانی نەتەوەی کاربەدەست و لەناو هەمان بارودۆخدا، ئاسایی گەشەبکەن و رۆڵی خۆیان ببینن، بۆیە بێتواناو بێدەسەلاّت دەمانەوەو زۆر لەسەرخۆگەشەیان دەکرد.

لەناو ئەو کاروانی گەشەکردنە نائاسایی و بەدەر لەیاساکانی مێژوو، بەشە خوێندەوارەکە لەناو بازنەیەکی تەسکدا بوو، چونکە، منداڵەکانی جوتیارو هەژارانی کۆمەڵ نەدەیانتوانی ئەو رێگەیە بگرن، نە ئەو دەرفەت و رێگەیەشیان پێدەدرا کەبخوێنن...

---

* بڕوانە: عبدالرحمن قاسملو، هەمان سەرچاوە.

ئەوە وێنەیەکی بچوککراوەی کۆمەڵگەی کوردەواریی سەردەمەکەی دووەم جەنگی جیهان و ساڵانی دواتریش بوو، لەناو ئەو بارودۆخ و هەلومەرجانەداو لەسەر ئەو زەمینەیە، حزبی دیموکراتی کوردستان وەك میراتگریی سیاسیی کۆمەڵەی ژ.ك پێکهێنرا، لەناو هەمان هەلومەرجدا سەرکردایەتییەکەی بەوەڵەد بوو، جڵەوی سەرکردایەتیی و... جڵەوی بەڕێوەبردنی جەمهوریەتەکەی پێسپێردرا...

هەرچەندە ناکۆکیی و ململانێ لەنێوان هەردوو چینە دیارو ئاشکراکەی کۆمەڵ، چینی جوتیارو هەژاران، چینی دەرەبەگ و کۆمەڵگەی خێڵەکی، بەهۆی ئەو بارودۆخ و حاڵەتە نائاساییانەوە، قووڵ بووبوون، جیاوازییەکان زۆر گەورەو ناعەدالەتییەکان چاوێنیی بوون، لەگەڵ ئەوانەشدا ناکۆکییەکان نەدەتەقینەوە، چەوساندنەوەکان ئاسان و بێگرێوگۆڵ دەکران، چونکە چینی یەکەم هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵیش بوون، بەڵام هەلومەرجە خۆیی و بابەتییەکان لەئاستێکدا نەبوون کە دەستەبەری ئەو دیاردەیەو توندوتیژکردنی ململانێیەکە بن، زیاتر لەوەش دەسەڵاتە سیاسییە خۆماڵییەکەش لەئاراد نەبوو، بوونی نەبوو.

چینی فەرمانڕەوای نەتەوەی کاربەدەست زیاتر یارمەتیی مانەوەو بەردەوامیی ئەو حاڵەتەی ئەدا...

ئەوەش بۆ خۆی هەم دەبووە هۆی زیاتر لاوازیی و بێدەسەڵاتیی و بێ ڕۆڵیی چینی بورجوا، وەك سەرەنجامێکی ئەم حاڵەتەش مانەوەی چینی کرێکار، لەناو بازنەکەی خۆیدا، خۆ ئەگەر ئەو ڕاستییەش لەبەرچاو بێت کە زیاتر لە 95٪ کۆمەڵ نەخوێندەوار بێت وا دیمەنێکی تری زۆر نائاسایی بارودۆخە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکەمان بۆ ئاشکرا دەبێت..

جا سەرکردایەتیی حزب و جەمهورییەتەکە لەناو ئەو کۆمەڵەوە لەدایك بوون و پەروەردەکراون و بوونە کاربەدەست، بۆیە باش وایە ڕووناکی بخەینە سەر جێگەو شوێنی کۆمەڵایەتیی و توانای ئابووری ئەو سەرکردایەتییە، تا لەناو ئەوەوە بتوانرێت هەم نرخاندن و هەم توێژینەوەی سروشتی چینایەتیی سەرکردایەتییەکەی حزب و جەمهورییەتەکە بکەن، بۆ ئاسانترکردنی ئەو کارەش باش وایە لەشوێن و پایەو پلەی کۆمەڵایەتی هەر لێپرسراوێك، لەباری ئابوریی و دەرامەتیی هەریەکەیان بگەین، بێ ئەوەی ئەو نرخاندن و توێژینەوەیە لەکەسێتیی هیچ یەکێك

لەلێپرسراوەکان کەم بکاتەوە، لەڕۆڵی دڵسۆزانەو نیشتمانپەرەوانەو لێپرسراوانەیان کەم بکاتەوە، بەپێچەوانەشەوە، ئەو لێپرسراوەتیانەی ئەو تێکۆشەرانە، کەلەسەرەنجامدا بووە هۆی شەهیدبوونی ژمارەیەکییان، نیشانەی دڵسۆزیی و بەوەفایی و نیشتمانپەروەرییان بوو.. بەتایبەتی و هەر وەك لەسەرەوە روونکرایەوە، ئەوە سروشت و کەرەکتارەکانی کۆمەڵەکە خۆی بوو کە ئەو حاڵەتانەی خوڵقاند بە لایەنە پۆسەتیڤ و نێگەتیڤەکانیشەوە..

## قازی محەمەد لەناو رووناکیی مێژوودا

جێگەی خۆیەتی لێرەدا لەخەسڵەتە تایبەتییەکانی سەرکردایەتی حزب و کۆمار بدوێین، روناکی بخەینە سەر کەرەکتارە کۆمەڵایەتی و ئاستیی چینایەتی و جێگەو پلەو پایەی لێپرسراوە سەرەکییەکان لەکۆمەڵگەی ئەو بەشەی کوردستانی رۆژهەڵاتدا، لەبەرئەوەی قازی محەمەد رۆڵی سەرەکی و هەستیارو تاڕادەیەك چارەنوسسازی لەژیانی خۆی و بنەماڵەکەی و مەهابادو ئینجا لەحزبی دیموکرات و جەمهوریەتدا بینی، بۆیە لەجێگەی خۆیدایە کە چەند بکرێ قسەی لەسەر بکەین و ئینجا بێینە سەر لێپرسراوانی تر..

1-قازی محەمەد، پێشەوای گەل و سەرۆکی حزب و سەرکۆماری کوردستان.

لەبەر رۆڵی گرنگ و هەستیاری، هوشیاریی سیاسیی و خوێندەواریی و زانینی گەلێ زمان... بەپێویستی دەزانم، کەمێ بەدرێژیی لەسەر پێشەوا بدوێم، مەبەستمە بڵێم هەرچەندە لێرەدا جێگە کۆمەڵایەتیی و چینایەتیەکەی ئاماژە بۆ دەکەم، لەگەڵیشدا ئەوەش دەردەخەم کە ئەو بوون و ئاستی دارایی و دەرامەتەکەشی هەر بۆ خزمەتی کۆمارو میللەتەکەی تەرخان کرد، خاوەنی چەندین دێ و دەرامەتێکی چاوێنی هەبوو، لەچەند بەڵگەنامەیەکی بەرگی سێیەمی دەوڵەتی جەمهوریی کوردستان (ستوکهوڵم1997)داو لەوەسییەتنامەکەیدا، کەلەجێگەیەکی تر دەبینرێت، بەهەق پێشەوا ئەو توانای ئابوری و داهاتەی هەر بۆ خزمەت و کاری گشتی بوو.

پێشەوا لەنێوان بۆکان و سەراو میاندواودا چەندین دێی هەبووە وەك دێی ئاغڵیان کە زیاتر چەڵتوکی تێدا چەنراوە.

لێرەدا هەوڵ ئەدەم روناکیی بخەمە سەر کورتەیەك لەژیان و رۆڵی پێشەوا تا روخاندنی کۆمار... خۆبەدەستەوەدان و گرتن و دادگایی کردنەکەش، لەشوێنی خۆیدا بەدرێژی باسدەکەم...

## قازی محەمەد لەناو رووناکیی مێژوودا*

پێشەوای گەل، رابەری حزبی دیموکراتی کوردستان، سەرکۆماری کوردستان، ئەو نازناوو پلەو پایانە، هەر لەخۆوەو بەرێکەوت، یابەهێزو سەپاندن، لەناو نەریتی تایەفەگەری و عەشایەری و بەوەراسەت دەست قازی محەمەد کەوتن، یان وەك شەخسییەتێکی ناسراو، خاوەنرێزو زاناو بەتوانا، سیاسییەکی دەرکەوتوو لەمامەڵەی ناو کاری رۆژانەو خەباتدا، کۆمەڵانی خەڵك بەخواستی خۆیان کردیانە نازناوی سەرکردەکەیان؟

هەیە وا بیر دەکاتەوە کە ئەوەی لەسەر قازی محەمەد نووسراوە، زیاتر لەسنووری پیاهەڵدان و گەورەکردندا بوە، لەناو سۆزی نیشتمانپەروەری و هەستی نەتەوایەتی و شانازیکردن بەئەزموونەکەی کۆماری کوردستانەوە نووسراون.

هەشە بێمروەتانە، نەزان و هەرزەکارانە، لەناو بیری تۆڵەسێنانەی پڕ لەڕق و کینەی رەش، باسی پێشەوایان کردووەو، ئەزموونەکەیان نرخاندووە، لەناو ئەوانەدا، نوسەری خۆماڵی و بیانی، گەلێ راستی و خەسڵەت و زانیاریی بەکەڵك و لێکۆڵینەوەیان نووسیوە، نرخاندنی لۆجیکانەیان کردووە، ئاماژەیان بۆ رەخنەو کەموکورتییەکان، هەڵەو بۆشایی‌یەکان کردووە، لێرەدا هەوڵ ئەدەم لەچەند لایەنێکی ژیانی پێشەوا قازی محەمەد بدوێم، بەپەنابردنە بەر زۆر لەنوسینی ئەو نوسەرانە.

---

* ئەم نوسینە بەشێکی لێکۆڵینەوەیەکە لەژێر سەردێڕی(قازی محەمەد لەناو رووناکیی مێژوودا)بڵاوکراوەتەوە، بەدەستکارییەوە. بڕوانە گۆڤاری مامۆستای کورد ژمارە 24و1995/25.

## رۆڵی مێژوویی سەرکردە[1]:

یەکێ لەگرنگترین هۆو هۆکارە چارەنووسسازەکان لەپرۆسەی رزگاری‌و سەربەخۆیی هەر گەل‌و نەتەوەیەك. سەرکردەو سەرکردایەتییە، چونکە هاوپەیوەندییەکی توندوتۆڵ‌و گرێدراوی بەسەرجەم فاکتەرو هەلومەرجەکانی ترەوە هەیە. ئەم هۆو رۆڵەی بۆ کوردو گەلانی هاوێنەی کاریگەرانەتر خۆی دەنوێنێ، سەبارەت بەو هۆیانەی کەلای خوێنەر شارراوە نین. هەر لەبەر خودی ئەو هۆیانەشە کە نرخ‌و سەنگی رۆڵی مێژوویی هەر سەرکردەیەك‌و سەرەنجامی خەبات هەر بەتەنها لەسەرکەوتن‌و رزگاری‌و گەیشتنە ئامانجدا نییە. هەر ئەم لایەنە بەتاکە پێوانە ناژمێردرێ. بەڵکوو هاوشان بەوە لەپێچەوانەکەشیدایە، لەساتەکانی نوشستی‌و شکستیدایە، لەوەشدایە کەلەبەردەم یان لەناو کارەساتی ژێرکەوتندات تا چ ئەندازەیەك گەل لەسەرئەنجامی بارو دۆخەکە، لەکارەسات‌و نەهامەتیی ناو کارەساتەکە سەرفراز دەکرێ، وزەو هێزو توانای لەتێکوپێکشکان لادەدرێ‌و بۆ هەلو دەرفەتی تر دەپارێزرێ.

ئەگەر لەروانگەی ئەو بۆچوونەوە سەرنجێکی وردو بابەتییانەی نالەباریی جیوپۆلیتیك‌و جیوستراتیجی هاوپەیوەند بەو زەمینە کە کۆماری کوردستانی لەسەر دامەزرا، نارەسیویی هەلومەرج‌و عەردی ئامادە نەبوو، هۆو هۆکارە ناکاملە خۆییەکان، فرەدوژمن‌و رۆڵی خراپی زلهێزەکان، نەبونی دۆستی ستراتیجی، ئاڵۆزی‌و گرفتە سەرهەڵداوەکانی رۆژانی پێش روخاندنی کۆمار... هتد بدەین‌و، بزانین ئەوانە، لەیەك ساتدا روبەڕوی پێشەوا قازی محەمەد، وەك سەرەککۆمار، بووبن، پێشەوا لەدامەزراندن‌و بەرێوەبردندا رۆڵی سەرەکی‌و بنچینەیی بینی، لەرۆژانی پێش کارەساتیشدا، لەبەردەم سێرێیانێکی یەك لەیەك تاریك‌و نوتەکتردا بووە. دەبو راستەوخۆو بەروونیش بریاری خۆی بدات، بریارێك کە کۆمارو تێکۆشەران‌و دڵسۆزانی دەخستە بەردەم رووبەڕووبوونێکی خولێلانەدەر: لەناو ئەو هەلومەرجانەدا بەرگری لەکۆمار بکەن، یابکشێنەوەو خەڵك بۆ ئەرتەش بەجێ بهێڵن، وە یان خۆی بەدەستەوە بدات‌و بەمەزنەی خۆی، گەل لەکارەسات‌و مەهاباد لەوێرانکردن رزگار بکات، بەڵێنەکەی خۆشی بەو جۆرە بهێنێتەدی.

هەڵبژاردنی ڕێگەی سێیەم، دیاردەیەکی هێندە هەستیارو نامۆ بوو کە دەبێ زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، وەرامی ڕەزامەندی زۆر پرسیار بدرێتەوە.

بۆ ئەوەی پێشەوا بناسین، لەڕۆڵی سیاسی و دیدو بۆچوونی بگەین لەدوابڕیارو چارەنوسەکەی حاڵی بین، دەبێ باس و لێکۆڵینەوەی بابەتییانەو هەمەلایەنەی ئەزمونەکەی مەهاباد بکرێ، دەبێ لەژیانی پێشەوا: ئایینی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و دیپلۆماسی، ڕۆشنبیری، سەربازی، باری سەرنج و بۆچوونی نەتەوەیی و نیشتمانی شارەزا بین، چونکە هەر بەوانەش نرخاندنی زانستییانەی ڕۆڵ و جێگەو بڕیارەکانی دەکرێ.

بۆ ناسینی قازی محەمەدو زانیاری سەرەتای ژیان و شێوەی پەروەردەو پێگەیشتنی باجارێ پەنا بەرینە بەر سەرچاوەی ڕەسەنی سەردەمەکە(ڕۆژنامەی کوردستان) بابزانین لەو ڕووەوە چی تۆمارکراوە:

(حزرتی پێشوای کوردستان محمد قازی کوری اغا میرزا علی مرحومە لەبانەمەر(اردیبهشت)1279ﻫ شمسی بەرانبەر بە 2 محرم 1318ﻫ ق لەشاری مهاباد لەدایك بو. ئەم زاتە زۆر بەچاکی لەژێر دەستی باب و دایکی‌دا پەروەردە کرا... دوای خوێندنی چەن رسالێکی کوردی و فارسی دەستی بەخوێندنی سەردای نحوو صرف کرد هەروا ادامەی بەخوێندندا تالەعلومی معقول و منقولدا: نحو، صرف، منتق، بلاغە، اصول، فقە، کلام.. فارغ التحصیل بو.. بێ ووچان لەڕووی خوێندن و زیادکردنی معلومات و فێربوونی زمانی بێگانە دەگەڕا، توانی بەوسیلەی مامۆستای تایبەتی زبانی انگلیسی، روسی، فرانسی بخوێنێ و بێجگە لەم سێ‌زمانەو زمانی زگماکی خۆی کە کوردیە، زمانی عربی، فارسی و تورکیشی زۆر باش دەزانی.

حضرتی محمد قاضی پێشوای کوردستان هەرلە منداڵیەوە خاوەنی گیانێکی بەرزو بەهێزو نیشانی گەورەیی، شجاعەت، لەخۆبوردن دەویدا دیاری دەدا... بێ وچان لەحقوقی هەموو کوردێك بەتایبەتی هەژاران و لێ قەوماوان لەهەموو جێگایەك دا دفاعی کردووەو دەیکا، بەطوری کلی رشتەی کاروباری مهاباد، سیاسی، کۆمەڵایەتی و.. حتی دە دەوری دیکتاتۆری رضا خاندا دە دەستی‌دا بوو... کاروباری حکومەتیش بێ مداخلەی وی حل نەدەکراو جێ‌بەجێ نەدەبوو...

اموژگاران و شاگردانی مدارس بەوەسیلەی رەهبری خۆیان مناسباتی سیاسیان دەگەڵ احزابە ازادیخواکانی عراق، تورکیە، سوریا، بنیادنا، وەختێ کە رضا خانی فاشیست لەکرودستان نفوذی پەیداکردو بەدەستوری مقاماتی فاشستی لەسەرۆکی فرهنگی لابرا... جنابی محمد قاضی دەگەڵ دوژمنانی شخصی خۆی بەمداراو دەگەڵ دۆستان بەوفایە بەلام ناتوانێ لەمقابل دوژمنانی نیشتماندا مدارا بنوێنێ.(2)

دیسان (ر.ك)و گەلێ نوسەری بیانیو فارسی، هەندێ خەسڵەتو رەفتاری ئەویان باسکردووە کە : شارەزای مەسەلەکانی ئایین، سیاسی، ئابووری، کۆمەلایەتی بووە.

پاش هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە بڕیاری خۆی ئەدا ئیتر دوای ئەوە نەیدەگۆڕی.. ماڵەکەیان پەناگەی هەموو ئەو کەسانە بوو کە دەکەوتنە ناو کێشەو گرفتەوە. زۆر لەو کچو ژنانەی تووشی کێشەو پەژارەو گرفت دەبوون پەنایان بۆ قازی محەمەد دەبرد، کەسێکی بەدەمو زمان... پتەو تاڕادەیەك دیکتاتۆر، لەبینیندا بەرامبەرەکەی ناچار دەبوو رێزی لێبگرێ. ئەوانەی لەنزیکەوە بینیبوویان بەباشی بۆیان دەرکەوتبوو کەچی شەخسییەتێکی هەیە، هەروەها فرە زوو تێگەیشتبوون کە ئەو چۆن لەهەموو جێگایەك بۆتە سیمبۆلی کوردایەتی، لەسەرخۆو مەتین، بەئارامی قسەی دەکرد.(3) پێش ئەوەی باوکی ئیجازەی قازێتی بداتێ سەرۆکایەتی مەعاریفو ئەوقافی مەهابادی لەئەستۆدا بوو. (4) پیاوێکی ئاگادارو بەرەوشتو هێمنو دانا...

لەخێزانێکی ناودار. پیاوێکی سیاسی بو... مێژووی کۆنی کوردستانی خوێندبووەوە.(5) تا ئەو سەردەمە هیچ سەرکردەیەکی کورد وەك ئەم تینووی بلاوکردنەوەی خوێندنو خوێندەواری نەبووە، رۆشنبیرو زانایانە، هەر پێش بلاوکردنەوەی دامەزراندنی کۆمار. لەناو ئەو قەوارە خودموختارییەی هێنرایە ئاراوە، زمانی کوردیی کردە زمانی خوێندن، خوێندنی قوتابخانەی بۆ کورو کچ کردە زۆرە ملێ: (لەو تاریخەوە تا 10 رۆژی دیکە هەر کەسێك کورو کچی هەبێ کە عومری اقتضای خوێندن بکا دەبێ بینێرنە مەدرەسە ئەڵبەتە هەر کەس لەو ئەمرە روو وەرگێڕێ بەتوندترین مجازات تەنبی دەکرێ:(6)

بۆ سەردەمو رۆژگارێکی وەك ئەو دەمەی کۆمەڵی کوردەواری، لەزانایەکی ئاینییەوە بڕیارێکی وا هەستیار، هەنگاوێکی مەزن بووە، بەو جۆرە خواستی بوو کە کورد لەنەخوێندەواری رزگار بکات، پێشەوا قازی محەمەد روناکبیرێکی هەڵکەوتوو

بوو کە وێنەی لەڕۆژگاری ئەو کاتەی نەتەوەی کورددا زۆر کەم بەدی دەکرا... گوڵێك بوو لەسەحرا روابوو، بەڵام دیسانەکە لەگەڵی خۆی نزیك بوو... دەردو ئازارو هیواو ئاواتەکانی زۆر باش تێگەیشتبوو... ئەوەندە خۆشەویست بوو... کە خەڵك خۆی نازناوی پێشەوای پێدابوو...(7) دیسان هەر قاسملو دەنووسێ: "شەخسییەتی قازی محەمەد پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، ئەو شەخسییەتە مەزنە لەمێژووی گەلی کورددا پلەو مەقامێکی تایبەتی و بەرزی هەیە، قازی محەمەد لەشارستانییەت و زانستی تازەو هەروەها وەزع و رووداوەکانی جیهانی تەواو شارەزا بوو."

رۆڵی دەرکەوتووی قازی محەمەدو شیاویی بۆ رابەر، لەو کاتانەوە باشتر دەرکەوت کە هەلومەرجی کەمێ لەبار رەخسا بۆ پێکهێنانی دامودەزگای خۆماڵی بۆ خۆبەڕێوەبردن، پێش ئەو دەسپێشخەرییەش، هەر دوای داگیرکردنی هەندێ ناوچەی ئێران، مەهاباد کەوتە بەر مەترسی هێرش و تالانی هەندێ تیرەو هۆزی کورد خۆی، ئەو لەهەموو کەس زیاتر بەپەرۆش بوو. لەدانیشتنێکدا لەگەڵ (مامۆستا مەلا رەحیمی عەبباسی)و قسەو باس و پرسیار لەسەر بارودۆخەکەو ساتەکانی ئەو رۆژگارە ئەم سەر گوزەشتەیەی لەزمانی حاجی سەید عەلی حەسەن پوور بۆ باس کردین:

شەوێکی لەدەرگا درا... کە کردمەوە، روانیم قازی محەممەد بۆ خۆی بوو، پاش سەلام و هەواڵپرسین، گوتی: تفەنگت هەیە؟ گوتم: بەڵی، گوتی: دە هەستە چیت فیشەکیش هەیە هەڵیان بگرەو بابڕۆین، گوتم: بۆ کوێ؟ گوتی: دەڵێن ئەمشەو مەنگوڕ دێنە سەر مەهاباد. پێکەنیم گوتی: بۆچی پێدەکەنی! دەزانم دەڵێی قازی... ئێمە بەدوو تفەنگ چیمان پێدەکرێ.. ئنجا گوتی: دەسا خۆت...، چونکە ئەوان بەشەو دێن... کە تەقە رووبەڕوویان دەبێ، ئەوان نازانن ئێمە چەند تفەنگین...

وا دەزانن پێنج سەد بۆیان دانیشتوون.. ئەو شەوە چووین، بەڵام هیچ رووی نەدا. بۆ سبەینێ کە پێشەوام دیتەوە پرسیم: کەچی کردووە؟ گوتی: بۆ ئەمشەوی سێ سەد چەکدارم هەیە.(8)

زۆر مەبەستی بوو ئارام و ئاسایش باڵ بەسەر کۆماردا بکێشن، هەر زوو پۆلیس و پارێزەرانی ئاسایش بۆ مەهاباد رێکخران.

چەند گەلەکەی خۆش دەویست هێندەش بەتەنگ گەلانی ترەوە بووە، چونکە: "چوارچێوەیەکی فیکری زۆر بەربەرینی هەبوو نێو نەتەوەیی بیری دەکردەوە، هەموو نەتەوەکانی دنیای خۆش دەویست." "ماوەیەکی زۆر بۆ زمانو ئەدەبیاتی کوردی داناو بایەخێکی زۆری پێدا، رەنگە وجودو دەوری چالاکانەی دوو شاعیری گەنج، هەژارو هێمن، لەو هەڵوێستەی قازیدا فرە تەئسیری هەبووبێ."(9) بۆیە لای مەبەست بوو کە زمانی کوردی پێش بکەوێو پاکژ بکرێ، بۆ پاککردنەوەی زمانەکە لەوشەی ئەو زمانانەی لەرێی داگیرکردنو سەپاندنی کولتورێکی نامۆ بەکورد کاری خۆیان کردبووە سەری، کۆڕێکی دامەزراند تا وشەی فارسیو عەرەبی بەوشەی کوردی بگۆڕدرێن.

هاتنە مەیدانی سیاسییەوە:

سەرەتای چالاکیو هەستی نیشتمانپەروەریو خۆشەویستی نەتەوە لای قازی محەممەد هەر بە سۆزێکی سادەو دوور لەچالاکییەوە نەوەستا، بەڵکو بەهۆی ئەوانەوەو سەبارەت بەوە کەلەخێزانێکی ناسراوو نیشتمانپەروەردا پەروەردە بووبوو، هەر لەسەرەتای ژیانییەوە تێکەڵی چالاکی سیاسی بوو. "لەساڵەکانی 1927-1930دا کۆمەڵێکی زۆر بچووکی سیاسی کورد دامەزرابوو کەلەگەڵ راپەرینی ئاراراتو خۆیبوون پەیوەندی هەبووە، وە لەگەڵ کوردستانی عیراقیش جاروبار پەیوەندی رادەگرت، ئەوانەی لەبەرێوەبردنی ئەم کۆمەڵە بچووکەدا ناسرابن بریتی بوون لە: (قازی محەممەدی شەهید، شێخ ئەحمەدی سربڵاوا، قازی کاکە حەمەی بۆکان، مەلا محەممەد صادقی قزڵجیو مەلا ئەحمەد فەوزی)(10)

ئەو جۆرە پەیوەندییە سیاسییانە، لەگەڵ رۆژدا فراوانتر دەبوون، زیاتر لەسەر گۆڕەپانی تەسکی سیاسەتی ئەو سەردەمەدا لای رۆشنبیران دەردەکەوت، بۆیە هەندێ لەرۆشنبیرانی کۆمەڵەی (ژ.ك- کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد) کەوتنە سەر بیری خۆنزیککردنەوە لێی تالەئۆکتۆبەری 1944دا لەکۆبوونەوەیەکی نهێنیو تایبەتی، بوو بەئەندامی کۆمەڵەو ناوی نهێنی(بینایی) لێنرا." هەرچەندە قازی محەممەد ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبوو، بەڵام رابەرو دەمڕاستی کۆمەڵە هەر ئەو بوو.(11)

دوای ئەم رووداوە، ژ.ك گەشەی چاوێنی دەست پێکرد، دانیشتوانی شارو دێهاتی هەر لەمەهابادەوە تا شنۆو نەغەدەو بۆکانو سەرو سەقز کەوتنە سەر بیری

هاوبەشی کردن، زۆر لەتیرەو هۆزەکان بەهاندانی سەرۆکەکانیان لە ژ.ك-دا بوونە ئەندام، پەیوەندی بەبەشەکانی تری کوردستانەوە زیاتر دەبوو، لقی کوردستانی عیراق کەبەلێپرسراوەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دامەزرابوو، چالاکییەکانی زیاتر دەبوو.. بەنامەیەکی تایبەتی پەیوەندی بەبارزانی، کە رابەری شۆڕشەکەی بارزانی دەکرد، کرابوو. تالەمەرامو مەبەستی بگەن، بۆ نەخشەی هاوکاریو یارمەتی .

لەو سەردەمانەدا کە چالاکیو هاتوچۆ زیاتر دەبوون، قسەو باس لەسەر دامەزراندنی کۆمارێ بۆ کورد گەرمتر دەبوو، سۆڤیەتەکانیش ئامۆژگارییان کردبوو کە کاتی ئەوە هاتووە لەجێگەی کۆمەڵەی ژ.ك حیزبێکی دیموکرات دابمەزرێنرێ. ئەم بیرە لەناو رۆشنبیرانی کۆمەڵەشدا قسەی لەسەر دەکرا. هەر وەك هێمنی شاعیر باسی دەکات:

دەستەیەك لەڕووناکبیرانو ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ك هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە جێبەجێکردنی بەرنامەی کۆمەڵە لەهەلومەرجی ئێستای جیهانو کوردستاندا ئیمکان کەمە، بۆیە بەرنامەیەکی کورتو نوێیان کەلەگەڵ هەلومەرجی ئەو سەردەمەدا دەگونجا گەڵاڵە کردو لەڕۆژی سێی خەزلوەری 1324-1945 یەکەم کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەشاری مەهاباد گیرا." (12)

رۆڵی قازی محەمەد لەخەملاندنی بیری دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان، بەبەستنی یەکەم کۆنگرەو داڕشتنی بەرنامەو نووسینی ئاگاداری لەمەڕ دامەزراندن، زۆر دیارو کاریگەرو بوو. بەتایبەتی هەموو لەبەردەم گۆڕانێکی گەورەتردا بوون، جەماوەری حزبەکەو رێکخستنەکەی، بەجۆرێ بەرین بوو کە نەدەتوانرا بەماوەیەکی کورت بیانگرنە باوەش، داخوازییە: کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیریو سیاسییەکان روونو ئاشکراتر کران، قازی محەمەد وەك رابەری حزب جێگەی پتەوترو خۆشەویستتر دەبوو، ئەو گۆڕانەی کە هەمیشە جێگەی رەخنەو مشتومڕ بووە "ئامانجە مێژووییەکەی نەتەوەی کورد" کە کۆمەڵەی ژ.ك کردبوویە دروشمو ستراتیجی خۆی، "یەکگرتنەوەو سەربەخۆیی کوردستان" گۆڕدرا. ئەگەر لەڕووی باری نێو دەوڵەتان، هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت، بارودۆخو هەلومەرجە خۆییەکان، جیۆپۆلیتیكو جیۆستراتیجی لەمەڕ کوردستان، رژێمی تارانو هەڵوێستی گەلی فارس بەرامبەر مافی چارەنووسی کورد، بیروڕای حیزبە ئێرانییەکان بەچەپو

پێشکەوتنخوازەکانیشەوە...هتد ئەگەر بەلەبەرچاوگرتنی جۆری سازانی ئەوانە لەگەڵ ئەو گۆڕانە، وەك هەنگاوێ لەوەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتییەکان، ئەو هەنگاوە بۆ ئەو گۆڕانە، بنرخێنرێ، وا بۆ ئەو سەردەمە هەر دەتوانرا ئەوە بکرێ، چونکە کاروبارو ڕووداوەکان نەلەدەست کورددا بوون و نەبەحەزی کورد دەسوڕان. بۆیە تائێرە هەڵەیەك نەکرابوو کە زیانی گەورەو ڕاستەوخۆ لەجووڵانەوەی نیشتمانی کوردو کۆمار بدرێ، بەڵام هەڵەی گەورە لەوەدابوو کە ئەو گۆڕانە کرا بەستراتیجی جووڵانەوە، تا ئەو کاتەو تائەوێ گۆڕانەکە بەخۆگونجاندن بوو لەگەڵ هەلومەرجەکاندا. بەتایبەتی ئەوە زیاتر لەبەرنامەو لەپرۆسەی گفتوگۆدا دەردەکەوت، بەڵام لەناو مامەڵەو ناوکرداردا: جەمهوریەتی کوردستان بەدامودەزگای وەزارەت و بەڕێوەبردن، سوپاو هێزی چەکدار، ئاڵای سێ ڕەنگ، مامەڵەی سیاسی و دیپلۆماسی و پەیمانبەستن، وتوویژ وەك لای دووەمی خاوەن قەوارەیەکی یاسایی و مەعنەوی، میدیاو رادیۆو چاپەمەنی، زمانی کوردی کردنە زمانی خوێندن و رەسمی...هتد ئەوانە هەمووی لەناو دیدی سیاسەتمەدارانی رژێمیشەوە، دووربوون لەخودموختاری.. زیاتریش لەوە هەر لەیەکەم کۆنگرەی ئەم حیزبە تازە بەوەڵەد بووە، لەئاگادارییەکەی لەمەڕ کۆنگرەدا دروشم و ئامانجە ستراتجییەکە زۆر بەئاشکرا تۆمارکراو دانی پێدانرابوو، رۆژنامەی کوردستان-ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان لەژمارە (302) لەژێر سەرباسی وتاری سەرەکییدا:

تێوەرسووڕانی پێنجەمین وەرزی هەوەڵین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان نووسیوێتی: پێنج وەرز لەمەوبەر دە بەرواری 2ی مانگی خەزەڵوەردا هەوەڵین کۆنگرەی حزبی دیموکراتی کوردستان لەبازێری مهاباد بەاشتراکی 270 نفر نوێنەرانی تەواوی چینەکانی کوردستانی مەزن ساز بوو.. وەکی معلومە لەدوژمنانی نەتەوەی کورد ایمە دایمە داوایان دەکرد کە گوایا ییکەتی ارادەو امانج دەنێو نەتەوەی کورددا دەگۆڕێ دا نیە.. بەڵام دیسانەکەیش ارادەی ییکەتی خوازی پی بی هێز نەکراو لەکوردستانی داگیرکراوی سوریەو عراق و تورکیەدا چەند نوێنەرێك بۆ اشتراك کردن دە کۆنگرەدا، هاتنە مهابادی، نوێنەری کوردستانی داگیرکراوی عراق دە کونگرەدا رای گەیاند "کەدەبێ تەواوی کوردستان ییك کەوێت مرامی حزبی دیموکراتی کوردستان رزگارکردنی تەواوی کوردستانی داگیرکراوە.. نوێنەرەکانی

کوردەکانی سوریە گووتی کە: ئیمە بەتەواوی هێزی خۆمان حازرین کەبەگوێرەی مرامنامەی حزبی دیموکراتی کوردستان تێبکوشین و ئەمن سلاوی گەرم و گوڕی دانیشتوانی کوردستانی سوریەو لوبنان بەخەڵکی قارەمانی مهاباد و بە نوێنەرانی کۆنگرە رادەگەیەنم... پێشەوای شهیدی نەتەوەی کورد قازی محمد دەو کۆنگرەیەدا نتقی کردو لەپاش بەخێرهێنانی نوێنەران و دووان لەمەڕ ئەو مەبەستانەی ژووروو رای گەیاند کە ....هتد دە هەوەڵین کۆنگرەی حزبی دیموکراتی کوردستان دا ریزە قرارێك قبوڵ کرا... هەروەها کۆنگرە لەپاش تەواوکردنی کاروباری خۆی اگادارییکی بلاوکردەوە... هەوەڵین کۆنگرەی حزبی دیموکراتی کوردستان لەپاش چەند رۆژ سکالا بەاشتراکی نوێنەرانی تەواوی نەتەوەی کورد ئەو نتیجەیەی وەدەست هێنا کە دەبێ کوردستان رزگارو سەربەست و ییك بێت..نهایت کۆنگرە بەسەرۆکایەتی قاضی محمد کومیتەی ناوەندی هەڵبژاردو پێی ئەسپارد کە لەوروا بەگوێرەی مرام و نظتمی تصویب کراوی کونگرە دەست بەکار بکات."(13)

لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەو دامەزراندنەی حزبی د.ك لەجێگەی ژ.ك، نەبووە هۆی وەلانانی یەکجارەکی و پێچانەوەی ستراتیجەکە. ئەوەی نائاسایی و بەزیان بووە لەو کارەدا ئەوە بوو کە خودموختاری لەدوای کۆماریش کرا بەتەوقێك و خرایە گەردنی جووڵانەوەی نیشتمانی کورد، دوایی تریش وشەی ئێران یش لکێنرا بەپاشکۆیەوە، کارە خراپەکە لەوەدا بوو کە کوردستانی عیراقیشی گرتەوە، بەجۆرێ کە تائێستاش نەتوانراوە ئەو تەوقە بشکێنرێ و هیچ لایەك تەواو خۆی لێ رزگار نەکردووە.

ئەگەر دامەزراندنی ح.د.ك لەجێگەی کۆمەڵەی ژ.ك بەخواستی رێکخستنەکەی ژ.ك نەبووایە، تەنانەت بەخواستی لێپرسراوانیش نەبوایە، کارێکی نائاسایی و سەپێنراو بووایە، وادەبوو ئەو ناڕازییانەی ناو کۆمەڵە ملیان بۆ ئەو سەپاندنە دانەنەواندایە، یا کاریان نەکردایە.

یادەبوو پاش لێکهەڵوەشاندنی کۆمار ببوژایەتەوەو بکەوتایەتەوە خەبات، دەبوو حزبی دیموکرات برووخایەو جارێکی تر سەری هەڵنەدایەتەوە، هەر وەك چۆن ژ.ك سەری هەڵنەدایەوە، کەچی وەك دەزانین ئەوانە هیچیان روویان نەدا، بەڵکو پێچەوانەکەشیان رووخساری جووڵانەوەی نیشتمانی کورد بوون، بەلام بەتەوقەکەوە.

بۆچی؟ چونکە رابەرانی نوێ دەرکیان بەجیاوازیی هەلومەرجەکانی ئەو دوو پلە تەواو لەیەکجودایە نەکرد.

لەدایکبوونی جەمهورییەتی کوردستان رادەگەیێندرێت:

دوای دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان و دووەم سەفەری نوێنەرانی کورد بەسەرۆکایەتی قازی محەممەد بۆ باکۆو گەڕانەوەیان... مەهابادو ناوچەکانی دەوروبەری روخسارییان تەواو گۆڕا، خەڵك چاوەڕوانی ئەو رۆژە مێژووییەیان دەكرد کە سەدان ساڵ بوو خەویان پێوە دەبینی. پاش چوار ساڵ لەبێدەنگی یەکێتیی سۆڤیەت، وا رەزامەندی خۆی نیشاندا بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی خودموختار، دوای ئەوەی تەقەلای بەستنەوەی کورد بەپاشکری ئازەرەوە لەبەردەم پێداگرتنی کورددا بەتاڵ بووەوە.

رۆژی 2ی رێبەندانی 1324(22جانیوەری 1946) لە چوارچراو بەئامادەبوونی دەیان هەزار کەس، لەدایکبوونی" جەمهورییەتی کوردستان" راگەیەنراو پێشەوا قازی محەممەد بەسەرۆککۆمار هەڵبژێردرا.

دامودەزگاکانی، هەر لەکابینەی وەزارەت و ئیدارە گشتییەکان تا قوتابخانەو دایەرە جۆربەجۆرەکان دامەزرێنران، یان شێوەو دارشتنی نوێیان گرتەخۆو کەوتنەکار.

خەسڵەتە هەمەجۆرەکانی کۆمار، نیشتمانی و ئازادو دیموکرات، خۆشەویستی جەماوەر بۆی، باری ئاساییش و ئامادەیی خەڵك بۆ فیداکاری، سروشتی نەتەوایەتی و هاوپەیوەندی بەبەشەکانی تری کوردستانەوە، پەیوەندی دۆستانەو چارەنوسگرێدراو لەگەڵ ئازەربایجان، باری سەربازی و شەڕو پێکادان، وتووێژو نەشەڕو نە ئاشتی، باری ئابووری وگوزەرانی خەڵك، باری رۆشنبیری و خوێندەواری، میدیا و رادیۆو چاپ و چاپەمەنی..هتد لەو ماوە کورتە کەمتر لەیەك ساڵدا، کارو شوێنەورای چاوێنی ئەو ئەزموونە بوون، لەگەڵ ئەو هەموو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمانەی کەرۆژانە رووبەڕووی دەبوون.

"ئەمن لەگەڵ رۆژنامەنووسێکی ئەمریکایی و یەکێکی فەرانسەیی چووینە مەهاباد کەبەچاوی خۆمان کۆماری خودموختاری کوردستان ببینین و لەگەڵ سەرکۆمارەکەی

قازی محەممەد وتوویژ بکەین. ئێمە بەتەواوی بۆمان روون بووە کە ڕێوشوێنێکی کۆماری ڕێك و پێکی کورد وجودی هەیە... ئێمە بەدیتنی قازی محەممەد هەستمان کرد کەناوبراو نفوزو بەرێزییەکی کاریگەری هەیە لەنێو زۆربەی گەلدا.. قازی پیاوێك بوو خاوەنی جەسارەت و ئازایەتی و بەکاری یەکی بێوێنە، خاوەنی مەنتیق و وتاردەرێکی کاریگەرو بەبڕشت بوو و بەتەواوی هێزی خۆیەوە تێدەکۆشێ ڕێوشوێنی کوردستان لەسەر بنچینەیەکی پتەوو قایم و خاوێنی دیموکراسی، بگۆڕێت.(14)

-(لەکۆڵان و شەقامەکانی مەهاباد بەئاشکرا دەکرا گوێ بدەیتە رادیۆکانی ئیستەنبڵ و لەندەن، بەڵام لەتەوریز گوێدان بەم رادیۆیانە تاوانێکی مەزن بوو سزای مەرگی بۆ داندرابوو.(15)

مامەڵەی دیپلۆماسی لەناو هەلومەرجێکی ئاڵۆزدا:

جیوپۆلیتیك وەك هاوپەیوەندی نێوان جوگرافیاو سیاسەت، وەك زانستی لێزانینی هۆو زەمان و شێوەی کارتێکردنی فاکتەرە سروشتییەکان لەسەر جێگەو دەوربەر لەمامەڵەی دیپلۆماسی، کە تاڕادەیەکی دوور کەئاڕاستەکراوی رۆڵی (یەکە) جوگرافییەکانە لەبڕیاردانی سیاسەتی دەوڵەت. ئەم لقەو لایەنە هەستیارە تەواوکەرەکەی (جیۆستراتیجی) کە هاوپەیوەندی فاکتۆرە جوگرافییە کارتێکەرەکانە لەسەر ستراتیجی دەوڵەت دەستنیشان و پێناسە دەکا.. (16)

لەمەوە دەتوانرێ بگوترێ، رادەی راست و دروستی بڕیاری سەرکردەو سەرکردایەتی لەکێشەی هاوپەیوەند بەوانەوە، تاڕادەیەکی دوور بەستراوەی ئاستی شارەزایی و تێگەیشتنی باری جیۆپۆلیتیك و جیۆستراتیجە.

ئەگەر ئەو پرنسیپە گشتییانە لەگەڵ تایبەتێتییەکانی جێگەی جوگرافی کوردستان بەگشتی و کۆمار بەتایبەتی سەرنج لێبدرێن، وا توندو تۆڵتر ئەو هاوپەیوەندییانە خۆیان دەنوێنن، یەکتر دەگرن و زیاتر رووداوەکان، لە مامەڵەی سیاسی و لەپرۆسەی دیپلۆماسیدا ئەوقی خۆیان دەکەن...بۆچی؟ ئەوە سەبارەت بەگەلێ هۆی تایبەتە بەکوردستان، لەڕووی: دابەشبوون بەسەر چەند دەوڵەتێکدا، فرە دوژمن و ئابلۆقەی کوردستان، دابەشبوونی هێزی مرۆڤی و ئابووری و زەمینی کوردو نیشتمانەکەی، کە جگە لەکاری پڕ لەزیانیان، بوونەتە هۆی زەمینە خۆشکردنیش بۆ

دەرپەڕاندنی رۆڵی فاکتەری کورد، وەك هێزێکی مرۆڤی گەورە، رۆڵی خەسڵەتە ستراتیجی و ئابوورییەکانی کوردستان، لەناو ستراتیجی زلهێزەکان لەناوچەکەدا... سەرباری شێواندنی سروشتی گەشەکردن و روخساری جووڵانەوەی نیشتمانی و ئامانجەکانی . ئەم دیاردەیە هەر لەو سەردەمەی پێش کۆمارەکەوە، تائێستاش یەکێکە لەو هۆ گرنگانەی کە کێشەی کوردی لەزۆر لاوە زیاتر ئاڵۆزو دابڕاوو بێ دۆستی ستراتیجی کردووە، بەجۆرێ کە تەنانەت لەمێژووی جەنگی سارد، بەشێوە کلاسیکییەکەی، ناکۆکی و ململانێ نوێیەکان، رۆڵێکی نەبێ یان نەیدرێتێ، یارۆڵێکی کاریگەرو کارتێکەری وای نەبێت.(17)

ئەگەر لەگەڵ ئەوانەدا، کۆی کێشەو تەگەرەو گرفتە جۆراوجۆرەکانی ناوخۆو دەورووپشت بهێنینە بەرچاو، لەبەر رووناکییان نرخاندنێکی بابەتییانەی دیپلۆماسییەتی سەرکردایەتی کۆمار بکرێ، بەرەچاوکردنی تەنها دەربازگەی ئازەربایجان-سوڤیەت، بەهەموو گرێ و گۆڵ و کۆسپەکانییەوە، لایەنی تاران و گفتوگۆ، کەلەراستیشدا، کوێرڕێیەك بوو، دەشبوو وازی لێنەهێنرێ، وەکەبەسوودی تاران و چەواشەکردنی کورد کۆتایی دەهات.. وا دەزانرێ کە مامەڵە دیپلۆماسییەکە چۆن پێچراوەی ناو کێشە سەختە لەچارەسەر نەهاتووەکان بوو.

گومانیش لەوەدا نییە کەڕادەی سەرکەوتنی سیاسەتێ، مامەڵەیەکی دیپلۆماسی، بڕیاری سەرچاوەو ئەندازیاری سیاسی، زیاتر هاوپەیوەندی خورتیی هێزو مەڵبەندەکەیەتی، دوای فاکتەرە نێودەوڵەتییەکە کە بۆ ئەم قەوارەیە، سەرەکی و بنچینەیی بوو. لەگەڵ هەموونەو هەلومەرجانەی سەنگی خۆیان لەناکۆکی و ململانێیەکەدا دەبینن.

هەر لەسەرەتای دامەزراندنی خودموختارییەکەی کوردەوە(1942) لەو بەشەی کوردستانی رۆژهەڵاتدا، بە گشتی و، لەدامەزراندنی کۆمارەکەوە بەتایبەتی، سەرباری ئەو هەموو گرێ و گۆڵ و کێشەو ئاڵۆزییانەی ناوخۆ، هەرێمی و نێودەوڵەتاندا، هەروەك قەوارەیەکی سەربازی، تەمەنی کورتی لەناو کرژیی سەربازی، شەڕو پێکادان، نەشەڕو نەئاشتیدا بردەسەر.

لەسەر ئەو زەمینەیەو لەناو ئەو ئاووهەوایەدا بوو کە پێشەوا مامەڵەی سیاسی و دیپلۆماسی خۆی دەکردو دەجوڵا. رووی سیاسی و رۆڵی رابەریی قازی محەممەد،

هەر لەیەکەم سەفەری نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ(سەرماوەزی 1320) کە نوێنەرانی‌سۆڤیەتەوە دەستنیشان کرابوون، دەرکەوت، کەزیاتر بۆ ناسین‌و ئاشنایەتی بوو، هەرچەند بەسەفەری فەرهەنگی ناو دەبرا، بەڵام سروشتی سیاسی شاراوە نەبوو، زیاتر لەوە نوێنەرانی دانیشتوانی ناوچەیەك بوون، بێخاوەن، لە رووی حکوومەتەوە، چونکە دامودەزگای تاران یا نەمابوو یارۆڵی لەدەست دابوو، ناوچەیەکیش بوو کەلەمێژەوە رۆڵی سیاسی خۆی بینیبوو، هەرچەندە لەو سەفەرەدا هیچ دەستگیر نەبوو، بەڵام دیسان کورد بێ ئومێد نەکرابوو، جگە لەوە قازی محەممەد تاڕادەیەك لەبیرورای سۆڤیەتەکان حاڵی ببوو زیاتر ئاشنایەتی پەیداکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا قازی محەممەد دۆستایەتی خۆی لەگەڵ ئەو رۆژئاواییانەی لەناوچەکەدا بوون باشتر دەکرد، بە مەبەستی دۆست پەیداکردن‌و سوودوەرگرتن لەهەلە رەخسیوەکە.

"لەسێپتامبەری 1941دا دوو ئەفسەری ئینگلیزی‌و ئەمەریکایی گەیشتنە مەهاباد، بەهۆی ژنێکی نەرویجییەوە، پلانێکی نادیار بۆ کوردستانێکی گەورە خرایە بەردەمیان، بەڵام ئەفسەرەکان هیچ جۆرە هاندانێکیان لێدەرنەکەوت، ئیتر دوای ئەوە بوو کە گفتوگۆی سیاسیانی کورد لەگەڵ رووسەکاندا دەستی پێکرد.(18)

"ئارچی رۆزفلت" کەئەفسەرێکی موخابەراتی ئەمەریکایی بوو لەسەفارەتی وڵاتەکەی لەتاران، هاتوچۆی مەهابادی کردبوو پێشەوای بینیبوو، هەر لەبەر هەمان هۆو را ئەو پەیوەندییە ئاشکرا دەکات، وەکوو لەدواییدا باسی دەکەین.

هەوڵێکی تری راستەوخۆی پێشەوا قازی محەممەد لەگەڵ ئینگلیزەکان بوو، دوو نوێنەری خۆی نارده تەورێز تا کونسولەکەیان ببینن بۆ ئەوەی لەئایندەدا پەیوەندی رەسمی ببەستن، بەڵام "عبدالرحمن زەبیحی"و "علی ریحانی" وەرامێکی نادیارو بێ ئومێدیان دەستگیر بو."(19)

هەرچەندە پێشەوا رابەری ئاینیش بوو، بەڵام لەگەڵ گەشەکردنی شارستانییەت بوو، ئاسۆی بیرو روانگەی بۆ جیهان کراوە بوو... "هەر لەسەرەتاوە چەند پروتستانتێکی ئەمریکایی‌و دکتۆرێکی ئەڵەمانی دۆستی بوون لەمەهاباد".(20)

هەمیشە لەگەڵ ئەو بیانییانەی کەلەوەخت و ناوەختا دیدەنی مەهابادیان دەکرد گەلێ بەرێزەوە رەفتاری لەگەڵ دەکردن، دۆستایەتی لەگەڵ ئەمەریکاییەکاندا گەرم بوو".(21)

کاتێ پێشەوا لەتاران دەبێ بۆ وتووێژ لەگەڵ سەرەك وەزیران قوام ولسەڵتەنە لەدیدەنییەکی رۆژنامەی (رهبر) لەناو پرسیارەکانیدا ئەم پرسیارەش دەکات: "بۆچی فرانسەوی راجع بەمسئلەی کورد زۆر علاقە دەنوی نی و ایا ئەو خبرەی فرانسەوی بەزمانی تووە گوتویە:"ایمە هەر وەختێك کە کەیفمان لی بێ کرماشان وەدەست دەگرین" راستە یان نا؟

وەڵام من پێم وایە فرانسەوی دەگەل کوردان نزرێکی خراپیان نیە، لەسوریە ئەوەندەی لەدەستیان هاتبی کومەکیان بەکوردان کردوە. راجع بەخبرێکی مخبری فرانسە لەزمان منەوە گتویە، هەوەل ئەوەیە کە ئەم قسەیە بۆ ئێستاکە ایمە لاگیری ئەوەین مسئلە بەمسالمەت حل بی مربوت نیە، دووەمیش ئەمەیە کە منظور دە دەست گرتنیکی غاسبانەو امپریالیستی نەبووە بەلکو مقصود ازادکردنی بەشیك لەهاونیشتمانان و کۆمەڵێکی پتر بەازاد تەواوی ایران بووە. دیسانیش دەلیمەوە کەدەولەتی ایستا ئەو جورە نظریانە کە هی زەمانی حکومەتە ارتجاعیەکانی پیشوە لەناو دەبا."(22). کێشەی گەورەی بەردەم دیپلۆماسیەتی پێشەوا قازی محەممەد، هەر ئەوانە نەبوون، بەڵکو ئاڵۆزتر لەوانە لەوەدا بوون کە دۆستەکانیشی لەناو جۆرێ لەپیلان و ئەوقکردن و لاوازکردنی کۆماردا بوون، نەك هەر لەرووی سیاسییەوە بەڵکو لەرووی ئابووری و چەك و ئازووقە، سیاسی و یاسایی، کێشەدروستکردن، ناکۆکی و ململانێ لەسەر سنوور، بەتایبەتی کاتێ کەئازەرەکان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە شارەکانی (خۆی، سەلماس، میاندواوو ورمێ) کورد نین و دەبێ لەناو سنووری کۆمارەکەیاندا بن، گفتوگۆو دانیشتن و دووجار سەفەری پێشەوا بۆ تەورێز بێ ئەنجام کۆتایی دەهاتن.

دیارە ئەمەش هەر لەناو بەشێکی نەخشەی پاشەرۆژ سەیری دەکرا. بەتایبەتی سیاسەتی رووسەکان چەند سەری بووەو بۆ هەر لایەك ئامانجێکی دیاری بۆ دانراوە:

رووی سیاسەتی رووسەکان بەرامبەر بەئێران دوو لایەنی و دوو ڕوو بووە، مۆلۆتوف، وەزیری دەرەوە لەگەڵ سادچیکوف سەفیریان لەتاران لەگەڵ وەرگرتنی

ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی سەرووی ئێران."بیریا" دەستەڕاستی ستالین و باقرۆف سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنستی ئازەربایجانی شوورەوی جارەها قسەیان لەسەر پێوەلکانی ئازەربایجانی ئێران بەتەعبیری ئەوان"ئازەربایجانی خواروو" بەبەشەکەی سەروو کردووە."(23)

لەگەڵ ئەو بارو دۆخ و گوشارو نائارامییەی ئەو هەڵویست و سیاسەتانە خوڵقاندبوویان:

خاڵی سەرنج ڕاکێشەر لەحکومەتەکەی قازی محەمەد ئەوە بوو کە نفوزو دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی رووسەکان لەکوردستاندا کەمتر بوو بەنیسبەت ئازەربایجانەوە. قازی هیچ کاتێ لەبیرو بڕوای خۆی دوودڵ نەبووە، لەسەر جێبەجێکردنی فەرزەکانی ئاینی خۆی لەهەموو هەلومەرجێکدا رۆیشتوە، تەنانەت لەکۆبوونەوەکەی باکۆدا، بەئامادەبوونی باقرۆف لەناو باس و گفتوگۆدا، لەکاتی نوێژدا، داوای لێبوردنی کردووەو هەستاوە نوێژی خۆی کردووە."(24)

پێشەوا بەسەبرو خۆڕاگرانە مامەڵەی واقیعە تاڵەکەی دەکرد، ئەو هەڵوێستە خراپ و گیروگرفتانە بێ تاقەت و بێ ئومێدیان نەدەکرد. کاتێ لەسەر راسپاردەی رووسەکان چۆتە تاران، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ قوام السلطنە، سەفارەتی سۆڤیەت دەعوەتی دەکەن، وەك پێشەوا چاوەڕوان بوو، وا پیشوازی لێنەکرا، زیاتر، ئامۆژگارییان بۆی ئەوە بوو کە لەگەڵ لێپرسراوانی تاراندا نەرم و لەسەرخۆ بن. لەلایەکی دی. گلەیی ئەوەشیان لێکرد کەلەگەڵ ئازەرەکاندا رەفتاری باش نییە.

بەرامبەر بەوە قوام و لسەڵتەنە زیرەك و فێڵبازانە لەسەر چەند پەتێ یاری دەکرد، سەرەڕای: گەرمکردنی پەیوەندی لەگەڵ رووسەکاندا، گفتی ئیمتیازی دەرهێنانی نەوت، نەخشەی گوشار خستنەسەر سۆڤیەت تالەشکری سوور بکێشێتەوە بۆ وشککردنی سەرچاوەی هاوکاری و یارمەتی بۆ کوردو ئازەر، لەسەر رێبازی ئاژاوەنانەوەو بەگژاکردنی هەردوو کۆمارەکەش کاری خۆی دەکردو پیلانی دەگێڕا، بەتایبەتی لەپرۆسەی گفتوگۆدا، جارێ لەگەڵ تەورێز بەدابڕانی مەهابادو گوێنەدانە کورد، جارێ بەهاندانی کورد بۆ بەگژاکردن و شەڕهەڵگیرسان، "لەدانیشتنێکی مەنافی کەریمی، وەزیری فەرهەنگ، لەگەڵ سەرتیپ ایروم و سەرهەنگ پزیشکیان

کەلەئاووهەوایەکی دۆستانەدا گفتوگۆیان دەکرد، پێشنیاریان کرد کەپێویستە کورد وەك تەواوی خەڵکی ئێران لەدژی رژێمی ئازەربایجان بێنە ناو شەڕەوە."(25)

سەرەڕای ئەوەی پەیمانی سەربازی لەنێوان هەردوو کۆمارەکەی کوردو ئازەردا ئیمزاکرا بوو(3ی بانەمەڕی 1325)دیسان ئازەرە ناسیۆنالیستەکان لەناو بەهێزکردنی خۆو گەیشتنە مەبەستەکانیان دەجوولاَن، کاتێك وەفدێکیان بەسەرۆکایەتی "پێشەوەری"گەیشتە تاران کە "حەمە حوسەین خانی سەیفی قازی" نوێنەری کورد بوو، لەهەموو ئەو دانیشتنانەی لەگەڵ "قوام السلطنة"و"سادچیکۆف"دا دەکران نوێنەرەکەی کورد بێبەش دەکرا(8ی بانەمەڕ 1325) دیسان کاتێ وەفدێکی تاران لە 25ی جۆزەدانی 1325دا بەسەرۆکایەتی "موزەفەری فەیروز" گەیشتە تەورێز لەکۆبوونەوەکانیاندا ئاوڕیان لەکورد نەدابۆوە. هەروەك بەشێکی ئازەربایجان حیسابی کۆمارەکەی کورد کرابوو.

کاتێکیش لەگەلاوێژی ئەو ساڵەدا پێشەوا لەگەڵ چەند لێپرسراوێکی تری کۆماردا چوونە تاران...لێرەشدا قوامو لسەڵتەنە بەلای کورددا دایشکاند، بەو مەرجەی کە تێکچوونی پەیوەندی کوردو ئازەری تیا مسۆگەر دەکرا، هەر وەك کەمێکی تر زیاتر روناکیی دەخەینە سەر ئەم لایەنە.

سەرەڕای ئەو هەموو هەڵوێستە نادروستانەی کۆماری ئازەربایجان، پێشەوا قازی محەممەد بەوەفا بوو بۆ بەڵێنو سوێندەکەی، هۆشیار بوو لەپیلانەکانی تاران، بۆیە، بۆ یەك ساتیش، بیری لەوە نەکردەوە کە کارێکی وەك کاری ئازەرەکانی، لێبوەشێتەوە.

## گفتوگۆو خودموختاری

دوو لەو خاڵە گرنگانەی کە هەمیشە جێگەی مشتومڕو رەخنەو سەرنج بوون، وتووێژو خودموختاری بوون، چونکە لەڕاستیدا هەردووکیان لەناو بازنەیەکی بێ دەربازگەدا بوون، بووبوونە خاڵی ململانێ کە هەر یەکە بەلایەکی پێچەوانەی خواستی ئەوی تردا رایدەکێشا، تاران لەنەبوونی بڕواوە بەمەسەلەکە، بۆ وەخت بردنە سەر تائەڵقەکانی زنجیرەی پیلانەکە یەکە یەکە دەگەنە مەبەستی خۆیان، لەناو

دیپلوماسییەتی زیرەکانەی پڕ لەساختە بۆ مەبەستو ئامانجێکی روونی بێ گرێو گۆڵ بوو.

بۆ لای کوردیش: پێشەوا قازی محەممەد، لەناو مامەڵەی دیپلوماسیو تاقیکردنەوەکانی ئەو ماوانەو، لەبەردەم ئەو هەموو گرفتو کەلێنو کێشانەی، لەمەوبەر کەمە تیشکێکیان خرایە سەر. کەوتبووە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێ هەوڵی جیدی هەر بۆسەلماندنی ئەو خودموختارییە بێت کە دامەزرا بوو، هەر وەك گەیشتوبێتە ئەو سەرەنجامەی کە لەو تاکە دەربازگەیەوە دەتوانرێ شتێ بۆ کورد بکرێ. بۆیە سیاسەتو هەڵوێستی لەگفتوگۆدا هەر بۆ ئەو مەبەستە بووە، راستگۆو بەدڵ کاری تیا دەکرد، هەرچەندە لەناو وتارو راکانیدا نەیدەتوانی تەواو بیرو ئاسۆی بینینی بۆ پاشەڕۆژی نەتەوەی کوردو کێشەکەیو خواستەکانی خۆی بشارێتەوە، لەهەمان کاتدا، لەناو مامەڵەی سیاسیو دیپلوماسیدا، نەیدەویستو نەیدەهێشت کێشە لەوە زیاتر بۆ کۆمارەکە بخولقێت. دوور نییە هەر ئەم دیدو بۆچوونەش نەبووبێتە گرفتی رێگەی بیری رزگارکردنی ناوچەکانی تر.(26)

لەنامەیەکدا بۆ جەنراڵ حەمە رەشید خان زۆر بەوردی خانەی کێشەی کورد لەنێو گرفتە گەورە جیهانییەکەدا دەستنیشان دەکات:

هەر کارێکی جزئی ئەکەن دەبی لەگەڵ ئەوضاع بین الملل تطبیق بکری چەجای کاری مە کە کلیە لەبەرئەوی ئەمە مجبورین لەری صلحەوە تا ممکن بێ ناتوانین بەری دی دا بروین ئەو تاخیرەی هی وەیە دەنا ئەمن لەتۆ بە پەلەترم."(27)

بەڵام لەکاتی پێویستو جێگەی خۆیدا، سەربەخۆو ئازایانە رەفتاری دەکرد، لەشەڕەکانی سالحاوا، قاراوا، سەرا، مامەشادا...، هەروەك سەرکردەیەکی سەربازی دەجووڵاو بڕیاری دەدا، دەچووە بەرەکانی جەنگو وتاری بۆ پێشمەرگەکان دەدا.(28)

کاتێکیش دوژمن بەهەڕەشەو گوڕەشە کەوتبێتە سەرباری گوشار خستنە سەرکۆمار، واپێشەوا وەرامی پڕ بەپێستی هەڕەشەکەی دەدایەوە: "لەدوای شەڕی سالح ئاوا لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە زەربەیەکی پشت شکێن یان وێ ئەکەوێت... تێدەشکێنو ژمارەیەکی زۆریان لێ بەیەخسیر دەگیردرێ جا لەبەرامبەر هەڕەشەو گوڕەشەی رەزم ارادا قازی محەممەد نامەیەکی بۆ ئەنێرێ وەڵێ دەگێڕێتەوە

کەدەست لەشەر هەلاییساندن و براکوژی هەلبگرێت و لەرێگەی وتووێژەوەو بەدانانی بەرێزی بۆ یەکتری مەسەلەکان جێبەجێ بکەن... کوردان لەهەرەشەو گورەشە ناترسن و کاتێك باسی هۆردوی ئێران و بەتایبەت باسی سەرۆکەکانی هۆردو دەکات ئەو شیعرەی فیردەوسیی و بیر دەخاتەوە کە بەم جۆرەیە:

اگرسربەسر تن بەکشتن دهیم

ازان بەکەکشور بەدشمن دهیم

ئەوە وەك دروشیش لەسەر بازگەکاندا هەلواسرا بوو... پێشەواو سەدری قازی وایان بەمەسلەحەت ئەزانی کە ئەو شیعرە بەم جۆرە لێبکەن:

همە سر بسر بەدشمن دهیم

از ان کە خودرا بەکشتن دهیم

جاسولیمانی–ح، پسیان (نجفقلی پسیان)و ئێگلتون دەڵێن: قوام و لسەلتەنەو رەزمارای سەرەك ئەرکانی ئەرتەشی شا بەوە دەهری دەبن و قینێکی تایبەتی لەو قسانە هەڵدەگرن."(29)

زیاتر لەوەش: کاتێ قازی محەممەد بەگوێرەی داخوازی قوام سەفەری تاران دەکات و لەوێ لەگەڵ حمە رەزا شاشدا وتووێژێکی دەبێت..."حەمە رەزا شا گەلێك بەشاخ و باڵی ئەرتەشدا هەڵدەڵێ و لەقازی ئەگێڕێتەوە کەلەبەرامبەر ئەرتەشدا خۆراگری نەنوێنن، دەنا ئەتوانێ تەواوی کوردستان لەخوێندا بگەوزێنێ... قازی محەممەد زەردەخەنەیەکی دێتێ و لەوەلامی شادا بەسەرهاتەکەی ئەرتەش لەسەردەشت ئەگێڕێتەوە، ئەویش بەم جۆرە بووە کە: ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەرو سەربازەکانی ئەرتەش لەسەردەشت تەسلیمی پێشمەرگەکانی کوردستان دەبن، پێشمەرگەکان تەماشا دەکەن ئەو ئەفسەرو سەربازانە وێرای دانانی چەکەکانیان جلەکانیشیان دادەکەنن، پێشمەرگەکان ناهێڵن و دەیانبەن بۆ مەهاباد...، جلیان بۆ دەکڕن و لەرێگەی سەقزەوە بەرەو تارانیان ئەنێرنەوە."(30)

یەکێ لەو باسانەی لەناو پرۆسەی گفتوگۆدا باس کراوە:

دیاری کردنی ئوستانێکی نوێ بوە بەناوی کوردستان، کەلەسنووری سوڤێتەوە تا ناوچەی کامیرانی نزیك کرماشان درێژ ببێتەوە، لەژێر چاودێری کاربەدەستانی کۆماری کوردستان وە قازی محەممەد بو ئوستانداری گشتی دیاری بکرێت... گوایا

قوام‌ولسەڵتەنە ئەو پێشنیارەی قبوڵ کردو بەمەرجێ کە دکتۆر سەلامولا چاودیی ئوستانداری ئازەربایجان دژی نەوەستێ، دیارە مەبەستەکەی سەرەك وەزیر زۆر روون بووە."(31)

دیسان کوڕی رەش(عەلی کوڕی قازی محەمەد) باسی هەمان پرۆژە دەکات و دەڵێت ئەو بەڵگەنامەیەشی بەئیمزاکراوی لایە(32).

چیرۆکی وتووێژ، چ لەگەڵ تاران و چ لەگەڵ تەورێز، کەمێکی بەدەرەوەیەو زۆر لەدرێژەی باس و گفتوگۆکان، پرۆتوکول و رێکەوتننەکان شاراوەی ناو ئەرشیفەکانن لەگەڵ ئەوەشدا چوونە ناو وردەکارییەکانی زۆری پێدەوێ و لەباسێکی وا کورتدا جێگەیان نابێتەوە. هەروەك لەپێشیشەوە ئامارژەمان بۆ کرد. پێشەوا بڕوای بەئاشتی و پێکەوە ژیان هەبووە.

بۆیە بەبڕواو هیواوەو گفتوگۆی کردوە، بەدڵ و گیان هەوڵی سەرخستنی داوە.. هەروەك خۆی گوتوویەتی: دەبێ ئەوەی بزانین کە هەموو کاتێك کارمان بەشەڕو خوێن رشتن سەرناکەوێت، دەبێت لەڕووی سیاسەتیشەوە کاری خۆمان بەرەو پێش بەرین، گەلێك جار بەئاشتی و پێکهاتن ئامانجمان پێش دەکەوێ...(33)

خۆ ئەگەر لەڕۆڵی پێشەوایەتی قازی محەمەدەوە ئاوڕ لەپلەو پایەی کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووریی و روناکبیریی بدەین، و هەموو ئەو لایەنانە روناکییان خراوەتە سەر، جگە لەلایەن ئابوری.. پێشەوا خاوەنی چەندین دێ بووە، سەروەت و سامانی خۆی هەبووە. وەسیەتنامەکەی ئەو راستییە دەخاتە بەردەست کە پێشەوا هەر خۆی بۆ میللەتەکەی تەرخان نەکردبو، بەڵکو سەروەت و سامانیشی لەخزمەتی کۆماردا بوو...

## دیپلۆماسیەتی کورد لەناو سیاسەت و نوتقەکانی پێشەوادا

بۆ ئەوەی ئەو خسڵەت و سروشتانەو سیاسەتەکانی جەمهورییەتی کوردستان زیاتر روونبکرێنەوە، کە ئاشکراو بێ پێچ و پەنا لەقسەو نوتق و چالاکیی و دیدەنیی و سەردانەکانی پێشەوا قازی محەمەد، سەرۆکی ح.د.ك و سەرەك کۆمارو نەخشەکێشی سیاسەتی کۆماردا دەردەکەون، وا لێرەدا چەند نمونەیەك لەنوتق و دیدەنیی و

رۆژنامەنوسیی و سەردان و کۆبونەوەو قسە لەسەر هاتن و چون و سەفەرەکانی دەخەینە پێش چاو*

بەداخەوە زۆربەی نامە، سەنەد، پاچەمەنی و ئارشیڤی سەردەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستان لەمهاباد یان فەوتێنران و نەماون، یان ئەگەر لەولاتیش لای تاکەو تەرا هێندێکیان مابن و لەکتێبخانەی هەندەرانیش بەشێك لەچاپەمەنییەکان دەستکەون، جارێ بەتەواوی هەوڵێکی بەپێی نەخشە نەدراوە بۆ ئەوەی یەکلا بکرێتەوە چ هەیەو چ نییە.

تائێستا لەسایەی خۆماندووکردنی چەند کەسێکی دڵسۆز بەشێکی زۆری رۆژنامەی کوردستان(نزیك 66 ژمارە) شۆنگێڕی کراوە.

لەم نامیلکەی بەردەستتاندا وتارەکانی پێشەوای نەمر قازی محەمەد، لەو ژمارە کوردستانانەی کە چاوم پێیان کەوتووە وەرگیران و بەوپێی تاریخ رێکخراون، چەند نووسراوەی دیکەش کە پێوەندی راستەوخۆی بەمەبەستی بلاوکردنەوەی ئەم نامیلکەیە هەیەو وەکوو شەرحی ژیانی پێشەوا، دەنگ و باسی سەفەرەکانی و دەقی چاوپێکەوتنی پێشەوا لەگەڵ رۆژنامەنووسانی فارس، هەر لەو ژمارانەی کوردستان وەرگیراون، تەنیا دەستێوەردانێکی کە کرابێ گۆڕینی رێنووسە، ئەوەش بۆ ئەوەی خوێنەوەران بەهاسانی و بێماندووبوون باسەکان بخوێننەوە.

بەلای منەوە ئەم نوتق و دیدەنی و سەردان و وتارانە دیمەنێکی گشتی لەروانگەو بۆچوونەکانی پێشەوا دەخولقێنن و هەلی ئەوە دەرەخسێنن لەوە بزانین پێشەوا لەبوارە جۆربەجۆرەکانی ژیانی مێژوویی، کۆمەلایەتی، سیاسی، سەربازیی و فەرهەنگی.. هتد گەلی کورددا چۆن بیری کردۆتەوە.

گفتوگۆی پێشەوای بەرزی کوردستان دەگەڵ خاوەنانی رۆژنامەی تاران

هێندێ لەمودیرانی جەرائیدی تاران: ئاغای تەفەزولی خاوەنی رۆژنامەی (ئێرانێ‌ما)، ئاغای عەبباسی شاهەندە خاوەنی رۆژنامەی (فەرمان)، ئاغایانی بوزورگی عەلەوی و هورموز نووسەرانی دوو رۆژنامەی (رەهبەرو ئێرانێ‌ما) بۆ ئاگاداری لەوەزعی کوردستانی خودموختار هاتنە مهاباد و لەگەڵ جەنابی قازی

---

* ئەم باسانە لەرۆژنامەکانی کوردستان-ەوە دەرهێنراون هەروەها لەو بابەتانەش کاك حەسەنی قازی بەنامیلکەیەك لەژێر ناوی: روانگەی پێشەوا، بلاوی کردەوە.

محەمەد رەهبەری میللەتی کورد یەکتریان دیتو گفتوگۆیان کرد. بۆ ئاگاداری خوێندەوارە بەرزەکان یەك یەك پرسیاری ئەوانو وەرامی جەنابی قازی دەنووسرێ:

پرسیار: لەتاران دەڵێن کوردان بەرەهبەری جەنابت جوێ بوونەوەو ئیستقیلالی کوردستانیان دەوێ، ئایا راستە؟

وەرام: خێر راست نییە، لەبەرئەوەی کە ئێمە لەدەوڵەتی ئێران ئیجرای قانوونی ئەساسیمان دەوێو دەمانەوێ بەخودموختاری لەژێر بەیداغی ئێراندا بژین، و خودموختاریشمان وەگیرکەوتووە.

پ:چەند وەختە ئەنگۆ خودموختارن؟

و: چوار ساڵە خودموختاری داخلیمان هەیە.

پ: چلۆن خودموختاری خۆتان هەڵدەسوڕێنن؟

و:لەو وەڵاتەی کە توانیومانە خودموختاری نێو خۆمان دەکار بکەین دەگەڵ نوێنەرانی گەورەی میللەتی کورد کەچەندێك لەوەی پێش لەمهاباد حازربوون ئینتیخاباتمان کردو هەیئەتێکی(9) نەفەری بەنێوی هەیئەتی میللی هەلبژێردرانو سەرۆکی ئەو هەیئەتە بەخۆمە.

پ:لەتاران دەڵێن جەنابت چەند کەست بۆ باکۆ ناردووە لەوێ چاپخانەو کاغەزو ئەسلەحەیان هێناوەو تەشکیلی حیزبی کۆمۆنیستوو داوە. ئایا راستە؟

و: ئەم قسانە کاربەدەسەکانی لەشکری بۆمان هەڵدەبەستن، ئەوانە راست نین، کاغەزو چاپخانەمان لەتەورێز کڕیوەو ئێوەش دەتوانن لەو جێگای لێمان کڕیوە ئاگاداربن، تەشکیلی حیزبی کۆمنیست درۆیە، شتێك هەیە ئێمە لەکوردستان دا هەر وەکوو قانوونی ئەساسی ئێران ئیجازە دەدا خەڵك بەتەواوی مەعنا ئازادی عەقیدەیان هەیەو حیزبێکی بەئاشکرامان هەیە ئەویش فیرقەی دیمۆکراتی کوردستانە.

پ: مومکین دەبێ کە مەرامی فیرقەی دیموکراتی کوردستانمان بۆ بەیان بفەرمووی؟

و: بەڵێ مومکینە. بەکورتی مەرامی فیرقەی دیمۆکراتی کوردستان بۆنگۆ بەیان دەکەم:

1-میللەتی کورد لەئێراندا لەهەڵسووراندنو پێك هێنانی کاروباری جێگای خۆیدا ئازادبێ و لەسنووری دەوڵەتی ئێراندا ئازاد بژی.

2-بتوانن بەزمانی کوردی بخوێنن و لەوەڵاتی کورد لەکوردستان کاروباری نووسین لەئیدارەکانی دەوڵەتیدا بەکوردی بێ.

3-ئەنجوومەنی ئەیالەتی و وەلایەتی کوردستان وەکوو قانوونی ئەساسی دەڵێ جێبەجێ داندرێ، لە هەموو کارەکانی ئیجتیماعی و دەوڵەتی دا چاوەدێری پێ رابگا.

4-مەئموورینی دەوڵەتی هەر دەبێ لەخەڵکی محەل بێ و بەپێی قانوون لەنێو رەعییەت و مالیکدا سازش بەجێبێ، کەدواڕۆژی هەردووکیان تەئمین بکرێ.

5-حیزبی دیمۆکراتی کوردستان سەعی بکا کە میللەتی ئێران هەموو بەبرایەتی و بەڕابەری بژین و بۆ خۆشبەختی و تەرەقی میهەنی خۆیان سەعی بکەن...

پ: حیزبی دێمۆکراتی کوردستان لەهەموو وڵاتی کوردستاندا تەشکیلاتی هەیە؟

و: فیرقەی دیمۆکراتی کوردستان لەهەموو جێگایەك کە دەوڵەتی دیکتاتۆر و ئیرتیجاع ئیجازەی...*

(ئەو نوسخەیەی کەلەژمارە 2 بەدەستەوەیە تەواو نییە، بەشێك لەم وتووێژە ناتەواوە)

(ئەخباری نێو خۆمان)*

-ڕۆژی 1324،12،4 جەنابی پیشەوای کوردستان لەساتی بەیانی بۆ پەزیرایی لەئاغایانی کە بەحوزووری شەڕەفییاب تا ساتی 12 لەسالۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی حازر بوو ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی، هەیئەتی رەئیسەی میللی و روحانیان و توجار و موحتەرەمین و نوێنەرانی لکەکانی حیزبی دێمۆکرات بەحزوری موشەڕەف بوون.

-ڕۆژی 1324،12،4 جەنابی پێشەوای کوردستان لەمزگەوتی جامیعەی مهاباد پاش نوێژی جومعە لەبابەت ئەهەمییەتی یەکەتی کوردو ئازەربایجان و قسمەتی نەزافەتی عوموومی و تەئمینی ژیانی هەژاران و خوێندنی پیاو و ژن و کوڕو کچی

---

- رۆژنامەی کوردستان ژمارەی 1و2-11، 13-1-1946(20و 1324/10/22)
- تێبینی: ئەو بەشەی لەژمارە (2)دا بڵاوکراوەتەوە لەبەرخراپی کۆپییەکەی وتووێژەکە ناتەواوە.

* کوردستان ژمارەی 19 ساڵی یەکەم دووشەمۆ 6ی ڕەشەمەی 1324، 25ی فیبریەی 1946

كوردستان نوتقی فەرموو لەنوتقەكەیدا زۆر لەبابەت فەرهەنگەوە دوواو لەلایەن خەڵكییەوە دەگەڵ ئیحساساتی نیشتمان پەرستی فەرمایشاتی وەرگیراو قەولیان دا كە هەموو موتیعانە بۆ جێبەجێهێنانی ئەوامیری پێشەوای خۆشەویست ئامادەن و گەورەو چكۆڵە بۆ خوێندن و پێشكەوتنی فەرهەنگ هەوڵ بدەن.

میتینگ لەمزگەوتی سوور

رۆژی 29-10-1234 ساتی 8ی سبەینێ بوو كەلەمزگەوتی سوور میتینگێكی گەورە لەلایەن حیزبی دێمۆكراتەوە بەرپاكرا. لەم میتینگەدا كۆمیتەی مەركەزی حیزبی دێمۆكرات و هەیئەتی رەئیسەی میللی كوردستان و تەواوی نوێنەرانی كوردستان و لكەكانی حیزبی دێمۆكرات و چەند هەزار نەفەر بەپێی گونجایشی مزگەوتەكە لەئەهالی شیركەتیان بوو. لەم میتینگەدا خەڵكی چاوەڕوانێكی زۆریان هەبوو مونتەزیری جێژنێكی هەرە مەزن بوون كە ئەویش رۆژی 2-11-1324 بوو، كەلەواقیعیشدا ئەم نمایشە سەرەدای ئەو رۆژە بوو لەبەر ئەوە خەڵكی هەموو گوێ قولاغ بوون كە بزانن چ دەگوترێ تا وابوو لەساتی 9 هەژارو هێمن دوو شاعیری میللی پاش وەرگرتنی ئیجازە بەتەرتیب چوونە سەر منبەرو هەر كەس ئەشعاری خۆی خوێندەوە...

پاشان ئاغای حەسەنی داودی دوای تەشكور لەحوزار وتارێكی درێژی راجیع بەیەكەتی و برایەتی خوێندن و خوێندەواری خوێندەوە.

ئەمجا حەزرەتی پێشەوای كوردستان (قازی محەمەد) تەشریفی بردە سەر منبەرەكە پاش بەخێر هاتنی تەواوی نوێنەران و ئاغایان و تەشەكور لەخەڵكی مهاباد كە دەو وەختانەدا بۆ خزمەتی برایانی خۆیان تووشی زەحمەتێ دەبن فەرمووی:...كورد دووسەد ساڵە بۆ وەرگرتنەوەی ئازادی هەوڵ دەدا، لەجەنگی بەینولمیلەلی رابردوودا كوردیان پتر لەت كرد، بەشێك بەعیراق و بەشێك بەسورییەو بەشێك بەروسییەوە بەشی زۆریشییان بۆ توركییەو ئێران هێشتەوە، ئەم كارانە هەستی سەربەستی كوردانی نەكوژاندەوە كوردانی توركییەو ئێران و سووریيە زۆر لەپێشدا بۆ ئازادی هەڵستان. دوژمنەكانیش دەستیان كرد بەكوردكوشتن،ئەگەر گوردانی بەدرخانی پرشوو بڵاو كران بابانەكان و ئەردەڵانەكان واردی مەیدانی كارزاری ئازادی كوردان بوون، شێخ عوبەیدیلا، شێخ سەعید، سمایل ئاغا، كوردانی

تورکییەو ئاڕارات قییامیان کردو چەنسەد هەزار نەفەر لەو قیامانەدا لەناوچوون و نەتیجە بەدەس نەهات و ئەم راد مەردانە گشتیان لەسەر ئازادی مردن. ئەمجا جەنابی پیشەوا مەسئەلەی حیزبی هێنا پێشەوە:

کەتائێستا چەند حیزب لەکوردستاندا بنیاد نراوە بۆ ئازادی کوردان هەوڵیان داوەو ئەمانیش لەم پێناوەدا چەند سەدهەزار قوربانیاندا، لەدیار بەکر دووسەد هەزار کوردی بەناوبانگیان کوشت و ئەم ملەیە لەکوردستاندا دەوامی بوو تاوەختی کەئەرتەشی شەهەنشاهی لەشەهریوەری 1320بڵاوبوو:

بەبڵاوبوونەوەی (بوونی ) دووپەر ئاگاهی بوو بڵاوئەرتەشی شەهەنشاهی

لاوان و گەنجانی مهاباد دەسیان کرد بەکارو مەرامی موقەدەسیان تەعقیب کرد، لەبن ئەشکەوتان، لەشیوان و خانوان بەدزی خڕدەبوونەوەو فەعالییەتیان بەخەرجدا تا لکی خۆیان لەتەواوی کوردستاندا کردەوەو هەموو کوردێکیان بۆ کار ئامادەکردو خۆشیان بەهێز کرد تاوابوو چەندە لەمەوبەر مەرامی دێمۆکراتییان بەدنیا گەیاندو تەقازای خودموختارییان لەحدوودی دەوڵەتی ئێران بەجنێوو هەڕەشەو بەتانك و تۆپ فڕۆکە وەڵامی دانەوە. لەزیمندا فەرمووی:-

دنیای ئەوڕۆ دنیای تەنازوعی بەقایەو هەر نەتەوەیەك دەیەوێ بۆ خۆی سەربەست بێ، ئەی نەتەوەی کورد، ئەگەر کوردستان بییەوێ لەڕۆژی پێداویستدا چەند هەژار لاوو گەنج و موسەلەح بکا بۆ دیفاع لەنیشتمانی خۆشەویست ئامادە بکرێن ئایا کورد ئەو ئیستیعدادەی هەیە کەکوڕو خۆشەویستی خۆی بۆمەیدانی کارزا بنێرێ؟ لەم ئانەدا نوێنەرانی کوردستان یەك دەنگ هاتنە جواب.

1-ئاغای محەمەدی نانەوازادە فەرمانەدەی پۆلی کوردستان وتی: ئەمن عوهدەدارم کە هەموو لاوانی مهاباد بۆ گیانبازی و دیفاع لەنیشتمان وەك هەمیشە حازرو ئامادەبن.

2-ئاغای سەدیقی حەیدەری و عەلی خوسرەوی لەلایەن موئەسینی حیزبی دێمۆکرات و لاوانی کوردستان گوتیان ئەمە لەلایان موئەسیسنی حیزبی دێمۆکرات و دەستەی لاوانی کوردستانەوە کەهێشتا خوێنی خۆیان نەڕشتووە قەول دەدەین کە هەموو حازرین لەڕێی نیشتماندا بمرین.

3-تاهیر خان کوڕی سمایل ئاغاو ئەمەر خان کە 50 ساڵە بۆ سەربەستی کار دەکا وتیان: ئێمە حازرین وەك باوك و باپیری خۆمان سەروومالمان لەڕێی کوردستاندا بەخت کەین.

4-شێخ جەلالی دەربەند پیاوانە وتی: ئەی ئاغایان سێ شت زۆر بۆ کوردستان پێویستە: 1-پوول، 2-پوول و 3-پوول دەبێ لەسێ شت دەستهەڵگرین وەکوو کەدەستمان لێهەڵگرتووە: 1-تەماع، 2-خوخۆری، 3- خۆفرۆشی، هەر وا زۆر کەس لەسەران و نوێنەرانی کوردانی جەلالی ، میلانی، شکاك، هەرکی، دێبۆکری، مامەش، مەنگوڕ و تەواوی نوێنەرانی کوردستان هەر لەوێستا را قەولی فیداکاریانداو قەولی خۆیان بەسوێند قایم کرد.

هەروا جەنابی پیشەوا لەبابەت وسوڵی ماڵیاتەوە بەیاناتێکی فەرموو. دیسان شێخ جەلالی دەربەند هەستاو وتی:

ئەمن سەد هەزار تمەنم دارایی هەیە بێجگە لەیەك جووت گاو یەکدەست پێخەف هەموو نەزری حیزب دەکەم کێ دەنێرن وەری گرێ و لەعوموومیشەوە دەنگی ئیتاعەت بڵیند بوو. دیسان جەنابی پێشەوا لەخسووسی برایەتی و بەزبانی کوردی خوێندن و کەسبی زانست و کەماڵ فەرمایشاتی ئیدامە پێداو کەلیماتی خۆی بە: بژی بەژیانێکی ئەبەد ئەو دەوڵەتەو نەتەوانەی کە بۆ ئازادی نەتەوانی لێقەوماو هەوڵ دەدەن"* ....

"جێژنی شیرکەتی تەڕەقی کوردستان لەلایەن بەزازان بەبۆنەی سەربەخۆیی و ناساندنی پێشەوای کوردستان"

بەبۆنەی جێژنێکی کەلەلایەن ئەعزای شیرکەتی تەڕەقی کوردستان و تەبەقەی بەزازانی مهابادی بەبۆنەی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان کرابوو ساتی 3ی پاش نێوەڕۆ مەجلیسی جێژنیدایر بوو و حەزرەتی پێشەواو جەنابی سەید عەبدوڵای شەمزینی و جەنابی حاجی سەید باباشێخی سیادەت و حاجی بایز ئاغای ئیلخانی زادەو تەبەقاتی عولەماو ئاغایانی عەشایر و توجارو موحتەڕەمینی شاری تەشریفیان بوو.

..... لەپاشان حەزرەتی پێشەوای بەرز خیتاب بەحوزار فەرمووی:" یەگانە حەملەی دوژمنان حەملەی ئیقتیسادییەو هەمیشە خەریك دەبن کەلەو ڕێگایەوە

---

* ر.ك، ژمارە 22، 4-مارسی 1946 (13ڕشەمەی 1324)

ئینقیلاب دەخەنە نێو میللەتی مەسەلەن مەسئەلەی تووتن کەدەوڵەتی ئێرانی خەریك بوو و وەسائیلی نیفاق و دووبەرەکی لەنێو کورداندا پێك بێنن، لازمە کە ئەمە رێگایەکی ئیقتیسادی بۆ خۆمان بکەینەوە. شیرکەتی تەرەقی دەبێ تەوسیعەی پێ بدرێ و لەرەوابیتی تەجارەتی لەهەمووکوردستاندا بەقەرار بکرێ. حکوومەتی کوردستان ئیحتیاجاتی زۆرە دەبێ وەزعی خۆی وەکوو دنیای ئەورۆ تەغییر بدا. مەسەلەن فەرهەنگ، فەلاحەت، کارخانە جات کەدەبێ دەتەوسیعەو تەرەقی ئیجادی ئەوانە دا سەعی و جیدییەت بکرێ...*

لەسەر ژیانی کۆمار رۆژنامەی کوردستان بەم جۆرە لەسەر قازی محەمەد دەنوسێت:

حەزرەتی پێشەوای کوردستان محەمەدی قازی کوڕی ئاغا میرزا عەلی مەرحوومە، لە 11ی بانەمەڕ(ئوریبهێشت)ی 1279 هیجری شەمسی بەرانبەر بە 2ی موحەرەمی 1318ی هیجری قەمەری لەشاری مهاباد لەدایك بوو. ئەم زاتە زۆر بەچاکی لەژێر دەستی باب و دایکیدا پەروەردەکرا، لەتەمەنی 7ساڵیدا دەستی بەخوێندن کرد و دوای خوێندنی چەند ریسالێکی کوردی و فارسی دەستی بەخوێندنی سەرەدای نەحوو سەرف کرد، هەر وا ئیدامەی بەخوێندن دا تا لەعلوومی مەعقوول و مەنقوولدا: نەحو ، سەرف، مەنتیق، بەلاغە، ئوسول، فیقە، کەلام فاریغو تەحسیل بوو و بەوەندە خوێندنە دڵی ئارام نەبووو بێوچان لەدووی خوێندن و زیادکردنی مەعلوومات و فێربوونی زمانی بێگانە دەگەڕا تا توانی بەوەسیلەی مامۆستای تایبەتی زمانی ئینگلیسی، رووسی، فەڕانسە بخوێنێ و بێجگە لەم سێ زمانەو زمانی زگماکی خۆی کە کوردییە زمانی عەرەبی، فارسی و تورکیش زۆر باش دەزانێ.

حەزرەتی محەمەدی قازی پێشەوای کوردستان هەر لەمنداڵییەوە خاوەنی گیانێکی بەرزو بەهێز بوو و نیشانەی گەورەیی، شوجاعەت، لەخوبووردن دەویدا دیاری دەداو خو و ڕەوشتی دەگەڵ هەموو تەبەقەیەکرێ کەوتووەو تێکەڵی دەگەڵ هەموان هەیە، لەڕیزی کەسەبە، مالیك، شێخ، مەلا،جەحێل، پیرو کاربەدەستانی حکوومەتدا دەبیندرێ و هەمیشە وەکوو باب و باپیرانی خۆی سیمەتی ڕیاسەتی رووحانیان و زانایانی مهابادو دەوروبەری بووەو هەیەتی و بێوچان لەحقووقی

---

* ر.ك، ژمارە 23، 6مارسی 1946(15رشەمەی 1324)

هەموو کوردێك بەتایبەتی هەژاران و لێقەوماوان لەهەموو جێگایەكدا دیفاعی کردووەو دەیکا و بۆ پێکهێنانی کارێکی زۆر چکۆلەی کەسێك زەحمەتێکی زۆری قبووڵ کردووە. بەتەوری کوللی رشتەی کارو باری مهاباد: سیاسی، کۆمەڵایەتی و... حەتتا دە دەورەی دیکتاتۆری رەزا خاندا دە دەستی بوو، سەهەلە کە گرێی کاری خەڵکی بەوەسیلەی وی دەکرایەوە کاروباری حکوومەتیش بێ موداخەلەی وی حەل نەدەکراو جێ بەجێ نەدەبوو.

سیفاتی نیشتمانپەرستی و میللەت پەروەری دە جەنابی محەمەدی قازی پێشەوای کوردستاندا کۆبۆتەوەو پاشکەوتنی هاوخوێنەکانی لەفەرهەنگ و شارستانییەت هەمیشە دڵی وی بریندار دەکا بۆیە ئەکسەری وەختی تەمەنی خۆی لەڕاهنمایی میللەتەکەی بۆ شەقامی خوێندن، زانست، تەمەدون بەخت کردووەو دەڕاهنمائی واندا لەم ڕێگایەدا زەڕێك کۆتایی ناکاو بۆ دانانی مەدرەسە لەسەر ئوسوولی دونیای تازە لەمهاباد زۆری هەوڵداو چەند ساڵ بۆ خۆی عوهدەداری سەرۆکی ئیدارەی فەرهەنگ بوو ئەوە ندەی لەتاقەتیدا بوو دەرسی نیشتمانپەرەستی بەمنداڵەکانی مەداریس فێرکرد تا وای لێهات مهاباد لەم ڕێگەیەدا زۆر وەپێش کەوت و ئامۆژگاران و شاگردانی مەداریس بەوەسیلەی ڕەهبەری خۆیان موناسەباتی سیاسی یان دەگەڵ ئەحزابە ئازادیخوازەکانی عیراق، تورکییە، سووریا بنیادنا، تاوەختێ کەڕەزا خانی فاشیست لەکوردستاندا نفووزی پەیداکرد... بەدەستووری مەقاماتی فاشیستی لەسەرۆکی فەرهەنگیان بەر کەنار کرد بەڵام دیسان کاروباری فەرهەنگ بەدەستووری ئەو نەبایە هەڵنەدەسووڕا.

ئەم زاتە لەسیفاتی: ویقار، راستی، فەزل، شوجاعەت، حەیا، زانست، تێگەیشتن، حیلم، تەوازوع، روحم، نیشتمانپەرەستی بەتەواوی مەعنی بەشدارە، بۆیە هەمیشە لەپێش چاوی میللەتی خۆی خۆشەویست و مەحبووب تەماشا کراوەو تەماشا دەکرێ.

جەنابی محەمەدی قازی دەگەڵ دوژمنانی شەخسی خۆی بەموداراو دەگەڵ دۆستان بەوەفایە، بەڵام ناتوانێ لەموقابیل دوژمنانی نیشتماندا مودارا بنوێنێ، ئەمن لێرەدا وەختم ئیجازە نادا وەکوو پێویستە سیفاتی موشەخەسەی ئەم پیاوە بڵێندە بنووسم ناچار بەچەند شیعرێکی مەرحوومی مەلا مەعرووف کۆکەیی لەمەدحی ئەم

زاتەدا دا کوتوویەتی و هیچ موبالەغەی نەنواندووەو هێندێ لەئەحواڵاتی زاتی وی بەیان دەکا لێرەدا دەهێنمە پێشچاوی خوێندەواران، لەقەسیدێکی عەرەبی‌دا دەڵێ:

من كان ذاحصه من علم او شرف

يحب ان لايرى شيئا من الاسف

فليأت محكمه بنيانها شرف

والفضل يظهر في الجدران والسقف

هذا بناء على اتقوى مؤسسه

ولايقاس على مافي شفا جرف

..تاد

لەهەڵبەستێکی فارسیدا لەتاریفی جەنابی قازی‌و سەدری قازی برایدا دەڵێ:

(قازی)و (سەدر) كه هردو گهر يك صدفند

مالك مملكت عزم‌و وقارو شرفند

رافع‌و عامل كسرند على غير قياس

در عمل واحدو در خط عمل مختلفند

رافع رتبهء آنانكه طرفدار شدند

عامل كسر به أنانكه بايشان طرفند

تاد...

حەزرەتی محەمەدی قازی هەرچەند ماوەی 20 ساڵە لەنێو میللەتی خۆیدا سیمەتی رەهبەری هەیە دیسان لەدووی رێبەندانی 1324دا لەلایەن نوێنەرانی کوردستانەوە رەسمەن بەپێشەوایی کوردستان هەڵبژێردراو بەیعەتی دەگەڵ کرا*.

نەورۆزی ئاوکەشی ئازادیی

جێژنی نەورۆز لەمهاباد

نووسینی: هاشمی خەلیلزادە

"رۆژی 5شەمووی هەوەڵی ساڵی 1325 کاتێك کەهەتاو لەپشت کێوە جوانەکانی کوردستان گەردنی بەرز... لەم کاتەدا کە قوتابی و سەربازەکان‌و خەڵکی شاری

* ر.ك-ژمارە 25، 17مارسی 1946(26رەشەمەی 1324)ئەو نوسینە بەبۆنەی جەژنی لەدایکبونی پێشەواوە بلاوكراوەتەوە.

مەستی تەبیعی ئازادیو جێژنی نەورۆزو هاتنی فەسڵی بەهار بوون فەرمانی خەبەردارو دەنگی سەلامی رەسمی مووزیك کەتەشریف هێنانی سەرداری مەحبووبو پێشەوای مەزنی ئیعلام دەکرد وە خەبەر هاتن.

زاتی موقەدەسی پیشەوا لەپاش گوێدانی گوزاریشات کەبەوەسیلەی فەرماندەی هێز درا داخلی ناو کۆمەڵی مەدرەسەکان بوو: هەوەڵ بەکچەکانو کورەکانی فەرموو شاد بن کچەکانم، شاد بن کورەکانم(خەڵك بەگوێ لێبوونی ئەو دوو وتەیە لەبەر شادی فرمێسکیان دەرژاند) هەر بەم جورەش بازیدو شادباشی لە پێشمەرگەکانی هێزی کوردستانو بارزان فەرموو دوایی هاتە پشتی تریبوون راوەستاونوتقێکی بەتینی ئیراد فەرموو. پاش پێبیرۆزەو رۆژباشی رۆژی تاریخی نەورۆزی کورد فەرمووی:

(ئەم رۆژانە تورکیاو ئێرانو عێراق خەریکی گفتوگۆنو دەیانەوێ پەیمانی مەنحووسی(سەعداباد" کەمادەیەکی بەزیانی کوردانە ئێستاش هەر بۆ دوژمنایەتی کوردان تازە بکەنەوەو بزانن ئەو معاهەدانە وەکوو لەپێشدا کاغەز پارەیەك پتر نەبوو ئێستاش کاغەز پارەیەك زیاتر نییەو لەنێو بەیانانی خۆیدا فەرمووی: رەزا شا، مستەفا کەماڵ، مەلیك فەیسەڵ کە بۆ دوژمنایەتی کوردانیان پەیمان بەست لەماوەیەکی کەمدا خودا لەنێوی بردنو ئێستاش هومێدیان لەخودای بەرز ئەوەیە: کە ئەو کەسانەی کەخەریکی بەستنی پەیمان بەدوژمنایەتی کوردان بن بەدەستی خۆیان قەبری خۆیان هەڵدەکەنن... و لەجەنابی مەلا مستەفا زەعیمی بارزان بەخێر هاتنو سپاسی فەرمووو لەهێزی بارزانو ئەفسەرانی ئەرشەدی ئەو هێزە زۆری قەدردانی کرد.*"

(سەربەخۆییو ناساندنی پێشەوای کوردستان)

"ساتی سێی پاشنیوەرۆی رۆژی هەینوو 12ی رێبەندانی 1324 بەهۆی بانگهێشتنێك کە لەلایەن ئاغای جەعفەری کەریمی بەئیفتیخاری ئازادیو سەربەخۆییو ناساندنی پێشەوای کوردستان کرابوو جێژنێك لەساڵۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی گیرا... پاش تەواو بوونی خیتابەی ئاغی جەعفەری کەریمی حەزرەتی

* ر.ك، ژمارە 27، 25مارسی 1946 (5خاکە لێوەی 1325)

پێشەوا سپاسی لێکردو فەرمووی:" ئاغای جەعفەری کەریمی ئیشارەیەکی بەوەزعی کوردستان کرد کەئیحتیاجی مەعاریف و قشوونە دەبێ هەمووئاغایان لەوەختی تەنزیمی بوودجەی مەعاریف و قشوون حزووریان ببێ.

ئەوڕۆ کەئەمە ئیستیقلالمان دەوێ پێویستە کەهەموو کارێك خۆمان جێبەجێی بکەین. ئەوەڵێ ئیدیعای خۆمان کرد کەلەحدوودی دەوڵەتی ئێراندا خودموختاریمان دەوێ ئێران ئیحتیاجی مەرەفع بکاو میللەت کارێ بکا.

دوو دەفعە لەلایەن ئازەربایجانەوە بۆ تەورێزییان بانگ کردم لەئازربایجاندا گرێمان هەبێ ئەمن پێشنیهادی وانم قەبووڵ نەکرد چون میللەتی کورد چوار ساڵە کە خودموختارەو داوای ئیستیقلال و تێکخستنەوەی تەواوی خاکی کوردستان دەکا، زۆرم پێ گران بوو کەلەو حەقەی دەست هەڵبگیرێ و ئیحساساتی ئێوە مانیعی ئەوەی بوو کەئێمە بەخودموختاری رازی بین چونکوو کەمودەی ئەوچەند رۆژەی کە جێژن گیراوە ئیحاساساتێکی ئێوە نواندووتانە وێنەیەکی حەساس و کامیلەو دەبێ دنیا بزانێ کەکورد لییاقەتی ئیستیقلال و سەربەخۆیی هەیە"*.

کوردستان ژمارەی 43 ساڵی یەکەم شەمۆ 14ی بانەمەڕی 1325 ، 4ی مەی 1946

دەنگ و باس

تەشریف هێنانەوەی حەزرەتی پێشەوای کوردستان

شەوی 12-2-1325ساتی 9ی حەزرەتی پێشەوای کوردستان کەماوێك بوو تەشریفیان بۆ بەستنی موعاهەداتی سیاسی و ئیقتیسادی دەگەڵ حکوومەتی میللی ئازەربایجان بردیووە تەورێز لەکاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی و کارگەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان تا گوێگتەپە لەپێنج ماشێن دا بەپێشوازەوە چووبوون بەموەفەقییەت و شانازێکی تەواو موراجەعەتی فەرمووو کاتێك کە گەیشتە پێش دەرگای شارەوانی لەنێو ئیحساسات و هەست نواندنێکی تەواوی خەڵکیدا دابەزی بڵیند گوێ ئیزهاری لوتف و میهرەبانی دەگەڵ ئەهالی کە بەپێشوازەوە هاتبوون فەرموو دیسان تەشریفی سواری ماشێن بوو و وردە وردە

---

* ر.ك، ژمارە 30، ئەپریلی 1946(12خاکەلێوەی 1325)

ماشێن حەرەکەتی کرد تا گەیشتە کانگای حیزبی دێمۆکرات و لەوێ دابەزی پاش ساتێك تەوەقوف لەکانگای حیزب بۆ لای مەنزڵ تەشریفی ڕۆیشت.**

کردنەوەی ئیستاسیۆنی رادیۆی حکوومەتی میللی ئازەربایجان

لەڕۆژنامەی ئازەربایجان

رۆژی هەینی 6-2-1325 ساتی 5و نیو ئیستاسیۆنی حکوومەتی میللی ئاوەربایجان بەڕەسمی کرایەوەو بە شانازی ئەو موەفەقییەتە برایانی ئازەربایجانی هەستێکی لەئەندازە بەدەریان نواند.

چونکوو جەنابی ئاغای پیشەوەری‌سەر وەزیری حکوومەتی میللی ئازەربایجان کەساڵەتی هەبوو رادیۆ تەوەسوتی جەنابی ئاغای شەبوستەری رەئیسی مەجلیسی میللی ئیفتیتاح کراو نوتقێکیان ئیراد فەرموو کە بەچوار زمان (کوردی، فارسی، رووسی، فەرانسە)بەهەموو دنیا راگەیاندراو بەرنامەی جێژن لەنێو هەست نواندن و هوڕا کێشانێکی لەئەندازە بەدەر لەساتی 8دوایی هات.

حەزرەتی محەمەدی قازی پێشەوای بەرزی کوردستان کە دەجێژنی ئەو برا خۆشەویستانەی ئازەربایجاندا شیرکەتی فەرموو بوو بەهۆی کردنەوەی رادیۆی ئازەربایجان نوتقێکی ئیراد فەرموو کەوەرگەڕاوەی ئەو نوتقە لەژێرەوە بەعەرزی خوێندەوارانی خۆشەویست دەگا:

ئێستا کە ئیستاسیۆنی رادیۆی حکومەتی میللی ئازەربایجان بەڕەسمی دەکرێتەوە لەقووڵایی دڵمەوە پێپیرۆزەو مبارەکبادی بەگشت میللەتی رەشیدو ئازادیخواهی ئازەربایجان عەرز دەکەم و چونکوو وەخت دیاری کراوە کەلەلایەن کوردستانیشەوە قسە بکرێ بەپێویستم زانی کە ئەم کردنەوەیە بەمیللەتی کوردیش تەبریك بکەم.

هومێد دەدەم کە ڕۆژ بەڕۆژ یەکەتی و دۆستایەتی ئەم دوو میللەتە نەجیبە بۆ وەچەنگ هێنانی ئازادی مەحکەمترو قایمتر دەبێت لەسایەی یەکەتی و برایەتی‌دا بۆ وەچەنگ هێنانی ئازادی و راگرتن و پارێزگاری‌وی پێکەوە پیاوانە هەوڵ دەدەین نیسبەت بەیەکتری لەهیچ جورە کۆمەك و یارمەتی کۆتایی نەکەین، باقی نەواقیساتی

** ر.ك، ژمارە 30، ائسپریلی 1946(12خاکە لێوەی 1325)

ئیجتیماعی و مەدەنی بەیارمەتی یەکتری لەنێوان هەڵدەگرین و زۆر بەتاڵووکە بۆ لایەن کانوونی سەعادەت و خۆشبختی دەچینە پێش.

وەها سەعی و کۆشش بەخەرج دەدەین کەلەمیللەتە سەرکەوتووەکانی دنیا نەمێنینەوە. هەژاری و فەقیرییەك کەلەبەر بێ خاوەنی داوێن گیری ئێمە ببوو بەهۆی عیلم و سەنعەت لای بەرین.

بەپوختی، ئەو دوو میللەتە بۆ هاوکاری و برایەتی بانگ دەکەین و لەمەوقیع ئیستفیادە دەکەم ئەو مەسئەلە وەبیردێنمەوە کە دنیای ئەورۆ لەسایەی زانست و مەعریفەتدا زەوی و ئاسمانیان تەسخیر کردووەو ئێستا بەدۆزینەوەی ئەسراری ئەستێران خەریکن، کەوابوو ڕێگای رزگاری ئێوە(کوردی و ئازەربایجانی) فێربوونی عیلم و مەعریفەتە،لەم سورەتەدا هەرچی هەتانە لەڕێگای وەچنگ هێنانی عیلم و مەعاریف و باسەوادکردنی خۆتاندا خەرجی بکەن و دڵنیابن کەبەئارەزووی کۆنی خۆتان دەگەن.

دەمەوێ میللەتی کوردلەم مەسئەلە خەبەردار بکەم: لە ماوەی ئەو چەند رۆژەدا کەهاتوومە تەورێز دەگەڵ سەرانی ئازەربایجان پێشمەرگەخانەو مەدرەسان و کارخانانم چاوپێکەوتووە، میللەتی ئازەربایجان لەڕێگای بەرزبوونەوەو خۆشبەختی خۆیاندا هەنگاوی گەورەیان هەڵێناوەو دیتم کە بۆ بەشدار بوون لەم تەرەقییاتە لییاقەتیان هەیە. لەتەورێزو باقی گوندەکانی ئازەربایجان بۆ لابردنی نەواقیساتی ماددی و مەعنەوی و بالابردنی سەتحی ئیجتیماعی و ئیقتیسادی جوولانەوەی گەورە دەبیندرێ.*

نوتقی حەزرەتی پێشەوای کوردستان لەپێش رادیو

رۆژی 12-2-1325 ساتی 6ی پاش نیوەڕۆ حەزرەتی محەمەدی قازی پێشەوای موعەزەمی کوردستان نوتقی ژێرووی بەهۆی رادیۆ بەگوێی دانیشتووانی کوردستان گەیاندو بەڵیندگۆ بڵاوکرایەوە:

برایانی خۆشەویست: لەدامەزراندنی دەستگای رادیۆو ئەم موەفەقیتەی کە دەستتان خستووە تەبریکتان لێ دەکەم. چونکوو لەوەختی کردنەوەی دەستگای

---

* کوردستان ژمارەی 44ساڵی یەکەم دووشەمۆ 16ی بانەمەڕی 1325 – 6ی مەی 1946 .

رادیۆ لێرە نەبووم ئێستا ئیحساساتی خۆم نیسبەت بەپێشکەوتنی ئێوە ئیزهار دەکەم. ئومێدەوارم کەلێرە بەدووا ڕۆژ بەڕۆژ بتوانین لەمەسایلی مەدنیدا پتر تەرەقی بکەین.

لەهەموو شتێك چاتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە بتوانین قسەی خۆمان بەگوێی دنیا بگەیەنین و تەسدیق دەفەرموون کەهەموو شتێك وردە وردە تەرەقی پێدەدرێ. دیسان دەتوانین بەهۆی ئەم دەستگایە دەرسی ئەخلاقی، فەلاحەتی و... بەبرایانی خۆشەویست بڵێین و لەئایندەش بەرنامەیەکی باش بۆ رادیۆکەمان دیاری دەکەین، ئەوەش بزانن کەئێمە ئاغای محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و ئاغای سەدری قازی مان بەنوێنەری کوردستان دەگەڵ نوێنەرانی ئازەربایجانی بۆ تاران ناردووەو گفتوگۆ دەوامی هەیە. تا لەتەورێز بووم ڕۆژ بەڕۆژ خەبەرم دەزانی و مومکینە بۆ ئەوەی لەموزاکەرات بێ خەبەردار بوون لەچلۆنایەتی ئەوزاع هاتمەوە.

حکوومەتی کوردستان ئەوڕۆ زۆر بەهێزە. ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ دەگەڵ دوژمنانی کورد ببنە یەك کوردستان دەتوانێ زۆر چاکیان چارە بکا بەڵام ئەمن تا مومکین بێت ڕێگای موسالەمەت بەر نادەم، ئەگەر هیچ چارەش نەما حکوومەتی کوردستان بەهێزی خوی سەری وان ڕەهەردی دەخا.*

حەزرەتی پێشەوای کوردستان

کاتی رۆیشتن بۆ تەورێز

لەڕۆژی یەکشەمۆی 15-3-25 حەزرەتی پێشەوای موعەزەمی کوردستان لەکاتی تەشریف بردنی بۆ تەورێز لەنێوانی تەواو سەرانی عەشایری مەنگوڕو مامەش، زەرزاو گەورك، دێبۆکری و قەرەپاپاق و ئەفەسەرانی بێباکی هێزی دێموکراتی کوردستان فەرمووی:

برایانی خۆشەویست، لەکاتێکیدا کە ئۆردووی سوور لەنێوماندا بوو، دوژمنانی ئێمە هەمیشە وایان بڵاودەکردەوە کە داواو ئیدیعای کوردان هەمووی بەهۆی سیاسەتێکی خاریجییە کە مەقسوودیان ئۆردووی سوور بوو، بەڵام ئەوڕۆ بەئاشکرایی لەهەموو کەسێك مەعلووم بووە کە کورد ئازادی دەوێ و دەست لەو

---

* کوردستان ژمارەی 44 ساڵی یەکەم دووشەمۆ 16ی بانەمەڕی 1325   6ی مەی 1946

مەڕامە هەڵناگریو وجوودی ئەو عەشایرانە لەوڕۆدا دا کەبەگیانو ماڵ ئامادەن ئاخرین دڵۆپی خوێنی خۆیان بۆ ئەو مەڕامەبڕژێنن شاهیدێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوەی کورد ئازادی دەویو دەستی لێهەڵناگریو بۆ وەچەنگ هێنانی ئازادی ئیعتیمادی هەر بەخۆیە.

ئەمن زۆر سوپاسی برا مەنگوڕەکان دەکەم کە هەر بەبیستنی ئەوەی کەزێومانە ئۆردووی سوور وڵاتی تەخلییە کردووەو ڕۆژی کارە، گەورەو چووکیان بۆ پاراستنی وڵات ئامادەی خزمەت بوون. برایانی مامش هەر کە زانیویانە کەڕۆژی ئەوەیە دەبێ وڵاتی کوردەواری نفوزی بێگانەی تێدا نەمێنێو دەستی ئیستعیماری لەسەر لابردرێ هەمووی بەگیانو دڵ حازربوون، هەر وەها برایانی گەورك، دیبۆکریو زەرزاو ئاغایانی قەرە پاپاق هەمووی ئەوڕۆ وەك کورد لەمەیدانێدا راوەستاونو چاوەنۆڕی فەرمانن کە هەمووی شاهیدێکی گەورەیە لەو ڕۆژەدا کەئۆردووی سوور تەخلییە کردووە ئەوان واجبی موقەدەسی خۆیان بەجێ دێننو بەڵگەیەکی زۆر ز لەبۆ ئەوەی هەستی نیشتمان پەرستیو ئازادیلەدڵی هەموو کوردێکدا جێگیر بووەو دەست لێهەڵگرتنی نییە.

برایانی خۆشەویستی بارزانی کەلەڕێگای وەدەست خستنەوەی ئازادی کوردستانی مەزنو وڵاتو ماڵو منداڵیان لەپێش چاو نییەو هەموویان لەپێناو ئەو مەتڵەبە ناوە، مەردانە لەکۆشش دان، جێگای شانازییەو ئازادیخواهی میللەتی کوردەواری نمایش دەدەنو شارەزایی وان لەعەمەلەییاتی جەنگیو ئازادیو رەشیدییان کە سیفاتی مومەیزەی کوردانە لەشەڕی ساڵح ئاوایەدا مەعلووم بوو کە عیدەیەکی 700 نەفەری ئۆردووی فارسەکان دەیەویست بۆ لای سەرایە بێت ئەوان بە 170 نەفەری پێشیان پێگرتن، 110نەفەریان لێکوشتن، 40 ئەسیریان لێگرتنو تەلەفاتێکی زۆریان لێدان بێئەوەی یەك نەفەریان خوێنی لەکەپۆی بێ.

جەنابی حەمە ڕەشید ان کە چەند وەختە لەو ڕێگایەدا ئیمتیحانی خۆی داوە، هەمووی ئەوانە بەڵگەیەکی زۆرگەورەن کە جونبیشی ئازادیخواهی کوردستان بەهۆی سیاسەتی خاریجی نەبو ە بەڵکو هێزێکە لەدڵی هەموو کوردێکدا مەوجوودەو لەسایەی خودا ئەو هێزە ئەو ەندە بەقووەتە کە دەتوانێ دەستی زاڵم ببڕێ، بەڵام میللەتی کوردی زۆر خا نی ئینساف و روحمە دیسان لەسەر ئەو حاڵەشەوە کە

هێزی مە زۆر کافییە بۆ ئەستاندنەوەی ولاتی خۆمانو تۆڵە ئەستاندنەوەمان لەسەر ئەوەشەوە ئەوا خەریکین کەبەرێگایەکی سولحو مەسالەمەت حقووقی خۆمان وەرگرینەوە،ئەگەر هاتوو هەر بەموسالەمەت لەگەڵمان نەهاتنو ئیدیعای ئێکمەیان قەبووڵ نەکرد کە نومایەندەی کوردستانی ئازاد بۆ ئەو جامیعە لەتاران مەشغووڵی موزاکەرەن، ئەو وەختی بەهومێدی خودای بەگشتی عالەمو بەتایبەتی بەدەوڵەتە زاڵمەکانی لێداگیر دەکەن نیشان دەدەین کە کوردچەندە بەهێزەو لێیان مەعلووم دەکەین کە تۆڵە ئەستاندنەوە چلۆن دەبێ.

لەنێوانی هوڕاو چەپڵەلێدانی تەواوی ئاغایانو ئیحساساتی گەرمی دانیشتووانی مهاباد فەرمایشاتی پێشەوای مەوعەزەم تەواو بوو و لەلایەن ئاغای عەبدوڵائاغای بایەزیدی بەنوێنەری لەلایەن سەرانی ئێلی مەنگوڕ لەوەڵامی حەزرەتی پێشەوادا نوتقێکی بەتین ئیراد کراو قەولیاندا بەگیانو ماڵ تائاخر بۆ پارێزگاری کوردستان هەوڵ بدەنو چون سەرانی قەبایل گشت عازمی سنوور بوون دەستی حەزرەتی پێشەوایان ماچ کردو خوداحافیزییان لێکرد.*

## هاتنەوەی حەزرەتی پێشەوای کوردستان

رۆژی 20-2-1325 ساتی 6ی پاش نیوەڕۆ حەزرەتی پێشەوای کوردستانو جەنابی ئاغای حاجی سەید بابا شێخ رەئیسی هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان لەتەورێز گەڕانەوەو لەکانگای حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دابەزین. حەزرەتی پێشەوا لەسالۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی کاربەدەستانی حیزبی دێمۆکراتو سەرکردانی کوردستان لەکاتێکدا کەئاساری خۆشحاڵیو موەفەقییەت لەنێو چاوانی حەزرەتی پێشەوادا دەبینرا شەرەفیاب بوونو پاش نیو سەعات جەسانەوە نوتقی ژێرەوەی لەبەرانبەر (ئەوان) ئیراد فەرمووو:

---

* رۆژنامەی کوردستان سالی یەکەم شەمۆ 21ی بانەمەڕی 1325 -11ی مەی 1946 ژمارەی 46

دوژمنانی کورد وایان شۆرەت دەدا کە دەوڵەتی کوردستان ئەساسێکی نییەو بەڕۆینی هێزی سوور تێك دەچێ. درۆ بوونی ئەو ئیدیعایەو گۆیە پووچانە زوو هاتەجێ و کورد ئیمتیحانی خۆیدا. دەو چەند رۆژانەدا کەئۆردووی سوور خاکی ئێرانی چۆڵکرد سەد هێندی جاران کورد وەجۆشش کەوتووەو هەزارها کەس لەخۆبوردووان لەسنووری کوردستاندا ئامادەن تا ئاخرین تنۆکی خوێنیان لەرێی کوردستاندا برێژن. دەبێ ئەو جار ئەو دوژمنانە بلێن چی، دەبێ لێیان مەعلووم بێ ئەگەر زوو حەقی کوردی نەدەن بەزۆری ئەسلەحەی دەی ئەستێنین. فەقەت راوەستانی ئێمە لەو رۆژەدا بۆ ئەوەیە کە حەقی مەبە بێ هەراو بەموسالەمەت بدرێ و پێمان خۆش نییە دووبارە لەدنیادا ئاوری شەڕێ هەڵکەینەوە. ئەوڕۆ کورد سەهلە دەتوانێ حەقی خۆی لەئێرانێ بستێنێ بەڵکوو دەتوانێ حەقی خۆی لەدنیایە بستێنێ.

ئەگەر چی پێویست نییە کەئەمن فیداکاری نەتەوەی کورد لەدنیادا باس بکەم چون جێی ئینکاری دۆستو دوژمن نییە. غیرەتو مەردانەگی و گیانبازی ئەوقەومە نەجیبە لەعالەمدا بەسبووت گەیوە. لەشەڕی پێشوو شیخ سەعیدو شیخ عەبدولقادر کەچەندسالان دەگەڵ تورکان بۆ وەچنگ هێنانی سەربەخۆیی بەشەڕ هاتن ئەگەر دەستی ئیستیعمار یارمەتی تورکییەیان نەدابا کوردان حەقی مەشروعی خۆیان وەدەست دێنا.

دیسان شەڕی تازەی بارزان، ئەگەر دەستی ئیستیعمار کۆمەگی بەعیراق نەکردبا هێزی بارزان بەئاسانی فایق دەبوو و بەمەرامی خۆیان کەسەربەخۆیی کوردستانە دەگەیشتن.

هەروەها قیامی سمایل ئاغا، ئەگەر دیسان دەستی ئیستیعمار یاریدەر ئێرانیان نەدابا، هێزی ئێرانی نەدیدەتوانی لەبەرامبەر سمایل ئاغا پایەداری بکات. سمایل ئاغا دەیگوت ئەگەر بێتوو فەقەت ئەمن عەشیرەتی جەلالیم دەگەڵ بێ زۆر بەئاسانی قشوونی ئێرانی تێك دەدەمو نەتەوەی کورد رزگار دەکەم.

دە سوورەتێکدا ئەوڕۆ یەکییەتی کورد لەجەلالی ڕا تا شکاك و هەرکی وزەرزا، مامەش، مەنگوڕو پیران و تەواوی عەشایری دەوروبەری مهابادی دامەزراوەو عێلی رەشیدی بارزانیش دەگەڵ مەن و کوردی جنووب(لە) کرماشان و سنەش و بیلئەخەرە

تەواوی کوردەواری پشتیوانی مەن و دەگەڵ مە هاودەنگن، ئایا بەو وێنەیە چلۆن بەسەر دوژمنانی خۆماندا فایق نابین.

ئەورۆ دەوڵەتی میللی کوردستان زۆر بەهێزە تا چەند رۆژ لەوەی پێش کەقشوونی سوور لەئێرانی بوو مەئموورانی ئێرانی دەهاتن لەنێومەدا برای مەیان دەگرت وەلی نەمان دەتوانی بڵێین بۆچی دەیگری و لەسەر چی حەبسی دەکەن وەلی بەپێچەوانەی ئەو رۆژە نوێنەری کوردلەتاران بەسەربەستی ئیدیعای ئازادی کورد دەکاو هیوادارم کەدنیاش چیدی چاوی نەقووچێنێ وحەقی خۆمان بدەنەدەست خۆمان و لەبەرئەوە کە پێمان خۆش نییە شەڕێ بکەین کەبرایانی ئێرانی بەزۆری ومەجبووری هێناویانن لەبەرامبەر مەیان راگرتوون بیان کوژین.وێستا نوێنەری خۆمان ناردووەتە تاران بێ شەڕ حەقی خۆمان بدەنە دەست و دەبێ ئەوەی بزانن کەئەورۆ یەکییەتی کورد دەگەڵ نەتەوەی نەجیب و فیداکاری ئازەربایجانی زۆر بەهێزەو ئەو بەینەی کەئەمن لەتەورێز بووم لەهەموو کارێکدا ئاگامان لێك بووەو هیچ تەفاوەتێکمان لەبەیندا نییە. هیچ رازی نەبوون و نەیان دەهێشت بگەڕێمەوەو حازرن وەك مەکە خۆمان بۆ فیداکردن دەرێگای واندا ئامادەکردووە ئەوانیش وا بۆ مەحازرن وهەردووکمان خەریکی بەرقەراری ئازادی لەسەرتاسەری ئێرانین وەلی لەبەر هێندێك قسە کەبیستبووم و یەکیش بۆ بەخێرهێنانی ئەو برایانە کەلەڕێی دوور ڕا بۆ فیداکاری و گیان بازی ئامادەبوون و تەشریفیان هێناوە گەڕامەوەو ئومێدەوارم کەبەیارمەتی خودای و فیداکاری عەشایروکوڕانی کورد بەزوویەکی زوو ئاڵای سێ رەنگی کوردستان لەسەرتاسەری کوردستان و حەتتا تەواوی ئێرانی بلەرێتەوە.*

## نوتقی حەزرەتی پێشەوای کوردستان لەمیتینگی رۆژی 1325-2-21

حەزرەتی پێشەواو رەهبەری کوردستان رۆژی21-2-1325 لەمیتتینگی ئەو رۆژەدا کەتەواوی سەران و سەرکردان و ژەنەراڵان و مەزنانی کوردستان و چەندهەزار کەس پیاو ژن و فەلەخوێ و جووتیر حوزوریان بوو ئەم نوتقەی ژێرووی خیتاب بەحازران ئیراد فەرموو:

* کوردستان ژمارەی47ساڵی یەکەم 4شەمۆ25ی بانەمەڕی 1325 - 15ی مەی 1946

برا خۆشەویستەکانم. مەعلووم تەسدیقی دەفەرموون کە دەگەڵ ئەو هەموو ئیختیلافو دووبەرەکییە کەدە نێو کورداندا هەبوو کە نێوان ناخۆشی وای لێ هاتبوو تەئسیری دە خانەوادانیشدا کردبووو نێوانی برایانیش تێك چوو بوو وحەتتا بابو کوڕیش پێکەوە یەك نەبوون. پێشڕەفتی کارو دانانی تەشکیلات چەند موشکیل بوو وەلی چونکوو لەمەردان کار عاسییە نابنو مێر بەسەر هەر جورە چەوتو چەڵەمەیەکدا فایق دەبێ بەهۆی ڕەنجو زەحمەتو حەول دانی چەند کەسی ساحیب ئیمانو ڕاست تەشیکلاتیش سازکراو نەزمو تەرتیبیش دەنێو مەملکەتدا بەرقەرار کراو دەمودەتێکی کەمدا ئیختیلافاتو ناتەباییش دووایی پێدرا. تۆخوداکەی چ شاهید و دەلیلێك لەوەی گەورەترە، هەر ئەوەندە کەخەبەری خەتەرێك لەجەبهەی سەقزیو سەردەشتێو تەجاوەزی دوژمن بەخاکی کوردستانی ئازاد بەکوردان گەیشت هەموو پێکەوە لەدوورترین نوقات کوردان خۆیان گەیاندە حدوودێ وهەرگاه لەتەرەف حکوومەتی میللی کوردستانەوە ئیجازەیان با وەك شێری ژیان دە یەك سەعاتدا تەواوی دوژمنانیان ونجڕ ونجڕ دەکردەو تا شاری کرماشانێ وەك هەژدیهای دەمان هەرچی هاتبا پێشیان هەڵیان دەلووشی.

ئەگەر ئەو دووبەرەکییەی جاران مابا چلۆن لەبەر یەکتری دەیان وێرا ماڵە خۆیان بەجێ بێڵنو بیست مەنزل لەماڵە خۆیان دووركەونەوە. دەجا دوژمنان تاکەنگێ دەبێ چاوی خۆیان بقووچێننو تاکەنگێ لەسەر نەفامی بڕۆنونەزانی، کەتانێستا کورد هەر زیللەتو بەدبەختییەکی بەسەریاندا هاتبێ لەبەر ناڕێکیو ناتەبایی بووە دەنا ئەگەر کورد ڕێك کەوێو تەبا بێ کێ پێی دەوێرێ. پێم وایە دوژمنانی خاریجی دەوەی گەیشتوون بۆیە وا وەجووڵەجووڵ کەوتوونو ملیان لەدووروەڕێ ناوە، بەلام دەستگای دیکتاتۆری ئارانی هێندێکیان هێندەیان خوێن خواردووە کە بێهۆشییەکی وا دای گرتوون ئەلعانیش نازانن دنیا چ باسە.

هێندێکیان بەنەشئەی تریاك سەرخۆشنو عیدەیەکیش مەستی ئارەقو شەڕاب لەگەڵ دڵبەرانی مەهوەشی خەریکی عەیشو نۆشنو دەڵێن:

ما را بجهان خوشتر ازاین یکدم نیست

کزنیكو بد اندیشه و از کس غم نیست

بەوانچی غەیری تارانی، مەرکەزی فەسادو شەرارەت و جندەبازی، ئەویدی هەموو خراپ ببێ. هێشتا لەبەر ئەوشتانە کەعەرزم کردن موتەوەجیهی کاری کوردان بەچاکی نەبوون دەنا لەپاش ئەوەی کەئەمە ئیستقلالی تام و تەمامی خۆشمان بەدەست هێنا بۆوەی لەحکوومەتی مەرکەزی مەعلووم بکەین و بەدنیایەش نیشان بدەین کە ئەمە کەئەو کارانەمان کردووە لەبەر موخالەفەت لەگەڵ دەستگای دیکتاتۆرییە نەئینکی کورد لەبرایەتی فارسان حاشا بکا یابەئیزانییەتی خۆی ئیفتیخاری نەکا بەلا ئەو دەردەی کە دەستگای حکوومەتی تاران چ لەپێش ڕەزا خان‌داو چ لەزەمانی ڕەزاخانی‌داو چلەپاش ڕەزا خانی داویە بەکوردان چەنگیزو موغولیش لەگەڵ کەسی نەکردووە.

کێ بێ نەیبیستبێ کەبە چ فێڵ و نامەردییەکی دەزەمانی قەجەراندا جەعفەر ئاغای شکاك لەتەورێزێ کووژرا. کوشتنی حمزە ئاغای مەنگوورو هەزاران ئەمسالی وایان نەبیستبێ؟ کێ بێ نەیبیستبێ کە بە چ ناچەوان مەردییەکی قشوونی ڕەزا خانی پەهلەوی چۆن وەختێك‌دا کەئاراراتی گەرمی شەڕی لەگەڵ تورکان بوون چ ناپیاوانەو ناجەوانمەردانە وەنێو ژن و منداڵی کوردان کەوتن، نەعووزوبیلا چیان بەسەر هێنان چیان لێ کردن، جەلالی چون هەموو بارکران و دەگەڵ هەزاران ماڵی کوردی لای وان هەریەکەی بۆ نوقتێکی ئێرانی بران، ئەلانیش بەشی زۆریان کەس نەیزانی چیان لێ‌هات و چۆن تەلەف بوون. ئەو دەردەی دایان بەگەڵبەغییان کەبەزستانی باریان کردن سەدها منداڵیان دەبەفری‌دا قڕبوون و پیاوان دەستووپێیان سەرمابردی و گەیێندرانە شارانی هەرە دووری ئێرانی و بەئەششەدی عەزاب بەشی زۆریان تەلەف بوو، هەتکی ناموسی و بێ عیفەتییەکی کە دەو هەموو کارانەدا بەسەر کوردا هات شەرمێ دەکەم شەرحی بدەم و تائەورۆ بەشەر نەیکردووە.

کاری ئەمنییان چی لێ بڵێم، سەرتاسەری ئێرانی دۆست و دوژمن شاهیدی فەجایع و جینایات و هەتکی ناموسی وانە،حەتتا تەعەروزیان بەپیاوان دەکرد. شەهرەبانی و نەزمییەیان سەد لەئەمنییە خراپتر، عەدلییە مەرکەزی تالان و بڕۆو ڕووتاندنەوەی خەڵکی بوون لەپەهلەوان و پەنبانی فیراری شەهریوەر مانگی کەدەشانی واندا هاتووە:

همە سر بەسرپشت بدشمن دهیم‌از ان بە کەخود بەکشتن دهیم

هیندە هەوای تەکەبورو عەزەمەت و گەورەیی یان لەسەر ئێمە لێدەدا بەدەرەجەی خوداوەندیش رازی نەبوون و کەسری شانیان دەزانی دەنا ئیدیعای ئولوهییەتیان دەکردو ئەوەی سەرتیپ هۆشمەند بەسەر بانەو هەورامان و مەریوانی هێنا دنیا بیستوویە.

لەبەر ئەوە چاوترساو بووین حازر بووین هەموو خۆمان بەکوشت بدەین و ئیتاعەت و فەرمانبەرداری ئەو دەزگایە نەکەین دەنا ئەگەر بێتوو ئازادی لەئێراندا بەرقەرار بێ چ مانعێك هەیە ئەوی لەئێرانیدا دەژین تێکڕا دەستی برایەتی بدەن بەیەکتری. بزانن شوورەوی چل پەنجا دەوڵەت و میللەتن عەدالەت کردوونیە برا، ئامریکا چل و چەند جمهوورین، سویس دووسێیەکن، یەك ڕوح و گیان پێکەوە دەژین. بۆ وەی کەئەمە نیشان بدەین دە وادەی خۆماندا راست گۆین، باوسەفی وەی کەلەگەڵ نەتەوانی دی ئازەربایجانی هیچ شتێکمان یەك نەبووە، چونکوو ئەوانیشبوونەئازادیخواو دێمۆکرات هەردووك بووینە یەك بەیەکەتییەك کەژیان و مردنمان پێکەوەیە(جە وێنەی بادام- دوو مەغزو یەك پۆست)و بو وەی کەلەسایری نەتەوانی دیکەی ئێرانیش مەعلووم بکەین کەبرایەتیمان لەگەڵ وانیش تێك نەداوە دوو نەفەر نومایەندەمان مەعلووم کرد لەبەر دەرك و ئاستانەی وان حازر بێ و یلێ خۆتان دەگۆڕن و تەشکیلاتوو دەکەنە دێمۆکراسی چون ئەنگو دەڵێن برایەتیو دەکەین و هەرگا خۆتان نەگۆڕن و تەشکیلاتیشتان نەکەنە دێمۆکراسی دیسان ئەمە زیدییەتیکمان لەگەڵ ئەنگۆ نییەو برایەتیمان برایەتی کیسەمان جودایی ئەمەش ساڵهای ساڵە بۆ ئازادی هەوڵی دەدەین پیاوی چابن چیدیکە بەتانك و تۆپ و تەیارە لێمان تێك مەدەن، ئەمەش بەشەرین، حەقێکمان دەبەشەرییەتدا هەیە چ میللەتێك غەیری مە دە ئەسارەت دا ماوە؟ چیدیکەمان قیل لەچاوییەوە مەنێن ولۆکەمان دەگوێی مەئاخنن. ئەوانەی ئەوهەموو کارخانە ساحێب عەزەمەتانەیان دروست کردووە وئەو هەموو شتە عەجایب عەجایبانە وەدەر دەخەن، دەمێکی وەك تەیری بەحەوایدا دەفڕن هەر ئەوەندەی چاولێك دەی مەشریق دەچن بۆ مەغریب، جارێك وەك ماسی هەر ئەوەندەی بلێی یەکودوو بە بن دەریایەدا ئەوسەر ئەوسەری دونیایە دەکەن، کێوانیان هەموو بەتونێلان پەرە پەرە کردو بەڕێی ئاسندا سەدتەها وەتاق کەشارێکی هەڵدەگرن پیاندا ئەودیووئەودیوی دەکەن.

ئوتۆمیبلی ببینن و تانکی تەماشا کەن و سەرنج بدەنە رادیۆو لەتێلێگراف و تەلەیفوونی خورد بنەوە کە لەهەزاران مەنزڵ ڕیوە قسە بەیەکتری دەگەیەنن و چرا بەرقی چاو لێکەن چۆن شەوی کردووتە ڕۆژ.

خولاسە هەر لەئەلئان ڕا تاساڵێکی یەکیەك ئیختیراعاتی ئەوشتانە کەلەسایەی خوێندن و سەنعەت بەدەست هاتووە شەرحی بدەم تەواو نابێ، بەڵێ ئەوانە ئەو عەجایباتانەیان هێناوەتە سەر دنیایە ئەوانیش وەك مە بەشەرن بەڵا چونکوو کاری خۆیان بەدەست خۆیانەو غەمی خۆیان بۆ خۆیان دەخۆن ئەوەی دەیخوێنن تێ دەگەن و ئەوە پێش کەوتوون. لێمان گەڕێن بائەمەش تەکانێکی بەخۆمان بدەین وەدوای خویچندن و سەنعەت کەوین و فەلاحەت و کشتوکاڵی خۆمان وەك خەڵکی لێ بکەین و میللەتمانی پێ دەوڵەمەند بکەین و کارخانان بێنین و ئەوهەموو کانگاو مەعدەنانەمان هەیە باوەڕێی خەین و بەمەنفەعەتی وانە وەڵاتی خۆمانی پێ برازێنینەوە. و ئاغای محەمەد حوسێن خان نومایەندەی مەنیشانیدا کەکورد هێندە لەبراکوژی و ئیختیلافێ خۆی دەپارێزێ، کورد کەدەئێرانێدا ئەکسەرییەتی هەیە بەئەقەلییەتیکی ئازەربایجانی وەك ئەرمەنی وئاسۆڕیان داندران دەنگی نەکرد. دیسان حکوومەتی تارانێ هێندە لەدیتنی مەنزەرەی کەدایك بۆ کوڕی کوژراویان قوڕوەسەر دەکەین وەکەیف دێن و بەبیستنی ڕۆڕۆی هەتیوو باب کوژراوان وەدەماغ دەکەون و بەبەچاوکەوتنی خانووی وێران و گرگرِ ئایساو شاد دەبن و بەناڵەناڵی برینداران وەنەشئە دێن و دەخوێنن تلانەوەی نەوجەوانان خۆشحاڵیان دەکا کەبەهەموو گوزەشتەی کوردانی ئەهەمییەت نەدا، نومایەندەی مە بەمەئیووسی ناردەوە.

ئێستا تەکلیف چییە؟ومیللەتی کورد چلۆنی پێ مەسڵەحەتە ؟ بڵێن بزانم حەقمان نییە بڵێین ئەی تاران ئەوهەموو قەسرو قسوورەت کەبەماڵێ مە دورست کردووە بەست بێ بائەمەش فکرێکی بۆ خانوو لەگڵینەکانمان کەوەغارانی دەورەی سەنگی دەچن بکەین، ئەو هەموو خیابانی ئیسفاڵت و کووچەی ڕازاوەت کافییە، ئەمەش دەکووچانێكدا لەبەر تۆزی بەوشکانی و لەبەر قوڕ بەتەڕوتووشی ناتوانین پێیدا بڕۆین، بائیسلاحاتێکی بکەین ئەو هەموو تەجەمولە دەهەر خاتوویەکی تارانێت دا وەخڕ کردو خەراج و قیمەتی هەموو وەڵاتی کوردانە چ ئیستیفادەیەکت لێکردووە کە ئیدیشت دەوێ؟ سینگوبەرۆکی خانمانوو هێندە زێڕو زێو تێکردووە کەدوو ئێرانی

دیشی پێ ئاوەدان دەبێ ئیدی چت دەوێ لەکوردی ڕووتاوەوە؟ دیسان دەڵێم،بڵێن سەرانی کورد، بڵێن سەرداران بڵێن برا جووتێرەکانو زەحمەتکێشەکان بڵێن چ بکەینو تەکلیف چییە؟

دوای ئەوەی بەیاناتی حەزرەتی پێشەوا لەکاتێکدا تەواوی حازرین پەنجەرەی دڵیان بۆ حاڵی بوون ئاوەڵە کردبوو وگوێیان لەو فەرمایشاتە ڕاگرتبوو لەنێو چەپڵەڕێزانو هوڕراکێشانو بژی کوردو کوردستان تەواو بووو تەواوی گەورەو چکۆڵەی حازران یەکدەنگو یەك ئاواز هاتنە جوابو لەوەڵامی حەزرەتی پێشەوای مەحبووبدا گوتیان: ئاوری نیشتمانپەرستیو ئازایخواهی ئێمە کووژاندنەوەی بۆ نییە، ئێمە مەرامیموقەدەسی (یامەرگ یا ئازادی)مان وەپێش گرتووەو ئازادی خۆشمان وەچنگ هێناوە، ئێستاش هاسانە کەئازادی خۆمان زۆر مەردانەو پیاوانە دەپارێزینو رای دەگرین، ئامادەین ئازادی گشت نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران تەئمینو پایەدار کەینو ئەوان لەژێرزۆری دیکتاتۆرانی خوێن مژو خوێن ڕێژدەربێنینو وەك خۆمان لەئازادی بەشداریان کەین، بژی کوردو کوردستان، بژی ئازادیو دیمۆکراسی بەڕاستی.*

## نوتقی حەزرەتی پێشەوا راجیع بەجەنگی مامەشای سەقز

شەوی30-3-1325حەزرەتی پێشەوای کوردستان کەلەتەورێز ڕا بۆ پێڕاگەیشتن بەمەڵبەندەکانی جەبهە تەشریفی چوو بوو گەڕایەوەو بەیانی ساتی 8لەعیمارەتی پێشەوایی حازر بوو و بەکارەکانی بەردەستی ڕاگەیشتو لەساتی 1ی دوای نیوەڕۆ بۆ بەجێهێنانی فەریزەی جومعە چووە مزگەوتی سوور. دوای نوێژ تەشریفی بردە سەر مینبەرو نوتقی ئیرا فەرموو. لەپێشدا حەزرەتی پێشەوا لەبابەت پەیمانێکەوە کەلەنێوان ئازەربایجانو تارانەوە بەستراوە گەلێك دوواو پتری مەودای پەیمانەکەی تەشریح فەرمووو و بەتایبەتی ئیشارەی بەمادەی 13ی پەیمان کرد کەدەڵێ: (دەوڵەت موافەقەت دەکا کەکوردانی نیشتەجێی ئازەربایجان لەمەزایای ئەم موافەقەتنامە

* کوردستان ژمارەی 50سالی یەکەم 2شەمۆ 6ی جۆزەردانی 1325 - 27ی مەی 1946

ئیستیفادە بکەن و بەپێی مادەی 3ی ئیبلاغییەی دەوڵەت تاکەلاسی 5ی ئیبتیدائی بەزمانی خۆیان بخوێنن."و فەرمووی : لەم مادەیەدا ئیقراریان بەحەقانییەت و مەوجوودییەتی ئێمە کردووەو ئەڵبەتە ئێمە دەمانەوێ تەواوی کوردستان لەم مەزایایەو لەئازادییەکی کەلەسەرتاسەری ئێران بەدەستی کوردان بەزوویی بەر قەرار دەکرێت هەموو براکان بەهرەمەند بن، پاشان ئیشارەی بەشەڕی رۆژی 25–3—24(25) جەبهە فەرموو: کە سووئی تەفاهوم ببوە هۆی روودانی ئەم جەنگە چونکوو من دەستووری تێلێگرافیم دابوو کەڕێگای بۆ میرەدێ و بانەوسەردەشت و بکەنەوە کەخواردەمەنی بۆ سەربازەکانی ئێرانی کەلەو مەڵبەندانە هەن ببرێت، نازانم تێلێگرافەکە درەنگ گەیشتبوو یا ئیجرا نەکرا بوو، سەرتیپ رەزم ئارایش کەئێستا لەسەقزە تێلێگڕافی بۆ ئاغای قەوامو سەلتەنە ناردیوو مەوزوعی رێگانەکردنەوەی وڵام دابوو و قەوام وسەلتەنەش دەستووری دابوو بەهێزی خۆیان رێگا ئاوەڵە بکەنەوە لەنەتیجەدا لەحدوودی 3هەزار کەس سەرباز کەبە 8توپ و دوو تەییارەو دووتانك پشتیوانیان لێکراوە پەلامار بۆ گردی مامەشا دێنن و فەرماندەی پۆستی ئێمەش لەوێ پەیام بۆ سەرکردەی خۆی مستەفا خۆشناو دەنێرێ کەئەوا هێزی ئیرتیجاع پەلاماری هێناوە چارە چییە؟ ئەویش دەستوور دەدا تا نەیێنە نێو سەنگەری ئێوە دەست مەکەنەوە، ئەوانیش کە جەمعەن بەکومەگێکەوە کە لەلایەن سەرکردەی خۆیانەوە پێیان دەکا دەبنە39 کەس دەنگ ناکەن تا دوژمن دەکاتەنێو سەنگەرەکەیان ئەمجار لێیان دەردەپەڕن و عیدەیەکیان لێدەکووژن و پەنجا هەزار فیشەکیان لێدەگرن و دوژمن دەشکێ. دوای کەمێك دیسان دوژمن پەلامار دێنێ، ئەمجار لەحدوودی 30 کەس لەپۆلی سەرکردە میرحاج ئەحمەد کۆمەگ بۆ کوردەکان دێت و شەڕێکی پۆستەمانەو قورسیان دەگەڵ دەکەن و گروهانێکیان لێدیل دەکەن، بەڵام چونکوو پێشمەرگەکانی کوردستان گەرمی شەڕ دەبن و ژمارەیان لە 70کەس پتر نابێت کەس نابێ ئەم دیلانە لێخوڕێ، ئەمجاریش دوای لێگرتنی چەندتفەنگ و کووژراوێکی زۆر دوژمن دەشکێ.دیسان جاری سێیەم پەلاماری دێنن، عیدەی مە کەوەسیلەی هەڵگرتنی بریندارەکانیان بوو ناچار بۆ خۆیان بریندارەکان هەڵدەگرن و دەکێشنەوەو گردی مامەشا بەجێ دێڵن و لەسەربازەکان 500 کەسیان کوژراوو 250 کەسیان بریندارە، دوو تانك و دوو تەییارەیان سووتاو و شکاوە.

حەزرەتی پێشەوا فەرمووی: مەقارنی ئەم پەلامارە لەوبەری چومێش ڕا لەدێی خەیدەرەوەو لەپۆستی میرەدیش ڕا پەلاماریان بۆ هێزی کوردستان بردبوو، هەرچەند لەجەبهەی خەیدەر پێشمەرگەکانی ئێمە لەبەر کەمی لەهەولێوە پاشەکشێیان کردووە بەڵام سوورانی ئاغای ئەحمەد خانی فاروقی بەهیمدادیانەوە هاتووە بیلنەتیجە لەهەردوو جەبهە دوژمن بڕێك تفەنگو فیشەکی بەجێ هێشتووەو عیدەیەکی کوژراو داوەو هەڵاتوون‌و لەجەبهەی میرەدێ محەمەد ئاغای شقویف شەربەتی شەهادەتی چێشتووە.

ئەمجار حەزرەتی پێشەوا هاتە سەر تاریفی ئێلی قارەمانی بارزان‌و فەرمووی: ئەم ئێلە ئازایە دەگەڵ وەش کەنیشتگای خۆشەویستیان بەجێ هێشتووەو هەموو لەماڵ‌و منداڵیان دوورن‌و گەلێ ناڕەحەتی دیکەشیان هەیە زەڕەیەك لەگیانی ئەوان تەئسیری نەکردووەو ڕۆژ بەڕۆژ لەنیشتمانپەرستی خۆیاندا بەتینترن تەنیا داخی کەهەیانە ئەوە بوو پەلامار بۆ سەقز بەرن‌و داگیری بکەن بەڵام ئەمن مەنعم کردن، شەڕێك کە ئێلی بارزان کردوویانە لەمێژوودا وێنەی نییەو دەگەڵ ئازایی ڕۆستەم‌و ئەسفەندییارو.....

بەرجەوەند ناکرێ. لەسەر ئێمە هەموومان پێویستە کەبەماڵ‌و دارایی مانەوە لەکۆمەگ بەهەموو ئێلی بارزان بەتایبەتی ئەوانەی کەلەجەبهەی ڕای دەبوێرن‌و بەتایبەتی ئەوانەی کەلەم شەڕەی دواییدا قارەمانییان نواندووەو لەنێو ئەواندا ئەوانەی لەشەڕێدا بریندار بوون نیسبەت بەخۆیان‌و ژن‌و منداڵیان کۆتایی نەکەین‌و بەڵکوو ئەوان لەخۆمان‌و ژن‌و منداڵی خۆمان لەپێشتر بزانین. *

موساحەبەی نوێنەری ڕۆژنامەی ڕەهبەر لەگەڵ پێشەوای مەزنی کوردستان

وەرگێڕ: قزلجی

ڕۆژنامەی ڕەهبەر دەنووسێ: پێرەکە سەعات 6ی دوای نیوەڕۆ ئاغای قورەیشی ئەندامی هەیئەتی نووسەرانی ڕەهبەر لەویلای ژمارە 5 واقیع لەدەربەند لەگەڵ جەنابی قازی محەمەد ڕەهبەری حیزبی دێموکراتی کوردستان کەدەڕۆژ پترە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ

* کوردستان ژمارەی 62 ساڵی یەکەم 4 شەمۆ 5 ی پووشپەڕی 1325 – 27ی ژوەنی 1946

دەوڵەتی مەرکەزی هاتۆتە تاران موساحابەی کردووە. شەرحی ئەوموساحەبەیە لەخوارەوە بەنەزەری خوێندەواران دەگا:

جەنابی قازی محەمەد کۆت و شەڵوارێکی ساکاری لەبەردابوو و زۆر مەحجووب و بەویقار و بەئوبوهەت دەبیندرا، چەند نەفەر لەموتەنەفیزو گەورە گەورانی کورد کەلەو مەجلیسەدا حازر بوون ئیحترامێکی زۆر نیسبەت بەڕەهبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان قایل بوون. جەنابی قازی دوای ئەوەی لەتەقازای ئێمە راجیع بەموساحەبە لەتەرەف ڕەهبەرەوە ئاگادار بوون زۆر بەمەیل و ئیشتییا حازر بوون جوابی پرسیارەکانمان بدەنەوە. جوابەکانیان کورت و موختەسەرو سەریح و لەڕووی ئیمان و قووەتی قەلبەوە بوو:

پرسیار: مەڵبەند و قەڵەمڕەوی ئێستای نێهزەتی دێموکراتی کوردستان تا کوێ دەڕوا؟

ولام-مەلبەندی نفووزی حیزبێکی کەبەناو کۆمەڵێکی زۆر و زەوەنددا بڵاوبووبێتەوە زەحمەتە مەعلووم بکرێ. بەڵام نێهزەتی ئێمە راستەوخۆ کوردی دەوروبەری ماکۆ، شاپوور، خۆی، ڕەزائییە، شنۆ، سندووس، سەقزو سەردەشت کەنزیکەی حەوسەت هەشت سەد هەزار کەس شارەزایی و ڕەهبەری دەکا.

پ-هێندێ لەسابیقەو ڕابردووی تاریخی نێهزەتی خۆتان شەرح دە.

و-حیزبی دێموکراتی کوردستان سەرەتای لەمەزلوومی وناڕەزایەتی قەدیم و کۆنەوەیە، هەرچەند سابیقەی زۆرە بەڵام لەنۆ مانگ بەم لاوە دەستی بەفەعالییەتی عەمەلی کردووە(کۆمیتەی مەرکەزی حیزب لەمهابادە.) دەست پێکردنەوەی حیزبی ئێمە بەفەعالییەت عەکسولعەمەلی زۆر بۆ هێنانی دەوڵەتانی مورتەجیعە کەلەپێش دەوڵەتی ئێستادا لەسەر کاربوون و دەیانەویست دەگەڵ هەموو نێهزەتێکی لاگیری ئازادی و ئیستیقلالی ئێران بەربەرەکانی بکەن.

پ-چ ئیقداماتێك تائێستا لەو ناحییەو مەنتیقەدا کراوە؟

و- کارێکی هەرە گەورە کە نێهزەتی ئێمە لەمەڵبەندی دەستەڵاتی خۆی کردوویە ئیجادی گیانێکی سەمیمییەت و یەکەتییەکی بێ نەزیرە لەنێوان چەند سەد هەزار نەفەر برایانی ئێرانی ئێوەدا.

ئەمنییەت و ئارامییەکی کە لەومەڵبەندەدا هەیە قەت نەبووەو میللەتی ئێمە لەخۆڕا لەئیجادو ئیبداع و دەست کردنەوەیەکی بەشەڕەفانە لەحەیسییەتی میللەتی ئێران زۆر شاکاریان کردووە. دەگەڵ ئەو وەختە کەمەو نەبونی وەسائیلی چاك کردنی ڕێگایان، دامەزراندنی مەدرەسان، دامەزراندنی چاپخانەو بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو تەربییەتی سیاسی و نیزامی کۆمەڵێکی زۆر لەکوردانی هاونیشتمانی ئێوە بەرەو تەرەقی ڕۆیشتووە.

پ- ئاگات لەحاڵی کوردانی جنووبی کەڕێوڕاست لەژێر نفووزی مەعنەوی نێهزەتی ئێوەدا نین هەیە؟

و-لەو جێگایانە لەهەموو جورە بزووتنەوەیەکی دێمۆکراتیك پێشگیری کراوە بەڵام ئێمە دەزانین لەهەموو جێگایەك هەموو کوردێکی زۆرلێکراوو عاشقی ئازادی لاگیری نێهزەتی بەرەو تەرەقی ئێمەیە.

پ- وەزعی ئێستای کوردانی دنیا بۆ ئێمە شەرح بدە.

و- بێجگە لە کوردانی ساکینی ئێران نزیکەی دوو میلیۆن و نیو کورد لەتورکیادا ڕای دەبوێرن، لەتەرزی بزووتنەوەو ڕەفتاری ئێستای دەوڵەتی تورکییە نیسبەت بەکوردانی ساکینی ئەوێ خەبەرێکم نییە. بەڵام لەوەپێش کوشتارو ئەزییەت و ئازاریان دەکردن، وئەمەش کەدەوڵەتی تورکییە ئیدیعا دەکا کە (مەسئەلەی کوردی لەو مەملەکەتەدا حەل کردووە"لەلای من قابیلی قبووڵ نییە. مەگەر پێمان وابێ کەئەو حەل کردنە بەباری هەڵکوشین و دامرکاندنی ئارەزووی میللی ئەواندا بووبێ... بێجگە لەوەش نزیکەی ملیۆنێك و دووسەد هەزار کوردی دیکەش لەعیراقدا دەژین. ئاکارو بزووتنەوەی حکوومەتی عێراقیش دەگەڵ ئەوان لەفیرارو هەلاتنی بەپۆل و کۆمەڵی کوردانی عێراق بۆ مەنتیقەو مەڵبەندی نفووزی نێهزەتی دێمۆکراتیکی ئێمە ڕووناك دەبێتەوەو وەدەرکەوێ.بەڵام دەبێ بڵێم کە دەوڵەتی فەڕانسە دەگەڵ حەوسەد هەزار کوردی کە لەسوورییە دا دەژین باش بووە.

پ- چ ڕابیتەیەکی مەعنەوی لەنێوان نێهزەتی کوردستان و ئازەربایجان دا هەیە؟

و-هەردووك لامان بۆ ئامانجێك کە ئازادی و سەربەخۆیی حەقیقی و بەڕاستی ئێرانە کار دەکەین.

پ-دەکرێ لەگفتوگۆی تاران یا کولییاتی ئەو ئاگادارمان بکەی؟

و-ئەمن چەند جەلەسە دەگەڵ ئاغای موزەفەری فیرووز معاوینی سیاسی ئاغای قەوام وسەلتەنە سەرەك وەزیرو ئاغای سەرلەشکر ڕەزم ئاراو دووجار دەگەڵ جەنابی سەرۆك وەزیر مولاقاتم کردووە. نەزەری ئاغای سەرۆك وەزیرم زۆر تێکەڵ بەحوسنی زەن و چاك نییەتی دیوە. داخەکەم بەرهەڵستێکی کەگفتوگۆی ئێمەی وەدواخست نەخۆشی جەنابی ئاغای قەوام وسەلتەنە بوو، لەخودام تەڵبە زووتر چاببنەوەتا مزاکەرە بەخێرو خۆشی نەفعو قازانجی ئازادی دوایی بێت.

پ-ئایا لەو ناوەدا چلوچوویی مورتەجیعو پاشەکەشەکان قابیلی تەوەجوهو لێ وریا بوون نییە؟

و-وەختێکی ئیرادەی میللەت و دەوڵەت تێکەڵکارێکی سەحیحو چاکدا ڕێك کەوێ هیچ شتێ ناتوانێ پێشی لێبگرێ.

من ئاتییەکی زۆر چاك تێبینی دەکەمو هیوادارم دەوڵەتی مەرکەزی بتوانێ دێمۆکراسی بەهەموو ئێراندا بڵاوبکاتەوە.

پ-نێهزەتی دێمۆکراتیکی کوردستان تا چ ئەندازەیەك یارمەتی دێمۆکراسی ئاتییەی ئێران دەدا؟

و-نێهزەتی ئێمە لەئازادیخوازانی تارانەوە ئیلهامی گیر کەوت، ئێمە شاعیرێکی میللی بەناوبانگمان هەیە بەنێوی هەژار کە قەسیدەیەکیشی لەڕۆژنامەی ڕەهبەردا چاپ کرابوو. لەم قەسیدەیەدا کوتوویە "ئێمە بەشمشێر ئەوان بەقەڵەم"، ئەمن ئەو قسەیەی وا بەیان دەکەم کەقەڵەمی ئێوەلەتاران کاری سەد شمشێری ئێمەی لەمەنتیقەی خۆمان کرد. میللەتی ئێمەزۆریان دڵ بەنێهزەتی ئازادیخوازی ئێرانەوەیە. ڕۆژنامە ئازادیخوازەکانی تاران بەئیشتیبا دەخوێننەوەو تف و لەعنەت لەڕۆژنامەی ئیرتیجاعی و پاشەکشە دەکەن.

پ- لەومانگانەی دواییدا لەنێوانی دەوڵەتی مەرکەزی و نێهزەتی کوردستاندا بەرهەڵستێکی وابوو کە نەیەڵێ هەر دووك لا لێك نزیك ببنەوەو ڕێك کەون یان نەو؟

و-پێش دەوڵەتی جەنابی قەوام وسەلتەنە ئەم جورە بەرهەڵستانە زۆر بوون بەڵام دوای ئەوە کەئەو دەوڵەتەهاتە سەر کار، دەوڵەتی مەرکەزی هەوڵ و تەقەلای دا بۆ ڕێك کەوتن و سازان.

پ-بۆچی فەرانسەوی راجیع بەمەسئەلەی کورد زۆر عەلاقە دەنوێنن و ئایا ئەو خەبەرەی موخبیری فەرانسەویی بەزمانی تۆوە کوتوویە:" ئێمە هەر وەختێك کە کەیفمان لێ بێ کرماشان دەدەست دەگرین" راستە یان نا؟

و- من پێم وایە فەرانسەوی دەگەڵ کوردان نەزەرێکی خراپیان نییە، لەسوریە ئەوەندەی لەدەستیان هاتبێ کومەگیان بەکوردان کردووە. راجیع بەخەبەرێکی موخبیری فەرانسە لەزمان منەوەکتوویە، هەوەڵ ئەوەیە کەئەم قسەیە بەئێستا کەئێمە لاگیری ئەوەین مەسئەلە بەموسالەمەت حەل بێ مەربووت نییە. دووەمیش ئەمەیە کەمەنزوور دەست گرتنێکی غاسبانەو ئیمپریالیستی نەبووە بەڵکوو مەقسوود ئازادکردنی بەشێك لەهاونیشتمانان و کومەگێکی پتر بەئازادی تەواوی ئێران بووەو دیسانیش دەڵێمەوە کە دەوڵەتی ئێستا ئەو جورە نەزەرییاتە کەهی زەمانی حکوومەتە ئیرتیجاعییەکانی پێشووە لەناو دەبا.*

نوتقی حەزرەتی پێشەوای موعەزەمی کوردستان

جەنابی قازی محەمەد لەکاتی ڕۆیشتن بۆ ورمێ

ڕۆژی هەینی 4-5-1325 سەعاتی 11پێشەوای موعەزەمی کوردستان حەزرەتی قازی محەمەد لەکاتێکدا خۆی ئامادەکردبوو کە بۆ پێڕاگەیشتن بەهێندێ کاران بۆ لای ورمێ و مەڵبەندەکانی کوردستانی باکور بچێت بەحوزووری ژمارەیەکی زۆر لەئاغایانی مامەش زەرزاو ئەندامەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی چاری نوتقێکی بەتسینی ئیراد کرد. حەزرەتی پێشەوای کوردستان لەسەرەتای نوتقەکەیدا ئەم ئایەتە موبارەکەی خوێندەوە:"کتب علیکم القتال وهو کره لکم وعسی ان تکرهوا شیئا وهو خیر لکم الخ" لەدوای خوێندنەوەی ئایەتەکەنوتقی بەتەرتیبی خوارەوە دەست پێکرد:

ئەڵبەتە هەمووتان ئاگادارن کە کورد لەرێگای ئازادیدا زۆری نیهزەت کردووەو لەموقابیل ئیستیعمارو ئیستیسماردا ملەو موبارەزەی دەوام پێداوەو من نامەوێ ئێستا مێژووی نێهزەتی کوردانتان بۆ بگێڕمەوە چونکوو کورد میللەتێکە کەهیچ وەختێ بەربەرەکانی ئیستعیمارو ئیستیسماردا ملەو موبارەزەی دەوام پێداوەو من نامەوێ ئێستا مێژووی نێهزەتی کوردانتان بۆ بگێڕمەوەچونکوو کورد میللەتێکە

---

* ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی 69 یەکشەمۆ پووشپەڕی 1325 ژوویەی 1946

کەهیچ وەختێ لەبەر بەرەکانی ئیستعیمارو فاشیستان دەستی نەگێڕاوەتەوە. بۆ خۆتان دەزانن لەعێراق چییان بەسەر کوردان هێنا. هەرچەند تۆپ‌و تانکیان بەڕووی کوردانەوە دەکار کرد نەیان توانی هەستی ئازادیخوازی کوردان بکووژێننەوەو شاهیدم (ئیشارەی بەدەست کرد) جەنابی مەلا مستەفاو قەومە دلێرە بارزانییەکەیەتی کەلەسەر بیری پاکی ئازادیخوازی وازیان لەخاک‌و نیشتگای خۆیان هێناوە. دیسان لەعەمەلییاتی کێویانەی تورکەکان ئاگادارن کەچیان بەسەر کوردان هێنا کەئێستا ماوەم نییە فەجایعی گیانبرژێن‌و دڵقرچێنی ئەوانتان بۆ بگێڕمەوە. ئەو میلەتانە بەهۆی یارمەتی هێندێ لەمیلەتانی بێگانەی دیکە دایمەن خەریکی شێرەزەکردنی کوردان بوون، بەڵام میللەتی کوردی ئازاو نەبەزو شەڕکەرو تەجرەبە دیتوو ئەو هەموو دەردو ناخۆشییانەی بەبارزانی‌و ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەنگی خۆی بڵیند دەکاتەوەو لەمیللەتانی دیکەی دەگەیێنێ کەحەقی ژیانی هەیەو تا مابێ لەئازادی دەست ناکێشێتەوە....

بەڵێ ئەو زوڵم‌و کوشتن‌و بێدادییە هەموو کۆبوونەوەو بوون بەمەدرەسەیەك فێری پشتی یەکتری گرتنی کردین‌و ئاگاداری کردینەوە بخوێنین، دووبەرەکی لابەرین، خیانەت بەکۆمەڵ‌و یەکتری نەکەین، لەسەر تەماع یەکتر نەهاڕین، دۆست‌و دوژمنمان بناسین. دوژمنانی کورد وایان دەزانی کەبەکوشتن دەتوانن گیانی ئازادیخوازیمان بکوژن.

ئێستاش لەسایەی هێزو قودرەتی ئازادی ئێمەش چاوو گوێمان کراوەو جاریکی دیکە ناچینەوە ژێرچنگاڵی بێدادی، کورد جوێ لەحەقی خۆی هیچی لەخەڵکی نەویستووە، دەیەوێ بەزمانی خۆی بخوێنێ، لەپیت‌و کانگای وڵاتەکەی سوود بەرێ ببێتە خاوەنی کارخانەو کانگا. کورد نایەوێ دەستدرێژی بۆ خاکی هیچ میللەتێك بکا. ئێمە لەو رووناکییەی کەلەدنیادا بریسکەی دێ خۆمان بەبەشدار دەزانین‌و پێمان ناکرێ لەڕۆژی ڕووناکدا چاومان بقوچێنین‌و لەتاریکی‌دا دابنیشین. دەتوانین بڵێین کەڕێگامان بۆ کراوەتەوەو لەقۆناغی حەسانەوە نزیك بووینەوە، بەڵام دەبێ بزانین کەهەموو وەختێك بەشەڕو خوێن ڕشتن کارمان پێك نایە، لەهێندێ وەختدا دەبێ فیداکاری بنوێنین‌و هێندێ ڕۆژی واشمان دێتە پێش کەلەڕووی موقتەزییاتی سیاسەت گوێ خۆمان لەمەیدان بەرینە دەر. گەلێ وەختیش بەئاشتی‌و موسالەمەت

مەڕاممان پێش دەکەوێ. کۆمەڵێکی زۆر لەبرا کوردەکانمان بۆ پێشڕەفتی مەڕام بەگیان و ماڵ هاتنە پێش بەدنیایان پیشاندا کەلەڕێگای پێشکەوتنی دێموکراتی و ئازادیدا باکیان لەسەرو ماڵی خۆیان نییە، پێشڕەوی ئەوانیش برایانی بارزانین و بەتایبەتی ژمارێکی زۆر لەئاغایانی مامەش و پیران و زەرزاو دێبوکری پۆل پۆل بەشەرافەتمەندی چوونە جەبهەو بەسەربەرزی گەڕانەوە، دیسان ئاغایانی مەنگوڕ خزمەتێکی زۆر بەمەگەسان کردووە، ئەو شتەی کە پتر ئەمن مەمنوونی مەنگوڕان دەکا ئەوەیە: ئەوان لەنێو خۆیاندا ناخۆشییان بوو، ڕۆژێك پێم کوتن کەکێشەی ئەنگۆ لەسەر ئیستیکانە چایەکە کەلەپێشدا بۆ کامتانی دانێن و یادئاوەریم کردن کەئەوڕۆ بۆ ئێمەیەکەتی پێویستە جا دوای ئەوە دێین بەوردە حیسابی نێو خۆمان رادەگەین. ئەلحەقی وەلئینساف ئەوانیش قسەی منیان بەکارهێنا و هەموو جورە ناخۆشییەکیان لەنێو خۆیان لابرد. دیسان ئەفرادو کۆمەلانێکی زۆر لەکوردەکان نیشانیان دا کە بۆ فیداکاری لەپێناو ئازادیدالەخۆبوردوو فیداکارن، لەبەرانبەر دێموکراسیدا ماڵ و منداڵیان نایەتە بەرچاوو بەئێمەو هەموو دنیایان نیشاندا کە بۆ لەباوەش گرتنی مەعشووقی خۆشەویست(ئازادی و دێموکراسی) باکیان بەهیچ نییە، پاکی و فیداکاری و مەردایەتی خۆیان بەدنیا نیشاندا، پێشڕەوی ئەوانەش برایانی "بارزانی"ن... بەقسە هیچ بوون بەڵام بەکار ڕووی کوردیان سپی کردووە.

هێندێ لەبرایەکانمان بەقسە کێوی بیستوون بوون، بەڵام بەکار مێشوولەش تەواو نەبوون.کورد ئەوانەی یەك بەیەك ناسی زانی کە بە"قسەی گەورە سەر ناکەوێ، بەکار میللەتی کورد دەگاتە هیوای خۆی" و لەوەختی خۆیدا هەر کەس بەمیزانی خزمەت جەزای دەدرێتەوە. بەشێك ویستیان کە بۆ ئازادی هەوڵ بدەن و مەڕامی خۆیان ببەنە سەر بەڵام داخەکەم هێندێ کاری ناشیرنیان کرد کەبووە لەکە لەسەر خۆیان.

برایانی خۆشەویست: ئەمن لەئێوەم دەوێ کەتەنیا شەڕکەر نەبن بەشکوو چەکێکی وا هەل بگرن کە بتوانن بەرامبەری دەگەڵ لەشکری میللەتانی تر بکەن، ئەو چەکەش(عیلم و زانستە). مەرحەلەی شەڕ تەواو بوو نۆبەی هونەرە... ئەمن لەئێوەم دەوێ کەبەزانست بەربەرەکانی دوژمنان بکەن."چەك بێ عەقڵ دوژمن نابڕێ"... بەڵام داخەکەم ئاغاکان ئامادە نین کەلەمیوەی خوێندن بەهرەوەر بن، ئەگەر بڵێم کوڕەکانتان، برایەکانتان بهێنن بیان نێرم بۆ جەبهە باکیان نییە، ئەگەر دە کوڕی

هەبێ هەر دەیان دێنێ، بەڵام ئەگەر بڵێم بۆ خوێندنیان دەنێرم رووی خۆیان گرژ دەکەن و عوزری ناموجەهە دێننەوە، ئەگەر پێیان بڵێم مەدرەسەیەك لەدێیەکانتان بکەنەوەمات دەبن، ئەو کارە پەستانەش سەبەبی ئەوەیە کەهێشتا لەبەری خوێندەواریان نەخواردووە، نازانن ئینسانی بیسەواد ئەگەر رۆستەم بێ بەکاری دوو شایی نایێ. تەماشای میللەتی رووس بکەن، سەرنج بدەنە سیاسەت و پێشکەوتنیان بۆتان دەردەکەوێ کەبەهۆی زانست و هونەرە کەسەد قوناغ لەپێش هەموو میللەتێکی رووی زەوین. فەرمایشی پێغەمبەر سەلەلاهوو عەلەیهی وەسەلەم" ئوتلبولعیلم مینەلمەهد یلەللەحەد" یان بەکارهێناوەو هەر ئەوان دەزانن مەعنای چییە... ئێمە وادەزانن کەباسەوادی ئەوەیە کە بتوانین چوار هاروێ ودوو کاڵەك کۆبکەینەوە، یاکاغەو بخوێنینەوە! کورد سێ شتی گەورە لەژیانیدا زۆر پێویستە :
1-خوێندەواری، 2- تەربییەی باش، 3-فیداکاری. بەڵام سەد مخابن کەماوەی ئێمەو ئەوانە وەکوو عەردو ئاسمانە.

دەبێ مانای تەربییەت فێر بین و بەکاری بێنین و سەرکردەکانمان دەبێ مەعلووماتی نیزامی زۆر کۆکەنەوە، دەبێ شارەکانمان زۆر پاك و خاوێن ڕابگرین کەمیللەت لەنەخۆشی و هەژاریدا نەمرێ، پێویستە کارو ئیدیعامان وەکوو یەك بن.. ئازادی بەقسەو هوراهورشا وەرناگیرێ بەماندوو بوون و لەخۆبووردن پایەدارە....

ئەی خۆشەویستەکانم وەختێ میللەتی کورد بەختیار دەبێ کەئێمە وا لەمەنافیعی شەخسی بهێنین... هەر وەکوو کاری خۆمان جێبەجێدەکەین کاری میللەتیش وابخەینەڕێ، کاری شەخسی وەپێش کاری عوومومی نەخەین.

دروستکار ئەو کەسەیە کە پووڵ و موڵك و مەقامی مەنزوور نەبێ، جا تکام وایە کە چی دیکە چاوتان لەمەنافیعی شەخسی نەبێ،مەدرەسە لەدێهاتەکان بکەنەوە بیمارستان دروست بکەن، یاریدەی هەژاران بدەن، کارخانە بکرن...دنیا پێنج و دوو ڕۆژێکە، پوول نێوی ئینسان بڵیند ناکا بەڵکوو خزمەت بەمیللەت و نیشتمان ئەستێرەی سەرشانی ئینسانە. بۆ خۆتان دەزانن کەئەمن بۆ وەرگرتنی حقووقی کورد شەوو ڕۆژ وچانم نەداوەوئەوزەحمەتەش بەفەخر دەزانم، تایەك ڕۆژم لەدنیا مابێ دەستلەفیداکاری هەڵناگرم و بەهەموو کەسێکی دەسەلمێنم کەکورد شایەنی ژیانە ودیسان بۆ خۆتان دەزانن کەلەپێشدا ئێمە بەهیچ جورێك داوای تەجزییەی شیرانما

نەکردووەو تەنیا مەبەستمان ئازادی خۆمانو پاراستنی دیمۆکراتی بوو. بەلام لەپێشدا کاربەدەستانی ئێران بێجگەلەوەی جوابیان نەدایەوە شۆخیشیان بەداوای ئێمە کردو ناچاربووین حکوومەتی میللیمان دامەزراندوهێزی خۆمان لەبەرانبەر ئەواندا تاقی کردەوە. ئەوان کەویستیان لەمە بێنە پێش، ئێمەش لەوان چوویە پێش، ئێستاش ئەوان حازر بوون پاشەکشێ بکەن، ئێمەش ئامادە بووین پکشێینەوە.ئەوان دەگەڵمان هاتوونە باری پیاوەتی ئێمەش گوێیان بۆ ڕادەگرین. لەسەفەری تارانمدا دەگەڵ ئاغای قەواموسەلتەنە زۆرم گفتوگۆ کرد ئاغای قەواموسەلتەنە نەزەرێکی موساعیدی دەگەڵ کوردان هەیە، ڕۆژێك ئاغای قەوام پێی گوتم: ئەوا ئێمەش بووینەدیمۆکراتو حیزبی دیمۆکراتی ئێرانمان دامەزراندووە وابەباش دەزانم کەنێوی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بگۆڕنو نێوی بنێن حیزبی دیمۆکراتی ئێران، منیش وڵامم داوە: کەئەمن بەبێ تەسویبی کۆمیتەی مەرکەزی هیچ کارێکی ناکەم چونکوو دیمۆکراتی مانای ئەوەیەکەشەخس ناتوانێ مەسلەحەتی میللەتی بێ موشاوەر بگرێتە دەستی خۆی. ئاغای قەوام ددانی بەوەدا هێنا کەکوردستان شایانی تەقدیرەو میللەتی کورد ئامادەی هەموو جۆرە فیداکارییە بۆ گەیشتن بەئازادیو دیمۆکراتیو کوتی:"نێهزەتی دیموکراتی کوردستان بەپشتیوانیکی گەورەی خۆمان دەزانینو ئومێدمان ئەوەیە کەبەهۆی ئێوەوە دیمۆکراتی لەتەواوی ئێراندا بلاوبێتەوە."

ئەلئان لەعێراقیش دەستیان کردووە بەموبارەزە کە دەستی زۆرداری لەمل خۆیان دەربێنن، ئێمە ئامادەین بەتەواوی ئێران کومەگ دەکەینو ئەگەر بێتوو ئازادیخوازانی عێراقیش پێویستیان بێو کومەگمان لێ بخوازن کۆمەگیان پێدەکەینو بەڵکوو بۆ یارمەتی هەموو ئازادیخوازانی دنیا ئامادەی فیداکارین.

وەئەگەر لەو سەفەرەی منیش دەپرسن: بۆ خۆتان دەزانن کەئازەربایجانی براو پشتو پەنای ئێمەنو ئەم ڕۆژانە بیستوومە کەلەئەتڕافی ورمێ هێندێ لەکوردەکان ئەسپابی زەحمەتی هێندێ لەبرا ئازەربایجانییەکانیان فەراهەم هێناوەو نارێککییان کەوتووەتەنێوان، ئەمەکارێکی یجگار خراپە، مومکین نییە تەعەدی بەحقووقی هیچ فەردێکی ئازەربایجانی یا کوردبکرێ، بەپێی پەیمانی نێوانی کوردو ئازەربایجان خیانەت بەئەفرادی ئازەربایجانی خیانەت بەئەفرادی کوردە، جا دەچم بزانم

مەبەستیان لەم جورە کارە ناحەزانە چییەو بۆچی وادەکەن. براکانم وەکوو بیستوومە گەڵێ کەس ڕیشوەت دەخۆن، گومرگ دەستێنن نای دەن بەماڵییە. شتی دەکڕن بەتمەنێك دووتمەن لەسەر حکوومەت دەنوسون، خیانەتو دزی کردن لەپیسترین دەردەی میللەتە. دەبێ لەو خووە پیسانە خۆتان بپارێزنو هومێدم هەیە کە هەموو پێکەوە شەوو ڕۆژ بۆ مەسڵەحەتی میللەت تێکۆشن، پووڵتان مەنزوور نەبێ، بوغزو دووبەرەکی بمرێنن تابتوانن دەدەنیای ئەوڕۆدا کەتەڕەقی گەیشتۆتە ڕادەیەك بێجگە لەبەرق دەیانەوێ ئەتۆم بکەنە نارنجێك مەملەکەتێکی پێ گەرم دابێنن یابیکەنە شوینێك نیشتمانێکی پێ تێك دەن، بگەینەڕیزەی میللەتانی دیکە.*

## نوتقی حەزرەتی پێشەوای کوردستان

برایانی خۆشەویست ئەوسەفەرانەی کەمن دەیان کەمو لەوەختی هاتنەوەدا تەواوی ئەهالی لەڕووی ئیحساساتی نیشتمان پەرەستییەوە ئیحساساتی خۆیان دەنوێننو گەورەو چکۆڵەیان دێن بەپێشوازەوە هەموو ماندوبوونو زەحمەتێکی سەفەرم لەبیر دەباتەوە. ئەوەی کە عەرزوو دەکەم زەحمەتی سەفەر لەبەر ئەوەیە کە مەشهوورەکە زەحمەتی هەیە دەنائەمن هەر سەفەری کەکردبێتم یابیکەم هەر چونکوو لەڕێگای میلەتی‌دایە بەمونتەهای سەعادەتو خۆشبەختی دەزانم، بەڵێ زەحمەت نییە بەڵکوو لەزەتە. ئەو سەفەرەی دوایش کەمن کردمو لەزیمندا شارەکانی ورمێ، شاپوور، خۆیو ماکۆم دیون، کوردو مەڵبەندەکانی کوردستان گەڕام بۆ ئەوە بوو کە برا کوردەکانی خۆم لەنزیکەوە ببینمو ئاشنای ڕووحییەی ئەوان بمو پێم کوتن ئێوە بۆ خۆتان دەزانن کەئێمە نێهزەتێکی گەورەمان کردووەو لەم ڕێگەیەدا زۆرمان زەحمەت کێشاوەو گەلێکمان فیداکاری نواندووە، ئێستاش ئێوە ئەگەر ئەم کارەتان لەبەر گرانە هیچ مانعێکی نییە، مومکینە کوردی هەر مەڵبەندێك دەگەڵ ئەو شارانەی ئازەربایجان کەلێیان نزیکە هاوکاری بکەن. مەسەلەن کوردی دەورو بەری ورمێ دەگەڵ ورمێو کوردانی دەوروبەری شاپوورو خۆی ماکۆ دەگەڵ ئەو شارانە هاوکاری بکەنو ئێمە دەگەڵ ئازەربایجان هیچ جیاوازیمان نییە.

---

* ڕۆژنامەی کوردستان– ژمارەی سێشەمۆ 8ی گەلاوێژی 1325–نۆوتی1946

لەوەڵامدا کوتیان ئێمە ئاڵای موقەدەسی سێ ڕەنگی کوردستانمان هەڵ کردووە کەلەسێبەری‌دا خۆمان‌و هەموو کوردێکی دیکە بحەسێنەوە، هەتا قەترەیەك خوێن لەبەر بەدەنی ئێمەدا مابێ ئاڵای موقەدەسی ئێمە نابێ نەوی بێت. ئێستاش لەحەمدی خوداوە ئاڵای موقەدەسی کوردستان لەتەواوی نوقاتی کوردستان دا دەلەرێتەوەو هەر دەبێ بلەرێتەوە. ئەو ئاڵایە تەنیا هەر ئی ئێمە نییە بەڵکوو ئاڵای هەموو کوردانەو ئەوانیش چاویان لەو ئاڵایەیەو بەهومێدی لەرینەوەی ئەو ئاڵایە دەژین‌و لەو جێگایانەدا کەدەپێشدا لەسەر خاکە موقەدەسەکەیان لەراوەتەوە دەبێ بلەرێتەوەو ئەگەر شتێکیش تائەوڕۆ لەئێمە بیندرابێت لەبەرئەوەیە کەئێمە تائەوڕۆ مەداریسمان نەبووەو لەخوێندن‌و شارستانییەت دوور کەوتووینەوەولەکاروباری حکوومەتی‌و تەشکیلاتیش بێخەبەرین، دەنا ئێمە هەموو کوردی خوێن پاکین‌و گشت لەڕێگای کوردییەت‌دا دەمرین. جوابی کوردەکانی ئەو ناوچانە بە من ئەوە بوو کەعەرزم کردن.

لەم سەفەرەدا کەبەشارەکانی ورمێ، شاپوور، خۆی، ماکو داڕبردم، برایانی ئازەربایجانی لەفەرماندارەوە بگرە تا ڕوئەسای ئیدارات‌و کارمەندان‌و خەڵکی شاری تاچەند فەرسەخی پێشوازیان لەئێمە کردوهەر کە دەگەیشتینە نێو شاری بۆ پێشمەرگەخانەی خۆیان بانگ دەکردین‌و لەچوون‌و گەڕانەوەدا گاردی ئیحترامیان لەڕێگەدا بۆ دادەناین‌و ئەگەر لەشاریش دەهاتین بڕۆین دیسان گاردی ئیحترامیان دەناردە دەری شاری‌و لەسەر ڕێگایان ڕادەگرت بەڵام لەم قسمەتەدا ئەمن مەنعم دەکردن‌و پێم خۆش نەبوو ئەوان زەحمەت بکێشن. لەهەموو شارەکان توانیم مەنعیان بکەم بەڵام لەشاری خۆیە نەم زانی لەوەختی حەرەکەتیش‌دا گاردی ئیحترامیان دانابوو. ئیحتراماتێکی فەوقولعادەیان بەجێ‌هێنا، بەڕاستی ئەو ئیحساساتەی کەبرا ئازەربایجانیەکان لەم شارانە نیسبەت بەئێمە نواندیان دەتوانم بڵێم لەکوردیش ئەو ئیحساساتە نەبیندراوەو لەورمێش مێهمانی جەنابی فەرماندارى وێ ئاغای ڕەفیعی کەیەکێك لەئەشخاسی نیك سیرەت بەیەك ئەندازە سەعی دەکا بۆ نێوان خۆشی کوردو ئازەربایجانیان بووین، زۆر پەزیرایەکی چاکیان کردین. لەم سەفەرەدا کە براکوردەکانم چاو پێکەوت موەفەق بووم کە هێندێ ئیختیلافات کە دەنێویاندا بوو لای بەرم. هێندێ لەئاغایانی هەرکی دەگەڵ نوری بەگی بەگزادە بەشەڕ هاتبوون، چەند پیاوێك لەبەین‌دا کوژرابوو توانیمان ئەو قەزییەش خامۆش کەین‌و ڕێکمان

خستنەوەو ئیختیلافاتی کۆن‌و نوێمان هەموو لەنێوان پاك کردنەوە. و لەخۆی‌و ورمێ ئاغای پیشەوەری سەدری فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجانم مولاقات کرد.

ئاغای پیشەوەری ڕاجیع بەبرایەتی کوردو ئاوەربایجان زۆر دەستووراتی فەرمووو وتی‌حازرین هەرچی لێمان بخوازن کۆمەگ بەکوردان بکەین‌و ئازەربایجانی ئامادەن لەسەر کوردان خوێنی خۆیان بڕێژن، فەقەت پیشەوەری گلەیی لەهێندێ کوردەکانی ئەتڕافی ورمێ کرد منیش جوابم داوە کە کوردانیش حازرن بەگیان‌و ماڵیان لەئازەربایجان دیفاع بکەن‌و فەرقێك لەبەینی کوردو ئازەربایجاندا دانانێن.چەند مانگ ئێمە قشوونمان لەئەتڕافی سەقزو بانەو سەردەشت ڕاگرتبوو ئەو لەشکرە تەنیا بۆ پاسەوانی کوردستان نەبوو، بەڵکوو بۆ پاراستنی سنووری کوردستان‌و ئازەربایجان بوو ئەلئانیش حدووداتی خاریجی کوردستان‌و ئازەربایجان ئەوڕۆ لەتەڕەف کوردانەوە پاس دەکرێ، دیسان فەرمووی قەتعەن ئێمەش بۆ هەموو خزمەتێکی پێویست بەکوردان ئامادەین‌و لەبابەت گلەییەکانیەوە جوابی لازمم داوە.

ئەمن لەمسەفەرەدا هێندێ کارم مابوو کەجێ‌بەجێیان بکەم بەڵام چونکوو بیستم کەسێ نەفەر لەموحەسیلینی ئێمە کەلەباکۆ دەخوێنن بۆ سەردانی وڵات هاتوونەوە تاڵووکەم کرد کەچاوم پێیان بکەوێت‌و ئینتیزاریم هەبوو کەلەوەختی هاتنەوەی ئەواندا پێشوازێکی زۆر چاکیان لێ‌بکرێ چونکوو ئەوانە هەوەڵ موحەسیلێکن کەلەکوردان چوون بۆ خاریجە، میللەت دەبێ زۆریان قەدردانی لێ‌بکا، بەڵام داخەکەم لەم خسووسەوە وەك پێویستە تەوجوهی لازم‌و پێشوازی شایانیان لێ‌نەکراوە.ئومێدەوارم کەهەموو ساڵێك مووەفەق بین ژمارەیەکی زۆر لەموحەسیلین بنێرین بۆ خاریجە کەبەحەول‌و قووەتی خودا مووەفەق بین بەهۆی عیلم‌و زانست کەشتی کوردستان بگەیێنینە ساحیل‌و خواهیش لەو دانیشجوو خۆشەویستانەی خۆمان دەکەین کەلەماوەی ئیقامەتی خۆیان لەمهاباد موشاهەداتی خۆیان لەوێ بەنووسین‌و بەگوتن بۆ خەڵکی بڵێن‌و بنووسن کە میللەت ئاشنا بێت کەمیللەتانی دیکە چلۆن بەقووەتی عیلم‌وزانست‌و ئەرزو ئاسمان، سەردەریا وژێردەریایان موسەخەر کردووە، لەوە زیاتر زەحمەتوو نادەم‌و لەزەحماتی ئێوە تەشەکور دەکەم‌و لەخودا دەخوازم هەر پێش کەون‌و هەر پیرۆز بن.*

* ڕۆژنامەی کوردستان ، ژمارەی 76سێشەمۆ 22ی گەلاوێژی 1325، نووت-1946

تێلگرافێک بەمەزموونی ژێرەوە لەلایەن جەنابی ئاغای قازی محەمەد پێشەواورەهبەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان موخابەرە کراوە.

تاران- جەنابی ئەشرەف ئاغای قەوام رەهبەری حیوبی دێمۆکراتی ئێران، روونووس جەنابی ئاغای دوکتور کەشاوەرز رهبەری حیزبی توودەی ئیران، روونووس جەنابی ئاغای سالح رەهبەری حیزبی ئێران

روونووس تەبریز جەنابی ئاغای پیشەوەری رەهبەری فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجان، تاران_ئاغای پادگان معاوینی سەدری فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجان.

بەئیحتیرامەوە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان ئامادەیی خۆی بۆ ئیئتیلاف دەگەڵ ئەحزابی ئازادایخواه(دێمۆکراتی ئێران، توودەی ئێران، دێمۆکراتی ئازەربایجان، حیزبی ئێران) رادەگەیێنێ و ئەم ئیئتیلافە بەموجیبی سەعادەت وعەزەمەتی میللەتی ئێران دەزانم و بەم وەسیلەیە جەنابی ئاغای سەدری قازی لەلایەن حیزبی دێمۆکراتی کوردستانەوە بۆ گفتوگۆی پێویست و ئیمزای ئیئتیلاف نامە بەنومایەندەیی موعەریفی دەکەم.

رەهبەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان
محمدی قازی*

---

* رۆژنامەی کوردستان ژمارەی 85 پێنجشەمۆ 21ی خەرمانانی 1325 سیپتامبری 1946

# پاری دووهەم

## سەرەك وەزيران و لێپرسراوانی تری حزب و كۆمار

دوای ئەو باس و رۆڵەی پێشەوا، باڤاوڕێك لەجێگە كۆمەڵایەتی و چینایەتی لێپرسراوانی تری حزب و كۆمار، بدەینەوە، بۆ ئەوەی بتوانرێت نرخاندنەكە گونجاو و لەگەڵ واقیعەكەی هەریەكەی لەو لێپرسراوانە یەكبگرنەوە....

2-حاجی بابە شێخ: لەشێخەكانی بۆكان و پیاوێكی موسڵمان و شەخسییەتێكی ئایینی بوو. لەسەردەستی زانایانی ئاینییدا لقەكانی زانستی ئایینیی خوێندووە.

خاوەن موڵك و پلەیەكی كۆمەڵایەتی بووە، لەتوێژاڵی سەرەوەی كۆمەڵگەدا جێگەی خۆی هەبووە، هێمنی شاعیر دەربارەی حاجی بابە شێخ گوتویەتی:

"پیاوێكی زۆر كۆنەپەرست و كەللەڕەق و خۆپەرست و ناشارەزا بوە، بەڵام زۆر راست و پاك و ئازاو بەبیروبڕوا بو. بەهیچ جۆرێك تاوانی خەیانەتی پێوەنانوسێ. لەكاتی وتووێژ لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی مەركەزیدا دور نیە فریوی خواردبێ و بەهەڵە چوبێ. بەڵام لەرێگای راست لای نەداوە.."(4)

لەگەڵ ئەوەشدا رەئیسی هەیئەی رەئیسەی میللی(سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران) بووە. بەڵام دەسەڵاتێكی ئەوتۆی نەبووە، لەبڕیاردان لەسەر هەندێ كێشەی هاوپێوەند بەئایین هەنگاوی ناوەو لەجێگەی یاسا، حسابیان بۆ كراوە. بەگشتیی پیاوێكی خۆشەویست و خاوەن رێز بوو لەناو كۆمەڵگەی كوردەواریدا گەلێك لەو بڕیارانەی پێوەندییان بە رەدوكەوتن و دزی و خیانەت و دەردە كۆمەڵایەتییەكانی تر بەناوی ئەمەوە لەرۆژنامەی كوردستاندا بڵاوكراوەتەوە.

3-محەمەد حسەین سەیف قازی(حەمە حوسەین خانی سەیف قازی) ژەنراڵ و وەزیر جەنگ بووە، ئامۆزای پێشەوا قازی محەمەدە، لەبەرئەوە جێگەی تایبەتیی خۆی هەبووە ئەو پلەیەی لەكۆماردا وەرگرتووە، ئازاو خاوەن پلەیەكی كۆمەڵایەتیی و سەربازیی بووە، شوێن و پایەیەكی گرنگی هەبوو...

خاوەن موڵك و ماڵ و زەوی‌وزار بووە، لەنزیك میاندواوە خاوەنی دە دوانزدە دێی بەپیت و بەرەكەت و بەراوو دەوڵەمەند بوو.. لەبەڵگەنامەكانی د.ج.ك دا زیاتر زانیاریی لەسەر ئەم لایەنە هەن.

4-محەمەد ئەمین معینی: لەسەرەتای دووەم جەنگدا، ئەم خاوەنی گەراج بوو، دوای ئەوەی وازی لەوە هێنا، بوو بەبازرگان، کاتێك ئەرتەشی سوریش چووە مهابادو ئەم پەیوەندیی خۆی لەگەڵ بازرگانە روس‌و ئازەرەکان بەهێزکرد، ئەو کارە نوێیە مەڵبەندی کۆمەڵایەتیی ئەم وەزیرەی گواستەوە بۆ چینی دووەم، یان چینی ناوەندی کۆمەڵ.. دوای ئەوەی بۆ سوڤییەتییەکانیش دەرکەوت کە هاوکارێکی باشە ئیتر زیاتر متمانەیان پێی بوو، تا کرا بەئەڵقەی پێوەندیکردن لەنێوان لێپرسراوانی سوڤیەت‌و حزبی دیموکراتی کوردستان.

5-ئەحمەد ئیلاهی: کوتاڵ فرۆش‌و بازرگان بووە، جێگە کۆمەڵایەتیی لەریزی چینی ناونجیی کۆمەڵدا دادەنرێ، شارەزای کاروباری بازرگانیی‌و کاسبکارێکی زیرەك بوو، ئەم وەزیرە خوێندەوارو هوشیارییەکی سیاسیی سنورداری هەبووە...

6-کەریم ئەحمەدیان: لەژنەکەیەوە خزمی پێشەوا قازی محەمەد بوو. پێش کۆمار فەرمانبەری حکومەتی بوو. لەریزی وردە بورژوا حساب دەکرێ، پیاوێکی دڵپاك وەزیرێکی کەم دەسەڵات بوو.

7-حاجی عەبدولڕەحمان ئیلخانیزادە: یەکێك بوو لەسەرکردە ناودارو خوێندەوارەکان، خاوەن‌و موڵك‌و زەوی زارێکی زۆری ناوچەی بۆکان بوو، هوشیارییەکی سیاسیی دیارو خاوەن رۆڵ بوو، لەکۆمەڵەی ژ.ك‌و چالاکییەکانی، لەنوسین لەگۆڤاری نیشتماندا لێپرسراوو وەزیرێکی پلەو پایەدیار بوو، نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو، لەیارمەتیدانی کۆمارو بزووتنەوەی کوردایەتیدا دەست والاو بەخشندە بوو... وەزیرێکی خوێندەوارو هوشیارو زیرەك بوو.

8-ئیسماعیل ئیلخانیزادە: ئامۆزای حاجی عەبدولڕەحمانی ئیلخانی زادەیە، سەرکردەیەکی تری ئیلخانیزادەکان بوو، خاوەن موڵك‌و زەوی‌وزار بوو. خوێندەوارییەکەی خراپ نەبوو، دانانی بەوەزیر، هەر لەبەر پلەو پایەی بوو لەناو ئیلخانیزادەدا.

9-مەناف کەریمی: بازرگان‌و وردە مالیك بوو، خوێندەوارو رۆشنبیر بووە، لەناو چینی ناوەڕاستی کۆمەڵدا حساب دەکرێ.

10-خەلیل خسرەوی: لەخێزانێکی ناوداری مهاباد بوو، بەبازرگانییەوە خەریك بوو. ئەمیش هەر لەچینی ناوەڕاستی کۆمەڵدا خۆی دەبینییەوە.

11-حاجی مستەفا داودی: بازرگانو خاوەن زەوی زارو باخو بێستانو، لەخێزانێکی ناوداری مهاباد بووە.

12-محەمەد وەلی زادە: لەخێزانێکی دەوڵەمەندو بازرگان بووە، دەڵێن خوێندنی کشتوکاڵی لەقوتابخانەی بەرزی کشتوکاڵی تەواوکردووە. لەڕوی ئابوریو دەرامەتەوە، خۆیو بنەماڵەکەی لەچینی سەرەوەی کۆمەڵ دادەنران...

13-سەید محەمەد ئەیوبیان: لەخێزانێکی دەوڵەمەندو لەچینی سەرەوەی کۆمەڵ بوو، باوکی خاوەنی ئەجزاخانەی مەهاباد بووەو ئەم بەڕێوەی بردووە.

هەروەها قاسمی قادری قازی مامۆستای قوتابخانە، عەلی ڕێحانی بازرگان، عەلی مەحموودی مامۆستای قوتابخانە، مستەفا سوڵتانیان بازرگان، عەبدولڕەحمانی کەیانی بازرگان، محەمەدی یاهو- کارمەند، مەلا عەبدوڵلای داودی (مەلای حەجۆکی)- ڕووناکبیر، محەمەد ئەمین شەرەفی بازرگان، سەدیقی حەیدەری بازرگان محەمەدی نانەوازادەو محەمەد دڵشاد ڕەسوڵی بازرگانو کوڕە بازرگان بوون، زەبیحی لەناوچینی هەژاراندا خۆی دەبینیەوە هێمنیو هەژار سەر بەناوە خێزانە دەرکەوتووەکانی موکریان بوون، ڕۆڵو جێگەشیان بەردەوام گرنگو بەتەئسیر بوو.

بەو پێیە دەردەکەوێ کەزۆربەی ئەندامانی سەرکردەو وەزیرەکان خاوەن موڵکو سەرەك هۆزو بورجواو پیتی بورجوا بوون، لێپرسراوو فەرماندەکانی سوپاو دەستگاکانی تری حکومەتو بازنەی چینایەتیی ئەو سەرکردایەتییەو جێگەی کۆمەلایەتین زامنی ئەو پلەو پایەیە بوون کە هەیانبو بەتایبەتی: عومەر خانی شەریفی، مەلا مستەفا، حەمە ڕەشیدخانیو سەرکردە پلە دووەمەکان.

دەربارەی پێکهاتەی کۆمەلایەتیی وەزارتەکەی جەمهوریەتی کوردستان ولیام ئیگلتون دەڵێت:

"بەگشتیی ئەو حکومەتە کوردییە نوێنەری چینی سەرەوەی شاری مەهابادو دەوروپشتی بووە، سیاسەتو سیاسەتی ئابووریی پارێزەر(محافظ) بووە، وە هەر ئەوەش لەخاوەن زەویو موڵکدارەکان دەکرا.. بەلام ڕەوتی گەشەکردنە کۆمەلایەتیو لایەنی خوێندەواریی نوێخواز بوو... هەرچەندە بەتەواوی نوێنەری بزوتنەوەی

ڕێکخراوی نیشتمانیی کورد بووە لەناوچەی مەهاباد، کەچی نوێنەرایەتیی ناوچەکانی ورمێ و هەرێمی سەردەشت-سەقز خرابوونە پشتگوێ..."(5)

لەڕوی شلۆقیی زەمینەی سیاسیی ئەو کەسانەی لەنێو بازنە لێپرسراواندا ناویان برا، ئەحمەد شەریفی دەنوسێت:

"زۆربەی ئەو کەسانەی ناویان برا لەئەنجومەن و وەزارەتی کوردستان، ئێستا لەژیاندان و لەشادۆست و نیشتمانپەرستترین خەڵکی مەهابادی ئێستان... زۆربەشیان ئەندامی ئەنجومەنی شاری مەهابادن....(6)

دیارە ئەحمەد شەریفی بەچاوێکی دوژمنانەوە سەیری کۆمارو سەرەنجامەکەی کردووە. راوبۆچوونەکان زیاتر شاپەرستانە بووە، گەلێ بوختان و درۆی هەڵبەستووە، بۆیە ئەو قسەو بۆچوونانە جێگەی پرسیارن و نابێ بێ گومان و بێ شك سەیربکرێن.

لەناو ڕووداوەکانی دوا روخاندنی کۆمارو داگیرکردنەوەی مەهاباد، نادڵسۆزیی و ڕاڕایی و خۆبەدەستەوەدان و نهێنییەکانی هەندێ شەڕ، دیاردەیەکی چاوێنی بوو، لەسەر ئەوە هێمن دەگێڕێتەوە:

"بڵاوە پێدانی گەماڕۆی دەوری سەقزو سەردەشت و خوڕخوڕە....پێوەندیی بەمەسەلەیەکی قووڵ و نەهێنی سیاسییەوە هەیە کە لێرەدا جێگای باس کردن نیەو باجارێ دەرخونەی لەسەردابنێین...(7)*

ئەو لایەنانە بەشێکن لەدەرەنجامی ئەقڵی سیاسیی کوردو ئاستی تێگەیشتنی لەڕوداوەکان و جۆری مامەڵەی بۆیان.

(شیروان) لەنامیلکەیەکدا بۆچونەکانی خۆی بەم جۆرە دەخاتە ڕوو:

(سەرۆکایەتی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵە بەدەست دەرەبەگ و مەلایانەوە بوو... ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە سەر هەلومەرجی ئەو کاتەی کۆمەڵی کوردەواری و نەخوێندەواری و دواکەوتویی گەلەکەمان. ئەگەر لەو بارەوە رەخنەی توند لەکۆمەڵە ناگیرێ، لەبەرئەوەیە کە پێویستی هەلومەرجی ئەو دەمی کوردستانمان لەبەرچاوبێ، دەنا هەڵەی کۆمەڵە لەوەدا بوو کە سەرۆکایەتی کەوتبووە دەست خان و دەرەبەگ و

---

* بۆ زیاتر شارەزابوون لەڕوداوو باس و خواسەکانی ئەم بوارە بڕوانە، مەحمود مەلا عززەت، بەرگەکانی د.ج.ك.

مەلاکان و زۆربەی ئەو دەرەبەگانە لەدوا رۆژدا یانی لەسەردەمی کۆماری دیموکراتی مەهابادا دەوری خەیانەتکاری خۆیان گێڕاوە لەگەڵ دوژمنانی گەل کەوتن...)(8)

شیروان، زیاتر لەسەر باری چینایەتی سەرکردایەتی حیزب و کۆمار دەدوێت و باشتر شوێن و جێگەی ئاشکرا دەکات و راستی باری کۆمەڵایەتی دەست نیشان دەکات و ئەڵێت:

"بەداخەوە ئەگەر بەراشکاوی و بەمەبەستی دەرس وەرگرتن لەجوڵانەوەی ساڵەکانی 1945-1946ی کوردستانی ئێران بکوڵینەوە، دەبێ بڵێین باری چینایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەلای دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەت و وردە بورژوازی شاردا بو...(9)

لەراستییدا هەڵسەنگاندنێکی لەو بابەتە، بەرەچاونەکردنی ئاستی پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، جۆرێك لەتوندرەویی تێیدا دەبینرێ، چونکە زەحمەتە لەکۆمەڵێکی دواکەتوەو نەخوێندەوارو هەژاری وەك کۆمەڵی ئەو سەردەمەی کوردەواریی، شتێکی ترو سەرکردایەتییەکی زۆر کامڵتر لەوە بخوڵقێ، لەلایەکی تر گەورەیی کێشەکان، لاسەنگیی تەرازوی کورد لەگەڵ داگیرکەر، ململانێ و مانۆڤری سیاسیی و سەربازیی زلهێزەکان.. کێشە گرنگەکانی ناوخۆ، سروشتی خێڵەکیی و سستێمی دەرەبەگی و زاڵیی، ئەم لایەنانە جوڵەو تەنانەت بیرکردنەوەی سەرکردایەتیی کوردی سنوردار کردبوو، ئەگینا، وەك لەشوێنێکی تردا باسی دەکرێ، سەرەك کۆمار لێزان و زیرەکانە جوڵاوە، گەلێ لەسەرکردەکانی بەسەرکردە سەربازییەکانی ناو سوپاکەی کوردیشەوە لێکدانەوەو بۆچوونی تایبەتیی باشیان هەبووە... بەڵام ئەو هەلومەرج و خەسڵەتە تایبەتییانەی سەرکردایەتی کۆمارو سروشتەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی رێگری گۆڕانی بنەڕەتی بوون، نەدەتوانرا بەرنامەیەکی وادابنرێ و جێبەجێ بکرێ کە کۆمەڵگەی کوردەواریی، شان بەشانی گۆڕانە سیاسییەکە، لایەنە ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و فیکرییەکانیش پێشکەوتنی چاوێنییان تێدا روو بدەن...

ئەگەر بەرنامەیەکی لێکۆڵراوەو ئەقلێکی کراوەتر لەسەر گۆڕانەکان لەناو سەرکردایەتیی کۆماردا، بەتایبەتی لەستافەکەی خوار پێشەواوە هەبایە، رەنگە

بتوانرایە هەندێك لەو هیواو خواستانە بەدی بهێنرانابە، چونکە گۆڕرانی بنەڕەتی و رادیکالانە کارێکی مەحاڵ بوو بەتایبەتی تەمەنی کورتی کۆمارەکەو پیلانەکانی دەوری و کێشەخۆیی دەرەکی و هەرێمییەکان، حکومەتەکەی کۆماری کردبوو بەحکومەتی جەنگ، چونکە زۆربەی زۆری وەزارەتەکانیش هەر بەکاروباری جەنگ و بەرەکانی شەڕەوە خەریك بوون بگرە زۆر لەوەزارتەکان رۆڵێکی... جگە لەوانە گەلێ دیاردەی تری نامۆ دەبینران، لەوانە:

پێکهاتنی ئەنجومەنی وەزیران و دەزگاکانی تری جەمهوریەتەکە لەسەر بنچینەیەکی کۆمەلایەتی و ناوەندییەکانی دەسەلات بوو، هەردوو سەرکردایەتییەکەی حزب و کۆمار جۆرە تێکەڵییەك لەکارو فرمان و پێکهاتەیاندا هەبوون، ناوەندی دەسەلات جۆرێ لەشپرزەیی تیا دەبینرا چونکە پێشەوا وەك سەرەك کۆمارو وەك سەرۆکی حزب و وەك پێشەوا سەرچاوەی دەسەلاتەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سوپا، سەرکردە خێلەکییە بەهێزەکان، هێزەکەی کوردی عیراق و بارزانی...ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکەکەی، ئەوانەش لەدانانی یاساو بڕیاردان و رۆڵی سەرکردایەتی و بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی بەرەکانی جەنگدا جێگەو سەنگ و حسابی تایبەتییان هەبوو.. لەناو ئەوانەشدا دەسەلاتی راستەقینەی دوا پێشەوا ناوەندی سەرەك خێڵەکان بوون کەبەکۆمەڵ و لەکاروانە گشتییەکەدا رۆڵی کاریگەریی خۆیان دەبینی، وەك کەسێتیش، هەر یەکە دەورو تەئسیری خۆی لەسەر بەڕێوەبردن و شەڕو گرفتەکان هەبوو. زۆر جارو بەئاشکرا بەرژەوەندییە تایبەتیی و خێڵەکییەکان دەخرانە سەرو دەستکەوتی کۆمارو میللەتەکەوە.. لەزۆر جێگە سەرانەو بێگارو باجە دەرەبەگییەکان بەردەوام بوون، گۆڕرانی ئابوری و کۆمەلایەتیی و چینایەتی بەزەحمەت دەرکی پێدەکرا....

کێشەی ناو خێڵەکان و ناکۆکیی نێوان سەرەك هۆزەکان و بەریەرەکانی لەسەر دەستکەوت و رۆڵ و دەسەلات زیاتر دەبوون، لەوانەش خراپتر گەلێ لەسەرۆك هۆزەکانی دەری سنوری کۆمارو هەندێك لەوانەی ناو سنوری کۆمار کە جێگەکانی خۆیان بەجێ هێشتبوو، لەگەڵ رژێمی شادا هاوکارییان دەکردوو ببونە داردەستی ئەرتەش بۆ گوشار خستنەسەر کۆمارو شەڕ فرۆشتن پێی، گەلێکیان عەجەم پەرست بوون.

ناکۆکی لەسەر زەوی و پاوانکردنی ناوچەی زیاترو هەندێ جار تالانی، بەربەرەکانی و شەڕ لەسەر دێهات و دەست بەسەرداگرتن....هەبوو...

لەناکۆکییە گرنگەکان:

ناکۆکی نێوان حەمە رەشیدخان_ ئیلخانیزادە

حەمە رەشیدخان‌و مەلا مستەفا...

پێوەندیی چەند ئاغایەکی ئیلخانیزادەکان بەئەرتەشی تارانەوە

بەتایبەتی عەلی ئاغاو کوڕی مەحمود ئاغا...هەروەها حەماغای عەباساغا لەسەقز.

ناکۆکی نێوان شکاک‌و عومەر خانی شەریفی لەگەڵ زۆر لەسەرەک خێڵەکان...

ناکۆکی نێوان زیرۆبەک‌و شێخ عەبدوڵڵای شەمزینی.

ناکۆکی نێوان ئاغا صالحی سوڵتان پەناهو مەحمود خانی سوڵتانی‌و ئاغایا گەڵباخی‌و تیلەکۆو حەمە رەشید خان‌و حەمە صدیق خان.*

جیاوازییەکانی نێوان ئەوانە هەموو وەهەریەکە بەجۆرێك لەگەڵ سەرکردایەتی حزب‌و کۆمار بەگشتیی‌و پێشەوا بەتایبەتی، کە لەزۆر حاڵەتدا دەرهاوردەی ناکۆکییە کۆمەڵایەتی‌و چینایەتییەکان بوون...

* * *

---

* بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، دەوڵەتی جەمهوری کوردستان، ب1و2و3.

# پاری سێهەم
## سیماو خەسڵەتە دیارەکانی
## جەمهورییەتی کوردستان

لەگەڵ ئەو پێکهاتەو سروشتانەی سەرکردایەتی حزب و کۆمار، دامەزراندنی کۆمارو کاروکردەوەو هەنگاوو بەرهەمەکانی، پلەیەکی نوێ بوو لەخەباتی نەتەوەی کورددا کە ناسیۆنالیزمی کوردی گواستەوە بۆ سەردەمو پلەیەکی نوێ، سەرکردایەتییەکەی قازییەکان بەتایبەتی، خوێندەوارو رووناکبیرو شاعیرو ئەفسەرو مامۆستاو سەرەك خێڵە دڵسۆزەکان بەگشتی دڵسۆزو نیشتمانپەروەرانە کاریان دەکردو ئەرکەکانی سەرشانیانی رادەپەڕاند...

لەگەڵ ئەوەدا کە جەمهوریەتی کوردستان رووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەی خۆیی و ناوچەیی و هەرێمیی و نێودەوڵەتی بوو بوو، لەگەڵ تەمەنە کورت و کەمتر لەیەك ساڵەکەی، هەرچەندە حکومەتەکەی حکومەتیی جەنگ بوو، چونکە هەر لەسەرەتاوە تاڕوخاندنی لەناو شەڕو پێکدادان یان نەشەڕو نەئاشتیدا ژیا.. لەگەڵ ئەو بارە کۆمەڵایەتییە دواکەوتوو ئاووهەوا ناسازەی دەوری کۆمار...

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەو جەمهورییەتە خاوەنی کۆمەڵێ تایبەتێتی و خەسڵەت بوو کەبەگشتیی هەم دامەزران و مێژووەکەی و هەم روخان و سەرەنجامەکانی، بەپلەیەکی نوێ لەخەباتی نەتەوەی کورد دادەنرێ، بێ ئەوەی هەڵەو بۆشاییەکان سەرکردایەتیی حزب و کۆمار لەڕاستیی ئەو بۆچونانە کەم بکەنەوە...

پێوانەی دیاریکردنی سروشت و خەسڵەتە گرنگەکانی جەمهوریەتی کوردستان، جۆری دامەزراندن، سروشتی سەرکردایەتییەکەی، دروشم و ئامانجە نەتەوەییەکانی، کارو کردەوەکانی، لەڕووی رووناکبیریی و کۆمەڵایەتی، قازانجەکان، دەرس و پەندەکان، هەڵوێست لەجەماوەری چەوساوەو خەڵکی زەحمەتکێشیش، هەڵوێست لەگەڵ و نەتەوەکانی سنوری ئێران، ئاستی پێوەندییان، یان هەڵوێست و جێگەی لەبزوتنەوەی دژ بەداگیرکردن و ئیمپریالیزم و چەوساندنەوە..

—جەمهوریەتی کوردستان کۆمارێکی نەتەوەیی بوو...

بۆ یەکەم جار لەمێژوی ئەو ناوچەیە کورد خۆی بەڕێوەبەرێتی تایبەتی خۆی پێکهێنا، بۆ یەکەم جار لەسەر ئەو بەشەی کوردستان سەلمێنرا کە کورد وزەو توانای خۆ بەڕێوەبردنی هەیە، ئەوەش سەلمێنەری ئەو راستییە بوو کە ئەو ئیدارە خۆیی و خۆماڵییە ئیرادەی نەتەوەیی کورد بوو کە وەك نەتەوەکانی تری دراوسێ و دنیا مافی ئەوەی هەیە کە خاوەنی خۆی و نیشتمانی خۆی بێت.. ئەو خاوەندارییەتییەی کەلەمێژەوە خەباتی بۆ دەکردو قوربانیی لەپێناودا ئەدا، بۆیە کۆمار لەڕاگەیاندنەکەی کۆبونەوە، بیست هەزار نەفەرییەکەی دووی ڕێبەندان بوو بەهیوای نەتەوەی کورد، سەرەتاو ناوکێ بوو بۆ گەیشتن بەئامانجە نەتەوەییە گشتییەکە... وەك هێزی رزگاریخوازی نەتەوەیی سەیری دەکرا، هەرچەندە لەسەر بەشێکی بچوکی پارچەیەکی کوردستان دامەزرابوو، زۆربەی کارو کردەوەکانیشی هەر لەخزمەت لایەنە نەتەوەییەکان و بۆ گەشەکردنی نەتەوەو کولتورەکەی بوو، ئیتر هەر لەزمانی کوردی کردنە زمانی رەسمی، بوژاندنەوەی بۆنە دیارە نەتەوەییەکانی وەك نەورۆز، هەڵکردنی ئاڵای نەتەوەیی، بوژاندنەوەی زمان، ئەدەب و مێژوی نەتەوە، نوسینی وتارو شیعرەکان بۆ هوشیارکردنەوەوە تاقوڵکردنی هەست و نەستی نەتەوەیی کورد.. هەموو نیشتمانپەروەرانی کورد لەهەموو پارچەکانی کوردستان کۆمارەکەیان بەهی خۆیان دائەنا، سرودی نەتەوە (ئەی رەقیب) و (سرودی میللی نیشتمانم رەنگینە) تەعبیریان لەویژدانی نەتەوەیی و خواستەکانیمرۆڤی کورد دەکرد.

کۆمار سروشت نەتەوەیی بوو، چونکە لەسەردەمەکانی دوا روخاندنیشدا بوو بەئەزمون و بیرەوەرییەکی نەتەوەیی ئەوتۆ کە هەموو ساڵێك یادی دامەزراندن و روخاندنی بکرێتەوە بوو بەهۆیەکی گرنگ لەگەشەپێکردنی گیانی کوردپەروەریی خەسڵەت نەتەوەیی، چونکە بوو بەزەمینەی یەکێتی خەبات و یەکگرتنی نیشتمانپەروەرانی پارچەکانی کوردستان، بوو بەئەزمونێکی نەتەوەیی وا کە هەموو کوردی هوشیاری فێری دەرسێك کرد کە چۆن دەبێت هەموان لەخزمەت دەستکەوتێکی نەتەوایەتی وا گرنگدا بن، ئەزمونێکی نەتەوەیی بوو چونکە کورد لەو بەشەی کوردستاندا(تامی ئازادی چێشت و بەزمانی زگماکی خۆی و لەقوتابخانەی دەرسی خوێند، ستەمی نەتەوایەتی لەسەر لاچوو حوکمی خۆیی چاوپێکەوتن....(10)

کۆمارسەرەوی بەداب و نەریتەو جل و بەرگ و کولتووری خۆمالی و نەریتە نەتەوەییەکان دا..

-جەمهوریەتی کوردستان.

کۆمارێکی نیشتمانیی بوو، چونکە بۆ جێگیرکردنی مافە نیشتمانییو خواستە رەواکان دامەزرا، جەخت لەسەر ئەو داوایانە دەکرا، وەك میللەتێکی خاوەن نیشتمانی خۆی دەیویست ئەو پێناسە گرنگەی خۆی ببوژێنێتەوە تا بۆ هەموو لایەکی دەربخات کە ئێمە خاوەنی نیشتمانی خۆمان بوین و خاوەنی نیشتمانیی خۆمانین، بۆیە داواکانی لەسنوری کۆماری مەهاباددا قەتیس نەدەکرا، هەرچەندە دامەزراندنەکەو پێوەندییە هەرێمییەکان و گوشاری سوڤیەت لەسەر سەرکردایەتی کۆمار ئاشکرا بوو، بەسەپاندنی دروشمی ئوتونومی و قەتیس کردنی ئامانجەکان لەو سنورەدا، سەپاندنی ستراتیجی بەرگری و بیرنەکردنەوەی لەفراوانکردنی سنوور، لەگەڵ ئەوانەشدا خەڵکی کورد بەنوسەرو شاعیرو لێپرسراوو جەماوەری هوشیارەوە چاویان بریبووە نیشتمانە گەورەکە، بەو پانتاییە تەسك و بەسنورە رازیی نەدەبوون.. گەلی کورد لەو بەشەدا بوو بەخاوەنی نیشتمانەکەی خۆی و فەرمانڕەوایی خۆی لەسەر دامەزراند، دەسەڵاتێکی نیشتمانیی و نیشتمانپەروەر پێکهات و ناوچەکەی بەڕێوەبرد. کۆمارێکی نیشتمانیی بوو چونکە بەرژەوەندیی دانیشتووانی دەپاراست، مافی کولتوری و روناکبیری کەمینە نەتەوەییەکانی وەك: جو، ئەرمەن دەپاراست و یارمەتی دەدان و هانی ئەدان بۆ بوژانەوەی کولتوری خۆیان و گێڕانی ئاهەنگ بە بۆنە تایبەتییەکانیانەوە...

جەمهوریەتی کوردستان کۆمارێکی دیموکراتیی بوو: چونکە ئازادییەکی چاوێنی لێ بەئەنجام هات، بەبەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێشودا، دەرفەتی بەئازادیی نوسین و تەعبیر لەبۆچون و خواست و داواکانی خەڵك هێنرایە ئاراوە، رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوە، سەربەستی بیروڕاو قسەکردن، لەئارادا بوون، رێز لمافی کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکانی ناو سنوری کۆمارەکە دەگیراو بەزمانی خۆیان دەیانخوێند. سەربەستی هاتوچۆو بڵاوکردنەوەی کۆبونەوەو بیرەوەریی و ئاهەنگ سازکردن هەبوو، رێکخراوەی ژنان و لاوان دامەزران، دەرگا بۆ ژنان کرایەوە کە هەم لەدایەرەکاندا وەك

کارمەند کار بکەن، هەم لەبواری حزبایەتی و ڕێکخراوی خۆیاندا چالاکیی بنوێنن و کۆڕو کۆبونەوە سازبکەن، کۆمارەکە دیموکراتی بوو، چونکە ببووە کۆماری هەموو چین و بەش و توێژاڵەکانی کۆمەڵی کوردەواریی، کۆمارێکی دیموکراتیی بوو، چونکە سەرجەمی خەڵکی کورد بەکۆماری خۆیان دادەناو بەرگرییان لێدەکردو هیوای گەشەکردن و چاککردنی ژیانیان لێدەکرد... دیموکراتیی بوو چونکە بۆ خۆی رزگاریخواز بوو، حەزی بەرزگاری هەموو گەلانی دنیا دەکرد، حەزی بەبرایەتیی و هاوکاریی هەموو گەلان دەکرد"لەکوردستان و ئازەربایجاندا واپایەگای شۆڕشگێڕی دروست بو کەلەدواییدا بوونە پایەگای جوڵانەوەی دیموکراسی لەهەمو ئێران...)(11)

جەمهوریەتی کوردستان کۆمارێکی ئازادیخوازو دۆستی گەلان بوو، لەبەرەی دیموکرات و ئازادیخواز بوو، لەبەرەی گەلان و برایەتی و دۆستایەتی گەلانی ناو ئێران و ناوچەکەو دنیادا خۆی دەبینیەوە، لەدژی داگیرکردن و چەوساندنەوە بوو... لەبەرئەوەی یەکێتی سۆڤیەت رۆڵی سەرەکیی لەدامەزراندنیدا بینی، بۆیە کۆماری ئازەربایجانی بەدۆستی ستراتیجی دادەنا، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی دۆستایەتیی دەوڵەتانی خۆرئاواش لەئارادا بوو، هەرچەندە کۆمۆنیزم و دەورو تەئسیری سۆڤیەت کاریگەری خۆی هەبوو، دیسان لەحزب و حزبە کۆمارەکەو نەسەرکردایەتییەکەی خۆیان بەکۆمۆنیزم و نەدەزانی، مەیلی ئەوەشیان نەبوو ریفورمی سوسیالیستانەی وەك ئازەربایجان ئەنجام بدەن.

جەمهوریەتی کوردستان: بەرهەمی تێکۆشانی خەڵك و ئاواتی جەماوەر بوو، بەرهەمی بزووتنەوەی کوردایەتیی بوو، خاوەن بەرنامەی حزبی دیموکراتی کوردستان بوو کە بوو بە نوێنەری خواستە کۆمەڵایەتیی و نەتەوایەتیی و نیشتمانیی و چینایەتییەکان، بابەنوسینیش بێت، داخوازییەکانی خەڵکی کوردی تەعبیر لێدەکرد.

هەرچەندە بەوەڵەدبووی ناو کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی و نیمچە دەرەبەگیی و نیمچە شارستانی بوو، بەڵام کردەوەو کارو هەنگاوە دەوڵەتیی و حکومەتییەکانی تاڕادەیەك شارستانیی و رووەو شارستانیەت بوون و هەنگاوی ئەنا... بەتایبەتی و بۆ یەکەم جار لەمێژوویی سیاسیی کوردا حزبێکی خاوەن بەرنامەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی بوو.

جەمهورییەتییەكی خودموختار بوو، بەئاشكراو لەسەر زاری لێپرسراوانو لەناو خواستو بەرنامەی گفتوگۆكاندا جەخت لەسەر ئەم لایەنەدەكرا، هەرچەندە ویسترا ئەو خودموختارییە بەخودموختارییەكەی ئازەربایجانەوە ببەسترێتەوە، بەڵام سەرانی كورد ملیان بۆ ئەو خواستە نەدا، لەسەرەنجامیشدا لەڕووی پراكتییكەوە جۆرێ لەبەستنەو زۆری ئیرادەی تەورێزی بەسەردا سەپێنرا بەتیابەتی لەڕووی پارەو پولو یارمەتییەوە، لەڕووی سیاسییو دورشمو ئامانجو ستراتیجی سەربازییەوە، سەركردایەتیی كۆمار بەپێی پەیمانیی مۆركراو لەنێوانیانداو بەپێی هاوچارەنوسییو هاوخەباتیی سەیری بەرامبەرەكەی دەكرد، بێ ئەوەی مل بۆ خواستو سەپاندنی داوا ناڕەواكان دابنەوێنێت...

## پەراوێزو سەرچاوەكانی بەشی شەشەم

1–بۆ سەرنجدان لەلایەنی نێگەتیڤی رۆڵی سەركردایەتی كۆمار، بڕوانە "تێڕوانینێكی سەردەم لەكۆمارەكەی مەهاباد" بەشی ئانزدەهەمو رۆژنامەی كوردستانی نوێ، ژمارە 592و 593 لە 21–1994/1/22دا بلاوكراوەتەوە.

2–رۆژنامەی كوردستان، ژمارە 25، 17ی جانیوەری 1946. ژمارە 47، 4مەی 1946، نووسینەكەی ئەم ژمارەیەی دوایی(47)، بەبۆنەی 46هەمین ساڵەی لەدایكبوونی پێشەواوە بووە، كەلەو ساڵەودا رێكەوتی یەكی ئایاری كردووە، بۆیە وێنەی پێشەواو هەڵبەستیشی بەو بۆنەیەوە بلاوكردبۆوە.

3–رۆژنامەی كوردستان، ژمارە25.

–ئارچی رۆزڤیلت، كۆماری كورد لەمەهاباد، خالیدی عەزیزی لەئینگلیزیەوە كردوویەتی بەكوردی، 1991.

–نجفقلی پسیان، از مهاباد خونین تا كرانهای ارس، تهران 1328.

–جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قوام السلطنة، چاپی دوم 1366.

–تێبینی: هەرچەند ئەم دوو نووسەرەی دوایی، رژێمدۆست بوون، دیسان هەر نەیانتوانی هەندێ راستی بشارنەوە.

ئارچی یائارشی رۆزڤیلت یش ئەفسەری مخابەراتی سەفارەتی ئەمریکایی هاوکاری رژێم بوو، بەڵام گەلێ رووداو راستیی گرنگی لەنووسینەکانیدا خستۆتە روو، وەك هەندێك لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەبینرێت، نووسینەکانی بوونەتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ئەو ئەزموونە.

4-بابا مردوخ روحانی، تاریخ مشاهیر کرد، بخش دوم، جلد سوم/ تهران 1371، ل 602.

5-نجفقلی پسیان، سەرچاوەی ناوبراو. ل5.

6-رۆژنامەی کوردستان، ژمارە 10-11جانیوەری 1946.

7-عبدالرحمن قاسملو، چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادیا، 1985، ل73.

8-ئەو دانیشتنە بەئامادەبوونی دکتۆر ئەمیری حەسەنپوور، کاك زاگرۆس و بەندە لەماڵی مامۆستای نێوبراو لەشاری ڤێستەرۆش سازکرابوو، گەلێ زانیاریی بەکەڵکمان لەمامۆستا بیستو لەلایەن کاك ئەمیرەوە تۆمارکران.

9-ئارچی رۆزڤیلت، سەرچاوەی ناوبراو، ل37و 38.

10-کەریمی حسامی، کاروانێك لەشەهیدانی کوردستانی ئێران، 1971، ل10-11.

11-William Eagleton, The Kurdish Republic 1946, London-1963. P.133.

-مەحموود مەلا عیززەت، کۆماری میللی مەهاباد، کوردستان 1984، سوید 1986، ل70. دەقی ئەو سەرچاوەیەیە.

12-هێمن، تاریك و روون، 1974، ل22-23.

13-رۆژنامەی کوردستان، ارگانی حزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە 302، شەممو6 خەزەلوەری 1329.

-دوای رووخاندنی کۆماری کوردستان، ئەو رۆژنامەیە وەك لاپەڕی چوارەمی رۆژنامەی اژربایجان لەباکو بەسەرپەرشتیی کۆمەڵێ لەرۆشنبیرانی کورد بەتایبەتی دکتۆر رەحیمی قازیو دوکتۆر عەلی گەلاوێژ، لەچاپ دەدرا. یەکەم ژمارەی 2ی رۆژنامەی اژربایجان 14 ازری 1326، 5 نوڤامبەری 1947دا بووە. چەندین ساڵی دەوام کردووە.

14–دۆکتۆر رەحیمی قازی: باسێك لەمەڕ موحاکەمەی پێشەوا قازی محەمەد، ل45و 46.

15–ئارچی رۆزڤێلت: ك.ك لەمەهاباد، ل43.

National Encyklopedin-Band7-Hoganas1992.–16

–مەحمود مەلا عزەت، سەرنجێ لەشۆڕش و دیپلۆماسیەتی کورد لەناو باری جیۆپۆلیتیکی کوردستاندا، گۆڤاری پەیڤ، ژمارە 7، ئاداری 1988، ل781–791.

17–جگە لەکوردستانی فیدراڵی، ئەمەش بارێکی نائاسایی ناوچەکە، هەڕەشەی ناوچەیی و شەڕی کوێت، خواستی خۆرئاوا، بەسەرۆکایەتی ئەمریکا، بۆ خوڵقاندنی ناوچەیەکی ئارام بۆ پاراستنی کورد لەهەڕەشەی لەناوبردن، دوای کۆچڕەوە زیاتر لەدوو ملیۆنییەکەی سەرەتای بەهاری 1991 خوڵقاندوویانە، دیارە ئەمەشیان لەناو بڕیارو نەخشەیەکی دیارو چەندین کێشەی خۆیی و هەرێمی نێو دەوڵەتاندا دەژی و هەڕەشەی چەند لایەنەی بەردەوام لەسەرە. کە هەرە گەورەکەیان ئەو شەڕە ناوخۆییە کە لەو سەرچاوانەوە دروست بووەو بۆتە گەورەترین هەڕەشە لەسەری.

Ferideh Kooli-Kamali Deh Kord. The re public Of Kurdistan- Its–18 Rise and Fall-1988-P.24.

19– جعفر مهدی نیا، سەرچاوەی ناوبراو، ل500.

20– جعفر مهدی نیا، هەمان سەرچاوە، ل 490.

21–کورد لەیاداشتەکانی قوام السلطنەدا، رۆژنامەی هەرێم، ژمارە27، 1993/6/10.

–محەمەد موکری، ئەو بەشەی لەکتێبی "زندگی سیاسی قوام السلطنة" چاپی دوم، تهران، 1326، لە نووسینی جعفر مهدی نیا، وەرگێڕاوەتە سەر کوردی، بەڵام لەژێر ئەو سەرباسەدا.

22–بڕوانە رۆژنامەی کوردستان، ژمارە (69)، 30 پووشپەڕی 1325.

23–بابەمردوخ روحانی، سەرچاوەی ناوبراو، ل604.

24–بابەمردوخ روحانی، هەمان سەرچاوە، ل518.

25–جعفر مهدی نیا، سەرچاوەی ناوبراو، ل518.

26-سەرنجدان لەوتارو سەرجەمی کارو کردەوەی تۆمارکراوی پێشەوا، بڕوانە ڕۆژنامەی کوردستان کەلە سەردەمی ژیانی کۆماردا لەچاپ دراون. بۆ ئاسانکردنی وتارەکان لەگەیشتنیان بەدەستی خوێنەر، کاك حەسەنی قازی، زۆر لەو وتارانەی ڕۆژنامەی کوردستانی دەرهێناوە، ڕستەو وشەو نادیارو کوژراوەکانی ساغکردۆتەوەو لەنامیلکەی "ڕوانگەی پێشەوا19 بابەتی ڕۆژنامەی کوردستان 1994"دا بڵاوکردۆتەوە.

27-مەحموود مەلا عیززەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دوکومێنت، بەرگی یەکەم، سوید1992، ل194، نامەی ژمارە 132.

28-بڕوانە ڕۆژنامەکانی کوردستان.

-مەحموود مەلا عیززەت، د.ج.ك.ل:55، 62، 63،64و سەرجەم ئەو نامانەی پەیوەندیان بەوانەوە هەیە.

29-دوکتۆر ڕەحیمی قازی، باسێك لەمەڕ مەحاکەمەی پێشەوا قازی محەممەد، مهاباد، 1359،ل12.

-مانای شیعرەکە: ئەگەر سەر لەسەر بنێین و پشت لەدوژمن بکەین لەوە باشترە تاقە کەسێ بەکوشتن بدەین.

30-دکتۆرڕەحیمی قازی، هەمان سەرچاوە، ل13.

31-عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو، ل56-57.

-جعفر مهدی نیا، سەرچاوەی ناوبراو.

-ئارچی ڕۆزڤێلت، سەرچاوەی ناوبراو، ل30.

-پێشەوا قازی، وەك ناڕەزایی لەو ڕێککەوتنەی نێوان تاران و تەورێز بەو سەفەرە هەستاو ئەو پرۆژەیەی خستەبەردەم سەرەکوەزیرانی ئێران. هەیە دەڵێ ئەوەی پرۆژەیەکی قوام السلطنة بووەو دەبوو ئوستاندار لەسنەوە سەرپەرشتی ئوستانەکەی بکردایە.. گوایا پێشەوا ڕەفزی کردووە.

32-ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە 390،/1993/5 17.

-لام وایە کوڕی ڕەش(عەلی کوڕی پێشەوا قازی) غەدر لەو دوکومێنتە گرنگە دەکات ئەگەر لەوە زیاتر بە حەپسکراوی بیهێڵێتەوە. دیسان بۆ وەسیەتنامەکەی پێشەوا.

33-بڕوانە: دکتۆر ڕەحیمی قازی، قازی محەممەدو مەسەلەی خودموختاری کوردستانی ئێران 1356 ل32.

-بۆ زیاتر زانیاریی لەسەر وتارو دیدەنیی ڕۆژنامەو نوتق و سەردانەکان و بڕیارو ئامۆژگارییەکانی پێشەوا بڕوانە: (پێشەوا لەسەردەمی سەرۆك کۆمارییدا، مەحمود مەلا عززەت) گۆڤاری رابون.

★ ★

★

# جەمهوریەتی كوردستان :

*دووهەم گەورەترین ئـەزمون و هـەلی رەخسـاوو گۆڕانـی سیاسـیی و ڕووداوی نەتـەوەیی بـوو تاناوەڕاسـتی سەدەی بیستهەم.

*هاندەروو بزوێنەری بوژاندنەوەی مێژوو ئەدەب و زمان و هونەرو فەرهەنگی نەتەوە بوو

*تاڕادەیەك كاری كردە سەر ئابووریی ناوچەكەو بوژاندنەوەی بازاڕو بازرگانی.

*دامەزراندنی ئەو قەوارە كوردییە خۆماڵیە ، متمانەی بە تواناو ئیرادەی سیاسیی و نەتەوەیی خوڵقاند.

*بزوێنەری هەست بەبەرژەوەندیە كۆمەڵایەتی و چینایەتیەكانی كۆمەڵ بوو.

*بوژاندنەوەی هەستو ئەستی نەتەوەیی و گیانی نیشتمان پەروەریی لە هەموو پارچەكانی كوردستاندا.

* پێكهێنانی سوپاو هێزی چەكداریی پێشمەرگە توانای سەربازیی كوردی سەلماند.

* پێكهێنانی ئەنجومەنی وەزیـران ( هەیئـەی رەئیسـەی میللـی )و وەزارەت و دام و دەزگاكـانی ، توانـای خـۆ بەڕێوەبردنی دەرخست.

*بزوتنەوەی جەماوەریی لاوان و ژنـان بەرێكخراوەیی دیارەدەیەكی نوێی نـاو كۆمەڵگەی كوردەواری بوو.

*یاسادانان و هەوڵی جێبەجێ و پیادەكردنی دیمەنێكی شارستانیی كۆمار بوو.

جەمهوریەتی کوردستان، پلەیەکی نوێ بوو لە بزوتنەوەیی کوردایەتی و جولانەوەی نیشتمانی و رزگاریخوازیی کوردا. هەرچەندە کۆمارەکە بە سنوور بە پانتایی و بە ژمارەی دانیشتوان، بچوك و کەم بوون، لە گەڵ ئەوەشدا لە ڕووی سیاسیی و مەعنەوی و هەستی نەتەوەییەوە، کوردایەتی لەو بەشەدا لە قاوغە تەسك و سنور داخراوەکەی دەرهێنا، لەسەر مەڵبەندێکی ونناوەوە خستیە سەر شانۆی هەرێمیی، بۆ یەکەمجار بوو لەو ناوچەیەداو بۆ دووەمجار بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا قەوارەو فەرمانڕەوایەکی خۆماڵی بڕەخسێنرێت، بۆ یەکەمجار بوو لە شێوەی کۆماریدا قەوارەی کوردیی پێکبهێنرێت.. تا ئەو ئاستەی کەنەك هەر دامەزراندنەکەو کارو کردەوەکانی ببنە لاپەرەیەکی گەش لە مێژووی کورددا، بەڵکو ڕووخاندن و لە سێدارەدانی سەرکردەو گەلێ لێپرسراو، بوون بە داستانێکی هەمیشە زیندوو کە بەردەوام هۆی بزوێنەرو گەشانەوەی تەوژمی کوردایەتی و سەرچاوەیەکی گرنگی دەرس و پەند بن.

دەستکەوتەکانی بوون بە سامانێکی گەورەی مێژووەکەی گەلی کورد.

دەتوانرێت قازانج و دەستکەوتەکانی جەمهوریەتی کوردستان بەکورتی و پوختی لەم خالانەی خوارەوەدا دەستنیشان بکرێن.

***دوای ئەزمونە مێژوییەکەی حوکمداریی و مەلیکایەتییەکەی شێخ مەحمود (1918-1924) گەورەترین گۆڕانی سیاسیی و ڕووداوی نەتەوەیی بو لە مێژوویی کورد بەگشتیی و لەو بەشەی کوردستانداو تا ئەو سەردەمانە بەتایبەتی.**

دوای خامۆشیەکی دوورو درێژ لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، دوای ئەوەی بزوتنەوەی نیشتمانیی کوردستان کەوتبووە ناو بازنەیەکی داخراوو بێ جوڵەو چالاکیەوە، ئەو ڕووداوە گرنگانەی سالانی دووەم جەنگ و پێکهێنانی کۆمەڵەی ژ.ك و ئینجا لە شوێنەواری ئەم دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کوردستان، بوون بە پێشینەیەکی هەستیارو گرنگ بۆ وشیاربوونەوەی خەڵکی کورد، کە نەتەوەی

کوردیان خستە بەردەم وەرچەرخانێکی گەورەو پاشە ڕۆژێکی ڕووناک، نەك هەر لە ڕووی ئەو سەرفرازییە بە سنورەو ئەو قەوارەیەوە، بەڵکو لە ڕووی خەباتی گشتیی و ئامانج و داخوازیە نەتەوەیی و دروشمە مێژوویەکەشەوە، بانگەوازەکەی دووی ڕێبەندان کەتائێستا وەك پێویست گرنگی و بایەخەکەی ئەو بڕیارە جەماوەرییە دەرنەخراوە، دەروازەی ڕزگاریی و خۆکردنەوە بوو لەسەر هەموو کورد، ئامڕازو ڕێگەی خەبات و سەربەخۆیی بۆ هەمووان دەستنیشان کرد.هەل و مەرجێکی سیاسی نوێ و لەباری لەو پارچەیەدا ڕەخساندوو بووە گەورەترین هیوا بۆ ئایندەیەکی گەش ترو گشتی تر، بە تایبەتی ئەو کۆمارە بووە قیبلەنمایەکی سیاسی و گەشانەوەیەکی بەرفراوانی کوردایەتی بەبەراورد لەگەڵ ڕابردووداو لەگەڵ سەردەمی پێش کۆماردا.

## *هاندەرو بزوێنەری بوژانەوەی مێژوو ئەدەب و زمان و هونەرو فەرهەنگی نەتەوە بوو.

سەردەمانی داگیرکردن و چەوساندنەوە کۆتایی پێهێنرا، درێژەدان بە شێواندنی مێژوو ئەدەب و زمان و کلتوری گەلی کوردا کۆتایی هات، لە خوێندن بە زمانی خۆ، نوسینەوەی مێژوو جوگرافیای خۆ، بێبەشکراوە، تا ئەو کاتەو لەوبەشەی کوردستاندا دەرفەتێکی وا بۆ کورد نەرەخسا کە ئەو لایەنانە نەهێڵێ و ڕەوتی ئاسایی ژیانی کولتوریی خۆیی بگرێتە بەر. بۆیە پێکهێنانی جمهوریەتی کوردستان خولقاندنی ئەو ئازادییە، کوردی خستە بەردەم بوژاندنەوەی سامانی نەتەوەو خۆ ڕزگارکردن لەو پاشا گەردانییە، کاری گرنگی سەرشانی لێپرسراوان ئەوە بوو کە هەنگاوی باش و چاوێنی لەو مەیدانانەدا بنێن، سەرەك کۆمار خۆی لەو بوارانەدا گەلێ هەنگاوی گرنگی نا، هەندێکیان بۆ کۆمەڵگەی دواکەوتووی ئەو سەردەمەی کورد، بە ئازاو بوێرانە دەدرێنە قەڵەم. بە تایبەتی‌کردنی خوێندنی منداڵان بە کچانیشەوە بەخوێندنی زۆرە ملێ، ئەوەی پێڕەوی ئەو بڕیارەشی نەکردایە، سزادەدرا، ڕۆژنامەگەریی و ئازادیی نوسین، نوسەرو شاعیران ئازادانە هاتنە مەیدانی نوسین و بڵاوکردنەوەو نوسین لەسەر مێژوو کولتوری نەتەوەیی و بوژاندنەوەی بیرەوەریە نیشتمانیەکان بەتایبەتی نەورۆز، دانانی ئێزگەو بڵاوکردنەوەی گۆڤاری هەمەجۆرو دانانی سروودی (ئەی ڕەقیب هەرماوە قەومی کورد زمان) بەسروودی میللی لەگەڵ

(سرودی نیشتمانم زەنگینە بەهەشتی سەر زەمینە) سەلامو سرودو مارشی جەمهوریی لەبۆنە رەسمیەکاندا، دامەزراندنی دەزگای چاپەمەنیو چاپخانە لەمهابادو بڵاوکردنەوەی چەندین گۆڤار وەك: کوردستان، هەڵاڵە، گڕوگاڵی منداڵانی کورد، هاواری کورد، هاواری نیشتمان، رۆژنامەی کوردستان.. ئەمانە کارو هەنگاو چالاکی گەشو چاوێنی کۆمار بوون. بۆ چاپ کردنی کتێبونوسینو جوڵاندنەوەی روناکبیریی، هێمن دەنوسێت:

(لە کۆموسیۆنی تەبلیغاتی حزبدا دەستم بە کارکرد لە هەمو چاپەمەنیەکانی حیزبدا دەستم بەنوسین کرد، لە رۆژنامەی کوردستانو گۆڤاری کوردستانو هاواری کوردو هاواری نیشتمانو گروگاڵی منداڵانو گۆواری هەڵاڵەدا شیعرو ووتارم بڵاوکردەوەو لە میتینگەکانی حیزبدا بەشداردەبوم. لە دەستەیەك کە ئەندام بووم، ئەندامە ئەسڵیەکانی ئەو لیژنەیە وەك بیرم مابێ، زەبیحی، هەژارو برایمی نادر، دڵشادی رەسوڵیو من بووین، پێشەوا بۆ خۆی چەند مامۆستای شارەزایش یارمەتیان دەداین، هەرچەندە هیچمان لەو کارەدا پسپۆر نەبوین، بەڵام چونکە زۆر بە دڵسۆزیەوە کارمان دەکرد، پێم وایە کتێبەکان کە بەداخەوە چاپ نەکران خراپ نەبوو...(1)

سەبارەت بەوە کە ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە بەرهەمێکی بەنرخی کۆمار بوونو دەوری باشیان بینی لە دەرخستنی ڕاستیو وشیارکردنەوەی جەماوەر، بۆیە چاکتر وایە چەند تیشکێك بخەینە سەر ئەو چاپەمەنیو بڵاوکراوانە کەکەوتونەتە بەردەست:

### *رۆژنامەی کوردستان:

ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان. رۆژنامەی رەسمی حکومەتیش بوو، سید محەمەد حمیدی سەرنوسەری بوو، لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپکراوە، رۆژانی شەممەو دووشەممەو چوار شەممان بڵاودەکرایەوە، یەکەم ژمارە لە 11-1-1946دا بڵاوکرایەوە، لە تەمەنی کۆماردا دەگوترێت(116) ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە، هەیە دەڵێت(113) ژمارە، بەهەرحاڵو لەبەرئەوەی هەموو ژمارەکان لەبەردەستدانین، ئەوەی تا ئێستا کەوتونەتە بەردەست(66)ژمارەی رۆژنامەی کوردستانە. لەبەرئەوە ساغ نەبۆتەوە کە چەند ژمارەی لێدەرچووەو ناتوانرێت ژمارەیەکی دروست بەدەستەوە

بدرێت، ئەوە یەکەم ڕۆژنامە بوو کە لەماوەیەکی کەمدا ئەو ژمارە زۆرەی لێدەرکرابێت، ڕۆژنامەکە وەك لەسەرەوە نوسرابوو(بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان بوو)[2]

**گۆڤاری گەلاوێژ لە ژمارەی ئازاری 1946 دا بەم جۆرە لەسەر ڕۆژنامەی کوردستان دەنوسرێت.**

(کوردستان ڕۆژنامەیەکی کوردی‌یەو بە شێوەی موکری بە زمانی کوردی ڕۆژێ نە ڕۆژێ لە شاری مەهاباد بە صورەتێکی ڕەسمی دەرئەچێت، باس‌و خواستی ئەم ڕۆژنامەیە چۆنیەتی کردەوەی کوردەکان‌و هەڵسوڕانیان، کۆبونەوەیان بۆ کرانەوەی چاپخانەی کوردستان، نوسینی باس‌و زانایانی کورد، وەرگرتنی دەنگ‌و باسی دەرەوە بە هۆی ڕۆیتەرەوە، ئامانجی قەومی، وتار. کۆبونەوە بۆ هاندانی خەڵك بۆ کردنە باوی خوێندنی کوردی لە هەموو قوتابخانەکاندا، هەموو جۆرە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی‌و گەلێ شتی تر، بەراستی ئەم ڕۆژنامەیە یەکەم ڕۆژنامەیەکی کوردی‌یە کەلە هەموو ناتەواویەکی کوردەواری‌یەوە قسە بکات‌و خزمەتی خۆی بەهەموو لایەك بگەیەنێ..[3].

دوای ڕووخانی کۆمار ڕۆژنامەکە پەکی کەوت لە دوایدا لە باکۆو ئینجا ناوبەناو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە نهێنی دەریکردووە.

ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە سەرچاوەو بەڵگەنامەی ڕەسەن‌و گرنگ‌و مێژوویین بۆ لێکۆڵینەوە لەسەردەمەکە، گەلێك نوسەرو شاعیرووەرگێر لە دەوری ڕۆژنامەکە کۆبونەوەو نوسینی جۆراو جۆریان تیا بڵاودەکردەوە.

یەکەم ژمارەی لە 11-1-1946 روناکیی بینیی.

**گۆڤاری کوردستان :-**

بڵاوکەرەوەی بیری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان‌و کۆمار بوو، یەکەم ژمارەی لە 6-12-1945دا چاپکراو بڵاوکرایەوە، لە مەهاباد دەردەکرا، بەرێوەبەرو لێپرسراوی مەلا قادری مودەرسی بوو، وادیارە لەتەمەنی کۆماردا چوار ژمارەی لێ بڵاوکرابێتەوە چونکە هەر ئەو چوار ژمارەیە کەوتونەتە بەردەست.

## گۆڤاری هەلالە:

حەسەن قزلجی لێپرسراوو سەرنوسەری بوو، لە بۆکان چاپ دەکرا ژمارە یەکی لە ئازاری 1946دا بلاوکرایەوە، زیاتر لەلایەنی سیاسی گۆڤارێکی ئەدەبی بوو، چوار ژمارەی کەوتونەتە بەردەست.

## هاواری کورد:

یەکەم ژمارەی لە رەزبەری 1324–6ی تشرینی یەکەمی 1945دا بلاوکراوەتەوە، ئەم ژمارەیە 30 لاپەرە بوو، لەسەر بەرگی یەکەمی گۆڤارەکە تەنها هاوار نوسرابوو، لەسەر بەرگی دووەم هاواری کورد نوسراوە..[4]

## هاواری کوردستان:

یەکەم ژمارەی لە 21مارتی 1946دا لە مەهاباد چاپ کراوە، ئۆرگانی لاوانی دیموکرات بووە، صدیق ئەنجیری سەرپەرشتی کردووە، لەسەر لاپەرەی یەکی ئەمە نوسراوە: گۆڤارێکی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەلایەتی. رێبازی مارکسی لەناوەرۆکیدا دیارە. لەسەرو ناوی گۆڤارەکەو نوسراوە با سەواد بیخوێنێتەوە بۆ بێ سەواد..[5]

## گۆڤاری گروگالی مندالانی کوردستان:

لە ژێر چاودێری مەلا قادری مودەرسیدا کرێکارانی چاپخانەی کوردستان لە مهاباد بلاویان دەکردەوە. لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نوسراوە(بیری کارگەرانی چاپخانەی کوردستان)ە یەکەم ژمارەی لە نیسانی 1946دا چاپکراوە، چوار ژمارە لە گۆڤارەکە کەوتونەتە بەردەست، پێدەچێت هەر ئەو چوار ژمارەیە بلاوکرابێتەوە..(6)

## *گەشانەوەی ئابوریی بوژاندنەوەی بازارو بازرگانیی

سەربەستیی هاتن‌و چوون‌و چالاکی بازرگانیی‌و زۆر بوونی بەرهەمی کشتوکاڵ‌و گۆرینەوەی کەل‌وپەل، دامەزراندنی کۆمپانیاو هەوالی کردنەوەی سینەما.. ئەوانە تارادەیەك بازاری ناوچەکەی سنوری کۆماریان بوژاندەوە، بەلام دەرامەت‌و داهاتی سەرەکی لە کۆمەکی یەکێتی سۆڤێتەوە بوو کەلە رێگەی تەورێزەوە دەنێردرا.

دەگوترێت کە: (کۆماری ئازەربایجان20.000)تومەنی نزیکەی(4400دۆلار)ی بەقەرزدابووە کۆماری مهاباد بریاریش درا بە شەکر پر بکرێتەوە..(7) هەرچەندە

ڕژێمی شا ئابڵوقەی خستبووە سەرناوچەكە، بەتایبەتی قەدەغەكردنی كرینی توتن لە جوتیاران بۆ برسی كردنی ناوچەكە بەڵام(سۆڤیەت توتنی ئەوساڵەی كوردستانی كڕی بە(80.000)پاوەن..(8).

هەرچەندە ئازەربایجان سیاسەتێكی ئابووری سۆسیالیستانەی پیادە دەكرد، كەچی سەركردایەتی كۆماری كوردستان كەمو زۆر بیری لەوە نەدەكردەوەو پێڕەویی سیاسەتێكی لەو جۆرەی نەدەكرد. بۆیە ئەم خۆی دوور خستەوە لە دابەشكردنی زەوی و زار بەسەر جوتیاراندا، وەك ئازەرەكان كردیان. یەكێك لەو هەوڵانەی كە درا بۆ زیاتر گەشە پێكردنی ئابووری، هەوڵی سەرەك كۆمار بوو بۆ كردنەوەی بانكو داواكردنی لە خەڵك كە ئاڵتونو پارەكانیان وەك قەرز لەوێدا دابنێن، بێ ئەوەی سەركەوتن بەدەستن بهێنێت. دیسان زەریبە لەهەندێ خێزانی دەوڵەمەندی وەك خێزانی شافعی لەمەهاباد كەبەربەرەكانی كۆماریان دەكرد، وەرئەگیرا(9).

### *دامەزراندنی ئەو قەوارە كوردییە خۆماڵییە متمانەی بە تواناو ئیرادەی سیاسیی و نەتەوەیی خوڵقاند.

نەبوونی ئەزموونی حوكمڕانی خۆوخۆبەڕێوە بردن، سەپاندنی حوكمو یاساو كولتورێكی نامۆ بە كورد، درێژخایەنیی ئەو حاڵەتە، دیاردەی نائاسایی لای خەڵكی كورد خوڵقاند بوو، دیاردەیەكی جۆری لە رازی بوون بەو بارودۆخانە، دیاردەیەكی نەبوونی تواناو هێزێكی ئەوتۆ كە كورد بتوانێت وڵاتی خۆی بەڕێوە ببات، بۆیە خامۆشیی ئەو ناوچەیەی كوردستانی گرتبۆوە. بە دامەزراندنی ئەو قەوارەیە، كوردایەتی بوژابۆوە، سەربەخۆیی سیاسیی، هەرچەندە یەك لایەنەو تەنها دیفاكتۆیەك بوو، هێنایە ئاراوە، كێشەی كوردی لەو بەشەدا زیندوو كردەوەو هێنرایە سەر شانۆیی سیاسی، لەگەلێكی چەوساوەو ژێر دەستەوە كە سادەترین مافیشی زەوت كرابوو، بوو بەخاوەنی قەوارەی سیاسیی و نەتەوەیی و ئیدارەی خۆی، بەردەوامیی ئەو گۆڕانانە، متمانەی كورد بە خۆو ئیرادەی سیاسی خۆی، بە توانای خۆ بەڕێوەبردنی وڵاتی خۆی بەهێز كرد، كۆبونەوە بیست هەزار نەفەرییەكەی دووی ڕێبەندان، ریفراندۆمێكی نەتەوەیی بوو بۆ متمانە بەسەركردایەتی كۆمار، بۆ دانانی دامو دەزگای بەڕێوەبردن، بۆ رزگار كردنی كورد لەهەر كوێیەك بژین..

## جەمهوریەتی کوردستان بزوێنەری هەستو بەرژەوەندییە کۆمەلایەتیو چینایەتیەکانی کۆمەڵ بوو

شـان بەشـانی گەشـەکردنی لایـەنی سیاسـی ، لایەنـە کۆمەلایـەتیو چینایەتیەکانیش گەشەیان کرد، هەرچەندە لە سنورێکی زۆر تەسكو لەسەر خۆ بوو، ئەوەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەبووە لە چەوساندنەوەو داگیر کردنـی سـەدان ساڵدا خۆی دەنواند، بۆیە جەماوەری جوتیارو خـەڵکی زەحمـەتکێش، کۆمارەکـەیان بە هـی خۆیان دەزانی، چونکە تا رادەیەك زوڵمو زۆر وەك جاران پیادە نـەدەکرا، خەڵك بۆیـان هەبوو شکایەتو داواو داخوازیەکانیان بگەیەنن.

تەنانەت پێشەوا قازی محەمەد رێگەو شوێنی تایبەتی بۆ ئەم جۆرە دیاردانە دانا بووبەتایبـەتی رێگـەی گـەیاندنی نامـەو دەنگـی هاوولاتیـان بـەخۆی، ئەوانـەش دەرئەنجامی دامەزراندنی کۆماری کوردستان بوو چونکە:

*گەشەکردنی بزوتنەوەی کوردایەتی کەوتە ناو قۆناغێکی نوێوە کە بیرو لایەنە کۆمەلایەتیـەکان باشـتر خۆیـان دەربخـەن، پێویسـتیی گۆرانکاریی بـاری کۆمەلایـەتیو گوزەرانی خەڵك لەبەرچاو بگیرێن.

*ئـەو نیمچـە سـەربەخۆیی و رزگـاریی و خـۆ بـەرێوە بردنـە، چەوسـاندنەوەی سیاسیو نەتەوەییو زوڵمو زۆری داگیرکـەرانی نەهێشـتبو، دەرگـای لەسـەر رێفورمـی کۆمەلایەتی کردەوە. بەلام نـەبونی نەخشـەیەکی لـەو بابەتـە، نـەبونی داهـاتو بنـەمای ئـابوریی دەوڵـەتی، زۆریـی کێشـەو گرفتـە جۆراوجۆرەکـان، بونـی هەرەشـەی بـەردەوام لەلایـەن هێزەکـانی رژێمـەوەو خـەریك بوونـی لێپرسـراوان بـەکاری پێشـمەرگەییو پەیداکردنی پێداویستیەکانی شەڕ... لەبەرئەوانە نەدەتوانرا کاری گرنگـی لـەو بابەتـە ئەنجام بدرێت.

*دامەزراندنی کۆمار بووە هۆی توندو تیژکردنی ململانێ لەنێوان نەتەوی کوردو چینـی دەسـەلاتدار، لـەناو خۆشدا ئاغاو سەرۆك خێڵە وابەستەکان بەرژێمەوە ببونـە جۆرێکی تر لە گوشار(هەم) بۆ سەر کۆمارو هەم بۆ سەردانیشتوان.

ئەوانەش کاری خۆیان لەسەر ئەو خەڵکە خوێندەوارە دەکرد کە خوازیاری جۆرێك لە عەدالەتی کۆمەڵایەتی بوون، کاری خۆیان دەکردە سەر خەڵکی زەحمەتکێش، بەتایبەتی کە کارو کردەوەی نائاسایی سەرەك خێڵ‌و دەرەبەگ‌و خاوەن موڵکەکانیان باشتر بۆ دەردەکەوت، بەڵام هەر ئەو نارەزاییی‌و کارتێکردنانە بەسنەبوون بۆ گۆڕران، بەس نەبوون تاسودیان لێوەربگیرێت‌و بکرێنە هێزێکی ڕێکخراوی ئەوتۆ کەکۆماریشیان پێ بپارێزێت.

## بوژاندنەوەی هەست‌و نەستی نەتەوەیی‌و گیانی نیشتمانپەروەریی

گەشەکردنی بزوتنەوەیی کوردایەتی هەر لە سنوری کۆمارەکەدا نەبوو، بەڵکو زوربەی ناوچەکانی کوردستانی گرتبۆوە، جموجۆڵ‌و چالاکیی، ئامادەبوونی گەلێ روناکبیرو نیشتمانپەروەر بۆ خزمەتی کۆمار. بونی هێزەکەی کوردستانی عیراق کە مەلا مستەفا سەرکردایەتی دەکرد، بەهۆی شکستی شۆرشی بارزان‌و ناچاریی ئەو هێزانە بۆ کشانەوەو خۆ گەیاندنە ناوچەکانی کۆمار کە بوبوو بەو هێزەی متمانەی پێ‌بکرێت‌و جێگەی دڵنیایی پاراستنی کۆمار بێت. جگە لە ئامادەبوونی گەلێ نیشتمان پەروەر لە ناوچەکانی ترەوە، لە کوردستانی عیراق‌و تورکیاو سوریاشەوە، ئەم گەشەکردن‌و فراوان بونەی هەست‌و نەستی نەتەوەییە، چەند دیاردەیەکی تری خوڵقاند، لەوانە کەوتنە سەر ڕێبازی حزب‌و کۆڕو کۆمەڵ پێکهێنان، دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد لە کوردستانی عیراق(16ی ئابی 1946) ئەنجامێکی گرنگ‌و پرۆسەی دامەزراندن‌و بەڕێوەبردنی جەمهوریەتی کوردستان بوو تا ئەو ساتەی کە لە زۆر ڕووەوە ئەم حزبە نوێیە هاوچەشنی حیزبی دیموکراتی کوردستان بێت.

فراوانیی شەپۆلی هەستی نەتەوەیی‌و گیانی نیشتمان پەروەریی لە هەموو پارچەکانی کودستاندا بە جۆرێك کەتەنانەت روخاندنی کۆمارەکەو لە سێدارەدانی پێشەواو هەڤاڵەکانیشی بوون بە هۆکارێکی تری ئەو فراوانبوون‌و گەشەکردنانە.

## پێکهێنانی سوپاو هێزێکی چەکداری پێشمەرگە، تواناو گیانی بەرگریی کوردی سەلماند..

بۆ یەکەمجار بوو کە سوپاو هێزی پێشمەرگە لە ئاستێکی باشدا رێکبخرێ، بەچەکی سوك پرچەك بکرێ، یەکەکانی هێز کە لە بچوکترینەوە بۆ هێزو سوپا، بوونی دەیان ئەفسەری لێوەشاوەو دەرچووی کۆلێج و ئەکادیمیای سەربازی، بونی پلەی جۆراو جۆری سوپایی هەر لە چەکدارێکی ئاساییەوە تا پلەی جەنەراڵ و وەزیری هێزی بەرگری، رێکخستنی ئەوانە لەوەزارەتێکی تایبەت بەجەنگ و بەرگریی لە کۆمار بۆ ئەو سەردەمە، کارێکی ئاسان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە بەجۆرێك کران کە هێزەکان بەردەوام لە حاڵەتی ئامادەیی‌دا بێت بۆ شەڕ، لەچەندین شەڕو پێکدادان و نەبەردیدا ئازایەتی و توانایی سوپاکەیان سەلماند.

لەوانەش گرنگتر، سوپاکەو هێزی پێشمەرگە، هێزی میللی بوون، لە پێناوی پارێزگاریکردنی کۆمارو بەرگری لەگەل، رێکخراو بوون، بە پێچەوانەی ئەرتەشی رژێمی شاوە کە ئەرتەشێکی فرە رەگەزو بەزۆرە ملێ دامەزرابوو.

هەرچەندە کۆمەڵگەکە گیانی خێڵەکی تێدا زەق و کۆمەڵگەی نیمچە دەرەبگی بوو، گەلێ لەو سەرەك خێڵانەی هەوڵی سەپاندنی خواست و ئارەزوویی شەخسیان دەدا، لەگەڵ کەم و کورتی پێداویستیە سەربازییەکان، هەر لەفیشەکی ئاسایی و ئازوقەوە تا چەکی قورس، لەگەڵ ئەوانەشدا مامەڵەی لێپرسراوانی سوپا لەگەڵ پێشمەرگەو چەکدارەکان جۆرێکی تری شارستانیان نیشان دەدا چونکە بەتەنگیانەوە ئەهاتن و هەوڵیان ئەدا پێداویستیەکانیان جێبەجێبکرێن، بونی ئەفسەرە لێزانەکان بەتایبەتی ئەفسەرانی کوردی عێراق، لێوەشاوەیی و شارەزایی و سەلیقەی کوردیان لە مەیدانەکانی سوپاو هێزی بەرگری و جەنگدا دەردەخست. ئەوانە متمانەو بڕواو باوەڕی خەڵکی کوردیان بە کومارو بە سوپاکەی بەهێزتر کرد.

## هەڵبژاردنی سەرەك کۆمارو خوڵقانی سستێمی کۆماری، پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیران( هەیئەتی رەئیسەی میللی )ودانانی حاجی بابەشێخ، بە سەرۆکی، رێکخستنی دام و دەزگاکانی وەزارەتەکان

بوونی سەرچاوە بۆ یاسادانان و بڕیار، هەرچەندە فرە سەرچاوەش بوو، خوڵقاندنی ئامرازی بەڕێوەبردن و لێپرسینەوە لە خەڵك و چارەسەر کردنی کێشەکانیان و بایەخدان بە قوتابخانەی کوران و کچان و خوێندن بە زمانی کوردی و بەئیلزامییکردنی و سزادانی ئەوانەی منداڵەکانیان نەدەنارده قوتابخانە، کردنەوەی پۆل بۆ نەخوێندەواران، بایەخدان بەتەندروستیی گشتیی، چارەسەرکردنی کێشەی نێوان تیرەو خێڵەکان، ئاوڕدانەوە لە کەمینە نەتەوایەتیەکان لە ڕووی بەڕێوەبردن و هاوبەشیکردنیان و کردنەوەی قوتابخانەی تایبەتی بۆیان. ئاوڕدانەوە لە هەموو ئەو لایەنانەی ژیانی خەڵك وەك لە پێکهاتەی وەزارەتەکاندا دەردەکەون کەتوانای خەڵکی ناوچەکە دەردەخەن سەلماندیان کە دەتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن وتواناکان بخەنە کار.

بایەخدان بەتەندروستیی گشتی، چاودێریی شوێنە گشتییەکان، شەقامەکان و رووناککردنەوەیان، بە حەمام و چایخانەو چێشتخانەکان و پاك و تەمیزییان و چاودێریکردنیان.

بێگومان ئەگەر سودیان لە تواناکانی خەڵکی کوردستانی عیراقیش وەربگرتایە هەروەك چۆن لە ڕووی پێشمەرگایەتییەوە سودیان لێوەرگیرا، ئەوا بەڕێوەبەرێتیەکی باشتر ئەهێنرایە ئاراوە.

لەگەڵ ئەو ناتەواوی و بۆشایی و گرفتانەی دەوری کۆماریان دابوو، لەگەڵ لاوازیی و کزیی باری ئابووری و گوشاری ئازەربایجان بۆ بەستنەوەی مەهاباد بەتەوریزەوە، ئەوقکردنی کۆمار لە ڕووی ئابوری و سیاسیەوە، سەرەرای سەپاندنی ستراتیجی بەرگری کردن و پەکخستنی هەوڵی فراوانکردنی سنور، وتوویژی بێ بەرهەم، و سەرلێشێوان، لەگەڵ نزمی ئاستی سیاسیی و خوێندەواریی زور لەلێپرسراوان و کەم ئەزمونیان، لەگەڵ ئەوانەشدا بەڕێوبەرێتیەکی تارادەیەك باش و رێك و پێك بوو.

بزوتنەوەیی جەماوەریی لاوان و ژنان و کـاری ڕێکخراوەیـی، دیاردەیەکی نوێـی نـاو کۆمەڵگەی کوردەواری بوو.

لـە پێش هـەموو بزوتنـەوە جەماوەریـەکان، بۆیەکـەمجار ڕێکخـراوی یایـان و لاوان خوڵقا، دیسان بۆیەکەمجار بوو کە کچان و ژنان لـە کـۆڕو کۆبونـەوە جەماوەرییـەکان ئامـادەدەبوون و وتاریـان دەخوێنـدەوە، لـە دام‌ودەزگـاو دایـەرەکاندا کاریـان دەکـرد مامۆستایانیان لە قوتابخانەی کچاندا دەرسیان دەوتەوە، بەوەش نەریتە کۆمەڵایەتیە کۆن و باونەماوەکان خرانە لاوە، بەتایبەتی هەر پێش ئەوانەش ماڵی پێشەوا قازی محەمـەد لانـەی ئـەو ژن و کچانـە بوون کـە بـەر زوڵمـی پیـاوو کـەس و کـار دەکـەوتن، خانـەوادەی پێشـەوا پێـش هـەمووان لـە مـەیدانی خـەباتدا بـوو. یـەکێتی جوانـانی کوردستان بەرهەمێکی تری کۆمار بوو، ئەم یەکێتیە چالاکانە هەڵدەسوراو ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام ئەدا.

## یاسادانان و هەوڵی جێبەجێ و پیادەکردنی، دیمەنێکی شارستانی کۆمار بوو

هیـچ دەوڵـەت و حکومـەتێك باش‌وسـەقامگیرو عـادیل نـابێت ئەگـەر یاسـای بـۆ دانەنرێ، هیچ کۆمەڵگەیەکیش بێ یاسا شارستانیی نابێت. هەرچەندە سەرچاوەکانی یاسادانان فرە لایەن بوو، هەر لـە پێشـەواو سـەرەك وەزیرانـەوە تـا کۆمیتـەی نـاوەندی حزبـی دیموکراتـی کوردسـتان و هـەندێ سـەرچاوەی سـەربازیی وەك وەزیـری هـێزی دیموکراتی کوردستان، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ماوەیـەکی کورتـی وەك تەمـەنی کۆمـاردا، جێگـەی سـەرنجە کـە ئـەو هەوڵانـە دراون و ویسـتی ئـەنجامدانیان لـە ئارادا بووە. ئـەو یاسـایانە هـەر لـە دەردە کۆمەڵایەتیـەکانی وەك تلیـاك کێشـان و بەدمەسـتی و شـەڕو شـۆڕو کێشـەکانی جوتیـاران و ژنـانی دەگرتـەوە تامەسـەلەی خیانـەت لـە نیشـتمان، هەرچـەندە هـەندێ لـە یاسـاکان لەگـەڵ ڕەوتـی شارسـتانیەتدا نـەدەگونجان، لەگـەڵ ئەوەشدا دیسان ئەوانە ئاوڕدانەوەیەك بو بۆ چارەسەرکدنی کێشـەکانی ناو کۆمـەڵ، بەپێی ئەقڵییەتی بارودۆخەکانی ئەو کاتە.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم بەشە بێنین چاك وایە نرخاندنەکەی کۆنگرەی سێهەمی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بخەینە پێش چاو:

"تەمەنی کۆمار تەنیا یانزە مانگ بوو بەڵام هەر لەو ماوە کورتەدا بەشێکی گرنگ لە ئاواتەکانی گەلی کورد هاتەدی، گەلی کورد چارەنوسی خۆی بەدەست خۆی وەرگرت، زمانی کوردی بە زمانی رەسمی ناسرا، فەرهەنگی نەتەوایەتی کورد بە خێرایی دەستی بە پەرە ئەستاندن کردو بۆ پەروەردەکردنی کادر هەندێك لە لاوان بۆ دەرەوە نێردران، چەند رۆژنامەو گۆڤاری کوردی بەرێكو پێکی بڵاوکرانەوە، تیئاتری کوردی پێك هات، ژنی کوردی لە ژیانی سیاسیو فەرهەنگیدا بەشدار بوو(هێزی میللی) سوپای گەلی کوردستان پێك هاتو شوێنەوارێك لە پۆلیسو ژاندرمەکانی زۆردار نەما، کۆماری کوردستان پەیوەندی دۆستایەتیو هاوکاری لەگەڵ حکومەتی میللی ئازەربایجان کە ماوەیەك بوو پێك هاتبوو دامەزراندو بەرەیەکی بەرین لە حزبە پێشکەوتووەکانی ئێران پێك هات کە حزبی دیموکراتی کوردستان یەکێك بوو لە کۆڵەگەکانیو بەمجۆرە کوردستانی ئێران بوبەبنکەی ئازادیو جێی هیوای ئازادیخوازانی ئێران.

کۆماری کوردستان هەر لەو کاتەدا نیشانەی هاودەردیو هاوکاریی نەتەوەی کورد بوو لە هەموو پارچەکانی کوردستان، کوردستانی ئێران، تێکۆشەرانی کوردی عیراق هەروەهاخەباتکەرانی کوردی تورکیاو سوریای لەباوەش گرت، کۆمار بەدڵەوە پێشوازی لەو میوانانە دەکردو رێزی لێدەگرتن، بەڵام لەبەردەم ئەو هەلە مێژوویەدا میوانەکان نەبوونە هۆی ناتەباییو ئاژاوەو دەست وەردانە کاروبارێك کە لێپرسراوانی حزبو حکومەت لێی ناڕازیی بن. بەڵکو هەموو تواناو هێزەکانیان خستەبەردەم سەرکردایەتی کۆمارو حزب. بەم چەشنە جەمهوریەتی کوردستان بوبە بنکەی ئازادیو جێی هیوای نەتەوەی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستانیش.." (10)

# پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی حەوتەم

1-هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل24.

2-د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی وشوێنی لە رۆژنامە نوسی کوردیدا، چاپی بەغدا/1978،ل83.

3-گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە/3سالی(7)-مارتی1946،ل29.

4-د.کەمال مەزهەرئەحمەد، سەرچاوەی ناوبراو، ل 238و239.

5-د.کەمال مەزهەر ئەحمەد هەمان سەرچاوە،ل83

6-د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل82

7 -Eegleton, WILLem op. Cit. P.10

8-Eegleton, WILLem Ibid .p. 88

9-Eegleton, WILLem Ibid . P .100

10-کۆنگرەی سێهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی (ئێران)، ئەیلولی 1973، ل11.

# بەشی هەشتەم

# جەمهوریەتی کوردستان لەمەیدانی زۆرانبازیدا

## پاری یەکەم :

*ئالۆزییەکانی چواردەوری کۆمار

* پیلانەکانی دوژمن لەدژی کۆمار

* پەیمانی نەوت لە نێوان ئێران و یەکێتی سۆڤیەتدا.

*کوردستان و ئازەربایجان لەیەك بەرەی یەکگرتوودا

*رۆژو ساتەکانی دوایی و کارەسات.

*کوردستانی ئێران دوای روخاندنی جەمهوریەت

## پاری دووهەم :

*لەسەرەك کۆمارییەوە بۆ ناو زیندانی داگیرکەر.

* پێشەوای گەل لەبەردەم مەحکەمەی ( بدوی سحرایی )دا

* پێشەوا لەدوو مەحکەمەدا

*بەرەو سێدارەو وەسییەتنامەی پێشەوا

# پاری یەکەم

## ئاڵۆزییەکانی چواردەوری کۆمار

ئەو بارودۆخ و هەلومەرجانەی جەمهوریەتی کوردستانی تێدا بەوەڵەد بوو، ئاسایی نەبوون، پڕبوون لەئاڵۆزیو ململانێو ناکۆکیی، چ لەسەر ئاستی زلهێزەکانو چ لەسەر ئاستی نێوخۆی ئێران. ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی سوڤیەت لەلایەكو ئەمریکاو بەریتانیا لەلایەکی تر لەسەر بەرژەوەندییە نەوتیو ئابوریو جێگەی ستراتیجی ئێرانو ململانێی ئایدۆلۆجیو سەرەتای جەنگی سارد بوو، ئەو دیاردانە نەخشەو پیلانو مانوڤری سیاسیو سەربازیی لای هەردوو بلۆکەکە خولقاند... لەبەر بەهێزیی بەرەی خۆرئاواو لاوازیی خۆرهەڵات، لەبەرگەلێك هۆ کە گرنگەکەیان زەرەرو زیانی گەورەی جەنگەکەی دووەم بوو، توانیان نەخشەکانی خۆیان جێبەجێبکەنو بگەنە ئامانج...

جەمهوریەتی کوردستان لەدایکبوویی ناو ئەو بارودۆخە بوو، زیاتر لەوانەش، کێشە هەمەجۆرەکانی ناوخۆو گوشارەکانی دەوڵەتانی هەرێم زیاتر بارودۆخەکانیان پڕ لەکێشە دەکرد...

هەر لەبەر ئەم هۆیانەش بوو کەحکومەتەکەی کوردستان زیاتر بەحکومەتی شەڕ دەچوو وەك لەوەی حکومەتێکی یاساو شارستانیو خاوەن بەرنامەی ریفورم بێت...

## پیلانەکانی دوژمن لەدژی کۆمار

رژێمی شاو دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی هاوکاری، بەبوونی جەمهوریەتێکی خودموختاری کوردستان نائارام بوون، لەبەرئەوەی یەکەم: جەمهوریەتێکی کوردی بوو کە وا دادەنرا بەمانو گەشەکردنی، هەڕەشە لەسەر هەموو رۆژهەڵاتی کوردستان دروست دەکاتو ئینجا بۆ سەرپارچەکانی تریش.

دووهەم: لەبەرئەوەی سوڤیەت دەستیهەبوو لەو دامەزراندنە، بۆیە هەم بەکۆمۆنیستو هەم بەوابەستەی ئەو دادەنرا کەئەوانەش بۆ خۆرئاوا نامەقبوڵبوون.

لەبەرئەوانە لەچەندین رێگەوە، نەخشەی دژ بەکۆمارو بۆ روخاندنی دادەنراو بەتایبەتیی:

*لەڕوی سیاسی و گەمەو مانۆڤری سیاسییەوە.

*لەڕوی ئابوری و ئابلۆقەی ناوچەکەوە.

*لەڕوی مانۆڤری سەربازی و گوشاری هەمە لایەنە لەبەرەکانی جەنگدا.

*تێکدانی ریزەکانی گەل بەدڵدانەوەو راکێشانی سەرەك خێڵەکانی، پەیوەندیکردن بەلێپرسراوانی پێشمەرگەوە بۆ راکێشانیان و بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ هێزەکانی رژێمدا....

بوونی هێزەکانی لەشکری سور لەناوچەکەدا کۆسپی هەرە گەورەی بەردەمی رژێمی شا بوو کەنەیەڵێت بیر لەچارەسەری سەربازیی بەهێرش ناوچەکە داگیربکاتەوە، لەم مەیدانەدا رژێم هێزو توانای سیاسیی خۆی خستەکار تا روسەکان رازیی بکات بۆ گەڕانەوەی ئەرتەشی تاران بۆ ناوچەکە، بێ ئەوەی بگاتە ئەنجامێك...هەوڵە بەردەوامەکانی لێپرسراوی سیاسیی و سەربازیی تاران بۆ رازیکردنی لێپرسراوانی رووس بۆ ناردنی هێز بۆ مەهاباد، بەبیانوو مەبەستی جۆراو جۆرەوە، بێئەنجام مانەوەو نەتوانرا رەزامەندیی ئەفسەرانی لەشکری سوور وەربگرن بۆ ناردنی بچوکترین یەکەی سەربازیش...

دیار بوو ئەوانە پێوەندییان بەنەخشەیەکی تری مۆسکۆوە هەبوو کەکاری لەسەر دەکراو کەوتبووە ناو پرۆسەی کاری دیپلۆماسییەوە...

مانۆڤرە سەربازییەکانیش، گوشاری بەرەکانی جەنگ و هێرشی لەناکاوو کوتوپڕ، شەڕی پروپاگەندەو سایکۆلۆجیش نەیان توانی مەبەستەکانی تاران بەئەنجام بگەیەنن، ئەو شەڕانەش کەلەبەرەکانی سەقز کران بەتایبەتی لەشەڕەکانی مامەشاو قالاوە، سەرکەوتن بۆ هێزەکانی کوردبوو، بۆیە سیاسەتمەدارانی تاران گەیشتبونە ئەو باوەڕەی کەجارێ کاتی چارەسەری سەربازیانە نەهاتووەو باشتر وایە رێگەی سیاسیی بگیرێت.. لەبەر ئەوە تواناکان زیاتر لەم بوارەدا دەخرانەکار... ئیتر رژێم پێویستی بەهێمنی و ئەنجامدانی لەسەرخۆیی نەخشەکەی هەبوو، پێویستی بەهەوڵی جێبەجێکردنی پەیمان و رێکەوتنەکان هەبوو، هێزی دەوڵەتانی داگیرکەر ناوچەکە بەجێبهێڵن، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، پێویستی بەمانۆڤری سیاسیی هەبوو، ئەوانەش چەند مەبەستێکیان لێ بەئەنجام دەهات:

–خەریککردن و هیلاك و بێهێزکردنی سوپاو پێشمەرگەی کۆمار، تێکدانی ریزەکانی جەماوەر،ورەو متمانەی خەڵکی کورد لاوازو کەم بکاتەوە، خەڵکی نەفس نزم لەکۆمار راست بکاتەوە.

*لەگەڵ ئەوانەشدا، ئەڵقەکانی تری نەخشەکە جێبەجێ بکرێت... تالەسەرەنجامدا ئەو بارودۆخە برەخسێنێت کەئاسان هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان لەناوبەرێت...

*حاڵەتێکی نزیکبوونەوەو دۆستایەتی لەگەڵ مۆسکۆدا بهێنرێتە ئاراوە، تالەمەترسییە گەورەکە رزگاری ببێت...

ئیتر رژێمی شاو لەپشتیشیەوە دیپلۆماسێتی ئینگلیزو ئەمریکا، کەوتنە نەخشەدانان...

پێشەکی ئیبراهیم حەکیمی(حەکیم الملك) لەوەزارەت لابرا.. ئەحمەد قوام‌ولسەڵتەنە کرا بە سەرەك وەزیران و وەزارەتێکی نوێ پێکهێنرا.. ئینجا کەوتنە ئەنجامدانی ئەڵقەکانی نەخشە کە:

*خەریککردنی سەرکردایەتی کۆمار بەپرۆسەی ئاشتیی و وتوێژ کەرژێم خۆی کەمو زۆر بڕوای پێی نەبوو، خەریککردن و هیلاککردنی هێزەکانی پێشمەرگە...تێکدانی یەکێتی ریزەکانی پێشمەرگەو حزب و جەماوەر، هەڵخەڵەتاندنی سەرەك تیرەو عەشیرەتەکان و پێکهێنانی تابوری پێنجەم.

*گوشاری ئابوری و ئابلۆقە خستنەسەر ناوچەکە..

*رێگەو شوێن دانان بۆ نزیکبوونەوە لەیەکێتی سوڤیەت و هەوڵدان بۆ کێشانەوەی لەشکری سور لەناوچەکە تا هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان لەیارمەتی و پاڵپشتیکردن بێبەش بکات...ئەوەش هەم بەخۆسازو نێوان تەباکردن لەگەڵ سوڤییەت و وەرگرتنی بەڵێنی هەندێ ئیمتیازات لەلایەك، هەم بەگوشاری جێبەجێکردنی پەیمانەکان کەلەچەند بۆنەیەکدا لەنێوان ئێران و یەکێتی سوڤیەت و بەریتانیا و ئەمریکادا مۆرکران.

*هەوڵدان بۆ راکێشانی حزب و رێکخراوو تاقمە سیاسییەکان، بەرووکەش، هەڵخستنی کەشێکی دیموکراتانەو ژیانی فرەحزبی، تا بەوە هەم گەل و حزبەکان بەلای خۆیدا رابکێشێ و رێگەی یارمەتیدانی هەردوو کۆمارەکە دابخات، و هەم

دڵنیاکردنی روسەکان لەجێبەجێکردنی داواو داخوازییەکانی حزبە سیاسییەکان و پێکهێنانی بەرەی یەکگرتوو...

*هەوڵی جیاکردنەوەی هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان لەیەکتری تا هەم ورەی خەڵك و گیانی بەرگری پێ لاواز بکات و هەم هاوکاریی سەربازیی و بەرگریکردنی نێوانیان تێکبدات تابگاتە حاڵەتێ کەشەڕو ئاژاوەیان لەنێواندا بخوڵقێنێت، ئەو پەیمانی بەرگرییەی لەنێوانیاندا ئیمزا کرا، کەلەجێگەیەکی تردا دەقەکەی دەبینرێت- بەتاڵ بکرێتەوە.

قوام ولسەڵتەنە کەوتە جێبەجێکردنی ئەڵقەکانی ئەو نەخشەیە.

پێشەکی فرمانی کردنەوەی دەرگای سەربەستییە دیموکراتییەکانی دا، چالاکیی سیاسیی ئازادکرد، بانگی هەمووحزب و رێکخراوەکانی کرد کە سود لەم کەشە دیموکراسییە وەربگرن، بێنە مەیدانی چالاکیی ئاشکراوە... تا بەوانە راستگۆیی و نییەت باشەی خۆی بسەلمێنێت...

ئینجا دیلە سیاسییەکانی ئازادکرد، دەرگای سەربەستیی چالاکیی ئاشکرای نەقابەکانی کرێکارانی خستە سەرپشت.

پێشتر هەم بەگوشارو ئینجا بەمەبەستی دڵنیاکردنی ئینگلیزو ئەمریکاییەکان جاسوس و پیاوانی سەر بەئەڵمانیا گیرابوون و لەزیندان توندکرابوون... بایەخێکی چاوێنی درا بەکرێکاران و جوتیاران و جەماوەر، جێبەجێکردنی هەندێ داوای رۆژانەو مانگانەو باشکردنی شوێنی کار لەکارگەو کارخانەکان، لە18مایسی 1946دا حکومەتی قەوام ولسەلتەنە(یاسای ئیشکردنی دانا بەپێی ئەم یاسایە سەعاتی کارکردنی کرد بە 48 سەعات لەهەفتەیەکدا، ولەسەدا(35)ی رۆژانەش دانرا بۆئیشکردنی سەعاتی زیادەو لەسەدا(39)ی رۆژانەش لەسنوقی هاوکاری (تعاونی) دابنرێ کەلەسەدایەکی لەکرێکارو لەسەدا دووی لەخاوەن کار بستێنرێت. هەروەها بەو یاسایە پشوی هەفتانەی داناو پشوی ساڵانەی کرد بەدوو هەفتە بەڕۆژانەی تەواوەوە، ئایاری کرد بەجەژنێکی رەسمی. رێگەی دامەزراندنی نەقابەکانی دا، وەلەهەر دایەرەکدا لقێکی تایبەتی دانا بۆ لێکۆڵینەوەی شکایەتی کرێکاران لەخاوەن کارەکان..."(1)

جگە لەوانە بەڵێنی بەگەلانی ئێراندا کەلەسەرتاسەری وڵات هەڵبژاردنێکی گشتیی و ئازادانە بکرێت، بۆ ئەوەی خەڵك دیموکرات و ئازادانە نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن، بەکۆمەڵانی خەڵك رادەگەیەنرا کەئیتر رۆژانی دیکتاتۆریەت بەسەرچوو، رۆژانی سەربەستیی و دیموکراسی دەستیپێکردووە... قەوام وای دەردەخست کەئەو هەنگاوانە سەرەتای گەیشتنە بەو بەهەشتەی بۆ گەلانی ئێرانی دەرەخسێنێت...

قەوام ولسەڵتەنە، توانیی زۆربەی زۆری حزب و رێکخراوە سیاسییەکان هەڵبخەڵەتێنێت، بۆیە ئاسان و بەپەلە بەدەنگیەوە چوون، بەحزبی تودەیشەوە، فریویان خواردو کەوتنە تەك ئەو حکومەتە دیموکراتە ساختەو کاتییە... بەلام سەرکردایەتیی هەردوو کۆمار هەڵوێستەیان لەبەردەم ئەوکارانەدا کرد، بێئەوەی نەخشەی گونجاو لەبەرامبەر دابنێن.

لەهەمان کاتدا حزبی تودە کەوتە دوای بانگەوازەکە، قەوام سێ وەزیری لەنوێنەرانی حزبی تودە دانا، بەم جۆرەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| 1-دکتور یزدی | وەزیری تەندروستی. |
| 2-ئیرەجی ئەسکەندەری | وەزیری پیشەسازی. |
| 3-کشاوەرزی | وەزیر فەرهەنگ. |

ئەو هەنگاوانە بۆ نەخشەکەی قوام‌ولسەڵتەنە سەنگیی سیاسیی خۆی لای روسەکان هەبوو، جگە لەوەی کە حزبی تودەی بەتەواوی لەبەرەی ئۆپۆسزیون دوورخستنەوەو بۆ بەرەی رژێم و کەوتە هاوکاریی و رێکخستن و یەکخستنی هەڵوێست.

کارەکە هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو سەرکردەکانی حزبی شیوعی سۆڤیەت و سیاسەتمەدارانی یەکێتی سۆڤیەتیش کەوتنە ناو داوەکەی قوام و لسەڵتەنە، وەك لەشوێنی خۆیدا لەنامەکەی (ستالین)دا دەیبینین.

دەربارەی ئەم مانۆڤرە سیاسیانەی سەرەك وەزیرانی ئێران دوکتورمحەمەد حەسەن ئەڵێت:

"بەڵی روداوەکانی دوایی دەریانخست کەئەو سازشکارییەی حکومەتی قوام ولسەڵتەنە تەڵەکەبازییەك بوو مەبەست لێی خۆئامادەکردن بوو بۆ هێرش بردنە سەر رێکخراوە دیموکراتیەکان و هەمو جولانەوەی رزگاریخوازانەی سەرتاسەری وڵات، وەبەکردار هەر لەساڵی 1946دا دەستیکرد بەهێرش بۆ سەر رێکخراوە

دیموکراتیەکانی ولات.. لەهاوینی 1946دا پارتی دیموکراتی ئێرانی دامەزراندو نەقابەی کرێکارانی ساختەی هێنایە کایەوە ژمارەیەکی زۆر لەکۆنەپەرستانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، هەر لەو ماوەیەدا ئیمپریالیستەکانی ئەمریکاو ئینگلیز چەكو هەمو پێویستیەکی تریان خستە بەردەست ئەرتەش و هێزەکانی پۆلیسی ئێران بۆ بەکارهێنانیان و بۆ لەناوبردنی جولانەوەی رزگاریخوازانە لەولاتدا.

لەکانونی یەکەمی ئەوسالەدا ئەو پەیمانەی شکاند کەقوام ولسەلتەنە لەگەل حکومەتی ئازەربایجان بەستبوی، ئەوە بو ئەرتەشی ئێران کەوتە پەلاماردانی ئازەربایجان و کوردستان و دەستیکرد بەخوێنڕشتنی دیموکراتەکان...."(2)

بەشەکەی تری نەخشەکەی قوام خۆ نزیککردنەوە بو لەمۆسکۆ، تاسەرەنجام لەشکری سور بکێشێتەوە... بەتایبەتی ئەو هەنگاوانەی ناوخۆ زەمینەخۆشکەر بوون بۆ ئەم ئەلقەیەی تری نەخشەکە... هاتوچون و سەردان بەجۆرێ گەرم کرا کەپروپاگەندەی ئەوتۆی لێبکەوێتەوە کەگوایا رەزا شا کچەکەی ستالین-ی بۆ حەمەی کوڕی خواستووە...دیسان هاوکاریی بازرگانیی و ئابوریی و فەرهەنگی هێنرایە سەرمێزی باسکردن، تاسەرەك وەزیران سەردانی مۆسکۆی کردو لەگەل گەورە لێپرسراوان کۆبووەوەو سەرکەوتووانە بارودۆخێکی سیاسیی ئاسایی خولقاندو بنچینەی پەیمانی نەوت دانراو هەر لەنیسانی ئەو سالەدا ئیمزا کرا، لەبەر بایەخ و گرنگی سیاسیی و مێژویی ئەو پەیمانە والێرەدا دەقەکەی دەخەینە پێش چاو:

## پەیمانی نەوت لەنێوان ئێران و یەکێتی سوڤیەتدا

هەردوو دەولەتی یەکێتیی سوڤیەت و ئێران لەسەر ئەوە رێککەوتن کەکۆمپانیایەکی نەوتی روسیی و ئێرانی لەئێراندا دابمەزرێنن.

دەولەتی یەکێتیی سوڤیەت لەلایەك و دەولەتی خاوەن شکۆ شای ئێران لەلای دووهەم، هەردوولا بەدۆستانە لەسەر ئەوە پێکهاتن کەهاوکاریی ئابوریی لەنێوان هەردوو دەولەتدا هەبێت و هەریەکەیان یارمەتیی ئەوەکەی تر بدات. هەردوو دەولەت بەپێی ئەو دوو نامەیەی لەنێوان سەرەك وەزیرانی ئێران و سەفیری روسیادا ئالوگۆڕکران لەتاران لە4-ی نیسانی -1946دا هەردوولا رەزامەند بوون:

بەو پێیەی سەرەوە ئەم ڕوونووسی ڕێککەوتنەی خوارەوە کرا بۆ دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوبەشیی نەوتی روسیی-ئێرانی، لەبەرئەوە هەر دەوڵەتێك نوێنەری خۆی دەستنیشان کرد بۆ دانانی ئەم بەندانەی خوارەوە:

لەباتی دەوڵەتی روسیا-سادجیکۆڤ- سەفیری یەکێتی سۆڤیەت لەتاران لەباتی دەوڵەتی ئێران -بەڕێز قوامو لسەڵتەنە- سەرەك وەزیرانی ئێران پاش ئەوەی نوێنەری هەر دەوڵەتە ئەو بەڵگەنامانەی دەرخست کە نوێنەرایەتی ئەسەلمێنن و دڵنیا بوون لەوبەڵگەنامانەو بڕیاریان‌دا کەئەم پەیمانەی خوارەوە دابنێن:

مادەی یەکەم: هەردوولا لەسەر ئەوە پێکهاتن بۆ دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوبەشیی نەوت بەناوی کۆمپانیای نەوتی روسیی و ئێرانیی کە دەوڵەتی ئێران مافی ئەوەی ئەداتێ بەدوای دۆزینەوەی نەوتدا بگەڕێت بۆ دەرهێنان و دەستگیربوون و دەرهێنانی نەوت و لێبووەوەکانی (موشتەقات) لەو زەویانەی کەبەشی یەکەمی مادەی دووەمی ئەم پەیمانە دەستنیشانی ئەکات، هەروەها مافی فرۆشتن و گواستنەوەی نەوت و هەموو ئەو ماددانەی لێی دەرئەهێنرێت، لەئێران و دەرەوەی ئێران ئەدات بەڕوسیا.

دامەزرێنەری کۆمپانیاکان ئەمانەن:

لای یەکەم : وەزارەتی دەوڵەتی یەکێتی سوڤیەت کەئیشەکەی دەرهێنانی نەوت و پەترۆلە بەناوی نەوتی ستالین-ەوە، وەکۆمپانیای گشتیی یەکێتی سوڤیەت کەناوی کۆمپانیای ناردنە دەرەوەی نەوتی سۆڤیەتە.

لای دووەم لەدەوڵەتی ئێران.

بەپێی ئەم پەیمانە لەماوەی سێ مانگدا کۆمپانیاکە دائەمەزرێت، لەدوای ئەوە هەردوو دەوڵەتەکەش ئیمزای دەکەن ئەوسا دەکەوێتە کار...

مادەی دووەم: سنوری ئیمتیازی کۆمپانیا سنوری ئەو نەخشەیەیە کەلەگەڵ ئەم پەیمانەدایەو بەشێکی جودانەبووەوەیە لەپەیمانەکە، ئەبێت دەوڵەتی ئێران پەیمان بدات کەزەویەکانی ڕۆژئاوای ئازەربایجان کەلە لێکدانی خەتی سنوری روسیای سۆڤیەت و تورکیاو ئێرانەوە درێژ ئەبێتەوە بۆ خواروو بەقەراغی ڕۆژهەلاتی گۆمی رەزائیە(ورمێ) تا زەوی ناوچەی نێوان هەردو ئاو(میاندواو)وەکو لەنەخشەی ناوبراودا وێنەی کێشراوە، لەو شوێنە دیاریکراوەدا هیچ ئیمتیازێك نەدرێت بەهیچ

کۆمپانیایەکی بێگانە یا ئێرانیو بێگانە یاکۆمپانیایەکی هاوبەشیی ئێرانو بێگانە، هەروەها سودیش لەسەرمایەی بێگانە وەربگیرێت...*

لەماوەی یەکەم دە ساڵی جێبەجێکردنی ئەم پەیمانەدا کۆمپانیا لەبەشی یەکەمی زەوییەکەدا بەشوێن نەوتدا ئەگەڕێتو ئەو شوێنانەی بۆ ئیشوکاری نەوت دەرهێنانو پاککردنەوەی پێویست بێت هەڵی ئەبژێرێت، وەئەگەر هاتوو ئەو زەوییە هەڵبژێرراوانە موڵکی دەوڵەت نەبوون وا کۆمپانیاکە نرخەکانیان ئەدات بەخاوەنەکانیان، بەپێی ئەو نرخەی کە دەوڵەت دیاری دەکات، ئیتر بەو نرخدانانە زەوییەکان ئەبنە موڵکی کۆمپانیا.

مادەی سێهەم:-سەرمایەی کۆمپانیا بەپێی رێکەوتنی هەردوولای هاوپەیمان ئەبێت، لەبیستو پێنج ساڵی یەکەمیشدا بەشی ئێران لە 49٪ی سەهمەکان ئەبێتو لە 51٪یش هی روسیا ئەبێت، لەبیستو پێنج ساڵی دووەمیشدا هەردوولا وەك یەك لە 50٪ی سەهمی کۆمپانیاکەیان ئەبێت.

ب-سەرمایەی دانراوی هاوبەشەکان (ودائع المساهمين) لەکۆمپانیاکەدا بەمجۆرە ئەبێت: هی ئێران ئەو زەویانە ئەبێت کەلەمادەی دووهەمدا دەستنیشان کراوە، پاش تەواوبوونی ئیشوکاری تەکنیکیو هەڵکەندنی بیری نەوتو بەدەستهێنانی نەوتی بەکەڵك، هی روسیا: هەموو سەرفو موچەی کارمەندانو کرێکار ئەبێت لەگەڵ هەر شتێکی تر کەدۆزینەوەو دەرهێنانی نەوتو بەرهەمەکانی تری نەوت پێویستیی بێت لەگەڵ هەر پێویستییەکی تریشیی.

مادەی چوارەم: پوختەی قازانج بەپێی سەهمی هەر لایەك دابەش ئەکرێت.

مادەی پێنجەم: دەوڵەتی ئێران لێپراوە لەپاراستنو تەئمینکردنی کۆمپانیاو بیرەکانو هەموو دامەزراوەکانی کۆمپانیا بەهۆی هێزی پۆلیسی ناوخۆو هی ترەوە.

مادەی شەشەم: کۆمپانیا بۆی هەیە هەموو پێویستیو ئامرازو کەرەسەی خاوو هەر شتێکی ترو هەموو مەوداو ئامرازو دەرمانو پێویستیی پاراستنی تەندروستیی گشتیی لەدەرەوە بهێنێت بەبێ‌دانی باجو باجی گومرگو رەسمی شت هێنان.

هەروەها بۆ کۆمپانیا هەیە نەوتو دەرهێنراوەکانیو بەرهەمەکانی نەوتو بەرهەمی دەستگاکانی نەوت بنێرێتە دەرەوە بێ ئەوەی رەسمی گومرگو زەریبە

---

* لەسەرچاوەکەدا ئەم نەخشەیە لەگەڵ دەقی پەیمانەکەدا نەبوو..

بدات وە ئەبێت کرێکاری روسیاو ویلایەتەکانی یەکێتی سوڤیەت هەقی کاریان لەپێش هەموو کرێکارێکی تر لەجیهاندا هەبێت.

مادەی حەوتهەم: دەوڵەتی ئێران کۆمپانیا لەهەموو باج و رەسم و زەریبەیەکی وەصل و هەموو باجێکی مالیی عەفو ئەکات.

مادەی هەشتهەم: ماوەی ئەم پەیمانە لەرۆژی دەستکردن بە جێبەجێکردنییەوە پەنجا ساڵە.

مادەی نۆهەم: پاش تەواو بوونی ماوەی پەیمانەکە، ئێران بۆی هەیە هەموو سەهمەکانی روسیا بکڕێتەوە، ئەگەر خوازیاریش بوو وا ئەتوانێت ماوەی پەیمانەکە درێژبکاتەوە بەرەزامەندیی هەردوولا.

مادەی دەهەم: هەر بەئیمزاکردن و سەلماندنی پەیمانەکەو ئیمزاکان لەلایەن ئەنجومەنەوە، پەیمانەکە جێبەجێ دەکرێت.

ئەم پەیمانە لەتاران بەدوو نوسخە نوسراوە یەکەمیان بەزمانی روسی و دووهەمیان بەزمانی ئێرانی، هەردوو نوسخەکەش لەرووی بڕوا پێکردنەوە وەك یەکن..."(3)

مایەوە سەر ئەوەی کە بزانین چۆن و کەی ئەم پەیمانە ئەخرێتە ناو بازنەی جێبەجێکردن و خستنە کارەوە؟

عەلائەددین سەجادی لەو بارەیەوە ئەڵێت:

"لەم تاریخەوە تاماوەی (7)مانگ ئەو پارلەمانەی کەئێستە لەئێرانا هەیە بیخات و پارلەمانێکی تر دروست بکاتەوە بۆ ئەوە ئەو پارلەمانە تازەیە بڕیار لەسەر دانی ئەم ئیمتیازە بدات، لەئێستا بەدواوە روس لەشکری خۆی لەناوچەی نفوزی ئێران- بەتایبەتی ئازەربایجان و کوردستان- بکێشێتەوە بۆ ئەوەی لەکاتی هەڵبژاردنی نائبەکانی پارلەمانی تازەی ئێران هیچ دەنگێکی بێگانە لەو ناوەدا نەمێنێ... وەئەو مەرجانەش کە کاربەدەستانی روس لەو ڕووەوە دایان نابو ئەمانە بوون:

1-بەهەمو مەعنایەك ئەبێ هەڵبژاردن سەربەست بێ لەهەمو ناوچەکانی ئێرانداو نابێ دەمی بێگانە لەهیچ لایەك لەم ڕوەوە ورتەی لێوە بێت.

2-مەسەلەی ئازەربایجان و دەوروبەری ئەبێ بەهێمنی و سیلم بڕێتەوە.."(4)

بەو جۆرە سەرەك وەزیرانی ئێران هەنگاوێكی گرنگی تری نا بەرەو ئامانجە سەرەكییەكەی نەخشەكە...

بەتایبەتی گەڵ ڕێكەوتن و پەیمان لەنێوان هەر سێ زلهێزەكەو ئێراندا ئیمزاكرا بوو كەلەهەمویدا جەخت لەسەر پارێزگاریكردنی یەكێتیی ئەرزو ئاوی ئێران دەكرا، بەڵێن درا كەشەش مانگ دوای كۆتایی دووهەم جەنگ، هێزەكانی هەرسێ دەوڵەتە گەورەكە ئێرانیان چۆڵ كردبێت.

"كۆنگرەی تاران بەسترا لەبەینی(ستالین و رەزفلت و چرچیل) كە بەگوێرەی ئەوە بڕیاریان دابو كەدوای بڕانەوەی شەڕ بەشەش مانگ هەمو هێزی بێگانە بچنە دەرەوە بەبێ دەست لێدان لەسنوری جوغرافی و كیانی سیاسی ئێران..."(5)

دەربارەی ئەم پەیمانە سیر ریدر پولارد بەم جۆرەی نوسیوە:

"...بەگوێرەی ئەو پەیمانە ئێران یارمەتی دەوڵەتانی هاوپەیمان ئەدات وچی پێویست بێت بۆ هاتوچۆی لەشكرو كەرەسەی شەڕ لەوڵاتدا ئەیكات وەهەر كەلوپەلێكی ناوخۆی ئێرانیان پێویست بێت ئەخرێتە بەردەستیان هەروەها ڕێگە درا بەو دەوڵەتانە كە ئەو هێزانەی بەپێویستی ئەزانن لەئێراندا بیهێڵنەوە، بەڵام ئەو دەوڵەتانەش پەیمان ئەدەن كەهێزەكانیان بكشێننەوە لەماوەیەكدا كەلەشەش مانگ دوای تەواوبوونی شەڕ تێپەڕ نەكات..."(6)

لەمەڕ سیاسەتی قەوام و لسەڵتەنە بۆ ڕازیكردن و ناچاركردنی یەكێتی سوڤیەت بۆ كێشانەوەی لەشكری سور.

جورج لینشوڤسكی گوتی:

"قوام ولەسەڵتەنە... سێ ئیمتیازی گرنگی دا بەسوڤیەت:

یەكەمیان لە4ی نیسانی 1946دا پەیمانێكی بەست بەپێی ئەوە كۆمپانیایەكی سوڤیەتی-ئێرانی هاوبەش پێكهێنرا.. دووهەمیان : قوام ولەسەڵتەنە ئاگاداری حسین عەلا-ی نوێنەری ئێران لەنەتەوەیەكگرتووەكانی كرد كە شكاتەكەی ئێران كەداربوبە ئەنجومەنی ئاسایش بكێشێتەوە...

سێهەم: لە2ی ئابدا سێ وەزارەتی بۆ شیوعیەكان تەرخان كرد..."(7)

هەرچەند لەکاتی پێشکەشکردنی شکاتەکەی ئێران بەئەنجومەنی ئاسایش، سۆڤیەت رایگەیاندبوو کەهەردوولا گەیشتونەتە ئەنجام، بۆ ئەوەی نوێنەری ئێران شتێکی پێچەوانەی ئەو قسەیە بڵێت.

بۆ زیاتر مۆڵەقەکردنی هەڵوێستی یەکێتی سوڤیەت و جێگە لێژکردن بەلەشکری سور، ئەمریکاییەکان بڵاویان کردەوە کەهێزەکانیان لە 31کانونی یەکەمی 1945وە ئێرانیان چۆڵکردووە، سوپای بەریتانیاش رایگەیاند کەلە 2-ی ئازاری 1946وە ئێرانی بەجێهێشتووە.. هەرچەندە زۆربەی هێزەکانی هەردوولایان شوێنە ستراتیجییەکانی خۆیان گرتبوو بۆ رووبەڕووبونەوەی هەر ئەگەرێکی ئاییندە لەپێکدادانێکی نوێی سەربازیی لەنێوان یەکێتی سوڤیەت و هەردوو دەوڵەتەکەی تر...

ئیتر بیانویەك بۆ یەکێتی سوڤیەت نەمابوو کەلەشکرەکەی نەکێشێتەوە.. بەتایبەتی چەند مانگێك بەسەر مانۆرە سیاسییەکەیدا تێپەڕی کردبوو، کەئەوەش ڕێگەخۆشکردن بوو بۆ دامەزراندنی خودموختارییەکی ئازەربایجان و ئینجا بەوەڵەدبوونی کۆمارە خودموختاریەکەی کوردستان، وەك دیفاکتەیەك هەم بۆسوڤیەت و ئازەربایجان و هەم بۆ ئێران...

بۆیە سوڤیتەکان هەم حسابی ئەوەیان کردبوو کە ئیمتیازی نەوتی خۆیان وەرگرتووەو هەم ئەو دوو قەوارەیەش هاتوونەتە ئاراوە کە وەك گوشارو کارتێکی دەستیان سودیان لێوەردەگرن... لەلایەك، روسەکان لەوەش دەترسان کە ڕووبەڕووبونێکی سەربازی، بەهۆی ململانێ و ناکۆکی لەسەر ئێران، بخوڵقێ کەدوای جەنگە پڕۆکێنەرەکە نەتوانن بەرەنگاریی بکەن لەلای دووهەم...

بەو جۆرە زەمینەی ئەڵقەیەکی گرنگ یان گرنگترین ئەڵقەی نەخشەکە خۆشکراو یەکێتی سوڤیەت هێزەکانی لە 27نیسانی 1946وە تا 9ئایار لەئێران کێشایەوە...

بەو شێوەیە سەرەك وەزیرانی ئێران لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا، کۆسپی ڕێگەی تەخت ئەکرد، چاوەڕوانی دواهەنگاو بوو...

بەرامبەر بەو مەترسییە رووبەڕووبوانە، کەزیاتر لەکێشانەوەی لەشکری سوردا خۆی دەبینی، هەردوو کۆماری ئازەربایجان و کوردستان پەیمانێکی سەربازییان ئیمزاکرد، بۆ بەرگریکردن لەخۆو لەدەستکەوتەکانی هەردوو گەل، کەلەجێگەی تردا زیاتر لەسەر ئەوە قسە دەکەین و بەندەکانی دەخەینە پێش چاو...

بەڵام، قوام بۆ بێبایەخکردنی ئەو پەیمانە، یەکلایەنە پێوەندیی لەگەڵ تەورێزدا سازکرد، پەیمانێکی دوو قۆڵییان مۆرکرد، هەرچەندە لەپەیمانە دووقۆڵییەکەی ئازەربایجان و کوردستاندا جەخت لەسەر ئەوە کرابوو کەبێ رێکەوتن و هاوکاری یەکتری هیچ هەنگاوێکی لەو بابەتانە نەنرێت، بەڵام ئازەربایجان ئەو کارەی بێ ئاگاداریی کوردستان کرد، وەك لەجێگەیەکی تردا زیاتر روناکیی دەخەینەسەر ئەم لایەنەش.

ئەم هەنگاوەی تەورێز کوردی زیاتر نیگەران کرد، ناچاری کرد کەپاشەکشە لەهەندێ دەستکەوت و بەرهەمی خۆی بکات... بێ ئەوەی ئەوانە ببنەهۆی تێکدانی پێوەندییەکان، بەتایبەتی کۆماری کوردستان پێویستیی بەو حاڵەتی تەباییە هەبوو....

هەرچەندە باری گرژیی و شەڕو پێکادان لەبەرەکانی رووبەڕووبووندا روویان ئەدا، بەتایبەتی لەسەقزو سەردەشت:

"لەو جەبهەدا دوژمن پەلاماری هێنابوو، بەڵام زۆر خراپ شکابو و زەبری دەستی پێشمەرگەی کوردستانی چێشتبو..."(8)

بۆیە لەمایسدا جەنراڵ رزمارا سەرەك ئەرکانی ئەرتەشی ئێران داوای لەمەهاباد کرد کەنوێنەری خۆیان بنێرن بۆ وتوێژو چارەسەری کێشەکانی بەرەکانی هێزی رووبەڕوبوو...لەهەمان کاتدا کەوەفدی کورد لەسەقز ئامادەبوو، وەفدێکی ئازەربایجانیش گەیشتە ئەوێ و هەرسێ لا لەسەر ئەمانەی خوارەوە پێکهاتن:

"1-ئەم نێرراوانە بەناوی حکومەتی خۆیانەوەخەبەر بنێرن بۆ ئەو هێزانەیان کەوان لەبەرامبەری هێزی حکومەتی ئێرانەوە بۆ ئەوە شەڕ بوەستێنن، وەکو چۆن ئەم فەرمانەئەکرێتە سەر هێزی ئێرانیەکانیش شەڕبوەستێنن تا ئاخر قسەی پێشەوایانی هەرسێ حکومەت دەرئەکەوێ.

2-بۆ ئەوەی هیچ تەنگ و چەڵەمەیەك لەبەینی هێزی ئێرانی و کورددا رونەدا، کوردەکان(4)کیلۆمەتر لەدەوری سەقز-سەردەشت و سێ کیلۆمەتر لەشماڵی جادەی سەردەشت بکشێنەوە دواوەو لەڕوباری سەقزو زەرینەرود نەیەن بەم لاوە( کوردەکان وتیان بڕیاردان لەسەر ئەم بەندە لەدەسەڵاتی ئێمەدا نییە، ئەتوانین تا ماوە 24 سەعات ئەم قسەیە بگەیەنین بەسابلاغ بزانین ئەوان بڕیار ئەدەن یان نا؟)

3-نەدەستەی ئێران نەهێزی کورد حەقی ئەوەیان نیە ئەو هێزانەیان کە ئێستە لەمەیدانی شەڕان و سەنگەرەکانی خۆیان گرتوە پشتیوانیان بکەن و هێزی تریان بۆ بنێرن، تا گفتوگۆی پێشەواکانیان ئەبڕێتەوە، ئەوەندە هەیە فرۆکەی ئێرانی ئەتوانێ تا (4) کیلومەتری شیمال سەقزو جادەی سەقز-سەردەشت بفڕێ، ئەمەش بۆ چاودێری کاروبار نەوەك شتی تر.

4-بۆ ئەوە کەوا هەردوولا دڵنیابن لەبەرئەنجام گەیاندنی ئەم پەیمانە تا گفتوگۆی پێشەوایەکان دوایی دێت سێ کەس لەلایەن حکومەتی دیموکراتی کوردستانەوە دابنرێت، یەکێ لەسەقز، یەکێ لەبانە، یەکێ لەسەردەشت کەئەمانە لەگەڵ فەرماندەکانی ئێرانا لەو شوێنانەدا ئەگەر تەنگ و چەڵەمەیەك لەوناوچانەدا رووی‌دا بیبڕێننەوە*.

5-مەفهومی بەندی دووهەمی ئەم پەیمانە بۆ ئەوە جێی خۆی بگرێ تا ڕۆژی 28ی مایس درێژ ئەبێتەوە..."(9)

لەڕاستییدا لەناو ئەو بەڵگەنامەو دۆکۆمێنتانەی تائێستا کەوتونەتە بەردەست، بەڵگەیەکی لەو بابەتە نەکەوتۆتە پێش چاو، کەبوونی ڕێکەوتنێکی وا بسەلمێنێ داخەکەم نوسەریش ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەك نەکردووە کە جێگەی متمانەو دڵنیایی بێت. هەروەك ڕووداوو سەرچاوەکانیش دەریدەخەن نە ڕەزمارا و نەهیچ لێپرسراوێکی تری ئەرتەش و حکومەتی، بەو جۆرە نەرمونیانی و ئەو شێوەی قسەکردنە مامەڵەی سیاسییان نەکردووە، مەبەستە سەرەکییەکانیان تێپەڕکردنی پیلانەکانیان بووە...

لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو ماوەی نەشەڕو نەئاشتییەو گرژی بەرەکانی ڕووبەڕووبوو، ناوچەکە ئاڵۆزو خەڵکی کوردیان هیلاکتر دەکرد.. پێشمەرگەکانی بێزار دەکرد، بەتایبەتی ئەمر کرابوو کەنابێت هێزەکانی کورد بجوڵێت و نابێت چاویان لەزەوی داگیرکەر بێت...

---

* بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بارودۆخی بەرەکانی شەڕو نەبەردییەکان بڕوانە مەحمود مەلا عززەت، بەرگەکانی 1و2و3-ی دەوڵەتی جمهوری کوردستان-1992-1995-1997.

مستەفا خۆشناو فەرماندەی لکی دووی هێزی بارزانیان لەنامەیەکیدا بۆ جەنراڵ حەمەڕەشیدخان فـەرماندەی هـێزی بۆکـان و مەنتیقـەی لایـەنێکی ئـەو سیاسـەتە سەربازییە دەردەخات و ئەڵێت:

بۆ فرماندەی هێزی بوکان مایورژنرال

1-اوە دوشمن لەسەر قلای مامشە قلاکونەکە آوەدان دەکاتەوە نیزیکەی (150) نفر ئیشی تیدا دەکات.

2-زۆر رجـا ئەکـەم مسـاعدە بفرمـو امشـەو هەلمەتـەکیان بـو ببـەین یاسـیریان دەکەین و یاخود هەڵدەقەنرین لە جێگای خۆیان ایمە سەنگەر اوەدان اکەینەوە.

3-زور مەمنون ابین حریەتیکمان هەبی بو ابداعی خودمـان باهموتماشاکەر نەبین بەرامبەر دوشمن ایتر امری گەورەیتانە

مستەفا خۆشناو

فرماندەی لکی2 (10)

هەندێ لایەنی پیلان و نەخشەی دوژمن ئاشکرا بوون، لەو کەسانەی کەبەوردیی سەرنجی لەوانە ئەدا جەنراڵ حەمـە رەشـید خـان بـوو، زۆر لەنامـەکانی هەڵوێسـتی گونجاو و دروسـتی ئـەم پیشـان ئـەدەن.. میرزا محەمـەد ئـەمین مـەنگوڕی کەنووسـەرو هـەندێ جـار جێگـری جـەنرال خـان بـوو، ئـەمیش لەداڕشـتنی نامـەو نوسـینەکانی فەرماندەییەکـەداو لەو بیرەوەرییانـەی لـەم دواییـەدا بـەدوو بـەرگ بـەچاپ گەیـەنران دەرخراوە. بەوردی باسی بارودۆخەکانی سەردەمەکە ئەکات و رووناکی ئەخاتە سەر گـەلێ لایـەنی گرنـگ. جـاری واش هـەبوو کومیتـەی نـاوەندیی حزبـی دیموکراتـی کوردستان پەردەی بێدەنگیی دەدڕیی و هـەندێ لەڕاستییەکانی دەخستە پێش چاو، یەکێك لەو نامانەی کۆمیتەی ناوەندی کەئەوە دەسەلمێنن ئەم نامەیەی خوارەوەیە:

1325-3-6

حزب دیموکرات کوردستان

مهاباد

کومیتەی مەرکەزی

نوینەرانی بەرزی حزب دیموکرات کوردستان

لەجوابی نوسراوی ژمارە 2دا ئەوە قەراریکە کە لەکومیتەی مەرکەزی حزب دیمکرات کوردستان....اگاداریتان لەژێرەوە دەنوسرێ:

1-عدەی مە ئەو مودەیە سەرخود هیچ جورە تجاوزو عەمەلیاتیکی نکردووە تا لەترەف عدەی حکومتی مرکزیوە تجاوزو حملەیەك بو سەر عدەی مە نکرابی. پاش تجاوزو حملەش عدەیمە مجبور بوە بو وی کەنیلی عدە تجاوزکار دەفعەیەکی دیکە ئەو جیگایەی بەدستبوە بو بیکاتە مبداو حملە تا نەوی نەوی دەگیر خویان بخەن.

2-قسمەتیکی مهم لەعدەی مە عشایرن وەکو افرادی نزامی دیسپلینە نین هیچ ممکن نیە کەلەدوای وی عصبانی کرا لە اتاعتی خارج دەبن چون دەبی مأمورینی حکومەتی مرکزی فکری وی نەکەن کە تیارە بچیتە سەر ئەوان بەمسلسلان دایان گری. لیان بکوژیە دیسان ئەوان بامیدی واهی مزاکراتی صولحیە دەجریان دایە حملەی متقابلە نکەن ئەوە شتیکی غیرە مومکنە.

3-چون دەبی ئەوانە خجالەتی نیان گری دەو وەختیدا کە دونیا بیزانیوە کە مزکراتی صولحیە دەماین دایە وە دەو وەختی‌دا کەنومایندەیمە چوتە بەر دەرکەو استانی وان ئەوان شەرمی نەکەن لەجبهەی سقز سەردەشتی تەواوی عدەیمەو ژنومندالی دیهاتیان کەهیچ جۆرە زدی هوایان نیە بەمسلسلان دایان گرن‌و تلفیاتیان پیٚ بدەن.

4-نازانین مامورینی حکومتی مرکزی تا کەنگی دەست لەدەسیسی‌و نیرنگی خویان هەل ناگرن کەئەلعانەکە بەجەبرو زور توانیوە ایمە بکشینەوە دووایە بەحیلەو تەزویر خەریکن...

ئەگەر مقصودیان ئەوە نیە کە ئەو جیگایانە دوبارە تەصەرف بکەنەوە حازرین هەر چەندی ئەوان... امەش بکشینەوە، بەساعت دەلین. بەفرسخ دەلین. بەمنزل دەلین کە ئەوە قاعیدەیەکی بین المللی‌یە. ایدی کەس نیبیستوە لایەك بەتنی بکشیتەوە.

5-فیلیکی دی ئەوەیە کەبەبهانەی خوار بارەوە خەریکن ریگایان بەمە چول دەکەن کە دە صورەتیکی لەو مەنتقانەی کە دە دەستان دایە خوراکیان هەیەو چاترین شاهیدو ئەو سەربازانەن کە لەوان گیراو نو فراریان کردووەو ئەلعان حازرن.

6-ایمە نازانین ئەو بهانەو بهانەتراشی چیە ئەوکشانەوەو مولەتو امروزو فردا بوچی ئەگەر حکومتی مرکزی راست دەکاو صلح دەکا لەدومانگ مزاکرە زیاتر؟

فـەرمون فـەوری بیکـەن ئـەو صلحـەی کەفـەوری برایــەتی دەنیـو میلـەتانی ایرانــی بەر قەراربیت.

کومیتەی مەرکەزی حزبی دیموکرات کوردستان

رونـوس لـەجوابی ژمـارە 343 دا بـەجنابی ژنـرال مـایور محمـد رشـید خــان زادە فرماندەی بەرزی هیزی بوکان و منطقەی سەرا دەدریت.

لەگەڵ ئەوەدا(کومیتـەی مەرکـەزی حزبـی دیموکـرات کوردسـتان) ئـەو تێگەیشـتنە واقعبینانـەی بەناچاریی بۆ لێپرسراوان دەردەخست، دیسان سـەرکردایەتیی کۆمـار ناچاری ددان بەخۆداگرتن بوو، کـەچی جموجوڵی هێزەکـانی دوژمـن هـەر بـەردەوام بوو، هەر وەك ئـەم بەڵگەنامەیـە کـە جـەنرال حەمـە رەشـید خـان فـەرماندەی هـێزی بۆکـان و منتقـەی ئاراسـتەی وەزارەتـی هـێزی دیموکراتــی کوردسـتانی کـردووە دەیسەلمێنێت..(11)

ژمارە/ 862

بروار/22-4-1325

سری جداً

بو وەزارەتی بەرزی هیزی جمهوریتی کوردستان

موزوع/ دسائسی ایرانیەکان و خیانەتی کویخا کاپیتان خانانە

1-مامورینی ادارەی عسکری سقز لەهەمو لایکەوە بەتەرزی نهینی و اشکرا هەوڵی ئـەدەن بـو تفرەقـەو بلاوکردنـەوەی هیزەکـانی دیموکـرات، و متمادیـا مشـاغبەو تشویشات ئەکەن بۆ شکاندنی نفوزی پێشەوای محبوب مان.

ئەو عملیاته حیله بازەیان قناعەتی تەواوی داوینـی کەمتلق ئـەو غدرانـه لـەغیرانی وقت کوشتنی ایمە هیچ وینـە مرامیکـی تریـان نیـە، هـەتا پیری سـروان منصـوری یوریان ناردوە بو تالەجەرو خورخورەو سەرشیو بوملاقـاتی اغایـانی ئـەو نـاوە بـو دعایەو تەنسیراتی مخالەفەت لەزدی دیمکرات.

هەتا ایستا ئەو عملیاتەی اغا صالح و ملاقاتی سروان منصوریەکان بەتـەواوی بـو رەوشەن نەبووە کەبو چ اقدامێکی مخالف اغا صالح تەوزیف کراوە...تاد.

بەو جۆرە گەلەك بەڵگەنامەی تری ئەو سەردەمە هەن کەبارودۆخەکان دەرئەخەن... باچەند دیرێك لەنامەیەکی تر بخوێنینەوە بەنیازی رونکردنەوە هەمان مەبەست.

نامەی جەنرال حەمەرەشید خان- بۆ معاونی سیاسیی وەزارەتی هێز...

ژمارە/ 879

بروار 1325/4/24

بو معاونی سیاسی وزارەتی هیزی جمهوریتی کوردستان اغای نانەوازادە

موزوع/ خلافی عهدو پەیمانی اغای همایونیه

سری

اشارەیه بەنوسراوتان ژمارە193وه رۆژی 1325/4/23

1-لەوەختی خویدا که دەولتی مرکزی ایران لەجهتی سقزو بانه وه میرەدی وه لەلایەن هیزی دیموکرات خرابو محاصره نزیکی 12دی له منتقەی سرشیو به لشکری شکاك اشغال کرا بو ایمه کەحازر بوین بۆ ریگادان وەهاتوچویان لەمنتقەی نفوزی خۆیاندا تنها بو ازادکردنی زنجیره وه خوار باریان بوه بو ئەو جیگایانەی کەسابقا بوسگی ئەوانی تیدا بو. ایمه له وەختی خویدا داخلی عهدو قەرارمان نەبوه کەتازه بەتازه ئەوان بوسگ مندی تازه تأسیس بکەن، وه لەو چندا نەش عینی موزوع به اغای سرهنگ غفاری گوتراوه...

جا پیوسته تبلیغات بکەین کەئەو عدەیان بگیرنەوه بو جیگای اصلی خویان اگەر هاتو لەمستقبلدا بو ئەو جهته مصادمه یك لەلایەن ترفینەوه واقع بو اغای همایونی لەم جهتەوه به نزری مسئول وه مخالف پیمان تماشا ئەکری.

2-اخباراتی رۆژانەتان لەگەل نتیجەی ئەم موزوعه به مفصلی بو بنوسنەوه.

فەرماندەی هیزی بوکان و منطقەی سرا

رونوسیکی بو:

وزارتی بەرزی هیزی کوردستان لەگەل رونوسی نوسراوی اغای نانەوا زادە...

اصلا سرهنگ همایونی لەم ترتیباته تازەیەیدا هیچ متلبیکی نیه تەنها ایجادی دەسائس وه تەئسیری سوء تفاهم نەبێت...

خۆ مەسەلەی وتوویژیش، هەر لەسەرەتاوە بێ هودە بوو، مەبەستەکانی تاران لەوە ارراوە نەبووە... دەی باسەرنج لەدوا پەردەکانی وتوێژو ئەنجامەکانی بدەین لەزمانی سەرەك کۆمار خۆیەوە.

رۆژنامەی ئێران ما و رەهبەر ناوەروکی وتوویژی رۆژنامەنوسانی خۆیان لەگەڵ رێبەری پارتی دیمکراتی کورد قازی موحەمەد کەلە رێکەوتی 3ی سپتامبر لەتەوریز کراوە بڵاوکردەوە... قازی رایگەیاند کەوتوویژی نێوان ئەو و ئێران لەتاران بەهۆی دژایەتی داروەدستەی دەسەڵاتداری سوپای ئێران راگیراوە....

دوای ئەوەی رۆژنامەکە قسەکانی قازی لەسەر لێپرسراوانی ئەرتەش باس دەکات کە چۆن دژی دیمکرات دەجوڵێنەوە... دەنووسێت:

قازی رایگەیاند کە پێش گەرانەوەی لەتاران بریار وابوو کە دوای پێنج رۆژێکی تر بۆ درێژەپێدان بەو وتووێژە بگەرێتەوە تاران. بەلام وتووێژ بەبەشداری هەندێك لەسەرۆکەکانی سوپایی بێکەڵك بووە لەبەرئەوە لەرۆیشتنی سەرلەنوێی بۆ تاران چاوپۆشیکردوە. ئەو رایگەیاند کە کوردەکان باوەریان بەنیازپاکی قەوامولسەڵتەنە هەیە، بەلام لەتاراندا هێندێك کەس هەن کەهەوڵ دەدەن قەوامولسەڵتەنە لەکوردەکان دووربخەنەوەو وتووێژەکان بپچرێنن. تا ئەو کاتەی ئەو کەسانە لەپۆستی خۆیاندا بمێننەوە بەئەنجام گەیشتنی ئەم وتووێژانە زۆر دوور دەنوێنێ، بەلام سەرەرای ئەمە وتووێژەکان بەیەکجاری رانەگیراون و هاتنی نوێنەرانی ئێران بۆ کوردستان بەم زووانە چاورێ دەکرێت*.

ئەوە نەخشەو پیلانی دوژمن بو، بۆیە هەر خێرا رزمارا پێشنیاری کرد بۆ بینینی نوێنەری مەهاباد بەتایبەتی پێشەوا قازی محەمەد. بەدڵ پاکی و نیازچاکی و دوور لەتوێژینەوەی نیازو مەبەستی تاران، پێشەوا بەرەو (سەراو) کەوتەرێ، هەرچەندە ئاگادار کرا کەئەو چونە مەترسی دروست دەکات لەسەر ژیانی... پاش گفتوگۆ لە 17 حوزەیراندا هەر دووك لەسەر ئەم پەیمانە رێککەوتن:

"1-حکومەتی کوردستان رای لێ بێ حکومەتی ئێران لەسەقزەوە خواردەمەنی و بەرگ بنێرێ بۆ ئەو هێزە ئێرانیانە کەلەمیرەدێ و بانەو سەردەشت لەلایەن حکومەتی کۆمەڵەوە ئابلۆقە دراون، ئەویش بەمەرجێك ئەم شتانە وەختێك دەرباز ئەبن کەلەلایەن

---

* ئەفراسیاو هەورامی، هەمان سەرچاوە.

هێزی کوردی‌یەوە بپشکنرێن‌و دڵنیا بن لەوە کەهیچ جۆرە چەك‌و گۆبەندێکی شەڕی تێدا نیە.

2-چەك‌و شتومەکی جەنگ بۆ ئەو شوێنانە بەهیچ جۆر ڕێ نادرێ، هەروەها ئەو ئەفسەرو سەربازانە کەلەشوێنە ئابلۆقە دراوەکانان نابێ بگۆڕێن، مەگەر نەخۆش وە یا بریندارێك نەبێ، ئەوە گۆڕین‌و بردنی ئەوە دروستە.

3-هەر کاروانێك ئازوخەو جل‌وبەرگ کەلەلایەن حکومەتی ئێرانەوە ئەچێ بۆ ئەو هێزە ئابلۆقە دراوانە ئەبێ لەپاش پشکنین، پیاوی کۆماری کوردستان بەرەسمی لەگەڵ بێ.

4- ئەگەر لەشکری ئێران بەپێچەوانەی ئەم بەندانە بزوتەوە نەیروێ کوردی حەقی ئەوەی هەیە بەربەست بکاو نەیەڵێ شتومەك بچێ بۆ ئەو شوێنانە کەناوبراون.."(13)

بەسەرنجدان لەم ڕێککەوتنەو ئەو نامانەی پێشو، دەرئەکەوێت کەئاشتی‌و گفتوگۆ هەر بۆ فریودان‌و خۆرزگارکردن بو لەتەنگ‌و چەڵمەی سەربازی، بۆ دەربازبون بو لەئابلۆقەو خۆبەهێزکردن‌و ڕێکخستنەوەی لەشکرو ئامادەکردنی چەك‌و تفاقی شەڕ، بۆچونە پێشەوەو سەنگەر قایم کردن بوو، بۆ وەخت بردنە سەرو ئەنجامدانی نەخشەکە بوو...

ب. ئەلوەندی لایەکی تر لەگفتوگۆو وتووێژی نێوان تاران‌و مەهاباد باس دەکات‌و ئەڵێت:

"رئیسی ارکانی جیشی ئێرانی(رازمارا) دوای بەینێك هات بۆ مەهاباد لەگەڵ پێشەواو سەدری قازی کۆبونەوە، گفتوگۆ کرا لەم روەوە... لەسەر گەلێ کاری تریش ڕێك کەوتن.

حکومەتی تاران دان بەخودموختاری (حکم الذاتی) کوردستان‌دا بنێت وەهەمو جۆرە یارمەتیەکی کۆماری دیموکراتی کوردستان بدات لەبارەی ئابوریەوە وەپەیمانێکی ئاشتی لەبەینیان ببەسترێت..."(14)

نوسەرێکی تر لایەکی تر لەهەنگاوو فڕوفێڵەکانی قوام‌ولسەڵتەنە ئەخاتەروو دەڵێت:

"لەئەنجامی ئەو وتووێژەی مزفر فیروز کەیاریدەدەری سەرەك وەزیران بو لەپارلەمانا، لەگەڵ وەفدی کوردستان‌و ئازربایجان بەسەرۆکایەتی جەعفەر

پیشەوەری، حکومەتی تاران رەزامەندی خۆی نیشاندا بەرامبەر هەمو ئەو رێگەو شوێن و هەنگاوانەی هەردوو کۆمار، وەبڕیار درا کەدەستورەکەی ئێران بخرێتەوە کار کە بەو پێیە ئەبێت پەرلەمانی ناوچەیی لەهەمو ئێراندا دابمەزرێنرێت(ئەنجومەن)وە هەمو هێزە سەربازی‌یە میللی‌یەکان بەبەشێك لەلەشکری شاهەنشاهی دانران، بەو جۆرە پەیوەندی نێوان تاران لەلایەك وە مەهابادو تەورێز لەلایەکی تر خرایە پلەیەکی نوێوە..."(15)

تاران بەو جۆرە هەنگاوی ئەناو قوام‌ولسەڵتەنە جێگە پێی ئەو هەنگاوانەی خۆش ئەکرد... شارەزاو دەستگا جاسوسیەکانی ئینگلیزو ئەمریکاش بەوردی سەرنجی شێوەی جێبەجێکردنی نەخشەو پیلانەکانیان ئەدا، رۆژانە ئامۆژگاری تازەیان ئەکردن. مایەوە سەر هەنگاوێکی تر.. مایەوە سەر هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی هەر دوو کۆمار لەیەك، پێش ئەوەی چەپۆکی کوشندەیان ئاراستە بکات... دەبا جارێ سەرنجێکی ئەم رووەی روداوەکان بدەین بابزانین هەر دووکۆمار لە چیدان و چۆن خۆیان کۆئەکەنەوە بەرامبەر تاران و نەخشەکانی، بابگەرێینەوە سەر نەخشەی قوام‌ولسەڵتەنەی سەرەك وەزیران.

## کوردستان و ئازەربایجان لەیەك بەرەی یەکگرتوودا

بەرامبەر مەترسی و پیلانەکانی تاران، مەهابادو تەورێز بۆ خۆرێکخستن، زیاترلەیەك نزیك ئەبونەوە، هەر پێش کشانەوەی لەشکری سوور خۆیان ئامادەکردو کەوتنە مەیدانی هاوکاریی سەربازیی و پەیمانی بەرگریی، بەتایبەتی:

"ئازەربایجان حکومەتێکی گەورەترو بەهێزترو زۆر تەیارترو پڕ چەك تر بو لەکوردستان، خەتی دیفاعی ئازەربایجانیش زۆر قایم تر بو..."(15)

سنوری هەردو کۆمار چارەنوسی هەردولا بوو، چونکە هاوسنور بون هەر بەو پێیەش هاو چارەنوس بون لەبەرامبەر یەك دوژمن، کە وابو ئەبێت لەسەر ئەو سنورە یەکگرتوەیان پێکەوەو لەیەك بەرەدا بەڵکو لەیەك سەنگەردا بڕیاری ئەو چارەنوسە بدەن، یان خۆگریی بەرەو ئازادییەکی هەمیشەیی... یان سەر لەنوێ داگیرکردنەوەو چەوساندنەوەو گرتن و کوشتن.

بۆ ئەم ئامانجەش ئەبو پێشەکی کێشەو ناکۆکیەکان چارەسەر بکەن... گیروگرفتی هۆزو خێڵەکانی سەر سنوریان، شێوەی بەڕێوەبردنی شارە تێکەڵەکان کەکوردو ئازەرو کەمینەی تریش کەلە: خۆی، شابور، ورمێ، ماکۆ وە میاندواو پێکەوەئەژیان، چارەسەر بکەن، ئەو گیروگرفتانە کەهەندێ جار لەم شارو ئەو شار، یان لەنێوان ئەم هۆزی کوردو ئەو خێڵی ئازەردا ئەبوە ئاژاوەو مەترسی هەڵگیرساندنی شەڕ لەبەینی هەردوو کۆماردا... کاتێکیش لێپرسراوانی سۆڤیەت دەرکیان بەوەکرد، کەوتنە هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی نوێنەرانی هەردو لا بۆ رێکخستن و پێکهاتنیان، بۆیە بڕیاردرا لەتەورێز کۆببنەوە:

کۆماری مەهاباد وەفدەکەی بەم جۆرە پێکهێنا:

1-قازی محمد. 2-محمد حسین سیفی قازی.

3-سید عبدالله گیلانی. 4-عمر خان شکاك.

5-رشید بەگ هەرکی. 6-زیرۆ بەگ هەرکی.

7-قازی محمد خزری شنۆیی.

هەموان بەرەو تەورێز کەوتنەرێ، لەوێ لەگەڵ ئەندامانی وەفدی تەورێز دەستیانکرد بەکۆبونەوە، وەفدی تەورێزیش بەم جۆرە بو:

1-جعفر پیشەوەری. 2-حاجی میرزا علی شیستری.

3-صاجق بادگان. 4-سلام الله جاوید.

5-محمد بیریا.

دوای گفتوگۆ لە 23/ نیسانی /1946دا هەردوو لا گەیشتنە ئەم رێککەوتنەی خوارەوە:

مادەی یەك: هەر کاتێك هەر دوو لا بەپێویستیان زانی، هەر یەکە نوێنەری خۆی هەبێ لەولاتی ئەوی تردا.

مادەی دووهەم: لەناوچەکانی ئازەربایجاندا کەکوردی زیاتر بێ لەتورك، کورد لەدایەرەکانی حکومەتدا دابنرێت، لە کوردستانیشدا هەر بەم جۆرە بکرێت.

مادەی سێهەم: هەردوو حکومەت لیژنەیەکی ئابوری پێك ئەهێنن بۆ چارکردنی کێشە ئابوریەکان، وەبڕیارەکانی ئەم لیژنەیە ئەبێ سەرۆکی هەردولا جێبەجێی بکەن.

مادەی چوارهەم: لەکاتی پێویستیدا هەردوولا پەیمانی سەربازی ئەبەستن و وەهەر یەکە یارمەتی ئەوی تر ئەدات.

مادەی پێنجهەم: هەمو جۆرە وتووێژێك لەگەڵ تاراندا نابێت بکرێت بەڕەزامەندی لاکەی تر نەبێت.

مادەی شەشەم: حکومەتی ئازەربایجان هەنگاوی پێویست ئەنێت بۆ هاوبەشی لەپێشخستنی زمان و رۆشنبیری کوردەکانی سنوری ئازەربایجان، وەهەروەها حکومەتی کوردستانیش بۆ ئازەر هەمان هەنگاو ئەنێت.

مادەی حەوتەم: هەر کەسێك هەوڵ بدات یەکێتی مێژوییی و هاوکاری هەر دوو گەل تێك بدات و یەکێتی نیشتمانیان لەناو بەرێت هەر دوو گەل سزای ئەدات.(16)

لەڕاستیدا دەقی پەیمانەکە لەگۆڤاری هەڵاڵەدا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام جۆرە جیاوازییەك لەنێوان بەندەکانی بەدی دەکرێت، وەك لەجێگەیەکی تردا خراوەتە پێش چاو.

کاتێك تاران بەو رێککەوتنەی زانی، ناڕەزایی و تورەیی خۆی ئاشکرا کرد، نەك هەر لەبەر پتەوبون و بەهێزی هەردوو کۆمارو پێکەوە بەستنی چارەنوسیان، بەڵکو لەبەرئەوەش کەهەردوو لا وەکو دوو دەوڵەتی سەربەخۆ ئەو پەیمانەیان بەست و ئیمزایانکرد. وەکو دوو دەوڵەتی جیابوەوە لەتاران-بۆیە قوامولسەڵتەنە خێراتر کەوتە هەنگاونان بۆ تێکدانی ئەو یەکێتییە، بۆ ئەمەش ئەیویست کەڵك لەناکۆکیەکانی نێوان هەردوو کۆمار وەربگرێ و کێشەکانی سنورو شارە تێکەڵەکان زیاتر قووڵ بکات و ببنە هۆی ئاژاوەو جیابونەوە، لە لایەکی تر هەوڵی ئەدا پێکهاتنی ساختەو رێککەوتنی درو لەگەڵ ئەم کۆمار یا ئەو کۆماردا رێکبخات بێ ئاگاداری یەکتری، وەکو ئەو رێککەوتنەی لەنێوان تاران و ئازەربایجان کەلەتەورێز کرا بێ ئاگاداری مەهاباد. هەروەها پەکخستنی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی قازی محمد ئەیدا بەنیازی گەیشتن بەهەمان ئامانج. چونکە قوامولسەڵتەنە لەو باوەڕەدا بو کە سەرکەوتن لەڕێگەی هێرشی سەربازی، جارێ کاتی نەهاتوە، بۆیە شەڕەکانی سەرەتای حوزەیران وەستێنران و کاری سیاسی دەستی پێکرایەوە کەمانگەکانی حوزەیران و تەممووز ئابی گرتەوە... ئەو ماوانە هەمووی بریتی بون لەهاتوچۆکردن و

وتوویــژ بــێ ئــەوەی هیــچ شــتێك دەســتگیر ببێــت و ئــەنجامێکی بەکــەڵکی بۆ کۆمار هەبێت...

کاتێکیش لەسەرەتای ئابدا قازی محەمەد چوو بۆ تاران و لەگەڵ رزماراو قوام ولسەڵتەنە کۆبوەوە، قوام پێشنیارێکی خستە بەرچاوی قازی محەمەد کە بەم جۆرە بو:

"هەموکوردستانی ئێران بەسنەشەوە بابکرێت بەیەك هەرێم وەلەپایتەختەوە ژەنراڵێك دابنرێ کەحوکمی ئەو هەرێمە بکات کەبەپێی ئەم بڕیارە باری کوردستان وەکو ئازەربایجانی لێدێت، وەبێگومان دەوڵەتی ناوەندی یەکەم ژەنراڵ کە بۆ ئەو شوێنەی دائەنێت هەر قازی محمد ئەبێت..."(17)

هەرچەندە ئەو پێشنیارە هەر مەبەستی تێکدانی پەیوەندی مەهاباد و تەورێز بو، دیسان ئیگلتن لەسەر ئەوە ئەڵێت:

"لەگەڵ ئەوەشدا قازی محەمەد بەلای ئەوەدا چو کەبەو پێشنیارە رازی بێت بەڵام ئەوەی لەبەرچاو بو کە کارێکی واو گۆڕانێکی لەو بابەتە لەپەیوەندی نێوان مەهاباد و تەورێز رەزامەندی سۆڤیەت لەوە شتێکی بنچینەییە..."(18)

بەڵام قازی محەمەد هەر لەسەرەتاوە بەلای ئەو جۆرە پێشنیارو کارانەدا نەچوەو رازی نەبوەو، چونکە بیری لەوە نەکردۆتەوە پشت بکاتە تەورێز، دڵسۆزو بەوەفا بوو بۆ بەڵێن و سوێندخواردنەکەی کەهەمیشە شانازی بکات بەیەکێتی کوردو ئازەرەوە، جگە لەوەش، پێشەوا ئەو راستیەی لەبەرچاو بووە کەلەیەك کردنی هەردوو کۆمار یا روخاندنی یەکێکیان، مانای نەمانی ئەوی تریشە. بۆیە پێشەوا بێ ئەنجام گەڕایەوە مەهاباد.

علاءالدین سەجادی باشتر تەقەلای تاران لەو روەوە ئاشکرا ئەکات و ئەڵێت: تاران پێشنیاری کرد کە:

"ئەگەر بێتو قازی و حکومەتی کوردستان واز لەدۆستایەتی و هاوکاری ئازەربایجان بێنێ، حکومەتی ئێران هەرچ ناوچەیەکی کوردەواری لەئێرانا هەیە وازی لێدێنێ بۆ ئەوە هەموی بکەوێتە سەر حکومەتی کوردستانی قازی محەمەد..."(19)

لەڕاستیشدا دیسان ئەم نوسینانەی عەلائەددین سەجادی، لەهیچ سەرچاوەیەکی تردا، بەو جۆرە نەبینراوەو خۆشی ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەك نەکردووە کە ئەم بڕگانەی لێوەرگرتووە.

بەڵام سەبارەت بەوە کە چارنوسیی هەردوو کۆمارەکە بەیەکەوە بەسترابوو، سەرکردایەتی هەردوو کۆمار باشتر هەوڵ و تەقەلای قوام‌ولسەڵتەنە یان بۆ رون دەبووەو لەمەبەستی گەیشتن، بۆیە باشتر لەیەك نزیك بونەوە.. لە 16ی‌تشرینی یەکەمی 1946دا پەیمانی سەربازی لەنێوان هەردوولادا مۆرکرا بەم جۆرەی خوارەوە.

1–دروستکردنی لەشکرێکی ئازەری کوردی کەشوێنی تەورێز بێت.

2–ناردنی لەشکری نیزامی ئازەربایجان بۆ قۆڵی (سەقز) لەکوردستان وەناردنی لەشکری غەیری نیزامی کوردستان بۆ "ئازەربایجان" ئەگەر پێویست بو.

3–دانانی "جەنڕاڵ عەزیمی" ئازەربایجانی بۆ سەرۆکی گشتی لەقوڵەکانی"سەقز""سەردەشت" لەکوردستان وە لە"هولاسۆر هەوشار" لەئازەربایجان.

4–دانانی مەلا مستەفا بەسەرۆکی گشتی کوردی‌و ئازەری لەناوچەی "سەقز"

5–ناوچەی "هەوشار" لەئازەربایجان لەژێر چاودێری "محمد حسین سیفی قازی"دا بێت.

6–قازی محمد سەرۆکی گشتی هەرە بەرز بێت لەسەر هێزەکانی ئازەربایجان–کوردستان، بەڵام لەژێر رەنگ رشتنی جەنراڵ عەزیمی‌دا.

7–"پیشەوەری" سەرۆکی هەرە بەرز بێت بۆهێزە شەڕکەرەکانی کوردی– ئازەری لەئازەربایجان.

8– هێزی کوردی هەر یارمەتیەکی تری ویست"ئازەربایجان" دەستی بۆ درێژ بکات..."(20)

ئەو پەیمانە سەربازیە کەلەژێر ناوی(کمیسیونی دفاع مشترکی ئازەربایجان‌و کوردستان)دا بوو، هیوای هەردوو لای بەهێزتر کرد، لەبری‌لەیەك دابڕین‌و ناکۆکی نانەوەو جیاکردنەوە، زیاتر لەیەك نزیك بونەوەو چارەنوسیانی پێکەوە بەستەوە....

بۆیە تاران، گەڕایەوە سەر ئەو بەڵێنە ساختەیەی کەدابوی بەگەلانی ئێران‌و یەکێتی سۆڤیەت، هاتە سەر مەسەلەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی تازە، ئەوهەڵبژاردنەش

پێویستی بەئاسایش و ئازادی رادەربڕین هەبووە تاخەڵك بتوانن بەسەربەستی نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن! ئاسایش و ئازادیی رادەربڕینیش کێ مسۆگەری ئەکات لەهێزەکانی رژێمی شا بەولاوە! هەر وەکو رێگەو شوێنیشی بۆ دانابوو، لەهێزەکانی تاران زیاتر کێ ئەتوانێ سەرپەرشتی هەڵبژاردن بکات! ناوچەکانی تری ئێران، یاساو ئاسایشیان تێدا بەرکەماڵە... ئازادیی و سەربەستییان تێدا چەسپیوەو لە ژێرسێیبەری رژێمی شا-دا کۆمەلانی خەڵك ئارام و بەختیارو سەرفرازن! تەنیا ناوچەکانی هەردوو کۆمار لەوانە بێ بەشن، لەبەرئەوە رژێمی شا لەشکری ئامادەکرد تا بەو ئەرکە هەستێت و دانیشتوانی ئەو ناوچانەش بەو جۆرە مافانە شاد بکات...!

## رۆژو ساتەکانی دوایی و کارەسات

نەخشەی ناردنی سوپاو دووا چەپۆکی کوشندە، ئامادەکرابو بۆیە بروسکەیەك گەیەنرایە تەورێزو ئاراستەی جعفر پێشەوەری کرا، تاران لەو بروسکەیەدا رای گەیاند:

"هێزی عەسکەری ئەبێ بێت بۆ ئازەربایجان بۆ ئەوە چاودێری هەڵبژاردن بکا، ئەمەش بۆ ئەوە نەوەك گەمەو گاڵتەی تیا بکرێ..."

وەرامی پێشەوەری بەم جۆرە درایەوە:

"بەپێی هەندێ لەبەندەکانی پێمانی پێشو- کەلەسەری رێ کەوتبوین- لەشکری "ئازەربایجان" لەشکری ئێرانە کەئەم پەیمانە هەیەو لەشکری ئازەربایجانیش ئێستە هەیە کەواتە پێویست بەهاتنی لەشکری "ئێران: ناکا. لەشکری "ئازەربایجان" خۆی ئەتوانی بەبێ لایەنگیری چاودێری هەڵبژاردنی خۆی بکا..."(21)

لەدوا سیناریۆی مانۆڤری سیاسی و پرۆسەی هەڵبژاردن و لەوەلامی هەمان داوای تاران پێشەوا قازی محەمەد بەم جۆرە وەلام ئەداتەوە:

"28نۆەمبەر بەگوێرەی راگەیاندنی دوێنێی رۆژنامەی ئێران واتە 27ی نۆڤەمبەر رێبەری دیموکراتەکانی کورد قازی موحەمەد وەلامی تیلگرام قەوام ولسەلتەنەی بەناردنی سوپای ئێران بۆ کوردستان داوەتەوە.

سەبارەت بەوەرگرتنی تێلگرام قازی موحەمەد دەنوسێت کە کۆنترۆڵ کردنی هەڵبژاردن بەپێی یاسای هەڵبژاردن، دەبێ لەئەستۆی ئەنجومەنی هەرێمیدا بێت.

بەقەوامدا کەهەڵبژاردن لەکوردستان لەبارودۆخێکی ئازادو دیموکراتیدا بەڕێوە دەچێ. ئەو رایگەیاند کەناردنی سوپای ئێران بۆ ناوچە کوردنشینەکان هیچ پێویست ناکات لەبەرئەوەی دەبێت هۆی دووپات کردنەوەی رووداوەکانی هەڵبژاردنی دەورەی چواردەمینی مەجلیس، سەرەڕای ئەوە ئامادەبوونی سوپا دەبێتە هۆی سوکایەتی کردن بەکورد*.

ئەو رازی نەبونە بێ کەڵك بو، چونکە پیلانەو رێك خراوە، نەخشەیەو سازکراوە، ئەبێت دوا هەنگاو وەکو ئەوانی تر بنرێت و ئامانجی رژێمی شاو ئیمپریالیزمی ئەمریکاو بریتانیا بەدی بهێنرێت بۆ داگیرکردنی کوردستان و ئازەربایجان...

لەبەر بەهێزی کۆماری ئازەربایجان.. دیار بو تاران وای دانابو کە پێشەکی ئەبێت پەلاماری ئەو بدرێت... بالێرەدا(هێمن) هاوکارو هاوژینی تەمەنی کۆمارو یاوەری پێشەوا ساتەکانی روخانی کۆمار بابزانین پێش کارەسات چۆن باسی ئازەربایجان مان بۆ باس دەکات:

"ئازەربایجان حکومەتێکی گەورەترو بەهێزترو زۆر تەیارترو پڕچەك تر بو لەکوردستان، خەتی دیفاعی ئازەربیجانیش زۆر قایم تر بو، زیاتر لەوە حساب بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەتیش دەکرا کە پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ ئەو بەشەی تری ئازەربایجان. کەوابو کەم کەس بەخەیاڵیدا دەهات لەڕێگای ئازەربایجانەوە پەلامار بۆ سەر جوڵانەوەی رزگاریخوازی گەلانی ئێران بهێنرێ...

ماوەیەك بو بۆ ئەوەی کارەکانی حیزب باشتر رابپەڕن پاش ئەوەی شەوانە پێشەوا کە زۆر شەو تادرەنگ لەدەفتەری حیزبدا دەماوە دەچوە ماڵی خۆی، کادرێکی حیزبی لەدەفتەری حیزبدا دەماوە بۆ ئەوەی راپۆرتی خوارەوە ئەگەر پێویست بو بەپێشەوا رابگەیەنێ و دەستوراتی پێشەوا بۆ خوارەوە بنێری. ئەو شەوێ نۆرەی منی تازە زاوا بوو...

لەدەفتەری حیزب دانیشتبومو خەریکی نوسینی مەقالەیەك بوم بۆ"کوردستان" ئەفەسەرێکی بچوك..هاتە ژور... دەستی بۆ رادیۆکەی سەرمیزەکە برد...لەپڕ شتێکی وامان گوێ لێ بو کەوەختا بو پێمان بەعەرزەوە وشك بێ.

---

* ئەفراسیاو هەورامی، هەمان سەرچاوە، گۆڤاری گزینگ، ژمارە25-1998.

رادیو تاران تەلگرافی پیرۆزبایی دوکتور جاوید وەزیری ناوخۆی ئازەربایجانی دەخوێندەوە کەبەبۆنەی گەڕانەوەی ئەرتەشی شاهەنشاهی بۆ تارانی ناردبو. دوایە خەبەری راکردنی "موتەجاسرین"ی راگەیاند... دەس بەجی بەتەلیفون ئەو خەبەرەم بەپێشەوا راگەیاند... ئازەربایجانی واتەیارو پڕ چەك لەشکری سازو پەرداخ و فەرماندە لێزانەکانیەوە بو وا زوو تەسلیم بوو؟ کارامەو شۆڕشگێرو کۆنە پیاوو ئازاو رابەرەکانی تری ئازەر بایجان بو وا بەپەلە رایان کرد؟ پرسیارێکە کەس بەتەواوی جوابی نەداوەتەوەو منیش جوابم بۆ نادرێتەوە..."(22)

عەلائەدین سەجادی روخانی کۆماری ئازەربایجان و وازهێنانی لێپرسراوەکان و مەیدان چۆڵ کردن وا باس ئەکات:

"بەجۆرێکی کوتوپڕی لەشەوی (11ی کانونی یەکەمی 1946)دا لەناکاو-بەلاغێکی لیژنەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان-دەرچو کەئەبێ شەڕکردن لەگەڵ حکومەتی "ئێران" بوەستێنرێ و ئیتر جەنگیان لەگەڵ نەکرێ..."(23)

ئەی هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت؟ ئەی ئەگەر پشتگیری ئازەربایجان نەکات و نەیەتە پێشەوە، ئەگەر یارمەتی بۆ نەنێرێت و هەڕەشەی دەستێوەردان نەکات... ئەی ئەبێ چی بکات...؟

"دوای روخانی خەتی بەرگری ئازەربایجان لە(میانە)کە ژەنەراڵ غلام یحیی دانشیان سەرکردایەتی ئەکرد وەلە 12ی کانونی یەکەمدا هێزەکانی ئێران چونە ئەو شارۆچکەیەوە، وادیار بوو سۆڤیەت زانیان کەهەوڵدان بۆ هێشتنەوەی رژێمی ئازەربایجان لەو پلەیەدا روداوێکە دەست تێوەردان ناهێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا دوا هەوڵی دیپلۆماسیانەی دا. لە13ی کانونی دووەمدا سەفیری سۆڤیەت داوای کرد چاوی بەمحمد رەزا شا بکەوێت بۆ ئەوەی ئاگاداری بکات کە حکومەتی سۆڤیەت ناتوانی سەبر بگرێت بەرامبەر رووداوو ئاژاوەکان لەسەر سنوری بەڵام شا نەی هێشت لەسەر قسەکەی بەردەوام بێت، بەپیشان دانی بروسکەی (جاوید) کەتەسلیم بونی تیا دەرئەخات، قسەکەی پێ بڕی، وادیار بو سەفیر هیچ ئاگاداری گورانی هەڵوێست بەو جۆرە نەبو، بۆیە بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات بەوڕی ئەو شوێنەی بەجێ هێشت..."(24)

هەرچی چۆنێك بێت دوای وردەشەڕ کەهیچ کاریان نەکردە سەر ڕووداوەکان، و بۆپێشەوەچونی هێزی تاران.... تەوریز داگیرکراو کۆماری ئازەربایجان روخێنرا، لێپرسراوان زۆربەیان هەڵهاتن‌و مەیدانیان چۆڵکرد... جەماوەریش کەوتە بەردەستی هێزەکانی رژێمی شا، گرتن‌و کوشتن‌و لەسێدارەدان‌و رااوروت دەستی پێ کرد... لەناو ئەو کارەساتەی گەلی ئازەربایجان تێیدا دەژیا...بابێینەوە مەهابادو بزانین چۆن سەرکردایەتی ئەم هەواڵە وەرئەگرێ... وبزانین بەرامبەر بەو مەترسیە چی ئەکات‌و چۆن هەنگاو ئەنێت؟ بابگەڕێینەوە لای(هێمن)تا ساتەکانی ئەو رووداوە... یا ئەو هەرەس هێنانەمان بۆ بخاتە پێش چاو، دوای وەرگرتنی ئەو هەواڵەی رادیۆی تاران... هێمن ئەڵێت:

"دەسبەجێ بەتیلیفوون ئەو خەبەرەم بەپێشەوا راگەیاند گوتی بۆ خۆت وەرە ئێرەو بەئەوانی تریش رابگەیەنە بێنە ئێرە. بەدوای ئەوانم دا ناردو بۆ خۆم چوم بۆ مالی پێشەوا. سەدری قازی برای پێشەوا کەنوێنەری مەجلیس بوو لەتاران‌و بەڕواڵەت نەدەبو لەو واقیعە بترسێ، لە هەمو کەس پتر شەڵەژابو. ئەو دەسبەجێ گەراوە بۆ تاران....

بەلی کوتوپڕ تەوریز گیراوەو کوردستانیش لەهەمو لاوە گەمارۆ درا. پاش ئەوەی سەدری قازی، نازانم بۆچی بەرەو تاران گەراوە، رابەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەمالی پێشەوا کۆبونەوەو ئەو شەوی رووحیەی هەمو کەس دەتوانم بڵێم باش بو. شورای جەنگ بەسەرۆکایەتی حاجی بابە شێخ پێك هات‌و سورەت جەلەسەی یەکەم ئیمزا کراو قەراری بەربەرەکانی درا. بەلام هێشتا مەرەکەبی بڕیار نامەکە وشك نەبووە کەخەبەر هات یەکێك لەئەندامانی ئەو شورایە رای کردووە بۆ بەیانی وەزع گۆڕاو بڕیاری بەربەرەکانی هەڵوەشایەوەو بۆ پێشمەرگە دەستور درا بێ دەستکردنەوە پاشەکشە بکاو رێگا بۆ ئەرتەش بەتاڵ بکاو خەڵك دەستێکی کەوتە ئەولای‌و یەکێکی کەوتە ئەم لای.

پێشمەرگە لەجەبهەی سەقزو سەردەشتەوە بەرێکوپێکی پاشەکشەی کرد. بەلام فیداییەکان کەفەرماندەکانیان رایان کردبو وەك مەری بێشوان بلاوبون.. فەرماندەی ئەرتەش بێ هیچ زەحمەت گەیشتە گوندی حەمامیان‌و پێشەوا لەوێ دیتی. لەو

ماوەدا من هەمیشە لەگەڵ پیشەوادا بوم. دیارە لەگەڵی نەچومە حەمامیان. بەڵام لەشاری بەجێم نەهێشت.

دەم دیت پەشۆکا بو. بەڵام نەك لەترسان، بەڵکە لەداخان و لەبەر ناهومێدی...

ڕۆژی 26ی سەرماوەرزی1325-1946 ئەرتەشی شرۆشپرێوی شاهەنشاهی تەواو ساڵە وەختێك پاش هەڵکردنی ئاڵای کوردستان شاری مەهابادی گرتەوە..."(25)

مەهاباد بەوجۆرە گیراو کۆماربەو شێوەیە، بێ شەڕو بەربەرەکانی کەوت، کێ چاوەڕوان بو ڕوداوەکان بەو جۆرە بن. بەبیری کێدا دەهات سوپاو چەکدارو دامو دەستگاو لێپرسراوان بەو جۆرە مەیدان چۆڵ بکەن بێ ئەوەی جارێ شەڕو پەلامار دەست پێبکات و توانا تاقی بکرێتەوە. دوای بڕیاردانی بەرگری... کێ بڕیاری شەڕ نەکردن و بڵاوەپێکردنیداو بۆچی؟ لەڕاستیدا نەمانی کۆماری ئازەربایجان، بێدەنگی یەکێتی سۆڤیەت و هەڵنەدانی لەسەرئازەربایجان.. بونەهۆی ورەبەردان و دەست بەرداربون لەکۆمار. ئەمانە هۆن، بەڵام هەمو هۆو نهێنییەك نین.. هەر چەندە لەو کاتانەشدا ژمارەیەك لەلێپرسراوو سەرکردەکان کەوتنە چالاکی و هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەرکردەکانی تر بۆ دروست کردنی هێزی بەربەرەکانی، بەڵام بێ سودو ئەنجام بو.. چەند هەوڵیش درا لەگەڵ پێشەوا بۆ ئەوەی خۆی بەدەستەوە نەدات بەڵام بێکەڵك بو.. بۆچی؟ سەبارەت بەچی وازوو هەروا بەئاسانی ڕێگەی خۆبەدەستەوەدانی گرت و چوە بەردەستی دوژمن، سەبارەت بەچی پێشەوا ئەو هەنگاوەی نا...؟

"بۆ خۆم لێم بیست گوتی لەسەرمانەوە ناچن و دەمانکوژن، بەڵام پێم خۆش نیە گەلەکەم بەجێ بێڵم و دەمەوێ لەناو ئەواندا بمرم..."(26)

مەسەلەی ڕوخانی کۆمار پەیوەندیی بەهۆ یاکێشەیەکی دیاری کراوەوە نەبووە بەڵکو کۆمەڵێك هۆی خۆیی و دەرەکی...ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەوریان لەو ڕوخانەدا بینی، هەر وەك لەشوێنی خۆیدا باسیان ئەکەین.

دوای ئەوە تاران هەناسەیەکی ئارامی دایەوە، وەکو نەخشەیان بۆ دانا بەئەنجام گەیشتن، هەردوو کۆمارە میللییەکە لەناوبراو ناوچەکانیان داگیرکردەوە، بابزانین بەڵێن و پەیمانەکانی قوام ولسەڵتەنە، هەنگاوە دیموکراتیەکان، هەڵبژاردنی ئازادو سەربەستانە، پەیمانەکەی نەوت و دوستایەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، بابزانین ئەوانە چییان لێبەسەرهات...؟

## کوردستانی ئێران دوای روخاندنی جەمهوریەت

دوای ئەوەی مەهاباد داگیرکراو تاران لەمەترسی ئازادیو پایەگای شۆڕشگێڕی رزگاری بو... هێزەکانی ئەرتەشی کەوتنە بەکارهێنانی ئاگرو ئاسن، بێ ئەوەی شەڕنەکردنو خۆبەدەستەوە دانی پێشەواو زۆر لەسەرکردەکان ببنە هۆی کەمکردنەوەی توندوتیژیو زوڵمو زۆر.. لەمەهابادو شارەکانی تر دەست کرا بەسڕینەوەی شوێنەواری کۆمارو گرتنو راونانی نیشتمانپەروەران، حوکمی عورفی دانرا، هەزاران نیشتمانپەروەر دەربەدەرکران، سەدانی تر دران بەدادگای عەسکەری، بڕیاری خنکاندنی پیشەواو سەیفی قازیو سەدری قازی دراو لە 31 ئازاری 1947دا لەمەیدانی چوارچرادا لەسێدارەدران... دادگاییکردنی پێشەوا رووداوێکی گرنگە لەمێژوی کورددا بۆیە لێرەدا بەدرێژی باس لەو روداوەو وردەکارییەکانی ئەکەین.

* * *

# پاری دووهەم

## لەسەرەککۆمارییەوە بۆ ناوزیندانی داگیرکەر

ئەو هۆوگیروگرفتو کۆسپانەی کۆمارەکەی کوردستانیان رووخاند زۆر بوون، باسکردنو چوونە ناو درێژەی رووداوەکان لەبەشێکی تردا دەیخوێنینەوە، لێرەشدا بەمەبەستی وێنەگیرییەکی روونی سەردەمەکە، بەچڕی، ئامارژە بۆ هۆ گرنگەکان دەکەین، تا جگە لەمەسەلەی رووخاندنەکە، لەدیاردەیەکی‌تری زۆر هەستیار بگەین، کەخۆیەدەستەوەدانی سەرەککۆماری کوردستان پێشەوا قازی محەممەد بوو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەهۆیەکی تری رووخاندنەکە دادەنرێ. زیاتر لەوە بۆ تێگەیشتن لەتەواوی دیاردەکە، دەشبێ لەبیرو بۆچوون، هەڵوێستو هەستو نەست، بیروباوەڕو بۆچوونەکانو ئاکارە گرنگەکانی قازی محەممەدو شەخسیەتی شارەزا بین، وەك هەندێکی لەپێشەوە دەرخرا، بۆ تەواوکردنی مەبەستەکانی دروستکردنی وێنەیەکی نزیك لەواقیعی سەردەمەکە، لەگەڵ هۆکارەکانی روخاندن، دەبێ لەو رووداو و کێشەو ئەو گرفتانەی لەڕۆژانی پێش رووخاندن، بەتایبەتی لەدوای رووخانی ئازەربایجان سەریان هەڵدا، بگەینو شارەزایان بین بەتایبەتی لە:

-ناکامڵیی هەلومەرجی دامەزراندنی کۆمارو ناڕەسیوویی زەمینەکەی.

-کێشەو گرێو گۆڵی ناوخۆ، گیروگرفتە سەربازیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو کولتورییەکان، لاوازیی هەستی نەتەوەییو هۆشیاریی سیاسی.. هتد.

-فرە دوژمن، جیاوازیی نێوان توانای ئابووریو سەربازی کۆمارو بەرامبەرەکەی، رۆڵی خراپی زلهێزەکان لەیارمەتیدانی رژێمی شا، رۆڵی ناحەزو دوژمنانەی ئەمەریکاو ئینگلیزەکان.

-نەبوونی دۆستی ستراتیجی.

-رۆڵی خراپی یەکێتیی سۆڤیەت، بەتایبەتی دوای مۆرکردنی پەیمانی نەوت لەگەڵ تاراندا(1)

-کشانەوەی لەشکری سوور بێ ئەوەی لایەنی کەمی یارمەتی کۆماربدات، تەنانەت ئەو تۆپانەی درابوون بەکۆماری ئازەربایجان وەرگیرانەوە، دەگوترێ کە ئامۆژگاری هەردوو کۆمار کرا کەڕێگە لەئەرتەش نەگرن... هەڵوێستەکە وا نیشان درا

کە سۆڤیەت یارییەکەی تەواو بوو، بۆیە بەرژەوەندی هەردوو کۆمارەکەی خستە لاوە، چونکە ئیتر پێویستی بەگوشار خستنەسەر تاران نەما. زیاتر لەوانە:

لە11ی دیسامبەری 1946دا ئازەربایجان رووخا، رووخانێکی کتوپڕی وا کە بوو بە بوومەلەرزەیەکی گەورەی سیاسیی رووخێنەر، سەرانی کۆمارەکە هەڵهاتن، خەڵکی تەورێزو دەوربەری کەوتنە بەردەم هێرشی ئەرتەش، شەڕو ئاژاوەو کوشتن و بڕین و تالانی و تۆڵەسەندن هەموو شوێنێکی کۆماری ئازەربایجانی گرتەوە رووداوەکان زۆر قەبەرتردەکران و دەگەیشتنەوە مەهاباد، ئەوانەش زیاتر لێپرسراوانی کوردی دەخستە بەردەم بیرکردنەوە لەهەمان دیاردەو هەڕەشە.

ئەو رووخاندنە، بەو ئاسانییە، کۆماری کوردستانی خستەناو بازنەیەکی بێ دەربازگە.

دەڵێن هاشمۆف ئاگاداری نمایندانی کوردی کردووە کەهێزێکی بچووکی ئەرتەش بۆ سەرپەرشتی هەڵبژاردنی مەجلس دێت و پاشان دەگەڕێتەوە.. رەنگە ئەمەش هەر لەهەمان هەڵوێستی رووسەکانەوە بووبێ کەکاتی خۆی پاش هێرشەکەی ڕەزمارا بەهێزێکی زۆرەوە بۆ سەربەرزاییەکانی مامەشا کەهێزێکی زۆر بچووکی کۆماری لێ بوو و سەرەنجام بەسەرکەوتنی رەزمارا کۆتایی هات، ئیتر لێپرسراوانی سەربازی کۆمار کەوتنە سەر دانانی نەخشەی پێشکەوتن تابتوانن سنەش رزگار بکەن... بەڵام هاشمۆف، کۆنسولی سۆڤیەتی لەورمێ، لەدێی سەرا چاوی بەپێشەوا کەوت و ئاگاداری کرد کەهێرش نەکرێتە سەر ئەرتەش چونکە ڕەنگە شەڕی گەورە دروست ببێت و ئەوانیش ناتوانن کۆمەکی کۆمار بکەن...(2)

دوای ڕووخانی کۆماری ئازەربایجانیش:

-ئەو تیرەو هۆزە کوردانەی هەر لەگەڵ ڕژێمدا بوون کەوتنە جموجۆڵ و هەڕەشە.

-هەر زوو پێش ئەم ڕووداوانە، بەهۆی ناکۆکی خێڵەکی و ناڕەزایی لەسیاسەتی گفتوگۆ، -وەك لەبەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێ، جەنراڵ حەمە ڕەشیدخان کۆماری بەجێهێشت و چووە عێراقەوە.

-جەنراڵ عومەرخانی شەریفی، سەرۆکی ئێلی شکاك، خۆی لەکێوەکانی "زیندەشت"گۆشەگیرکردبوو.

-زۆر سەرەك خێڵی تر چاویان لەو کردو دانیشتن.

-هەندێکی تر کەوتنە هاوکاریی ئەرتەش‌و ئامادەبوون بۆ هێرش بردنەسەر دیموکرات.

-سەرلەشکر همایونی هێزێکی لەمەنگوڕو مامەش‌و دیبوکری کەبەشێکیان هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ تاران بوون، ئامادەو پڕ چەك کرد.

هەر دوای کۆبوونەوەکەی مزگەوتی عەباس ئاغا کەتیایا بڕیاری دامەزراندنی شوورای بەرگری‌و بەرەنگارکردنی ئەرتەش درا:

-میرزا ڕەحمەتی شافعی، شێخ حەسەنی شەمسی بورهان، عەلی ئاغای ئەمیر عەشایەری‌و هی تریش خۆیاندا بەدەست ئەرتەشەوە.

-مەلا عەبدوڵلای مودەڕیسی‌و مەلا حوسەینی مەجدی کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەندو باوی بێسوودی بەربەرەکانی‌و شەڕی ئەرتەش.

-هەندێ لەدەوڵەمەندو مەلای مزگەوتی مەهاباد وەلایان بۆ ئەرتەش برد.

بەو جۆرە شڵەژاوی، ئاژاوە، بڕوا بەخۆنەمان، هەوڵی خۆڕزگارکردن بڵاودەبوونەوە، "ئەبولحەسەنی تەفرەشیانی" لایەکی ئەو تراجیدیاو سەر لێشێواویەی رووبەڕووی کۆمارو پێشەوا ببووەوە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە. ئەو دەڵێ: کاتێ نامەیەکی سەرهەنگ عزت، سەرۆکی ستادی مەلا مستەفا بەدەستم گەیشت(مەبەستی عزەت عەبدولعەزیزە) کەهەواڵی ڕاکردنی پێشەوەری پێدەگەیەنێ، دەچێت بۆ لای تا پرسیاری ڕووداوەکانی لێ بکات...

ئەو پێی گوتم: ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ڕێبەرانی فیرقەی دیموکرات هەموویان هەڵاتوون‌و ئیتر شتێك بەناوی فیرقەوە نەماوە... ئەرتەشی ئێرانیش هەر لەو دوو سێ ڕۆژانەدا تەواوی ئازەربایجان داگیر دەکا، جا ئێستا خۆتان بڕیار بدەن! خێڵی بارزان لێرە مالیکی نییە کەبەرگری لێبکا، ئێمە لەڕاستیدا لەهەوادا ماوینەوە، ئێوەش ئێستا وەزعێکی ئاواتان هەیە ناتوانن خۆتان بگەییننە تەورێز، دژی شۆڕش لەڕێگادا هەر نەبێ بۆ وەرگرتنی چەکەکەنتان ئێوە وەبەر گوللە دەدا، ئەگەر بەسەلامەتیش بگەنە تەورێز لەوێ ڕوون نییە چتان بەسەردێ، تەنیا ئەرکی ئێوەو ئێمە لەکاتی ئێستادا پاراستنی گیانی خۆمانە، جا بۆ خۆتان بڕیار بدەن بزانن چ دەکەن، ئێمە بەرەو مەهاباد پاشەکشە دەکەین. ئەگەر ئێوەش پێتان خۆشە دەگەڵ ئێمە وەرن... هتد.

دوای ئەوەی ناوبراو بەسێ ڕۆژ دەگاتەوە مەهابادو لەوێ ویستوویەتی پیشەوا ببینێ، پێیان گوتوە کە چوە بۆ میاندواو تا پێشوازی لەئەرتەش بکات، ئینجا سەیفی قازی دەبینێ و دەڵێ: ئەو گوتی: ئێمە بۆ خۆشمان نازانین چ کارەین، بەڵام بەبیروباوەڕی من مانەوەی ئێوە لەمەهاباد مەسڵەحەت نییە، چونکە هەردەم لەوانەیە ئەرتەش بێتە مەهابادەوە"(3)

زیاتر لەوانە:

لە 15دیسامبەر ئەسەدۆف نمانیدەی بازرگانی ڕووسەکان، مەهاباد بەجێ دەهێڵێ و خۆی دەگەیەنێتە ورمێ.

سەرهەنگ غەفاری هەر ڕۆژێك دوای هەرەسی ئازەربایجان بەهێزێکەوە دەگاتە بۆکان، عەشایەری ناوچەکە کەوتنە پەیوەندیو ئامادەبوونی خزمەت بۆ ڕژێم...

هێمنی شاعیر لەباسی ڕۆژگارەکەدا دەڵێ:

لەو ماوەیەدا من هەمیشە لەگەڵ پێشەوا بووم، دیارە لەگەڵی نەچوومە حەمامیان" بەڵام لەشاری بەجێم نەهێشت دەمدیت پەشۆکا بوو بەڵام نەك لەترسان، بەڵکوو لەداخان، لەبەر ناهومێدی...(4)

ئیتر بارو دۆخەکە بەو جۆرە شڵەقا بو، ڕووخاندن لەئارادا بوو، بێهیوایی، ترسی گەڕانەوەی ئەرتەش و ترسیی کوشتن و بڕین، هەڕەشەی عەشایەرو تالانی و تۆڵەسەندن، ڕووداوەکانی تەوریزو دەوروبەری... هەمووساتێك لەبەرچاودا لەبیرو کردارو چاوەڕوانیدا هۆش و گۆشی داگیرکردبوون. کورت و پوخت قاسملو واتەنی:

"پێشەوا هیچ هیوایەکی بەتێکۆشان یایارمەتی هێزە دیموکراتیەکانی ئێران نەمابوو... پێشەوا قازی هاتبووە سەر ئەو بڕوایە کەکۆماری کوردستان توانای بەربەرەکانی بەرامبەر بەدەوڵەتی مەرکەزی نییە، بۆیە تەنیا مەبەستێکی کەپێشەوا قازی پەرۆشی بوو ڕزگارکردنی خەڵکی مەهابادو دانیشتووانی قەڵەمڕەوی کۆماری کوردستان لەکوشت و کوشتار بوو.(5)

"لەناو ئەو مەترسییانەو ئەو بێهواییەدا، هیچ لەبەردەم پێشەواوادا نەمابوو جێبەجێکردنی بەڵێنەکەی نەبێ، بۆیە لە 16ی دیسامبەردا بەتەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ همایونی کرد، دوای تەلەفۆن لەگەڵ حاجی بابە شێخ ی سەرەك وەزیران و سەیفی قازی وەزیری جەنگ دەچنە حەمامیان و خۆیان دەدەن بەدەست ئەرتەشەوە...

دوای قسەکردنی لەگەڵ همایونی، پێیان دەڵێ کەبگەڕێنەوە مەهاباد، بەو جۆرە هەم کوردان هێمن دەکاتەوەو هەم مەترسی بارزانییەکان و ئەو عەشایەرانەی تا ئەو کاتە ملیان بۆ ئەرتەش نەدابوو، دوور دەخاتەوە.

کە پێشەوا دەگەڕێتەوە مەهاباد، بارزانی خۆی دەگەیەنێتێ و چاوی پێی دەکەوێ، تا وای لێبکات مەهاباد چۆڵ بکات و خۆی نەدات بەدەستەوە، هەمان ئەو قسەیەی کەلەو چەند رۆژەدادەیگوت و هەر وەك بەهەندێ لەسەرکردەکانی حیزبیشی گوتبو، کاتێ باسی پاشەکشە بۆ سۆڤیەت یا بۆعیراقی لەگەڵ دەکەن، دەڵێ:

دەزانم ژیانم دەکەوێتە مەترسییەوە بەڵام قەیدی نییە، خەڵك بەجێ ناهێڵم.. لەباسی ژیانیشیدا، باسی ئەوەکرا بو کە پێشەوا پاش هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە، بڕیاری خۆی ئەدا، ئیتر دوای ئەوە نەیدەگۆڕی" ئەو بڕیارەش ئاسایی نەبوو لەدایکبوی ئەو ساتە نەبوو، بۆیە دەبوو خۆشی لەپێناودا دابنێ. تەنانەت هەروەك کوڕی ڕەش لەزمانی"مینا خانمی" دایکیەوە دەگێڕێتەوە کەلەڕۆژانی کۆتاییدا:

–دەوڵەتی شورەوی وتی ئامادەن هەتا گەسکی ماڵیشت بۆ هەڵگرین و هەموو شتێکت بۆبار بکەین.

–قونسوڵی ئینگلیز لەتەورێز داوای کرد بێتە عیراق و لەڕێی عیراقەوە بچێتە ئینگلستان.

–ئەمەریکایی‌یەکانیش چاویان بەقازی محەممەد کەوتبو داوایان لێکردبوو ببێتە پەنابەر لەدەرەوە.(6)

بەڵام هیچیانی قەبووڵ نەکرد لەڕاستیدا لۆجیکی رەوتی رووداوەکان نیشانەی پرسیار لەبەردەم ئەو سێ هەڵوێستەی ئەو سێ زلهێزە دادەنێت، ئەگەر راست بن.

بەم جۆرە دواڕۆژی‌کۆمار– رۆژی کارەساتی نەتەوایەتی‌ورمانی کۆمار هاتەبەردەم.

ئەوەبوو لەڕۆژی 17ی دیسامبەری1946دا دوای ئەوەی سەرەککۆمارو دەستەیەك لەبەرپرسیاران و هاوبەشانی کۆمار لە"کوکتەپە" پێشوازی ئەرتەشی رژێمی تارانیان کرد، لەو ڕۆژەدا جارێکی تر عەجەم مەهابادی داگیرکردەوەو کۆتایی بەسەردەمێکی کورتی ئازادی، بەڵام نەمرو هەمیشە لەیادا، هێنا. سیمبۆلی ئازادی و سەربەخۆیی کورد بەدەستی دوژمن هەرەسی پێهێنرا، نەك "ئاشبەتاڵ" وەك هەندێ لەنووسەرانی کورد وای ناو لێدەنێن.(7)

چونکە بەکارهێنانی "زاراوەیەکی وا لەتراجیدیاوکارەساتێکی نەتەوایەتی وا گەورە، رەنگە هەر درشتیی بیرکردنەوە یا دژەکرداری لەدەستچوونەکەی کۆمارو، مەزنەی ئەگەر پێشەوا خۆی بەدەستەوە نەدایە وا ڕەنگ بوو ڕووداوەکان ڕەوتیان بەجۆرێکی تر بکردایەو، وەبووبێ، ئەگینا لەپرۆسەیەکی مێژوویی وا مەزن و نەمردا، دەبێ: "ئاشەوان، ئاش، باراش. خاوەنباراش کێ بن. ئەگەر هەر ناوێك لەگەڵ سەرکردە. شۆڕش، جەماوەرو پێشمەرگەو شەهیدان وەئامانج و دروشمەکان جووت بکرێت، وا دەزانرێ چی سووکایەتییەك دەبێ بۆ ئەو ناوە پیرۆزانە، تەنانەت ئەگەر دوژمنەکە یا دۆستە" دوژمنەکەش بخرێتە سەریان وا دیسان هیچ لەمەسەلە ناگۆڕێ، دیارە ئەمەش بۆ خۆی باسێکی گرنگەو لێرەدا مەودای ئەوە نییە درێژەی پێ بدرێ.

## پێشەوای گەل لەبەردەم مەحکەمەی "بدوی سحرایی"دا

دوای داگیرکردنەوەی مەهاباد، ئەرتەش کەوتە سەروکاری سڕینەوەی شوێنەواری کۆمار، ئەفسەران زۆر بەپەلە بوون بۆ گرتن و لەسێدارەدانی قازییەکان.

بۆیە همایونی و ئەفسەرانی بەرپرسیار لەناوچەکە کۆبوونەوەیەکیان کرد تیایا گەلێ بڕیاریاندا...لەوانە:

-ڕاونانی بارزانییەکان.

-چەککردنی هەموو عەشایر.

-گرتنی ئاژاوەچی و موتەجاسرین.(8)

هەرچەند شای ئێران لێبووردنی گشتی بڵاوکردەوە، بەڵام ئەوەی مەبەستیان بووایە نەیدەگرتەوە. سەرتیپ "همایونی"یش وەك سیمبۆلی ڕژێمی تاران لەمێژووی شکاندنی گفت و بەڵێن و پەیمان. هەر بەوەوە نەوەستا "تەئمینی جانی"یەکەی خۆی باسی کردبوو:" بەرلەوەی قازی محەمەدو سەرانی تری حکومەتی کوردستان بچن بۆ لای گفتی(تەئمینی جانی) پێدابوون(9) بخاتە ناو تورەکەی بێبەڵێنی و شکاندنی پەیمان، لە 21ی دیسامبەردا پێشەواو سەیفی قازی و دەیان تێکۆشەرو لەدواییشدا، گەیاندنەوەی سەدری قازی لەتارانەوە بۆ مەهابدا بەحەپسی، لەزیندان توندکران، دادگای سازکرا.

رایگەیاند کەهەر کەسە سکاڵا و بەڵگەی لەدژی بەندییەکان هەیە راگەیەنی"(10)

بەلام "ڕووداوەكان ڕەوتى خۆيان بەهێمنى پێوا، هيچ كارەسات و دژەكردەوەيەكى لەم چەشنە نەقەوما."(11)

(ديارە كەمەبەستى لەڕووداوەكانى ئازەربايجانە) مەحكەمەى بدوى سحرايى بەسەرۆكايەتى (سەرهەنگ پارس تبار)و دادوەرى گشتى (سەرهەنگ فيوزى) دەستى بەكارى خۆى كرد. "تاوانەكان" زۆر بوون: دامەزراندنى جەمهوريەت و بوونە سەرۆكى، بەرزكردنەوەى ئالاى سێ ڕەنگى كوردستان، بەرگى جەنرالى پۆشين، گۆڕينى ئالاى ئێران و لابردنى نيشانى شێرو خورشيد، كوشتنى ئەفسەرو سەربازانى ئەرتەش، كۆبوونەوەو قسەكردن لەگەڵ بێگانەو چوونە باكۆ، بەلێنى ئيمتيازى نەوت بەڕووسەكان...هتد.

بەڵگەش سەرجەمى ڕۆژنامەو بلاوكراوەو وتارو ديدەنى و ئەو نامەو وێنانە بوون كە كەوتبوونە دەستيان.

پێشەوا قازى محەممەد هەر زوو ڕوونى كردەوە كە ئەم دادگايە ناياساييەو دەسەلاتى ئەوەى نييە موحاكەمەيان بكات، چونكە سەربازييەو ئەمان سڤيلن، لەڕووى "پارێزەر"و "ماوە" ناياساين، بەلام گوێ لەو قسانە نەگيرا... نەخشەيەو دانراوە... مەحكەمەى بدوى سحرايى دەبێ حوكمى خۆى بەسەر قازييەكاندا بدات، ئيتر ياساو بەرگرى و پارێزەر ڕۆڵيان نامێنێ. بۆيە لە 23ى جانيوەرى 1947دا بڕيارى لەسێدارەدانى هەر سێ سەركردەكەى كورد درا.

بەئومێدى ئەوەى لەتاران موحاكەمە بكرێنەوە، داواى چاوپياخشاندنەوەو دادگاى "تەميز"يان كرد، چونكە پێشەواو هاوڕێكانى وايان مەزەنە كردبوو كەئەگەر لەوێ بدرێنە مەحكەمە لەئيعدام ڕزگار دەبن.

مەحكەمەى تەميزى سەربازى بەسەرۆكايەتى (سەرهەنگ عطائى)و دادوەرى گشتى (سرهنگ نكوزاد)و پارێزەران: (ملازم صلح جو)و( ملازم نبوى) لە 28ى مارسى ئەو ساڵەدا دەستى كرد بەمەحكەمەكردنەوەى پێشەواو هاوڕێكانى. دادوەرى گشتى "تاوانەكانى خوێندەوە، هەمان كۆنەكان و "تاوان"ى نوێش: ڕاپەڕينى چەكدارانەى دژ بەدەوڵەتى مەركەزى، بەسووكى ڕوانينە حكومەتى مەركەزى، سووتاندنى ماڵى فەرمانبەرانى دەوڵەت.

## پێشەوا لەدوو مەحکەمەدا

پێشەوا بەرامبەر تاوانەکان ئازاو لێزانانە لەهەردوو جارەکەدا بەرگری لەخۆیو هاوڕێکانی دەکرد، چەندین سەعات لەسەر قسە بەردەوام بووە: "گوتبووی:.. سەرچاوەو وەڕۆحهێنەری ئەمن لەم کارە، نیشتمانو نەتەوەکەم بووە. هەرچییەکی ئەتانەوێ لەگەڵ مندا بیکەن، بەلام نەتەوەکەم ئازار مەدەن. لەو کاتانەشا هەوڵی ئازادکردنی زیندانییەکانی تری داوە:"کاتێ کە چووم بۆ سەردانی پێشەوا کە سەرهنگ (پارسی تباری)دێت پێی دەڵێت:" بۆ ئەو خەڵکە لەخۆڕا گیراوە، ئەوانە هیچیان نەکردوە. ئەگەر کەسێك هەبێ مەسئولو بەرپرس بێ هەر منم."(12)

چیرۆکی مەحاکەمەکردنی پێشەواو هەردوو هاوڕێکەی هەرچەندە کورتو بەچەند ڕۆژێ ئەنجام درا، بەلام سەیرو مێژوویی و بێوێنە بووە. دەنگوباسەکانی لەناو ئەرشیفەکانی ئەرتەشدا زیندانی کراون، کەمێکی لەسەر زاری ئەفسەرەکانو هەر ئەوەش کەئەوەی مەبەستیان بووە بلاو کراوەتەوە، سەرچاوەیەکی تر، سەروان (پەروێزیو شەریفی) بوە کە خۆیان ئاگاداری ڕووداوەکانی مەحکەمەکە بوون.

ڕۆژێك سەروان شەریفی دەچێتە مالی خێزانی قازییەکان بەدلپڕییەوە وتوویەتی:"حەیف بۆ قازی محەممەد، بۆ ئەو پیاوە مەزنو ژیرو زانایە، دوێنێ لەکاتی مەحکەمەدا بەبێ کاغەز 4سەعات وتاریدا بەزانستو مەنتیقی خۆیەوە هەمووانی حەیران کردبو... لەهەموو کەس باشتر قانوونەکانی ئێرانی دەزانی لەهەموو کەسێك باشتر شارەزا بوو لەوەزعی سیاسی ئێرانو هەندەران.. لەڕاستەقینەدا قازی بوو کە مەحکەمەی مەحاکەمە دەکرد... دەڵێن هەر لەسەر ئەوەش بوە ناوبراو لەئەرتەش دەرکراوە بەلێسەندنەوەی هەموو دەرەجەکانی"(13)

دیسان (نجفقلی پسیان)و( سولیمان ح)وە ئەرشیفی سۆڤیەتی ڕووخاو (...کەمێ لەڕووداوو بەسەرهاتەکانی باس دەکەنو دەنووسن:" لەمەحکەمەدا قازی محەممەد پەلاماری بردە سەر سیاسەتو ئاکاری دەوڵەتی تارانو ئەیگوت من لەو قوژبنەی گرتوخانەوە دەنگی خۆم بەرز ئەکەمەوە لەدژی دەوڵەتی تارانو سەرۆکەکانیو ئەڵێم

تاوانبـار ئێـوەن نـەك ئێمـە... ئێـوەن كـە وەڵاتتـان لێ داگـیركردوینو هێرشـتان هێناوەتە سەرمان.

"لەجیاتی ئەمەی كە ئێوە بگیردرێنو مەحاكەمـە بكرێـنو، هـاتون لـەماڵی خـۆم ئەمنتان گرتووەو لەگرتوخانەتان هاویشتووم... تەواو ئەم بەسـەرهاتەی كەڕووی‌داوە ئەنجامی سیاسەتی داگیركەرانەی دەوڵەتە... ئەگەر دەوڵەت تەواو كوردان بـەخاین دەزانی دەست لەو مەڵبەندە هەڵگریو ئەگەر بەنیشتمانپەروەریشیان حیساب دەكات بابهێڵن بۆ خۆیان كاروباری خۆیان بگرنە دەست خۆیانەوە."

قازی محەممـەد لەتـەواوی ڕێـڕەوی مەحكەمەكـەدا زۆر بەجەسارەتو نەترسـیو سـەربەرزی وتـاری ئـەداو جـارێك نـەدیترا سـەری داخـاو پەشـیمانی لـەكردەوەی خۆی بكات.(14)

ئـەو هەڵوێسـتانەو ئـەو قسـەلۆجیكی یاسـاییانە، مەحكەمـەو سـەركردایەتیی ئەرتەشی نیگەران كردبوو، بەردەوام ئەفسەرانی لێپرسراو بەبێسیم لەگـەڵ مـەهاباددا بوون. پەلەیان بوو لـەدەركردنی بڕیارو جێبەجێكردنی، لای ئەوان هـەمووی دەزانـرا، تەنـها ئـەو بۆیـە یاسایەی گـەرەك بـوو. تـا لـە 30ی مارسـدا حوكمەكـە بەلەسـێدارەدان جێگـیر كـرا. هـەر كەسـەرانی ئەرتـەش بڕیارەكـەیان پێگەیشـت، بەپەلـە ئاگـاداری مـەهابادیان كـرد كەلـەماوەی 24 سـەعاتدا بڕیارەكـە جێبـەجێ بكـەن، چونكـە زۆری پێنەدەویست لەسەر بڕیاری "اعلی حزرت" شای ئێران بوەستن.

## ساتەكانی نێوان بڕیارو جێبەجێكردن

"بێگومانە كە موحاكەمـەكردنی سـەركردەكانی جەمهوریـیەتی كوردستان سـەرنج ڕاكێشـەرترینو نـامۆترین موحاكەمـەی سیاسـی بـوو كەلـەمێژووی نوێـی ئـێراندا بێوێنە بووە."

"جعفر مهدی نیا"ی تاراندۆست بـەو جـۆرە پێناسـەی موحاكەمەكـەی پێشـەواو هاوڕێكانی دەكا.

لەڕاستیشـدا، سـاتەكانی نێـوان بڕیـارو جێبـەجێكردن، خـودی جێبەكردنەكـە، پڕبـوون لـەڕووداوی سەرنجڕاكێشـەرو دەگمـەن، بگـرە نـامۆتر لەموحاكەمەكـە، هیـچ گومانیشـی تێدا نـەبوو كەخوڵقێنـەری ئەوانـە، هـەردوو لای سـەر شـانۆ سیاسـییەكە

بوون، لای یەکەم: پێشەواو هاوڕێکانی کەلەمەڵبەندی نیشتمان و نەتەوەپەروەری، ویژدان و یاساو دادوەری، خاوەن گفت و بەڵێن و ڕاستگۆیی، ئارام و ئاسایش و ئازادیخوان، مرۆڤدۆست و زوڵملێکراو، نیشتمان و ماف زەوتکراوەوە ڕەفتاریان دەکرد. لای دووەمیش: ڕژێمی تاران و سەرانی، کەتەواو بەپێچەوانەوە بوون.

بالێرەدا، کورت و پوخت، چەند نموونەیەك لەو ڕاستییانە بخەینە پێش چاو:

ڕۆژنامەی "جهان پاك" دوای بڵاوبوونەوەی بڕیارەکە نووسیبووی: "قازی محمدو سیفی قازی و صدری قازی کە بەاعدام محکوم کران اعلی حزرت بۆ دلنوایی کوردەکان عفوی کردبوون."(15)

ئەو درۆیەی ڕۆژنامەکە سەرچاوەکەی سەرەك وەزیران و شای ئێران بوو.کاتێ سەدری قازی پێش گرتنەکەی، خۆی دەگەیەنێتە تاران، تا قوام ببینێ بەڵکە بەڵێن و وادەکانی وەبیر بێت، هەموو داواکەی دێتە سەر ئەوە کەکارێ بکات بەڵکو نەنێردرێتەوە مەهاباد، چونکە لەوێ ئیعدام دەکرێ.

قوامیش دەڵێ:" دەزانیت کەگوشاری سەربازەکان زۆرە، ئەگەر تۆ نەچیتەوە مەهاباد وا خراپ تێدەگەن کە من پەیوەندیم بەفیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە هەیە، باشتر وایە تۆ بگەڕێیتەوە مەهاباد تا منیش لێرە بەکاری ئازادکردنی ئێوە هەستم."(16) ئەوە لەکاتێکدا سەرەك وەزیران دەیزانی چی دەکرێ و چۆن ڕووداوەکان دەخوڵقێنرێن، هەر خۆشی دەیزانی لەو ساتانەشدا چاوەڕوانیان دەکرد کەسەدر بێتە دەرێ و بیگرن.

با لەسەرەك وەزیرانەوە بچینە لای شاو بزانین ئەم چۆن گفت و بەڵێنی خۆی دەخاتە ناو توورەکە مێژووییەکەی ئەو نەریتە نەفرەتلێکراوەوە.

ئارچی رۆزڤیلت ئەفسەری موخابەراتی لەسەفارەتی ئەمریکا لەتاران لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ:

"چارەنووسی قازی محەممەد زۆری نەخایاند. هەرسێك قازییەکان لەمەهاباد، لە 23ی جانوەری، لە مەحکەمەیەکی عەسکەری ئاشکرادا محاکەمە کران و حوکمی ئیعدامیان درا. لەگەڵ ئەوەشەدا، جێبەجێکردنی حوکمەکان لەلایەن تارانەوە دواخرا، لەبەرئەوەی کە پێخۆش نەبون لەڕاستەی جەنگەی وتووێژی ناسك لەتەك شوورەوییەکاندا لەمپەرو تەگەرەی بێتە سەر ڕێ ئەو درێژە بەقسەکانی ئەدات:

ماوەیەکی کورت بەر لەوەی لەفیبریوەری 1947دا تاران بەجێبهێڵم، ژنرال رەزمارا چوو بوو بۆ مەهاباد، ئەمن وای بۆ چووم کەمەبەستی لەو سەفەرە بۆ چاودێریی ئیعدام کردنی برایانی قازی بێ. جا بۆیە ئەمن بەپەلە خۆم گەیاندە لای سەفیر "جورج ئاڵێن" بۆ ئەوەی بزانم ئەو لەم بارەیەوە چی لەدەست دێ.

جورج ئالێن پێی گوتم:" ئەتۆ بۆچی ئەوەندە بەتەنگ چارەنووسی قازییەکانەوەی؟ دەبێ لەبیرمان نەچێ کە ئەوان لەتەك شوورەوییەکاندا هاوکارییان دەکرد." ئەمن وەڵامم دایەوە:"ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەوان لەبناوانەوە ناسیونالیست بون وە بۆ باشترکردنی وەزعی گەلی خۆیان ئەوەی لەدەستیان بهاتبا دەیان کرد، ئەگەر ئەوان ئیعدام بکرێن، لەچاوی کوردە ناسیونالیستەکاندا لەهەموو شوێنێکدا ئێمە وەك بەشێك لەم دڕندەییە دادەنرێین."

"باشە، ئەتۆ دەڵێی ئەمن لەم بارەیەوە چی بکەم؟"

"من پێم وایە ئەتۆ دەبێ داوا لەشا بکەیت کەفەرمان بدا بە "رزمارا" بۆ ئەوەی قازییەکان بهێنرێن بۆ تاران و لە دادگایەکی عادیلانەو کراوەدا محاکەمە بکرێن."

لەسەر ویستی سەفیر، دەستبەجێ کاتی پێدرا کەچاوی بەخاوەن شکۆ حەمە رەزا شا بکەوێت، لەم دیدەنییەدا شا هیوای دەربڕی کەدادگا عەشیرەتییەکان باشتر بەڕێوە بچن وە لەمانە محاکەمەی کوردەکان. پاشان ئاڵێن بەشای گوتبو، ئەگەر چی قازییەکان هاوکارییان لەگەڵ شوورەوییەکاندا کردووە، بەڵام ئەوان کارێکی زۆریشیان بۆ بەرەو پێشبردنی خوێندەواری و پەروەردە کردوە، شا قسەکەی پێ دەبڕێ و بەبزەیەکەوە دەڵێ:

"لەوە دەترسێی فەرمانی تیرباران کردنیان بدەم"."چ ترسی وات نەبێ ئەمن نایان کوژم."

لە31ی مارسدا قازییەکان لەشەبەقی بەیاندا بەفەرمانی "خاوەن شکۆ شاهەنشا" لەدار دران.

مرۆڤ بەم ئاکامە دەگا کەلەوانەیە هەر دوای ئەوەی کەسەفیرەکەی ئێمە چۆتە دەرەوەو دەرگای لەسەر گاڵە دراوە، فەرمانی ئیعدام کردنی قازییەکانی ناردبێ.(17)

## بەرەو سێدارەو وەسیەتنامەی پێشەوا

ڕووداوەکـان بـەو جـۆرە گوزەریـان پـێدەکرا. کۆمـار ڕووخێـنرا، مـەهاباد داگیرکرایەوە، ناوچەکـە خرایـەوە نـاو زیندانـە گەورەکـە، پێشـەواو سـەدرو سـەیف چاوەڕوانی ئەنجامدانی بڕیاری مەحکەمە دەکەن، نەیاندەزانی کـەی و چۆن ! جار جار تروسکایی هیوا وەك بروسکەیەك لەناو بیرە ژاکاوەکاندا گوزەری دەکرد، بیرو گیانیـان شـەکەتی نـاو مەحکەمـەو هەڵمـەتی هـۆش و لـەش بـوون لـەدژەکرداری دەرپەڕاندنی ڕەستەی "کوردی سەگ سیفەت" بەڕووی پێشەوادا، جارێ مەرەکەبی بڕیـار وشـك نـەبوو بـوو نـەیاندەزانی ئـەو شـەوەی 30ئـازاری 1947، هـەر ئـەو ڕۆژە، شەوەزەنگی ئەو ڕۆژە، دوا شەوی ژیانی دەبێت و لەڕووەو بەرەبەیانی ڕۆژی 31ی ئەو مانگـەدا، کـاتێك خـەڵکی مـەهاباد لەشیرینەی خـەودا دەبـن ژیـانی سـەرکردەکانیان کۆتایی پێدەهێنن. لەپڕ بەو نیوەشەوە یەکێك خۆی کرد بەژووری زیندانەکـەیاندا: خۆتان ئامادە بکەن، چونکە دەوڵەت بڕیاری داوە بنێردرێن بۆ تاران. ئەم هەواڵە کە هەمیشە بیری داگیرکردبوون، بۆ ئەو ساتە وەك مژدەی سەرفرازی وا بوو بۆ ئەوان. کەوتنە ئەملاو ئەولای یەکتری ماچ کردن، داوایان کرد ڕێگەیان بدەن داوای پول بکەن بۆ خەرجی، وەرام درانەوە کە دەوڵەت بەوە هەڵدەستێ.

پێشـەوا ئامـادە بـوو، برایـەدەرەوە، سـواری لۆرییـەکی پـڕ لەچـەکدار کـرا، گوایـا دەبرێ تا کەمە لێکۆڵینەوەو ڕێکخستنی پێویستی سەفەر سازبکرێ، لەبەر بینایـەکی چەند دەرگا لەگۆشەیەکی چوارچرادا، دابەزێنرا. بۆ خانووەکە برا، ڕووەو ژوورێکـی ڕووناك. کە کرا بەژووردا، ئیتر تێگەیشت کە لەدواساتیشدا درۆیـان لەگـەڵ کـرا."مەلا صدیـق صدقـی" لـە پشـت مـێزێك کـە قورئـانێکی لەسـەر دانرابـوو، سـەرۆکی تەندروسـتی،و سـەرهەنگ نکـوزادو هـی تریـش ئامـادە بـوون. نکـوزاد، بڕیارەکـەی مەحکەمەی خوێندەوەو گوتی: بڕیاریشە کە دەبێ هەر ئێستا حوکمەکە ئەنجام بدرێ، بۆیە هەر داواو وەسییەتێکت هەیە بینووسە.

لەسـەر وەسـیەتنامەکەی پێشـەوا، چـەن ڕیوایـەتێك بـاس دەکـەن. لەمـەڕ هـەندێ لەناوەڕۆکی "جعفر مهدی نیـا" و "روزنامـەی مـرد امـروز" نووسـیوویانە کەبەشـێك لەوەسیەتەکە: تـەرخان کردنـی بەشـێ لەسـامانی بـۆ دروسـت کردنـی قوتابخانـەو

نەخۆشخانە بۆ خەڵکی کورد لەمەهاباد تەرخان بکرێ،کوردی نەسیحەت کرد بەیەکێتی و شتی لەو بابەتانە.

هەرچی دوکتۆر ڕەحیمی قازی هەیە دەڵێ: بەگوێرەی وێژراوی ئەفسەرەکان قازی محەممەد دوو وەسیەتنامە ئەنووسێت، یەکیان لەمەڕ ماڵ و منداڵ و ئەوەی تریش لەمەڕ مەسەلەی سیاسی. ئەمەی کەلەمەڕ ماڵ و منداڵە ئەیدەن بەخێزانی قازی، بەلام ئەوی دیکەیان نەدابوو ئێستاش مەعلوم نەبوو کە قازی لەوێدا چی نووسیبوو. لە وەسیەتنامەکەی لەمەڕ ماڵ و منداڵ کەڕوونووسەکەی بەدەستی ئێمەوەیە چەند دێڕێکی مەبەستی سیاسیی تێدایە کەوا لەژێرەوە هەرچۆنێکی کەنووسیویەتی ئەیخەینە پێش چاوی خوێندەواران:"...بەو هەموو هۆیەوە کەلەئیختیاری مندا بو ئەگەر شەڕم کردبا ڕەنگ بوو تێ نەشکێین، بەڵام بۆ ئەمەی کەمەهاباد وێران نەبێت و بۆ خاتری تێدانەچوونی خەڵك شەڕمان نەکرد.

بەو هەموو ماشێن و هەلانەی کەلەئیختیارمدا هەبوو ئەمتوانی لەمەهاباد هەڵێم و دوو جاریش لەوتارەکانی خۆمدا بەخەڵکی مەهابادم گوت، ئەمن دەمزانی ئەگەر هەڵێم ئێرەش وەکوو تەورێزی لێدەهات و توشی کوشتارو تاڵان و بڕۆ دەبو. ئەمن بەخەڵکم ڕاگەیاند کە، ڕەنگە بمگرن و بشمکوژن، بەڵام بۆ ئەمەی ناموسی خەڵکی بپارێزدرێت و تاڵان نەکرێت هەڵنایەم و خۆم بەقوربانی ئێوە دەکەم. ئەوا ئەمن بەعەهدی خۆم وەفا نەکەم و تائێستاش لەمێژوودا نەدیتراوە کەسێك فیداکارییەکی وای کردبێت. هەڵبەت لەسەر ئێوەش پێویستە نیسبەت بەخزم و کەس و کاری من وەفادار بن و تۆڵەی منیش بستێننەوە.(18)*

*دوای بڵاوکردنەوەی وەسیەتنامەکەی پێشەوا کەلەشوێنی خۆیدا دەقەکەی دەبینیت، وادەردەکەوێت کەهەر ئەوە تەنها وەسیەتنامە بێت... پێشم وایە قسەکانی تری بەدەر لەم وەسیەتنامەیە، ئەسلێکیان نەبێت...چونکە پێش ئەوەی لەساتی جێبەجێکردنی حوکمەکە ئاگادار بکرێن، ڕێی تێناچێت هیچ نامە یا وەسیەتنامەیەك نوسرابێت... لەکاتی نوسینی ئەو وەسیتەتنامەیەشدا بەکات و بەشێوەی نوسینی ئەو وەسیەتەدا هەر ئەو بۆچونە دەسەلمێنن.

لەدواییدا کاتی جێبەجێکردنی ڕێوشوێنی ئیسلامەتی بۆ خۆ ئامادەکردنی مردن هات. ئینجا لەو دەرگای لەسەر مەیدانی چوارچرادا بوو هێنرایە دەرێ، ڕاستەوخۆ

چاوی بەهەرسێ سێدارەکان کەوت، گوتی : سێدارە لەئیسلامدا مەکروهەو گوللەبارانم بکەن. وەرامیان: بڕیار هەر سێدارییەو دەبێ هەر وا بکرێ.

لەسەعات سێ و دە دەقیقەی ڕووەو بەیانیی 31 مارسی 1947لاشەی پێشەوای نەتەوەی کورد بەسێدارەوە شۆڕبووەوە، دوای سێ و چوار دەقیقەیەك گیانی نەمری ڕوەو بەهەشتی ئەزەلی هەڵفری، ناوی پیرۆزیشی بەنەمری و مێژووی پڕ لەشانازیی بۆ کورد مایەوە.

بەهەمان ڕێگەو شوێن سەیفی قازی بەرەو سێدارە بەڕێ کرا، هەر کەپێی نایە ئەم دیو دەرگای سەر زەوی چوار چراو لاشەی پێشەوای بینی کەوتە پەلامارو نەعرەتە.... وەك شێر هاواری دەکرد: بژی پێشەوای کورد، بژی سەربەخۆیی میللەتی کورد. دەگوترێ زۆر لەو دەوروپشتە، لەنەعرەتەی سەیف وەخەبەر هاتن. دوای پەتی سێدارە لەمل کردن و بەردانەوەی، پەت دەپچڕێ...

بەڵام زۆردار بەوەش وازیان لێنەهێنا، سەریان خستەوە سەر سێدارەو ئەویش بەگیان و ناوو شانازییەوە ڕێوشوێنی پێشەوای هەڵگرت.

سەدری قازیش بەوجۆرەی ئەوانی لەگەڵ کراو بەهەمان شێوە لەسێدارە دراو ناوو مێژووی ژیانی بەشانازییەوە بۆ کورد بەجێهێشت و گەیشتە ناو کاروانی شەهیدان.

دوای ئەو تراجیدیا پڕ لەنەهامەتی و ڕوخان و لەسێدارەدانانە، دەمێنێتەوە سەر پرسیارێك کە ئارچی ڕۆزڤیلت لەکۆتایی باسەکەی لەسەر مەهاباد بۆ ئایندەی کوردی بەجێی هێشتبوو دەڵێ: دەبێ داهاتو ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کەئایا لەشوێنێکدا کەخەڵکەکەی مریدو لایەنگری ڕێبەرانی مەزهەبی و سەرۆك عەشیرەتەکان و ناسیونالیزم بۆیان دیاردەیەکی نەناسراوە، جوڵانەوەی کوردی شتێکی پراکیتك و گونجاوە...؟(19)

پرسیارێکی تەواو گونجاوە لەگەڵ سەرەنجامی یەك لەدوای یەکی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد. بەڵام کام جووڵانەوە؟ یان کام شێوەو ڕێبازی خەبات؟ چونکە هیچ گومان لەوەدا نییە کەئەو بارودۆخە خراپەی کوردی تیا قەتیسکراوە، بەبێ بوونی کورد خۆی، بێ خواست و ویست و خەبات و دورشم و ئامانجی خۆی، بۆ خۆی، گۆڕان نایەتە ئاراوە. بۆیە ئەم بوون و جووڵانەوەیە بۆ ئەو گۆڕانەی کە دەبێ کورد بگوێزێتەوە بۆ مەڵبەندی ئازادی و سەفرازی و دەوڵەتی نەتەوایەتی خۆی، زۆر

پێویست و پراکتیکیشه، بەڵام چۆن و لەسەر چی ڕێبازو هەلومەرجێ؟ خۆ ئەگەر مەبەستیش لەوە جووڵانەوەی چەکدارو شۆڕشە، شێوەو ڕێبازی خەباتە وائێستا پاش ئەوەی پرسیارەکە لەسەر سەرەنجامی ڕووداوێك كراوه كه زیاتر لە(55)ساڵی بەسەردا تێپەڕیووەو تازه بەهەمان شێوەو بۆ هەمان مەبەست ڕووبەڕوومان ئەبێتەوە، لەبارودۆخی سەردەمدا پرسیارەکە پێویستی بەهەڵوێستەیەکی هۆشیارانه هەیە. سەبارەت بەو هەموو زیان و کارەساتانەی سەرەنجامی هەر یەك لەم جۆرە جووڵانەوانە بوون، دەبێ هێزە سیاسییەکانی کورد، لەناو لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی وردو بابەتی و زانستییانەی ڕابردوودا، بکەونە سەر ڕێبازی دانانی ستراتیجێکی یەکگرتوو بۆ جووڵانەوەی نیشتمانی کوردستان. بەرەخساندنی بەرەیەکی یەکگرتووی سەرتاسەری، بەتێکەیشتنی واقیعی هەر بەشە، گونجاندنی خەباتی پلەیی، دروشم و ئامانجی پلەیی لەگەڵ جووڵانەوەی سەرتاسەری و ستراتیجییەکەیدا. ئەمەیە کە دەبێ هێزە سیاسییەکانی کورد کاری بۆ بکەن و نەیەڵن لەوە زیاتر کات بەسەربچێ نەیەڵن لەوە زیاتر هێزو توانا بەهەدەر بڕوات، نەیەڵن لەوە زیاتر کورد تووشی زیان و کارەسات و شکستی و هەرەس ببێت. بەتایبەتی بۆ ئەمڕۆی کورد کە لەکوردستانی عیراقدا هەلێکی مێژوویی تری بۆ ڕەخسێنراوە، وا لەناو هەمان سەرچاوی بیری پرسیارەکەوە، کورد خۆی نەك دوژمنەکەی خەریکە لەناو شەڕی خۆکوژیدا وەڵامێکی پۆسەتیڤ دەداتە دەست پرسیارەکەی ئارچی روزفلت...

## وەسیەتنامەکەی پێشەوا

بۆ زیاتر ڕوناکیی خستنەسەر دواساتەکانی ژیانی پێشەوا قازی محەممەدو ئەو وەسییەتنامەیەی لەو دواساتانەی پێش لەسێدارەدانیدا نوسراوە، لێرەدا دەقی دەقە ئەسڵیەکەو تایپکراوی وەسیەتنامەکە دەخەینە پێش چاو....

این وصیتنامه، در دهم فروردین 1326 بحضور اینجاب محمد صدیق صدقی گفته اند:

یك پارچه یا دو پارچه قالی یاقالیچه سید رحیم پسر سیدجامی با اسبابهای منند، بدهید بخودش و او هم پولی به من مقروض است، اگر داد خوب و اگر نداد مختار است.

گندمی کەدر تثبیت بوده‌است و مال من است اگر دادند بگیرید.

موقعی کەمرا بازداشت کردند پنجهزارو دویست تومان در جیبم بوده، از من گرفتند ویکصدو پنجاه و سه تومان هم یك فقرەو دەهزار تومان هم سروان شریف بە نام حق الوکالە از عیال من گرفته ان را هم پس بگیرید.

معینی سه هزار تومان چیزی زیاد یا کم بەمن مقروض استو لو هم چیزی دادەاستو ساعت کەبەعنوان هدیه برای من اورده داخل دفتر شرکت کردەو من با شرکت طرف نبودەام.

سید سلام نمیدانم هشت هزار تومان یاچیزی کمتر طلب بر سرم دارد، هرچه خودش گفت به او بدهید.

تلفون را بردەاند تعقیب نمائید.

اتومبیلی که ازبابا شیخ گرفته اند انهم مال شخصی خودش است.

چهار جیب که بشخص خودم... ودر اختیار من بوده انها هم مال شخص خودم میباشند.

چون سروان شریف زحمت... در حدود سیصد تومانی به او بدهند.

اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخذ شدبه هر یك از سعید همایونو میرزا رحیم کەخدمت کردەاند یك هزار تومانو به محمد فیروزه خانم هم پانصد تومان بدهید.

خواهر خودم هستند غیر از اغلیان که بەاسم خودم ثبت شده، در همەو ترکه پدرم حق دارند، ایشان را راضی نمائید.

عیالم مادر بچەها وصی باشد اطفالها سرپرستی بکندو ملا عبدالله ناظر باشد.

مطبعه هم خودم خریده ام مال من است.

مام عزیز قرنی اقا کاری کەبر سرش امده به خیالش بەتحریك من بودەاست اگرچه بی خبرم، اما کاری بکنید که مرا ازاد نماید.

میرزا رحمت یادیگری هرچند از کشتن نجاتش دادم اگر از من چیزی در دل داشته باشد ازادم کند.

نوکرها که این مدت خدمت کردەاند زحمت با من کشیدەاند، نیکی به ایشان کردەو ایشان را راضی نمائید.

بعد از...چند هزار تومان برایم اسقاط وتهلیل نمائید.

شب 10-1-1326

*محمد قاضی* *امضاء*

شب 10/1/1326 *ملا صدیق صدقی و قاضی محمد.*

## هەندێ سەرنج و ڕوونکردنەوەلەسەر وەسیەتنامەکە:

1-ئەم سەنەدەی لێرەدا بڵاودەکرێتەوە وەسیێتنامەی پێشەوا قازی محەمەدە، کەبەخەتی مەلا صدیق لە شەوی 10-1-1326ی هەتاویدا(31-3-1947)، نیو سەعاتێك پێش شەهیدبوونی قازی نوسراوە پێشەوا بەردەوام ئیمزای خۆی بە"محمد قازی"نووسیوە.

مامۆستا مەلا صدیقی صدقی ڕۆحانییەکی زۆر بەڕێزی مەهابادی بووەو لەڕابوردوودا پێشنوێژو دەرسبێژی مزگەوتی هەباساغای مەهاباد بووە. لەشەوی لەداردرانی قازیدا بۆ وەسیێت کردنی قازیو یارانی، ئەویان هێناوە تا وەسیێتەکەیان یادداشت بکا.

ئەسڵی ئەم وەسیێتنامەیە لەلای "دۆکتۆر عەبدوڵلا ئەبریشەمی"یە. دۆکتۆر ئەبریشەمی پیاوێکی هەڵکەوتووی مەهابادە، زاوای قازی محەمەدەو ئێستا لەتاران دەژی. کاك سەعیدی هومایوون کە خوشکەزای قازییە، بۆ ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی چەند جێگەیەکی ئەو بەڵگەنامەیە یارمەتییان دام. زۆر سوپاس بۆ گەورەیی و پیاوەتیی هەردوولایان.

2-(گندمی کە در تپبیت است)، تپبیت (تەسبیت) ناوی جێگەیەکەو عەمباری دەغڵ و دان بووە.

3-معینی: محەمەد ئەمینی موعینی، وەزیری کیشوەر لەکابینەی کۆماری مەهاباددا.

4-(سید سلام نمیدام هشت هزار تومان)، سەیید سەلامی حوسەینی، ئەرباب(خاوەن)ی دێی سەوزی بووە.

5-بابا شێخ: جەنابی حاجی بابا شێخ؛ سەرۆك وەزیرانی حوکوومەتی مەهاباد.

6- لەدوو جێگەدا ناوی سەروان شەریف هاتووە، ئەم سەروان شەریفە ئەفسەرێك بووە لەپادگانی مەهاباد کەئەو سەردەمە لەلایەن حوکوومەتەوە وەك وەکیل(پارێزەر)ی بەزۆر دانراو(تسخیری) بۆ پێشەوا قازی دیاری کراوە، پیاوێکی بەڕێزو ڕاستگۆ بووە، پاشتر خاتوو مریەمی کاکاغازادەی خەڵکی مەهاباد بوو بەهاوسەری. زۆربەی ڕووداوەکان لەبارەی قازییەوەو کاروباری بەدادگادانی ئەوی بۆ خەڵکی مەهاباد گێڕابووەوەو ئاشکرا کردبوو.

7-(عیالم مادر بچەها... و ملا عبدالله)، مەبەست مەلا عەبدوڵلای مودەڕڕیسییە.

8-(اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخز شد بە هر یك از سعید همایون و میرزا رحیم... و بە محمد فیروزە خانم)، سەعیدی هومایوونی کەسایەتییەکی بەڕێزو خۆشەویستی مەهابادە(لەبنەماڵەی فەیزوڵلا بەگییە)و خوشکەزای پێشەوا قازی محەمەدە. میرزا ڕەحیم، میرزا ڕەحیمی جەوانمەردی قازییە.

محەمەدی فەیرووزەخانم کارمەندی ئیدارەی دوخخانییات(کارگێڕیی تووتن)ی مەهاباد بووە، تار ژەنێکی لێهاتوو بووەو پووڕزای قازی بووە.

9-میرزا ڕەحمەت: خودا لێ خۆشبوو میرزا ڕەحمەتی شافیعی، یەکێك بوو لەکەسایەتییە ناودارو دیارەکانی مەهاباد.

10- ئاغلیان: ناوی دێیەکە لەدەوروبەری مەهاباد.

با لێرەدا بگەڕێینەوە دواساتەکانی سیاسەتی ڕژێمی شا بەرامبەر بەکوردو بەڵێن و پەیمان و ڕووداوەکان...

بۆ زیاتر چاوترساندن و سەرکوتکردنی کۆمەڵانی خەڵك ڕژێمی شا چەندین تێکۆشەری تر بەخنکاندن حوکمدا لەوانە:

لە 7ی نیساندا، حمید مازوچی، ڕەسول نەغەدەیی، ملازم عبدالله ڕەوشن فیکر وەملازم محمد فاگمی لەمەهاباد کران بەسیدارەدا. هەر لەو ڕۆژەدا لەسەقز ئەمانەی خوارەوە لەسێدارە دران: شێخ حمە امین کەس نەزان، ئاغا صدیقی یازی بلاغی، علی ئاغای تەموتە، ئەحمەد خانی فاروقی، عەولاخانی فاروقی، حمە خانی فاروقی، ڕەسول ئاغای میرەدێ، حسین خانی کانی نیاز وە عبدالله مەتین.

وەلەبۆکان: علی بەگی شێرزاد، محمد بەگی دانشوەر، ئەحمەد خانی کەلتەگە، محمد خانی بابە خان بەگ وە محمود خانی تورکمان کەندی، کران بەپەتی سێدارەدا.(28)

سەرەڕای ئەوە بەدەیان لێپرسراوو سەرکردەی کۆمار لەزیندان توندکران و دەیانی تر خۆیان نەدا بەدەستەوەو ئێرانیان بەجێ هێشت یاخۆیان شاردەوە.. ئیتر چەوسانەوەو ئازاردان لەخراپترین شێوەدا دەستی پێکرد، گەلێکی شکاو، بەکاتیش بێت، بکەوێتە بەردەست دوژمنێکی کۆنەپەرستی خوێن ڕێژ، ئەبێت ژیانی چۆن بێت؟

سەرەك وەزیرانی ئێران- احمد قوام‌ولسەڵتەنە- ئەو دەورەی پێی سپێررا بو پێی هەستا، نەخشەکەی بەئەنجام گەیاند، ئەوسا فەرمانی پێ‌کرا کە ئیستقالەی خۆی و وەزارەتەکەی پێشکەش تەختی شا بکات و هەر خێرا جێ‌بەجێ‌ی کرد.

دوای ڕوخانی هەردو کۆمار، بەڵێنەکانی قوام لسەڵتەنەو پەرلەمان و سەربەستی دیموکراسی و مافی کرێکاران و ئازادی بیروڕاو چالاکی پارتی و ڕێکخراوەکان و نوێنەرانی تودە لەوەزارەت و تاد... چیان لێ بەسەر هات؟ ئەوانە وەکو هەڵم چوون بەئاسمانا و نەك هەر شوێنەواریان نەما، بەڵکو ڕژێمی تاران کەوتەقەلاچۆکردنی هەمو بیرودەنگ و داوایەکی ئازادی، سەر لەنوێ ستەم و زۆرداری سەرانسەری ئێرانی گرتەوە.

لەشوێنی خۆشیدایە، دوای ئەوانە، ئاورێك لەپەیمانەکەی نێوان سوڤیەت و ئێران بدەینەوەو بزانین کۆمپانیای هاوبەشی نەوت چی لێبەسەر هات:

"پاش ئەوەی حکومەتی قوام‌ولسەڵتەنە بەیارمەتی ئینگلیزو ئەمریکا لەجولانەوەی ڕزگاریخوازانەی ئازەربایجان و کوردستانی‌داو لەگۆمی خوێناو خۆڵدا نقومی کردن، ڕێکخراوەکانی حیزبی تودەو یەکێتیەکانی کرێکارانی لەناوبرد...

ئەوسا لەتشرینی یەکەمی ساڵی 1947دا پەیمانەکەی سۆڤیەتو ئێرانی خستەبەردەم پەرلەمان... پەرلەمانیش رەفزی کرد..."(29)

بەڵی نزیک روانینو دورکەوتنەوە لەتێگەیشتنی سروشتی رژێمو چینی دەسەڵاتدار... نەبونی بنچینەی زانست لەشیکردنەوەی سروشتی رژێمی تاران، دەرك نەکردن بەپیلانو نەخشەی دوژمنانە بەرامبەر دوو گەلی ئازادیخوازو دوو قەوارەی خودموختار... ئەبێت هەر ئەوە ئەنجامی بێت.

ئەگینا زۆر ئاشکرا بو کە رژێمی شا نۆکەری ئیمپریالیزمە، لەوەش ئاشکراتر ئەوە بو کەئیمپریالیزمی بەریتانیا هەر لە سەرەتای ساڵی 1920 وەبەهۆی (کۆمپانیای پیترولی سەروی ئێران) دەستی بەسەر نەوتی ئێراندا گرتبوو، ئیمپریالیزمی ئەمەریکاش هەر لەکۆتایی ساڵی 1921وە بەهۆی (کۆمپانیای ستاندارد اویل اوف نیوجرسی)یەوە هاوبەشی نەوتەکە بو... لەدوایشدا هەمو نەوتی ئێران کەوتە بەردەستیان، ئەی چۆن دەست بەرداری ئێرانو نەوتەکەی ئەبن، چۆن رێگە ئەدەن رژێمی تاران روو بکاتە لایەکی تر یان رێگەی ئازادی گەل بداتو جێگەیان پێ لێژ بکرێت؟ بێگومان سروشتی ئیمپریالیستیی ئەو دوو دەوڵەتە هەرگیز رێگە بەوانە نادەن، ئەوە راستیەکە زۆر لەمێژەوە ئاشکرایەو بیر لێکردنەوەی قوڵی ناوێت.

## پەراوێزو سەرچاوەکانی پاری یەکەمی بەشی هەشتەم

1-د. حسن محمد، مسأله النفط ومؤامرات الاستعمار في ايران ترجمة احمد عبدالکریم، طبعه بغداد-ص15و 16.

2-د. حسن محمد، هەمان سەرچاوە، ل15و16و 17.

3-سليم طه التكريتي، معركة النفط في ايران، بغداد 1951، ل 109ء 110و 111و 112.

4-علاءالدین سەجادی، شۆرشەکانی کوردو کوردو کۆماری عیراق بەغدا 1959، ل 304و305.

5-ب- ئەلوەندی، زنجیرە روداوێکی گرنگ... رۆژنامەی دەنگی کورد ژمارە 48ی ساڵی 1960.

6- ریدر بولارد سەرچاوەی ناوبراو، ل192و 193.

7-جورج لنشوفسكي- الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ج1ترجمة جعفر خياط، بغداد 1964 ص246ء 247.

8-هێمن سەرچاوەی ناوبراو، ل22.

9-علاءالدین سجادی، سەرچاوەی ناوبراو، ل287و 288و 289.

10-نامەیەکی دەست خەتی مصطفى خۆشناو بەئیمزای خۆی. بروانە مەحمود مەلا عزەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، بەرگی یەکەم-ستوکهولم 1992.

11-12- نامەیەکی تایپکراو. بروانە، مەحمودمەلا عزەت،هەمان سەرچاوە.

12- علاءالدین سەجادی، سەرچاوەی ناوبراو، ل 290 بەداخەوە کەهیچ سەرچاوەیەك بۆ ئەم پێکهاتنە دەستنیشان نەکراوە لەناو بەڵگەنامەکانی سەردەمەکەشدا شتێکی وا ناکەوێتە بەردەست کەباسی ئەو رێکەوتنە بکات، هەروەها بۆ رێکەوتنەکانی تریش کەعەلائەدین سەجادی باسیان دەکات و ژمارەیەکیان لێرەدا دەبینرێن.

13- ب. ئەلوەندی، زنجیرەی روداوێکی گرنگ.. رۆژنامەی دەنگی کورد ژمارەی 69ی ساڵی 1960 لەناو سەرجەمی ئەو بەڵگەنامەو رۆژنامانەی لەبەردەستدان، ئاماژە بۆ کارێکی لەم بابەتە نەکراوە...

14- زانا، بیرەوەری دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەمەهاباد، رۆژ نامەی خەبات ژمارە 413/ بەغدا/1960.

15- هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل26.

16- بەگشتی پێك هێنانی وەفدی هەردوولاو ناوەڕۆکی ئەو رێککەوتنە لەکتێبەکەی ئیگلتنەوە وەرگیراو، کەلەگەڵ ئەو دەقەی لەگۆڤاری هەڵاڵەدا بڵاوکراوەتەوە جۆرە جیاوازییەك لەنێوانیاندا هەیە، وەك لەجێگەیەکی تردا رووناکیی خراوەتە سەر.

17- Wiilliam Eagleton, op. Cit, p. 106

18- William Eagleton, Ibid.P. 106

19- علاءالدین سەجادی، سەرچاوەی ناوبراو، ل299.

20- علاءالدین سەجادی، هەمان سەرچاوە، ل308و 309.

21- علاءالدین سەجادی، هەمان سەرچاوە، ل 308.

22- هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل26و 27.

23- علاءالدین سجادی، سەرچاوەی ناوبراو، ل310و 311.

24- لەپەراوێزی کتێبەکەی ئیگلتن کە جەرجیس فتح الله وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی، ل 195.

25- هێمن سەرچاوەی ناوبراو، ل27و 28.

26- هێمن، هەمان سەرچاوە، ل28.

## پەراوێزو سەرچاوەکانی پاری دووهەمی
## بەشی هەشتەم

1- بۆ سەرنجدان لەدەقی پەیمانی نەوت، بڕوانە: مەحمودمەلا عززەت، ك.م.م. چاپی 1984و1986 ل159-162.

-سليم طه التكريتي، معركة النفط في ايران، بغداد، 1951 ص109-112

2- عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو.

3- ئەبولحەسەنی تەفرەشیان، پاشەکشەی بارزانییەکان لەکوردستانی ئێران، وەرگێڕ حەسەنی سەیف(قازی) 1987، ل 16و17. ئەو نووسینە بەشێکە لەکتێبی (قيام افسران خراسان) 1977، کەناوبراو نووسیویێتی، ئەم خۆی ئەفسەرێکی کۆماری ئازەربایجان بوو، لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی ترو دوو تۆپ نێرابوون بۆ کوردستان بۆبەهێزکردنی بەرەی جەنگ.

4- هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل27-28.

5-عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو، ل68-69.

6- کوردستانی نوێ، ژمارە 390، 1993/5/17.

7-عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو، ل61.

داخم ناچێت کە دکتۆریش یەکێکە لەوانەی کەئەو ناوەی بۆ ڕووخاندنەکەی کۆمار بەکارهێناوە، دیسان لەبەکارهێنانی هەمان "زاراوە"دا بۆ هەرەسی شۆڕشەکەی ئەیلول1961، لە 1975دا هەمان بۆچوون جێگەی خۆی دەگرێ.

8-احمد شریفی، عشایر بارزان، ل45.

9-نەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان، کورد لەگەمەی سۆڤیەتیدا، ئوتریخت1993، ل 265.

10-ئارچی ڕۆزڤیلت، ک.ک لەمەهاباد، ل 51.

11- ئارچی ڕۆزڤیلت، سەرچاوەی ناوبراو، ل52.

12-کوردستانی نوێ، ژمارە 390، 1993/5/17، "دیدەنی کوڕی ڕەش" دکتۆر ڕەحیمی قازی، سەرچاوەی ناوبراو، ل10-11.

13-دکتۆر ڕەحیمی قازی، سەرچاوەی ناوبراو، ل33، 34.

14-دکتۆر ڕەحیمی قازی، هەمان سەرچاوە، ل9-10. دکتۆر ئەو بڕگەیەی دوایی لەئارشیوی دەوڵەتی شوورەوی دەرهێناوە، بەڵام بەداخەوە ئاماژەی بۆ جۆری ئەرشیفەکەو ژمارەو شوێنی نەکردووە.

-بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو مەحکەمانە، بڕوانە ئەم سەرچاوانەی لەم باسەدا ناویان هاتووە.

15-بەکورتی هەڵکەوتی دیریکی لەڕۆژنامەکانەوە، وەرگێڕی حسین حزنی موکریانی. 3نشرەی دەنگی گیتی تازە 1947، چاپخانەی معارف، بەغدا، ل 3. لەڕۆژنامەی جهان پاك، ژمارە1، وەرگیراوە.

16- جعفر مهدی نیا، سەرچاوەی ناوبراو، ل544.

17-ئارچی ڕۆزڤیلتArchie Rooseult- For lust Of Knowing, memoirs Of an Intlligence Office, George Weiden feld+ Nicolson, limited, London-1988.P.287-288.

18-دکتۆر ڕەحیمی قازی، سەرچاوەی ناوبراو، ل 38، 39.

19- ئارچی ڕۆزڤیلت0ئارشی ڕۆزڤیلت) کۆماری کورد لەمەهاباد، ل 57.

**سەرنج:**

***لەدەقە وەرگیراوەکانی هەندێ سەرچاوەدا زۆر جار لەنێوان دوو وشە یان دوو ڕستەدا چەند نوختەیەك بەم جۆرە دانراوە... واتە لەو شوێنانەدا یان وشە یان ڕستەی تر هەیەو بەپێویستم نەزانیوە بنووسرێ، تکا لەخوێنەری بەڕێز دەکەم لەوە ئاگادار بێت.***

## بەشی نۆهەم

# بۆچی جەمهوریەتی کوردستان وابەئاسانیی روخێنرا..؟

1-ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستیی...

2-دامەزراندنی کۆمار لەسەر زەمینەیەکی پتەوو هەلومەرجی رەسیو نەبوو...

3-لاوازیی هەستو نەستی نەتەوەیی و کزیی هوشیاریی سیاسیی...

4-جێگیر نەبوونی خەباتی یەکگرتووی گەلانی ئێران و نەبوونی بەرنامەیەکی هاوبەش...

5-خۆبەدەستەوەدانی پێشەوا قازی محەمەدو هاورێکانی...

6-باش نەناسینی دۆستو دوژمن و زوو باوەڕکردن بەداگیرکەر...

7-ناکۆکی و ناتەبایی ناو ریزەکانی گەل..

8- مانەوەی رژێمی دەرەبەگی و سیستمی خێڵەکیی و دواکەوتوویی کۆمەڵگەی کوردستان...

9-لاسەنگیی لەچەك و نازوقەو تفاقی پێویستو لەروی ئابوریی و داهاتەوە.

10-سیاسەتی چەوتی یەکێتی سوڤیەت و کشانەوەی لەشکری سور لەئێران،

11-بەئاسانیی روخانی کۆماری ئازەربایجان.

12- سودوەرنەگرتن لەتوانایی ئابوریی و مرۆڤیی ناوچەکانی تری کوردستانی ئێران و هەموو بەشەکانی تری کوردستان.

جێگـەی جوگرافیـی کوردسـتان لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕسـتدا شـوێنێکی سـتراتیژیو جێگـەی سـەرنجو بایـەخو تـەماعی هـێزە هەرێمییـەکانو زلهێزەکـانی دنیـاش بـووە، سەبارەت بەداگیرکردنو دابەشکردنیشی باری جیۆپۆلیتیکو بارێکی جیۆستراتیجیی هەستیارو ئاڵۆزی بۆ خوڵقێنرا، کەکۆماری کوردستانیش دامـەزرێنرا سـنوورەکانی عـیراقو تورکیـا ئـاڵۆزتر بـوون، سنوریشـی لەگـەڵ کۆمـاری ئازەربایجـانی دۆسـتو هاوپەیمانیدا بێ کێشەو گرفت نەبوو. بەرەکانی رووبەڕووی ئەرتەشی رژێمی شا-ش بـەردەوام نائـارامو مەڵبـەندی هەڕەشـەو شـەڕو پێکـادانبوون، واتـە دوولای سـنوری بەهەڕەشـەی نـاو ململانێی دوو دوژمنـی ناسـەرەکییو سێهەمیشـی بەسـەر یەشـەو چوارهـەمیش بەهەڕەشـەی راسـتەوخۆی دوژمنـی سـەرەکییەوە گـیرابوون، هۆکـاری سـەرەکیی کەئـەو هێزانـەی یـەك پێدەگرێتـەوە مەسـەلەی کوردبوونـی پارچەیـەکی کوردستان بوو. سنوری جواگرافیش بۆ هەریەکەیانو ئایندەی کورد، وەك هەڕەشە سەیری دەکرا..

ئەوانـە، ئـەو هەڕەشـەو ئاڵۆزیانـە سـەرچاوەی خوڵقـاندنی هـۆو هۆکارەکـانی مەترسـییو روخـاندنی کۆمـار بـوون.. لەگەڵیشـیاندا رۆڵـی یـەکێتی سـوڤیەت لەدامـەزراندنیو جۆری مامەڵەو هەڵوێستیو کێشانەوەی لەشکری سورو رێکـەوتن لەسەر نەوت، لایەنێکی تری گرنگ بوون لەدیاردەی روخاندن...

بەگشتییو لەگەڵ ئەوانەدا هۆیەکانی شکستییو روخاندنی کۆماری کوردستان زۆرن، هـەندێکیان خۆیـیو ئـەوانی تریـان دەرەکـین، بـەدەر لەلێکدانـەوەو بۆچونـە کلاسیکییەکان کەهەمیشە هۆیە خۆییـەکان بەسـەرەکی دەرەکییـەکان بەناسـەرەکیی دانراون، لەم ئەزمونەی کۆماردا، هەر وەك لەئەزمونی حوکمدارییو مەلیکایەتییەکەی شـێخ مـەحمودی نـەمر لەباشـوری کوردسـتاندا، هۆیـە سـەرەکییەکان لـەخۆییو لەدەرەکیشدا خۆیان دەبیننەوە، بگرە هۆیە دەرەکییەکان کاریگـەرو بەتەئسیرتر بوون لەروخاندنەکەدا، لێرەدا ئاماژە بەگـەلێك لـەو هۆیـە سـەرەکییانە دەکـەین کەڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر روخانەکە هەبووە:

-1-

## ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستیی

بەرژەوەندییە ئابوریی و بازرگانییەکان، ستراتیجی زلهێزەکان و نەخشەیان بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچە جوگرافییە هەستیارەکاندا، سەقامگیرکردنی ناوچەی تامپۆن لەبەردەم هەڕەشە گەورەکاندا، بازاڕ دۆزینەوە، ململانێ لەسەر نەوت(1) سەرچاوەی کەرەسەی خاو بۆ پیشەسازیی.. ئەوانە هۆی سەرەکین لەنەخشەی دەوڵەتە سەرمایەدارو زلهێزەکانی دنیادا بۆ دەستبەسەراگرتن و داگیرکردنی ئەم وڵات و ئەو وڵات... کوردستان یەکێك بووە لەو ناوچە گرنگانەی گەلێك لەو بەرژەوەندییانەی ئەو زلهێزانەی تێدا بینراوە، یان چاوەڕوانکراو بوەو، هەر لەکۆنیشەوە مەیدانی ململانێ و شەڕو داگیرکردن و لەشکرکێشی بووە... لەدوای یەکەم جەنگی جیهانیش، ئەو بۆچوون و نەخشەو هەوڵانە بەرین و زیاتر بوون و زۆرانبازییەکان ئاشکراو توندوتیژ تربوون.. کاتێ بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردانیش سەری هەڵداوە، بەهۆی بارو دۆخە هەرێمییەکانەوە، بەهەڕەشەیەك بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان دانراوە، بۆیە راستەوخۆ بەرەنگاری بوون و لەدژی وەستاون و بونە هۆی سەرەکیی لەروخاندن و لەناوبردنی راپەڕین و شۆڕش و قەوارە ئازادەکان.

دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان، سەبارەت بەکات و شوێن و جۆری دامەزراندن و هۆیە راستەوخۆکان، بەهۆی ململانێی زلهێزەکان لەسەردەمێکی زۆر ناسك و جێگەی زۆر هەستیاردا، کەسەردەمی سەرەتای شەڕی سارد بوو، ئێرانی رووبەڕووی یەکێتی سوڤیەت کرد کەلەپشتیشیەوە هەردوو زلهێزی خۆرئاوا بریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو.... لەبەر ئەوانە ئەم کۆمارە کەوتە ناو بازنەی دژەکان، بەبەرژەوەندییەکانی ئەمریکاو ئینگلیزیشەوە، بۆیە کارێکی چاوەڕوانکراویش بوو کەڕاستەوخۆ پاڵپشتی رژێمی کۆنەپەرستی تاران بن، نەخشە لەدژی نەیارەکانی دابنێن و هەمووجۆرە یارمەتییەکی بدەن.. وەك نمونەیەك:

"سەفیری ئەمریکا لەتاران ج. الن لەگەڵ (رزمارا)ی سەرەك ئەرکانی گشتیی ئەرتەشی ئێران سەری لەبەرەکانی شەر ئەدا لەکوردستان..."

جگە لەوە:

"بەشەکانی لەشکری بریتانیا بەسەرکردایەتی (میجەر ئوکشادا سنردا) یارمەتیی دەسەڵاتی سەربازی ئێرانی ئەدا بۆ دامرکاندنەوەی جوڵانەوەی رزگاری خوازی کورد.."(2)

ئەوانەو یارمەتیی لۆجستیی و گوشار خستنە سەر روسەکان بۆ کێشانەوەی لەشکری سور، مانۆڤرە سیاسیی و سەربازییەکان، هەرەشە بەشەرێکی نوێ، نوێ دروستکردنی بۆمبی ئەتۆم لەلایەن ئەمریکاوە، ئەوانە پاڵپشتێکی گەورە بوون بۆ تاران کەراستەوخۆ لەدژی کۆمارەکەی کوردبن..

دەربارەی سیاسەتەکانی ئینگلیزو ئەمریکا لەدژی کورد، لێکدانەوەی حزبی دیموکراتی کوردستان لەسەردەمی خۆیدا بەم جۆرە بوو:

"ئینگلیزەکان بەتایبەتی لەوە دەترسان لەچەسپاندنی کۆماری کوردستان لەئێران تەئسیر بکاتە سەر کوردستانی عیراقیش کەسەرچاوەی نەوت بو، نەوتەکەش زیاتر بەدەست شیرکەتەکانی ئینگلیزەوە بو ئەمریکاییەکانیش هەم بەگشتی دژی پەرە ئەستاندنی رزگاریخوازیی بوون و هەم بونی بنکەیەکی دیموکراتی وەك کۆماری کوردستانیان لەئێران بەزیانی نفوزی خۆیان لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕستدا دەزانی، بێجگە لەوە شیرکەتەکانی نەوتی ئەمریکاییش لەنەوتی کوردستانی عیراقدا بەشداربوون. بۆیە ئەم دوو وڵاتە ئیمپریالیستە بەهەموو هێزیان رژێمیی کۆنەپەرستی ئێرانیان بۆ لەناوبردنی کۆماری کوردستان هانداو لەهەمو بارێکەوە دراوو چەك و موستەشار یارمەتیان پێکرد...(3)

## -2-

## دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان لەسەر زەمینەیەکی پتەوو هەلومەرجی ڕەسیوو ڕەخسیو نەبوو

دامەزراندنی کۆمار لەناو پرۆسەیەکی وادا نەبوو کەزەمینە بۆ کارێکی وا گەورە خۆش بکرێت، هەلومەرجەکان بەسازاویی بێنەئاراوە، بارودۆخەکان بەو جۆرە لەدژی دامەزراندنی کۆمار نەبن.

هەرچەندە کاری باش‌و چاوێنی‌و هەنگاوی لەبارو بەسوود نرا، بەڵام ئەو دیاردانە ڕێگەی گۆڕانی رادیکاڵ‌و بنەڕەتییەکی ئەوتۆیان نەئەدا کەپایەگەکانی سەقامگیرکردنی قەوارەکە بینابکرێن‌و کۆمار لەدیفاکتۆیەکی تەمەن کورتەوە بکرێتە دیژۆرێکی وا کەلەخەمی روخان‌و بەردەم هەڕەشەکان ڕاوەستاوو خۆگربێت...

لەسەر رۆڵی سەرکردایەتییەکەو ئاستی تواناکانی خەمڵاندن‌و چەسپاندنی ئەزمونەکە، لەنرخاندنی ئەو سەرکردایەتییە حزبی دیموکرات لەکۆنگرە سێهەمێدا دەڵێت:

"کزی سەرکردایەتی حیزب‌و نەبونی رێکخراوێکی رێك‌و پێك‌و بەدیسپلینی حیزبی، نزم بونی تێگەیشتن‌و بێ ئەزمونی زۆربەی بەڕێوەبەران‌و کادرەکانی حیزب لەکارەساتی پاشەکشەی جولانەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بەتەواوی دەرکەوت. حیزبی شورشگێڕ ئەوحیزبەیە کەلەوەختی شکستدا بتوانێ بەرێك‌و پێکی پاشەکشە بکات، خۆی نەدۆڕێنێ..."(4)

بۆیە پێکهاتەی کۆمەڵگەی قەڵەمڕەوەکەی کۆمار لەڕوی کۆمەڵایەتی‌و چینایەتی‌و هوشیاریی سیاسیی‌و رۆڵی جەماوەر،گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا نەهات، تاڕادەیەکی زۆر پێوەندییە خێڵەکی‌و دەرەبەگییەکان وەك جاران مابوونەوە، ئەرکە قورسەکان لەسەر شانی جوتیاران‌و خەڵکی زەحمەتکێش بوون.. بالەمەدا بزانین یەکێك لەسەرکردە سەربازییەکان چیی بۆ تۆمار کردوین، ئەفسەری بەتواناو یاریدەدەری سەر لکی چواری هێزەکەی کوردی عیراق لەنامەیەکیدا بۆ فەرماندەکەی کەجەنڕاڵ حەمە ڕەشید خان فەرماندە هێزی بۆکاو مەنتیقە بوو، ئاوا دەنوسێت:

نامەی ژمارە( 58 )

نامەی محەممەد عەلی ئاغا زادە(وەهاب ئاغای جندیانی)

325-2-21

گەورەم جنابی آغای محمد رشید خان

عرض وتقدیم

دەستتان ماچ دەکەم واحوالی شریفتان دەپرسم و ایمەش باشین بلام گەورەم ئەو ظلمەی کەمن لەدی آلتونی سەرو دەکەم تاایستا عجم نەیکردوو ئەگەر وایە فرق لەبەینی منو امنیە چیە؟ صد خوزگەم بەامنیە.

1-ئەم دیە 10 مالە چواریان دایکی هەتیون.

2-لەو روژەوە کەهاتومە ایرە اهالی ئیرە نەماستو نەدویان خواردوە...

3-پیاوەکانیان یان نان بو پوست دەبن یان داردەشکێنن یان لەدێدا ایشی تریان پێدەکەم.

4- ژنەکانیان یان نان دروست دەکەن یان چیشت لێ دەنێن.

5- خانووەکانم خراپ کردن چند مال ایستا بی سکنی ماون.

6-گوێدرێژەکان دائم لە ایشن.

7-حیوانیان نیە 10 شەکم لێ ستاندون.

8-هەر مالیك 15 نفرمان لێداناوە جیگای صاحب مال نیە لێ دانیشن.

9-نوینەکانیان داگیرکراون نوینیان نیە خۆیان پی بخەون.

10-منجەلو دیزەیان همولای ایمەن نیانە چیشتیان تی بخون.

گەورەم وجدانم زور نارەحەتە حتی نانیش بەراحتی ناخوم لەبەر اهو نالەی پیرەژنو مندالو گەورەو چوك یعنی ئەم نارحتیەی اهالی ئەم دیەتیدا کسی تیدا نیە..

ئەگەر هەر ئەبیت امر بفرمون کە کاکە مصطفی تواو نقلی حلقەنی بکات بلکی 60نفریك لەسیداوا تأمین بکم یان مساعدە بفرمون 60نفریك لە دێ التونی خوارو دابنێم ایتر چارەیك نەفرمون اهالی بەشەو دەکەونە کیوانو لەژێر ئەم زوڵمە رادەکەن.

بویە بەرسمی عرضم نەکردی چونکە نامەوی کس حسی ئەم زوڵمە بکات. ایتر امر امری جنابی عالیتانە گەورەم.

بچوکی مخلصتان

محمد علی اغازادە( 5 )

لەگەڵ ئەو ئەرکە گرانو پڕ مەینەتیانەشدا:

"حزبو کومار یاسای چاك کردنو دابەش کردنی زەویو زاریان دانەنا وەتەنیا ئەوەندەیان دەرخست کەهەول ئەدرێ بۆ چاك دابەش کردنی بەروبووی زەوی جوتیاران کەلەخاوەن موڵکەکانیان گرتووە."(6)

رەنگە بۆ ئەو سەردەمەو بۆ مۆلەقەیی باری سیاسییو هەرەشەکانی بەردەم، ئەو داوایە بەبارێکی قورس دابنرێت، بەتایبەتی لەتەمەنێکی واکورتدا، بەلام کەئەوەش نەکرا:

"دەرەبەگو خاوەن موڵکەکان ئیمتیازە کۆنەکانیان پارێزگاری کردبو..."(7)

بەوەش پەیوەندییە کۆنە دەرەبەگیو خێڵەکییەکان دەوامیان هەبوو، هەندێ جار دەسەلاتە سیاسییەکەش خراپ بەکاردەهێنراوو بۆ بەرژەوەندییە نائاساییەکانی ئەم سەرەك خێڵو ئەو سەرەك تیرە بەکار دەهێنران.

لەگەڵ ئەوانەشدا:

"زۆربەی بەڕێوەبەران بۆ یەکەم جار لەژیانیاندا دەستیان بەکاری سیاسی کردبو، تاقیکردنەوەیان کەم بو.. بەڕێوەبەریەك پیك هاتبو کەپایەی گەیشتنو تاقیکردنەوەی سیاسی لەڕادەی ئەو مەسئولیەتەی کەهاتبۆوە ئەستۆی نزم تر بو..."(8)

بۆیە حزبەکەش کەبەوەڵەدبوی ئەو کۆمەڵگەیە بوو نەیدەتوانی رووبەڕووی کێشەسیاسییو ئابورییە سەرەکییەکانو ململانێ هەمەجۆرەکان بێت:

"حیزبی دیموکراتیکوردستان لەکۆمەڵی کوردەواری ئەو وەختە هەڵقولابوو هەرچەندە پێشڕەوی کۆمەڵ بو، بەلام نەی دەتوانی حیزبیك بێ کەبەپێی تیوری زانستی پەرەستاندنی کۆمەڵ بجوڵێتەوە.

مەبەست تەنیا ئەوەیە کە تەنانەت یەکێتی فکریش لەسەر بنەمایەکی رون بەتەواوی پێك نەهاتبو... لەسەر گیروگرفتەکانی گشتی ئێرانو گیروگرفتەکانی ناوخۆ، یەکێتی.... یەکێك لەئەرکەکانی بنەڕەتی هەموو شۆڕشێك، تەنانەت هەمو گۆڕانێکی قوڵی کۆمەلایەتیش تێکدانی دەزگای دەوڵەتی کۆنو دانانی دەزگای نوێیە کە بەئامانجەکانی شۆڕش وەفادار بێو خزمەتی کۆمەلانی خەڵك بکاو دژی دوژمنانی جولانەوە تاسەر رابوەستێ، بەداخەوە سەرۆکایەتی کۆماری کوردستان

نەئەو دەرفەتەی هەبو، چونکە ئەو ماوەیەی بەدەستییەوە بو کەمتر لەساڵێك بو نەئیمکانی ئەوەی هەبو...

لەدرێژەی قسەکانداو لەسەر سوپای کوردستان دەڵێ:

"هێزی پێشمەرگە نەلەباری سیاسیو نەلەباری عەسکەریەوە پەروەردە نەکران..."(9)

گومان لەوەدا نییە زۆر لەناتەواوییەکانی دەگەڕێنەوە بۆ ئەو پێکهاتەو خەسڵەتانەی ئەو حزبەو ئەمیش ئاوێنەی کۆمەڵگەکەی کوردەواریی بو کەلەناو جەرگەیەوە هەڵقولا بوو.

## لاوازیی هەستو نەستیی نەتەوەییو کزیی هوشیاریی سیاسیی

مانەوەی ڕژێمی دەرەبەگیو نیمچە دەرەبەگیو خێڵەکی، گیانی هۆزو خێڵ پەرستیی بەسەر گیانی نیشتمانو نەتەوە پەروەریی زاڵکردبوو، نەخوێندەواریی و هەژاریی و دواکەوتوییو چەوساندنەوەی هەمە لایەنەی سەدان ساڵ هۆی کاریگەر بوون بۆ خولقاندنی کەموکورتییو بۆشاییەکانی ناو کۆمەڵگەی کورد... حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کۆنگرەی سێهەمیدا تیشك دەخاتە سەر هەندێ لایەنی ئەو بۆچونانەو ئەڵێت:

"پاشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری ئەو سەردەم ڕێگای نەدەدا جولانەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد قوڵتر بێو ببێتە هۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی کۆمەلایەتی، ئەو بۆ خۆی یەکێك لە هۆیەکانی تێکشکانی کۆماری دیموکراتی کوردستانیش بو بەڕاستیش لەباری کۆمەلایەتییەوە جولانەوە زۆر پێش نەکەوتبوو ماوەی نەبو پێش کەوێ نەحیزبو نەکۆمار دروشمی شۆڕشگێڕی وایان هەڵنەگرتبو کە جوتیاران یانی زۆربەی دانیشتوانی کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێو بیانکاتە پشتیوانی شێلگیری کۆماری مهاباد...."(10)

ڕۆژهەلاتی کوردستان پێش دووەم جەنگی جیهان نیشتمانێکی تاڕادەیەك خامۆشو بەدوور لەچالاکیی سیاسییو خەباتی نیشتمانییو نەتەوەیی بووە. هەرچەندە ڕێکخراوی سیاسیی پێکهێنراو چالاکیی سنور تەسکیان هەبوو، بەلام نەبوونە ئەو ئامرازەی خەبات کە زەمینەی بزووتنەوەیەکی نیشتمانیی باشو سازاو

برەخسێنن، ژ.ک-یش لەڕوی دروشمو ئامانجو چالاکییەوە هەنگاوی گەورە گەورەی نا، بەڵام ڕێبازی خەباتو وەلاوەنانی خەباتی چەکداریی بۆ ئەو سەردەمە لەڕوی تیۆریی و سروشتیی تێکۆشانی سەردەمەکە، نەدەگونجا لەگەڵ سروشتی داگیرکەرو رادەی ئامادەیی بۆ دان نان بەهەندێ مافی کوردا.... لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێین کەلایەنێکی پوسەتیڤو هۆشمەندانەی ئەو ڕێبازە لەتێگەیشتنێکی هوشیارانەی سروشتی کۆمەڵگەی کوردەواریو داگیرکەرو لاسەنگیی هێزو کەرەسەی جەنگەوە بووە...

ئەم ڕێکخراوەش بوو بووە ئامڕازی سەرەکی دامەزراندنی کۆماری کوردستان، چونکە هەر ژ.ک بوو کەحزبی دیموکراتی کوردستانی لەسەر دامەزراو هەر ئەویش بوو بەسەرکردایەتیی پێشەوا قازی محەمەد بەدامەزراندنی کۆمار هەستان...خۆ ئامانجو خواستەکانی ژ.ک لەدڵو دەروونی خەڵکی کوردی روناکبیرو هوشیار هەر بەردەوام بوو... هەر کۆمەڵەی ژێکافیش بوو کەدوای بڵاوبوونەوەی لەشکری سور لەناوچەکەو موکریاندا جموجوڵو چالاکییەکی باشی بەخۆیەوە بینیو بووە سەرەتای پرۆسەکە لەسەر زەمینەی ئەوکۆمەڵگەیەی لەناو ئەو بارودۆخانەدا دەژیا، بەرێوە دەچوو.

## -4-

## جێگیرنەبوونی خەباتی یەکگرتووی گەلانی ئێرانو نەبوونی بەرنامەیەکی هاوبەش

حزبو کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکانی ئێران، لەئاست هەستیاریی روداوەکان نەبوون، لەدۆستو دوژمنی خۆیان نەدەگەیشتن، نەیانتوانی بەرەیەکی یەکگرتوو پێکبهێنن... کە کۆماری ئازەربایجانو جەمهوریەتی کوردستان دامەزرێنران دەرکیان بەبایەخیی سیاسیو کۆمەڵایەتییو نەتەوەیی ئەو دوو ئەزمونە نەکردو ئاوڕیان لێنەدانەوە، ئەوەشی ناوی بەرەی لێنرابوو ، لەڕاستیدا پێکهاتەیەکی دوور لەبەرەو گیانی هاوکاریی بوو...

"هەرچەندە بەرەیەک لەناو شەش حیزبی ئێراندا وەک حیزبی ئێران، حیزبی تودەی ئێرانو حیزبی دیموکراتی کوردستان، فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانو

حیزبی سوسیالیستیو حیزبی جەنگەل پێکهاتبوو ئەو بەرەیە لەبارەی فیکریەوە تەئسیرێکی زۆری کردبووە سەر وەزعی سیاسی ئێرانو کۆمەلانی خەلکی سەرانسەری ئێرانی لەباری سیاسییەوە وریاکردبووە بەلام بەداخەوە رۆژێک کەپێویست بو ئەم بەرەیە بەهەمو هێزیەوە بێتە مەیدانی خەبات بێ دەنگ وەستاو بو بەتەماشاچی رووداوەکان...."(11)

رەنگە ئەگەر هەر بێدەنگو وەك تەماشاکەریش بمانایەتەوە، قوامولسەلتەنە نەیتوانیبایە نەخشەکانی بەو جۆرە ئەنجام بدایە. بۆیە تێکۆشانی ئاشکراو ئەو نیمچە ئازادییە خەلك فریوێنە، وەزیردانانو نەقابە ئازادکردن، ئاسان حزبی تودەیان خستە ناو داوەکەوە کەلەدواییدا باجەکەشی لەسەر گەلانی ئێران زۆر کەوت، ئەوانەش سەرەنجامی جێگیرنەبوونی خەباتی یەکگرتووی گەلانی ئێرانو نەبوونی بەرنامەیەکی هاوبەش بوو، نیشانەی لاوازیی هۆشی سیاسیی بوو، بۆیە لەدواییدا:

"دوژمن بەتاکتیکی زیرەکانەی خۆیەوە توانی لەیەك یەکی ئەم حیزبانە زەربە بوەشێنێ، هێزەکانیان بلاوبکاو رێگای خۆپاراستنیان نەداتێ...(12)

لەڕاستیشدا بیروبۆچونی هەلە، رێگەی نادروست، بیرو لێکدانەوە نازانستانە، تێنەگەیشتن لەخۆو لەبەرامبەرو لەدوژمن، تێنەگەیشتن لەیاساکانی گەشەکردنی کۆمەلو گۆڕرانە مێژوییەکان، سەرەنجامێکی پێچەوانەو دژ بەخواستەکانی گەلیان لێبەئەنجام دێتو رووداوەکان دژ بەخواستەکانی جەماوەرو رەوتی مێژو وەردەچەرخێنرێن. خۆ ئەو ناتەباییە هەر گەلو حزبەکانی دەری کوردستانو ئازەربایجانی نەگرتبۆوە، بەلکو تەنانەت لەنێوان ئەم دوو کۆمارە ئازادەشدا ناکۆکییەکان شارراوە نەبوون، وەك لەجێگەی خۆیدا روونکراوەتەوە....

-5-

## خۆبەدەستەوەدانی پێشەوا قازی محەمەدو هاوڕێکانی

تائێستاو بەوردیی هۆی خۆبەدەستەوەدانی پێشەوا دەرنەخراوە، یاروون و ئاشکرا ئەو هۆیانەی پاڵی بەپێشەواوە نا بۆ ئەو هەنگاوە، ئاماژەیان بۆ نەکراوەو رووناکییان نەخراوەتەسەر، هۆکارەکان هەڵنەهێنجراون.

بۆیە هەڵوێستی ئەوسەرکردەیە لەرۆژی کارەسات و ناخۆشیدا، خۆبەدەستەوەدانی، مەسەلەیەکی گرنگە لەمێژوی کۆمارو نەتەوەی کوردیشدا، چونکە چاوەڕوانی هەڵوێستەی لەو جۆرەی لێنەدەکرا کە بوو بەهۆیەك لەهۆکانی روخان و هەرەسی قەوارەکە، لەبەرئەوە کەڕاستەوخۆ کاری کردە سەر وورەو متمانەو گیانی بەربەرەکانیی کۆمەلانی خەلك، بەلکو گیانی بەربەرەکانیی و ورەی پەك خست، بڕوا بەخۆو بەهێزی خۆ روخاو گیانی بلاوەپێکردن و خۆپاراستن باڵی بەسەر خەڵکیدا کێشا، تا ئەو ئاستەی کەتەنانەت گیانی بەربەرەکانیی لای خەلکە خۆ ئامادەکردووەکەش بمرێت... ئەوانەی بیریان لەبەرگریی دەکردەوە بەناچاریی وازیان هێنا.. هەرچەندە لەدوا کۆبونەوەدا بۆ بڕیاری چارەنوسساز، زۆربە لەگەڵ بەرگری بوون کەچی زۆری نەبرد گیانی خۆبەدەستەوەدان بلاوبووەوە، پاشەکشەو راکردن دەستی پێکرد، پێشەواش بڕیاری خۆیدا، بۆچی ئەو بڕیارەی دا؟ لەبەرچی نەڕای کۆمیتەی ناوەندی وەرگرت و نەبەقسەی کەسیشی کرد؟ بۆچی گوێی لەدەنگی مەترسیی چونە بەردەستی دوژمن نەگرت؟ کە تەنها وەڵامیشی!"لەسەر مانەوە ناچن و دەمانکوژن، بەلام پێم خۆش نیە گەلەکەم بەجێ بێڵم و دەمەوێ لەناو ئەواندا بمرم...)(13)

ئەم وەڵامە لەو ساتانەدا لایەك لەجۆری بیرکردنەوەی پێشەوا شیدەکاتەوە، چونکە دوو ئەلتەرناتیڤی تری لەبەردەمدا بوو، ئەویش یاکشانەوە بۆ خۆدەربازکردن، یان بەربەرەکانیی چەکدارانەو رێگەگرتن لەئەرتەشی شا کە مەهاباد داگیر بکاتەوە...

هۆو هۆکارەکانی دیاردەی خۆبەدەستەوەدانی پێشەوا زۆرن و رەنگە هەر کەسێکی تری تێگەیشتوو لەبارودۆخەکەو ژیاوی ناو رووداوەکان، لەجێگەی ئەو بوایە هەر ئەو رێگەیەی هەڵبژاردایە، وەك روونتر لەجێگەی خۆیدا باسیی دەکەین... بەلام ئەوەی

لێرەدا پێویستی بەگوتنە: پێشەوا پەیمانەکەی خۆی بردەسەرو لەگەڵ گەلەکەیدا مایەوە... هەر وەك چۆن لەکاتی پێویستدا لەخەباتدا بوو، لەمەیدان چۆڵکردنیشدا لەگەڵ خەڵکەکە مایەوەو خەیانەتی بەبەڵێن‌و خەڵك نەکرد، لەو رێگە هەڵبژاردنەشدا کەدەیزانی‌و دەیگوت" لەسەرمانەوە ناچن‌و دەمانکوژن" دوا هەناسەی لەسەر سێدارە دایەوەو دڵی گەورەی لەلێدان خرا. ئەو خۆبەختکردنە، ئەو رۆڵ‌و بیرو رێگەو کردەوەیە، دیسان هەر کارێکی شۆڕشگێڕانە بوو ئەگەر تاریکستانی ناو بۆشایی‌و هەڵەو ناکۆکی‌و لاسەنگیی‌و خیانەتەکان‌و ئایندە نادیارەکە لەگەڵ هۆکارەکانی تردا رەچاو بکرێن... رەنگە هەندێ کەس‌و یەك لایەنە کارەکە بنرخێنێ‌و سەرەنجامەکانی ئەڵتەرناتیڤی دووەم نەهێنێتە پێش چاو، بەڵام بۆ گەیشتنە راستییەکان دەبێت بارودۆخەکە بەوردەکارییەکانییەوە، هەلومەرجەکان کەموکورتی‌و بۆشاییەکان هەمووی لەبەرچاوبن... بێگومانیشە کەهەر لایەنێکی لێکدانەوەکە بۆ ماوەکە بکرێت وا لەهیچ بارو حاڵەتێکدا لەنیشتمانپەروەری‌و دڵسۆزی‌و ئازایەتیی پێشەوا کەم ناکاتەوە نەك هەر لەبەر گیانی خۆدانان‌و قوربانییە گەورەکە، بەڵکو لەبەرئەوەش کە وەفادار بوو بەبەڵێن‌و بەمیللەتەکەی(سەرهەنگ0ئەمیر پەروێزی) فەرماندەی ژاندارمەری مهاباد، چەند ساڵ پاش شکانی جوڵانەوەی کوردستان‌و ئازەربایجان، لەسەر ئیعدامی قازی محەمەدو هاوەڵەکانی لەگۆڤاری ژمارە پەنجای اطلاعاتی مانگانەی چاپی تاراندا نوسیبوی: " دەرۆژ لەپێش لەداردانی قازی‌دا، چەند کاربەدەستی پایەبەرزی باڵوێزخانەی ئەمریکا لەتاران، لەگەڵ سەرهەنگ (پارسی تبار) ئەفسەری قشونی ئێران دەچنە لای قازی محەمەد، کاربەدەستانی ئەمریکایی بەقازی محەمەد ئەڵێن: (ئەگەر مەسەلەی کورد بەگوێرەی سیاسەتی ئەمریکا بەرێوەبەری، وەسیاسەتی ئەمریکا لەناو کوردەکان‌دا بڵاوبکەنەوە، لەکوشتن رزگار دەبی) قازی محەمەد لەوەڵامی ئەمریکاییەکاندا دەڵێ: "من دوو رونیم، چاویشم چاك دەبینێ، من دەزانم ئێوە چیتان لەمن دەوێ، بەڵام من بیروباوەڕو مەسلەکی خۆم ناگۆڕم، من ناتوانم خەیانەت لەنەتەوەکەم بکەم لەو رێگایەی کەگرتوومەتە پێش ناگەڕێمەوە"(14)

ئارچی روزفلت ئەفسەری موخابەراتی لەسەفارەتی ئەمریکا لەوسەردەمەدا، ریوایەتێکی تر دەگێڕێتەوە، وەك لەشوێنی خۆیدا دەیخوێنینەوە، کەلەوەدا هەوڵی

بێمەرجی خۆی و سەفیرەکە باسدەکات و دەری دەخات کە چۆنیش بێ ئەنجام بووە جگە لەوەی شا گفتی درۆشی پێدابوون...

گۆڤاری "رۆژگاری نوێ" لەژمارە 15ی مانگی نیسانی 1947 چاپی مۆسکۆ نوسیبوی:

"جاسوسەکانی ئیستعماری ئینگلیزو ئەمریکا لەگەڵ قازی محەمەد گەلێکیان هەوڵدا، بەڵام کاتێك کە دیتیان ناتوانن قازی بۆ لای خۆیان رابکێشن و بیکەنە خائینی نەتەوەی کورد، فەرمانی کوشتنیان دا..."(15)

رۆژنامەی ئیزڤیستیای سوڤیەتیش لەژمارە 20ـی نیسانی ساڵی 1947 بەبۆنەی خنکاندنی پێشەواو هاوەڵەکانی نوسیبوی:

"رابەری هەرە بەرێزو بەنفوزی کورد(قازی محەمەد، سەدری قازی، سەیفی قازی) بۆیە کوژران، چونکە ئامادەنەبوون کەنەخشەی ئیستعماری ئەمریکاو ئنگلیز لەبارەی کوردستان قبوڵ بکەن.

ئەمریکاییەکان بۆئەوەی نەخشەکانیان دەرنەکەوێ بۆ کوشتنی قازیەکان بەپەلە بون..."(16)

ئەو سۆزو پەرۆشەی رۆژنامە رەسمییەکەی سوڤیەت لەگەڵ سیاسەتە پەیرەوکراوەکەو شێوەی کێشانەوەی لەشکری سورو پەیمانی نەوت و هەڵنەدان لەسەر داگیرکردنەوەی مەهابادو قسەکانی ناو نامەکەی ستالین، کەلەجێگەیەکی تردا دەبینرێت، ناگونجێن..

لەسەرهەڵدانەکەش، ئەوە بوو کەتاران بەمەبەستەکانی خۆی گەیشت و رەفزی قبوڵکردنی پەیمانی نەوتی کرد، بۆیە ئەو دوو حاڵەت و هەڵوێستە ناکۆك و دژ بەیەکن و زیاتر لەبەرژەوەندییە تەسکە سیاسیی و ئابورییەکانەوە سەرچاوەیان هەڵگرتبوو...

ئەوەش کە(سوارە) بەدوا وتاری پێشەوا لەقەڵەمی داوەو لەگۆڤاری رووناهیدا بڵاوی کردۆتەوە، لەناو رۆژنامەی کوردستان و بەڵگە نامەکان کەتائێستا بەردەست کەوتوون نابینرێ و لەشێوەی نوسینەکەش گومان پەیدا دەبێت..(17)

زیاتر لەوانەش رێرەوی رووداوەکان ئەوە دەردەخەن کەلەو رۆژگارەدا گۆڕانە زۆر کوتوپڕەکان بۆ حزبی دیموکرات و بۆ سەرکردایەتی کۆمار بەشێوەیەکی چاوەڕوان

نەکراو بون پێشەوا ماوەی ئەوەی نەبووە کە وتارێکی لەوبابەتە بۆ کۆمەڵانی خەڵك بدات، چونکە هەر دوای کۆبونەوەی مزگەوتی سور، هەر زوو خۆبەدەستەوەدان و گیانی دەستبەرداربوون لەبەرگریی بڵاوبووە، دوور نییە ئەم گۆڕانانە هەڵوێستی کۆبونەوەکەی پێ پێچەوانەکردبێتەوە... هەرچی چۆنێك بێت پێشەوا قازی محەمەد، لەگەڵ ئەو هەنگاوو هەڵەیەشدا، پێشەوایەکی بێوێنەی سەردەمی خۆی بو، لەفیداکاریشدا ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی کوردستان و سەر کاروانی شەهیدانی رێگەی سەرفرازیی نەتەوەی کوردە. لەژیانیدا پێشەوای ئازادیخوازو تێکۆشەران بوو، بۆ مردنیش رابەرو پێشەوای شەهیدانی رێگەی سەرفرازیی بوو..

-6-

## باش نەناسینی دۆستو دوژمن و زوو باوەڕکردن بەدوژمن

بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی شۆڕشگێڕانە، دەبێت خاوەن تیورییەکی زانستیانەو ستراتیجێکی لێکۆڵراوە بێت، رێکخراوەیەکی لەو بابەتە لەبارودۆخی ناوخۆو هەرێم و جیهان دەگات و دەزانێت جێگەی ململانێ و دروشم و ئامانجەکانی بزوتنەوەکە کوێیەو چۆن مامەڵە لەگەڵ واقیعەکەدا ئەکات. لەخۆی و رەخسیویی هەلومەرجەکان و دۆست و دوژمن و هاوپەیمانەکانی دەگات، دوژمنی سەرەکی و لاوەکییەکان دەناسێت و بەو پێی ناسینە نەخشەو تەکتیکەکانی خۆی دادەڕێژێت.

سەرکردایەتی کۆمارو حزبی دیموکرات بەتاقیکردنەوەیەکی وادا تێپەڕ نەبوو بون، ئەزمونی ئەو جۆرە ململانێیەیان نەبوو، شارەزاییەکی ئەوتۆیان لەئەڵقەی ململانێ ئاڵۆزو گرنگەکاندا پەیدا نەکردبوو...

"بێ ئەزمونی کاربەدەستانی کۆماری کوردستان لەوەدا دەردەکەوێ کەپاش ئەو هەمو تاقیکردنەوە تاڵە مێژوویییە کەگەلی کورد بەدرێژایی خەباتی خۆی دەستی کەوتبوو، تاڕادەیەکی زۆر فریوی قسەو وادەو بەڵێنی حکومەتی کۆنەپەرستی تارانیان خوارد، کە گوایا حکومەتی شا وەزعی کوردستان تێك نادا..."(18)

لەو کاتانەشدا رژێمی شا لەگەڵ ئەنجامدانی نەخشەو پیلانەکانی خۆی خەریك بو، ئاشتی و گفتوگۆ لای ئەو بۆ کات بردنە سەرو بۆ پێگەیاندنی هەلومەرجی روخاندنی کۆمار بوون، خۆ لەڕاستیشدا تاران هیچ جۆرە بەڵێن و گفتێکی نەدەدا

کەپێوەندیی بەداخوازییەکانی کوردەوە هەبێت، کەچی سەرکردایەتی کورد، لەناو بیروبۆچوونی خۆی و گوشاری روسەکاندا، لەناو هیواو ئاواتی بێ بنچینەدا دەژیا، بەدڵپاکی و نیازچاکی دەجوڵایەوە، بۆ سەلماندنی ئەمە با سەرنجی یەکێك لەنامەکانی پێشەوا بدەین کە بوو بوو بەستراتیجی سەرکردایەتی کۆمار:

"آغای فەرماندەی هێزی بۆکان و منطقەی سرا هەر کارێکی جزئی ئەکەن لەگەڵ ئەوضاع بین المللی تطبیق بکری چ جای کاری مە کلیە لەبەرئەوەی ئەمەمجبورین لەری صلحەوە تامکن بێ ناتوانین بەڕێ دیدا بروین ئەو تاخیرە ای وەیە دەنا ئەمن لەتو بەپلەترم. لەهاتن عائلە گەلەك خوشحالم کە بەسلامتی نجاتیان بوە لەلایەك غمگینم کە تا کەنگی کورد دەبی مالکی جیگای خوی نەبی خدا رحمیکی بکا"[*]

محمد قاضی

ئەو نامەیە بۆ جەنراڵ حەمەرەشید خان فەرماندەی هێزی بوکان و مەنتقەی سەرا نێررا بوو، ئەم فەرماندەی چوار لقە سەرەکییەکەی هێزەکانی بارزانییەکان و ئەفسەرانی کوردی عیراق و چەکدارانی خۆی دەکرد، ئەم بەردەوام لەو جۆرە گفتوگۆیە ناڕازیی و نائارم بوو، بەنامەو سەردان ئەو ناحەزایەتییەی خۆی بۆ ئەوجۆرە گفتوگۆیەو فروفێڵی دەستەو دایەرەی شا، بەڕوونی دەردەخست... چونکە هەر لەساتەکانی وتووێژدا، ئەفسەرانی ئەرتەش لەگەڵ کاری دژ بەئاشتی و بۆ روخاندنی کۆمار خەریك بوون، بەنامەو بەخەڵك ناردن، پەیوەندییان بەلێپرسراوو خەڵکی خاوەن نفوزەوە دەکرد تالەخشتەیان بەرن، تابەهەڕەشەو گورەشە یان بەکڕین ریزەکانی کورد تێکبدەن... دەیان نامەی: سرلشکر رزمارا رەئیسی ستادی ئەرتەش، سەرتیپ همایونی فەرماندەی لەشکری چواری کوردستان، سروان سوار منصور پور، سەرهەنگ غفاری و گەلێکی تر، دەنێردران بۆ ئەم لێپرسراوی پێشمەرگەو سیاسیی و ئەو سەرەك تیرەو خێڵ، بۆ ئەو مەبەستەی خۆیان، سەدان جاسوس و بەکرێگیراویان لەناوچەکەدا بڵاودەکردەوە.

باش دەستنیشان نەکردن و تێنەگەیشتن لەسروشت و کەرەکتارو ئەقڵ و نەخشەی بەرامبەر هەر ئەو حاڵەتە دەخوڵقێنن کەلەساتەکانی دواتەمەنی کۆماردا خوڵقا...

---

[*] بڕوانە مەحمود مەلا عززەت، د. ج.ك، ب1-1992

## -7-

## ناکۆکی و ناتەبایی ناو ریزەکانی گەل

یەکێتیی بیرو کارو ئیرادەو ئامانج و رێبازی خەبات، لەهەر حزبێکدا، چەند مەرجێکی بنچینەیین بۆ ژیان و گەشەکردن بەرەو پێشچوون و سەرکەوتن، هەر بۆشاییەك لەوانەدا هۆیەکی ئاسان لێکداترازانی ئەوحزبە دەهێنێتە ئاراوە، هاوبەشیی بەرژەوەندییە نیشتمانیی و سیاسیی و ئابوریی و نەتەوەییەکان بەهوشیاریی سیاسیی و نەتەوەیی.

بنەما گرنگەکانی ئەو یەکێتییە لەحزب و کۆماردا دەرەخسان کە لەو سەدەمانەدا پێنەگەیبون، کۆمارەکەش لەسەرەنجامی خەباتێکی دورودرێژی بەئەزمون نەهاتبووە ئاراوە، بۆیە تێکۆشەرو لێپرسراوانی حزب و کۆمار لەناو بوتەی خەباتێکی وادا نەهاتبونە مەیدانەوە کەنەیەڵن دەستکەوتەکەیان وائاسان لەدەست دەربهێنن..لەبەرئەوە گەلێ لەکێشە کۆمەلآیەتی و ناکۆکییە خێلەکییەکان بێ چارەسەری بنەرەتیی مانەوە، نەدەتوانراو ئەو دەرفەتەشی نەبوو گرفتە ئابورییەکان چارە بکەن، شەڕو ئاژاوەو ململانێی ناو هۆزو خێلەکان و سەرەك هۆزەکان ساردی و دوودڵی و ناحەزیی و دووبەرەکیی و دوژمنایەتیی، شارراوە نەبوون.. چەند ناوەندێکی هێزو قودرەت لەدەری سەرکردایەتی حزب و کۆمار رۆڵی چاوێنییان ئەبینی لەناوچەکانیاندا، لەدرێژەدان بەناکۆکی و ململانێ و هەوڵی جێگیرکردنی نفوزو دەسەلآت و دەستکەوتی خۆیان.. ئەو ناکۆکی و ناتەباییانە لەرۆژانی دوایی و کۆتاییەکانی تەمەنی کۆماردا بەزەقی دەردەکەوتن..ئەگەر سەر حسابی خێلْ و تیرەکانی دەری بازنەی کۆماریش بکەین کەچۆن سەرقاڵی کۆمەك بوون بەرژێمی حەمەڕەزا شاو لەدژی کۆمارو هۆزە نیشتمانپەروەرەکان کاریان دەکرد، وا زیاتر مەترسیی و هەڕەشەی ئەم فاکتەرەمان بۆ دەردەکەوێت...

بۆ باشتر حاڵی بوون لەهەندێ لایەنی ناکۆکییەکان سەرنج لەم یاداشتەی سەر کۆنسوڵی سوڤیەت لەماکۆ بدەن.

22ئاگوستی 1946

یاداشتی وتووێژی سەر کۆنسولی یەکێتی سۆڤیەت لەماکۆ سەلومین و.ی

2ی ئاگوستی ئەمساڵ سەرۆکی دەوڵەتی کوردستان قازی موحەمەد لەگەڵ نزیکەی چل نەفەر کە زۆربەیان پیاوی ئایینی بوون، هاتە ماکۆ، بۆ رۆژی دوایی قازی هاتە کۆنسولخانەو لەوتوویژدا بەکورتی مەبەستی گەشتەکەی خۆی بۆ ناوچەی ماکۆ راگەیاند، مەبەستی ئەو بەکورتی ئاشنابوون لەگەڵ کاروباری پارتی دیموکراتی کوردستان* لەناوچەکەو چارەسەرکردنی ناکۆکیکی گەورەیە کەلەنێوان سەرکردەی هێزەکانی کورد هەیە.

هەروەها چەند کۆبونەوەیەکی ئامۆژگارییانە بەبەشداری سەرۆک خێڵەکانی کوردو لێپرسراوانی رێکخراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان سازدەکات. وەك قازی موحەمەد رایگەیاند بەداخەوە تائێستا زۆربەی پیاوە ناودارەکانی کورد هەست بەئەرکی سەرشانی خۆیان ناکەن‌و هەر خەریکی گیرەوکیشەی نێوان خۆیانن بۆ بەشکردنی دەسەلات‌و دەست بەسەرگرتن کەلەخۆبوردنێکی زۆری دەوێ بۆ کەمکردنەوەو لابردنی ئەو ناکۆکیانە. بەلەپێشچاوگرتنی ئەوەی کە ئاسۆی بیرکردنەوەیان تەسکەو بەگشتی نەخوێندەوارن‌و کارکرد لەگەڵیان زۆرگرانە....

دوای درێژەدان بەقسەکان:

راگەیاندن‌و وتەکانی قازی موحەمەد لەکۆبونەوەکەدا بوو بەهۆی ناڕازی بوون‌و بێ باوەڕی هێندێ گەورە پیاوی کورد کەلەبەرئەوە هاتبوون بۆ کۆنسوڵخانەی ئێمە بۆچوونەکانی قازی روون بکرێنەوە شتێکی سروشتییە کە کاربەدەستانی کۆنسوڵخانە، پێشنیارو ئامۆژگاریان کردبوون کە سەبارەت بەو پرسیارانە بچنە لای دەوڵەتی کوردی خۆیان، جگە لەوە سەرۆکی دەوڵەت ئێستا لەشاری ماکۆیە.

دوای نانی نیوەڕۆ.. خاتوونی تەمیوری بەشانازییەوە لەبەرهاتنی قازی موحەمەد میواندارییەکی رێك خستبوو. قازی لە 4ی ئاگوستی رۆیشتەوە بۆ شاری خۆی. کاتی هاتنی قازی موحەمەد بۆ ماکۆ هیچ هەراوهورییایەك لەلایەن ئازەربایجانییەکانەوە روی نەدا.

کاربەدەستانی خۆجێیی ئازەربایجان لەکاتی هاتنی قازی هەموو هەوڵی خۆیان بەرکارهێنا تاکو پێشوازیو هاتنەکەی قازی موحەمەد بەرێزو بەشکۆوە بێت.*

---

* لێرەو لەجێگەکانی تر مەبەستی وەرگێڕ لە"پارتی دیموکراتی کوردستان" حزبی دیموکراتی کوردستانە.

* بڕوانە ئەفراسیاو هەورامی، هەمان سەرچاوە، گزنگی ژمارە25-1998.

## -8-

## مانەوەی رژێمی دەرەبەگی و سستمی خێڵەکی و دواکەوتوویی کۆمەڵگەی کوردستان

کۆمەڵگەی کورد لەسەردەمی کۆماردا، نەخوێندەوارو هەژارو دواکەوتوو بوو، زیاتر لەسەدا نەوەدی بێسەوادو هەژار بوون، قورسایی رژێمی دەرەبەگی و سستمی خێڵەکی و نەریتە کۆنەکان لەلایەن ئەو دەستە کەمەی کۆمەڵگەوە بەسەر دانیشتوانی جوتیارو خەڵکی هەژاردا سەپێنرابون.. دەسەڵاتی هێزەکانی زۆر لەئاغاو بەگ و خان و خاوەن موڵکە گەورەکان و سەرەك هۆزەکان، نوێنەری رژێمی شابوون، بۆیە دەسەڵاتە-سیاسیی و ئابورییەکانیان لەدەستدا بوو، لەبەرئەوەش کە کۆمەڵی کوردەواری داگیرکراوو چەوساوە بوو، ئەوانەش لەدەری بازنەی پەیوەندییەکانی ناو کوردەواریی بوون، وابەستەی بەش و چینە باڵادەست و حوکمڕانەکان بوون، بەفرمانی ئەوان دەجولانەوە.. بۆیە چەند جۆر چەوساندنەوە بەسەر زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگەی کوردستاندا سەپێنرا بوون، هەر لەدەسەڵاتی زەوتکەری ئیمپریالیزمەوە تا بەش و توێژاڵی سەرەوەی چینی دەسەڵاتدارو دەرەبەگایەتی و عەشیرەتگەریی ناوخۆ. کە ئەوانەش هۆی سەرەکیی نەخوێندەوارو هەژارو برسیکردنی خەڵکەکەبوون..بۆیەو لەبارودۆخێکی ئاوادا زەحمەت بوو دەستکەوتێکی نەتەوەیی وا گەورە بپارێزرێت و بەرامبەر داگیرکەر درێژە بەخەبات بدرێت، بزواندنی جەماوەر بۆ کارێکی واشۆڕشگێڕو گرنگ هەر موعجیزەی گەرەك بوو نەك شتێکی تر. بەتایبەتی لەهەلومەرجێکدا کە ئەو هۆو فاکتەرانەی تریش لەئارادا بوون.

## -9-

## لاسەنگیی لەچەكو ئازوقەو تفاقی پێویستو
## لەڕوی ئابوریو داھاتیشەوە

ھەرچەندە یەكێتی سوڤیەت پاڵپشتو یارمەتیدەرو ھۆی سەرەكیی دامەزراندنو ژیانی كۆماری كوردستان بوو، بەڵام ئەوانە لەسنورێكی زۆر تەسكدا بوون، لەوەش خراپتر، ئەوە بو كەتاڕادەیەكی زۆر كۆماری كوردستان لەڕوی ئابوریو یارمەتییە بنچینەییەكانەوە ئەوقی تەوریز كرابوو، لەزۆربەی زۆری حاڵەتەكانداو تەنانەت بۆ پێداویستە بچوكەكانیش دەبوو روو لەئازەربایجان بكرێت.. ئەوەش كە دەگەیشتە دەست سەركردایەتی كۆمار كەم بوون، چارەسەری كێشتە سەرەكییەكانیان پێنەدەكرا...

بۆیە لاسەنگییەكی گەورە لەنێوان تارانو مەھابادا ھەبوو، بەبەراورد لەگەڵ كۆمارەكەی كورد، ئەو پڕ چەكو تفاقو پارەو پولو چەكی قورسو دەستبەرەڵا لەڕوی مامەڵەی سیاسی لەگەڵ ئازەبایجانی سۆڤیەتو لێپرسراوانی رووس، ئەمیش لەحاڵەتێكی تەواو پێچەوانەدا بوو.. بۆیە ئەركو زەحمەتییەكی زۆر كەوتبووە سەرشانی جەماوەری شارو دێھاتەكان، نەبوونی چەكی پێویستو بێ تفاقییەكی زۆر لەسوپاو ریزەكانی پێشمەرگەدا ھەبوو، پێویستییەكان لەو ئاستەدا نەبوون كە لەململانێیەكی درێژخایەنداو بەبێ پشتو پەنا كورد بەرامبەر ھێزەكانی داگیركەر بوەستێت، ھەرچەندە نەبەردییەكانی بەرە گەرمەكانی شەڕ بەچەندین سەركەوتنی كورد كۆتاییان ھات، بەڵام ئەوانە لەبارودۆخێكدا بوون كە ھێزەكانی تاران نەیاندەتووانی ھێرشی تەواو بۆ داگیركردنەوەی پایتەختی كۆمار بكەن، دیارە ئەوەش زیاتر لەترسی لەشكری سور بوو، چونكە لەشكری سوور رێگر بوو، داخوازییەكانی ئەفسەرانی ئەرتەشیان رەتدەكردەوە بەتایبەتی نەخشەو پیلانەكانیش نەگەیشتبوونە دوایلەی ھێرش. كۆماریش سەرچاوەیەكی داھاتی نەبوو كە ئەو پێویستییانەی پێ دابپۆشرێن، تواناو كاتو زەمینەو ئەقڵی خوڵقاندنی ئابوریی دەوڵەتیش لەئارادا نەبوون... ئەگەر سەرنجێكی خێرا لەڕەوتی رووداوەكانو

بەرەکانی جەنگ و کاروکردەوەی وەزارەتەکان بدەین و بەڵگەنامەکانی سەردەمەکە بخوێنینەوە، واڕاستیی ئەو بۆچون و لێکدانەوانەمان بۆ دەسەلمێ*

## -10-

## سیاسەتی چەوتی یەکێتی سۆڤیەت و کشانەوەی لەشکری سور لەئێران

لەپرۆسەی دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان-دا پەیوەندیی چارەنوسسازی یەکێتی سوڤیەت و بوونی لەشکری سور لەناوچەکەدا، روون و ئاشکرا بوو، هەر ئەوەش بوو کەرێگری ئەرتەشی تاران بوو بۆ هێرش و جەنگێکی رووبەڕوو، زیاتر لەوە حکومەتی قوام ولسەڵتەنە کاری بۆ ئەنجامدانی نەخشەکەی دەکرد، تا لەسەرەنجامی نەخشە سیاسییەکان و بۆ ئەنجامدانی داخوازییە نەوتی و ئابورییەکان بەمەبەستە سەرەکییەکە، بگات چونکە لەو موعادەلە سیاسی و ئابورییە گەیشتبو کەکاری دیپلۆماسیی سەرەتاو زەمینە خۆشکەرە بۆ دواکار کەلەڕوی سەربازییەوە کۆتایی بەناثارامییەکان دەهێنرێت، وشکردنی سەرچاوەی ئابوریی و ژیانی ناو ئەو قەوارەیەو کێشانەوەی لەشکری سور بەئامانجی سەرەکیی دادەنرا..

کاتێك پەیمانی نەوت ئیمزاکراو دەستکرا بەکشانەوە، هیچ جۆرە نەخشەو یارمەتییەك نەبوو، نەك هەر چەکێکی وا بۆ هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان بەجێنەهێڵرا تابەرگری پێبکرێت، بگرە ئەو چەند تۆپەش کەدرابوو بەئازەربایجان، لێیان وەرگیرایەوە..

دەشگوترێ، گوایا نوێنەری بازرگانیی روسەکان لەمەهاباد(ئەسەدۆف) لەکاتی چۆڵکردنی ناوچەکەدا لەوەڵامی ئەوەدا کەپێی گوتراوە: وازهێنان لەمەهاباد لەو کاتە ناسکەدا خیانەتە لەکورد...گوتویەتی" باری کۆماری مەهاباد ئێستا بۆتە کێشەیەکی دەوڵەتان"(20)

---

*- بڕوانە مەحمود مەلا عززەت بەرگەکانی د.ج.ك(1و2و3) 1992، 1995، 1997.

-دیسان بڕوانە ئەفراسیاو هەورامی، گۆڤاری گزینگ.

ئیتر ئەو هەڵوێستو بڕیارە لەبەر گۆڕانی بارودۆخی ئێران بێت، لەبەر پەیمانی نەوتو بەڵێنەکانی زلهێزەکان بۆ چۆڵکردنی ئیران لەدوای جەنگ بێت، یان لەبەر ترسی شەڕێکی نوێو هیلاکی سوڤیەتو هێزەکانی بێت کەلەسەرەنجامی جەنگە وێرانکارییەکەی هیتلەر دووچاری بوبو، یان هەر هۆیەکی تر بووبێت، نەدەبوو ئەو دوو کۆمارە واڵاسان لەبەردەم هەڕەشەی ئەرتەشی شاو زلهێزە هاوپەیمانەکانی بەجێبهێڵرێن.

نامەکەی ستالین بۆ پێشەوەری جەخت لەسەر ئەو بۆچوونانە دەکەن کە دەگوترا هۆی کێشانەوەی لەشکری سور: پەیمانی نەوت، سەرکەوتنی دیپلۆماسیێتیی قەوام‌ولسەڵتەنەو هەڵخەڵەتاندنی رووسەکان، تێنەگەیشتنی سۆڤیەتەکان لەفروفێڵی سیاسەتمەدارانی تاران بوو...

لەکشانەوەی لەشکری سور لەئێرانو خولقانی هەڕەشەی راستەوخۆ لەسەر ئازەربایجان، دیارەکە پێشەوەری رەخنەی توندی لەو هەنگاوە گرتبێت، چونکە وەڵامەکەی ستالین بەرگری لەکشانەوەی لەشکری سورو هەڵوێستی سۆڤیەت دەکات. لەبەشی دوایی خاڵی سێهەمو لەخاڵی چوارهەمی نامەکەدا ستالین دەڵێت:

".... تاکتیکی ئێمە لەو کەینوبەینەدا دەبێ چ بێ؟ من وابیردەکەمەوە کە ئێمەی دەبێ لەم تێکهەڵچوونە کەڵك وەرگرین بۆ ئەوەی قەوام لەو بڕیارەی پاشگەز نەبێتەوە. دەبێ پشتی بگیرێ تا لایەنگرانی ئینگلیسی وەلاخرێنو بەم چەشنە هێندێك بۆ دیموکراتیزەکردنی ئێران پێك بێنرێت. هەموو ئامۆژگارییەکانی ئێمە بۆ ئێوە لەو ئەساسەڕا سەرچاوە دەگرێ، بەڵام دەکرێ تاکتیکێکی دی بگرینە پێش: واز لەهەموو شتێك بهێنرێتو پێوەندی لەگەڵ قوام بپچڕێتو بەم چەشنە سەرکەوتنی لایەنگرە کۆنەپەرستەکانی ئینگلیس مسۆگەر بێت، بەڵام ئەوە تاکتیك نییە بەڵکو نەزانینە، ئەمە لەڕاستیدا خیانەت بەگەلی ئازەربایجانو دیمورکاسیی ئێرانە."

"چوارەم: ئێوە لەوانەیە بڵێن کە ئێمە لەسەرەتادا ئێوەمان گەیاندە ئاسمان، بەڵام دوایی پشتمان بەردانو ریسوامان کردن. ئەگەر وابێ، جێی سەرسوڕمانە، بەڵام لەراستیدا چ رووی داوە؟ ئێمە لێرە شێوەی دیاریکراوی شۆڕشگێڕانەمان بەکارهێناوە کەلای هەموو شۆڕشگێڕێك روونو ئاشکرایە، بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان لەگەڵ ئەو هەلومەرجەی ئێران بگونجێنینو لانی کەمی داخوازییەکانی بزووتنەوە

جێبەجێبکرێت، پێویستە لەداخوازی کەمەوە دەست پێبکرێت و پێشڕەوی بکرێت و بۆ حکوومەت مەترسی دروست ببێت و پاشەکشەی پێبکرێ، بەڵام راکردنتان بۆ پێشەوە، لەبارودۆخی ئێستای ئێراندا رێگەتان پێ دەگرێ بەو داخوازیانە بگەن کە حکوومەتی قەوام ئەمڕۆکە ناچارە جێبەجێیان بکات. ئەمە یاسای بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەیە، بەڵام قسەی ریسواکردنی ئێوە بەهیچ شێوەیەك لەگۆڕێدا نییە. جێی سەرسووڕمانە ئەگەر ئێوە وابیربکەنەوە، کە ئێمە ئیتر ئێوەمان ریسوا کردووە. بەپێچەوانەوە ئەگەر ئێوە ژیرانە بجووڵێنەوە، بەپشتیوانیی مەعنەویی ئێمە بەو داخوازیانە دەگەن، کە ئامااژەم پێکردن و زۆربەیان لەهەلومەرجی ئازەربایجاندا هەیە، هەم ئازەربایجانییەکان و هەم ئێرانییەکان وەك پێشڕەوانی بزووتنەوەی پێشکەوتوخواز-دیموکراتیك لەرۆژهەڵاتی نێوەراستدا دوعای خێرتان بۆ دەکەن.

ی ستالین 8ی مای 1946*

ئەو بۆچوون و بڕیار سەپاندنانەی ستالین ئەم بۆچوون و هەڵەو ئەقڵی ئیستیعمارگەری و سەپاندنی خواست و بەرژەوەندیی لێوە هەڵدەهێنجرێت:

1-دەستکەوتی نەوت بەو پەیمانەی _ لەشوێنێکی تری ئەم بەرهەمەدا دەقەکەی خراوەتە پێش چاو_ بۆتە سەنتەری سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت بەرامبەر بەئێران و ئازەربایجان و کوردستان....

2-لاخستنی بەرژەوەندیی گەلی چەوساوەو میللەتانی داگیرکراو، لەگەڵیشیدا پاڵپشتیکردنی حوکمێکی کۆنەپەرستانەی ئەوتۆیە کە ستالین خۆی هەر لەو خاڵی دووهەمەی نامەکیدا بڵێت:" ئێمە کێشەمان دەگەڵ حکوومەتی "قەوام" و لایەنگرانی ئینگلیس هەیە، کە کۆنەپەرستانەترین داروودەستەن لەئێراندا. رابردووی کۆنەپەرستانەی قەوام هەرچۆنێك بووە. ئێستا ئەو ناچارە بۆ بەرگری کردن لەبەرژەوەندییەکانی خۆی و پاراستنی حکوومەتەکەی، هێندێك ریفۆرمی دیموکراتییانە بکات و بەدوای پاڵپشت لەناو هێزە دیموکراتەکانی ئێراندا بگەرێت..."

---

* بڕوانە ئەفراسیاو هەورامی گۆڤاری گزینگ ژمارە 13

ئـەوەش بەپێچەوانـەی بۆچوونەکـەی سـتالین، خـۆی ناشۆڕشـگێڕانەو بگـرە کۆنەپەرسـتانەش بـوو، لـەوەش زیـاتر پشـتتێکردن‌و رسـواکردنی هـەردوو گـەلی ئازەرو کورد بوو.

3-لەو نامەیەداو لەلێکدانەوەی ئاییندەی رووداوەکانی ناو ئێران‌و چارەنووسی گەلانی ئێران، لەدوورو نزیك باس لەکورد ناکات.

4-ویسـتویەتی دیکتاتۆرانـە راوبۆچـوون‌و بڕیارەکـانی بەسـەر پێشـوەریدا بسـەپێنێت، تـا ئـەو ئاسـتەی کـە پێچەوانـەی قسـەکانی سـتالین خـۆی بەخیانـەت بەگەل دابنێت...

5-ئـەو هەڵوێسـتەی کـە بڕیـاری پالپشـتیکردنی بانگەشـەی هـەردوو کۆمـاری ئازەربایجان‌و کوردسـتانی لـەدوواوە بـوو، ئـەو مـانۆرە سیاسـییە بـوو کـە تەنـها بـۆ گوشارخسـتنە سـەر تـاران بـوو تـا ناچـاری بکـات مـل بـۆ خواستەکانی‌مۆسـکۆ دابنەوێنێت‌و ئیمتیازی نەوتی بداتێ.

6-ئەو ئامۆژگارییانـەی ستالین... مانـای داوای راستەوخۆیە بۆ هاوکاریی تـاران کەلەڕاستیدا تاران بەکەمتر لەخۆتەسلیمکردن رازیی نەدەبوو.

7-ئـەوەش هـەمان ئـەو بۆچوونانـە دەسـلمێنن کـەدەگوترا: مۆسـکۆ ئاگـاداری تەورێزو مەهابادی کردووە کەلەهاتنی ئەرتەشی تاراندا، پێشی پێنەگرن.

8-لەکشـانەوەی لەشـکری سـورو وەرگرتنـەوەی ئـەو چـەند چەکـە قورسـەی بەئازەربایجانیان دابوو، بۆ بێهێزکردنی هـەردوو کۆمارەکـەو بـۆ لاوازکردنـی گیـانی بەرگری بۆ خۆتەسلیمکردن بەتاران‌و مەرجەکانیی بووە...

9-هـەمان ئـەو سیاسـەتە لەزۆربـەی وڵاتـانی تـردا پـێڕەوکرا، بۆیـە بزوتنـەوەی نیشتمانیی‌و رزگاریخوازیی زۆر لەگەلانی چەوساوە لـەباربراوو حوکمـی دیکتـاتۆریی بەناو نیشـتمانیی رەواجـی پێدرا، لەگەڵیشـیاندا پـەڕوباڵی بزوتنـەوەی کۆمۆنیسـتی‌و سۆسیالیسـتیی لـەزۆر وڵاتـاندا کـرا، لەگەڵیشـیاندا هۆیـەکی گرنگـی نـاو هۆیـە بنچینەییەکانی روخانی یەکێتی سۆڤیەت سەریان دەردەهێنا.

-11-

## بەئاسانیی روخانی کۆماری ئازەربایجان

هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان خولقاوی ناو یەك بارودۆخ و هەلومەرجی نێودەوڵەتی و زەمینە رەخساوی ناو یەك ناوچەن، بۆیە لەبەردەم هەڕەشەی دوژمنی هاوبەشدا یەك رێباز یەك چارەنوسیان هەبوو، بۆ ئەوەش بوو پەیمانی سەربازییان ئیمزاکردو لەڕوی تیۆریشەوە زیاتر پێکەوە گرێدران، بۆیە لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی روخانی کۆماری ئازەربایجان، شڵەژان و بێ پشت و پەنایی باڵی بەسەر خەڵکەکەو سەرکردایەتیی کۆماردا کێشا، چونکە بەتەنهاو لەناو کێشەکانی خۆیدا دەبوو بەرەنگاری چارەنوسێکی سەخت بێت، بۆیە دەتوانرێت ئەو روخانەی ئازەربایجان بەیەکێك لەهۆیە راستەوخۆکانی روخانی مەهاباد دابنرێت.

چونکە راستەوخۆ لەورەو گیانی بەربەرەکانی هێنایە خوارەوە، شەپۆلی ورە روخان لەلایەك و حەماسەتی شۆڕشگێڕی و خواستی بەربەرەکانیی دوو لای کۆمەڵانی خەڵك و لێپرسراوانی گرتەوە، بەتایبەتیی دوای کۆبونەوەی مزگەوتی سورو تەواوبوونی دانیشتنەکە بەبڕیاری بەربەرەکانی و خۆڕاگریی، ئەو گیانی خۆبەدەستەوەدان و ورە روخاندنە هەموو لایەکی گرتەوە.

ئەمەش بۆ خۆی یەکێك بوو لەهۆیەکانی خۆبەدەستەوەدانی پێشەوا و هاوڕێکانی.

-12-

## سوود وەرنەگرتن لەتوانای ئابوریی و مرۆڤی ناوچەکانی تری کوردستانی ئێران و هەموو بەشەکانی تری کوردستان

جەمهوریەتی کوردستان تەنها سێیەکی زەمینەی کوردستانی ئێرانی گرتبۆوە، ئیتر ناوچەکانی تر لەژێر دەسەڵاتی رژێمی شادا بوو، کۆمار لەهەموو یارمەتی و داهات و توانای خەڵکی ئەو ناوچانە بێبەش بوو، زیاتر لەوەش لەدژیشی بەکار دەهێنران. کەهەر لەسەرەتاشەوە ئەوە هۆیەکی گرنگی لاوازیی کۆمار بوو..

زیاتریش لەوە مەهاباد لەیارمەتیی هەمەلایەنەی بەشەکانی تری کوردستان و لەسوود وەرگرتن لەدانیشتوانەکانیان، لەیارمەتیی پێویست بێبەش بوو، هوشیاریی سیاسیی و گیانی نیشتمانپەروەریی هێندە کزو لاواز بوون بوواری خستنەگەڕی تواناکان زۆر بەسنورکردبوون، بەتایبەتی بۆ کوردستانی تورکیاو سوریا...

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی نۆهەم

1-د. عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراز ل108.

2-زانا، بیرەوەری دامەزراندنی...، رۆژنامەی خەبات-بەغدا-ژمارە413/1961.

3-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سێ کورتە باس لەسەر سێ روداوی تأریخی لەکوردستانی ئێران/ ئاگوستی/ 1978/ل6.

4-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆنگرەی سێهەم/ / 1973 ل15.

5-لەنامەیەکی دەست خەتی ناوبراوەوە وەرگیراوە. بڕوانە مەحمود مەلا عززەت د.ح.ك.

6-د. عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو ل116.

7-د. عبدالرحمن قاسملو، هەمان سەرچاوە ل106.

8-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سێ کورتە باس ل2.

9-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سێ کورتە باس ل3و 4.

10-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆنگرەی سێیەم ل14.

11-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سێ کورتە باس ل5و6.

12-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆنگرەی سێیەم ل15.

13-هێمن، سەرچاوەی ناوبراو ل28.

14-کەریم حسامی، سەرچاوەی ناوبراو ل25.

15-کەریم حسامی، هەمان سەرچاوە ل26.

16-کەریم حسامی، هەمان سەرچاوە 26.

17-سوارە، روخانی کۆماری ساوای کوردستان، گۆڤاری روناهی بەغدا/ 1960/ژمارە 7و8.

18-حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆنگرەی سێیەم ل14.

19-یەکێك لەنامەکانی قاضی محمد، بەخەتی خۆی.

20-William Eagleton, op, cit .p . 113

**جەمهوریەتی كوردستان: زیاتر لەهەر ڕووداو ئەزمونێكی تری كوردستان دوای یەكەم ئەزمونی حوكمڕانیی و مەلیكایەتییەكەی حوكمی خۆماڵیی دوا یەكەم جەنگی جیهان لە كوردستانی باشوردا، ئەزموونێكی پڕ لە پەندو دەرسی مێژوییە كەدەتوانرێت هەرە سەرەكیەكانیان بەم جۆرە دەستنیشان بكرێن:**

## -1-

## هەلو مەرجی ڕەسیوو بارودۆخی سازاو

هەلومەرجی ڕەسیوی ناو بارودۆخی سازاو، مەرجی سەركەوتنن بۆیە بەبێ سازاویی هۆكارەكانی دامەزراندنی كۆمار، بەبێ ئامادەیی هۆشیارانەو لێزانانەی سیاسەتمەداران بۆ جۆری دامەزراندن و تێگەیشتن لە گرفت و كێشە خۆیی و ناوچەیی و هەرێمیی و نێودەوڵەتییەكان، بەبێ حاڵی بوون لە بایەخی گرنگ و چارەنوسسازی ڕۆڵی زلهێزەكان و هەڵوێستیان لە كۆی كێشەكانی هەرێمەكەو خانەی دۆزی كورد لەسەر شانۆی سیاسیی و ئابووریی و لە ستراتیجەكەی زلهێزی خاوەن قودرەت لەناوچەكەدا، بەبێ ئەوانەو گەلێ شتی تر سەركەوتن، یان سەقامگیر كردن و بەڕێوەبردنی قەوارەیەكی لەوبابەتەی كۆمار، دەبێتە كارێكی قورس و زەحمەت و بگرە مەحاڵیش، لام وایە ئەو هەلومەرجانە یان لە ئارادا نەبوون یان ناكامڵ و لە ئاستی پێویستدا نەبوون، ڕاستە هەندێ لەهۆكارە بابەتیەكان ئامادەبوون بەڵام مانۆڤرو یاریە سیاسیەكان، سەرچاوەی خولقاندن و ئاراستە كردنیان بوون، لێكۆڵینەوەو بڵاوكراوەكانی سەردەمەكەو بەڵگەنامە دەستكەوتووەكان، لەگەڵ ئەو بیرەوەرییانەی تائێستا كەوتونەتە بەردەست، ڕووناكیی دەخەنە سەر لایەنێك لە دروستیی ئەو بۆچون و ڕایانە، بەتایبەتی هۆكارە خۆییەكان كە زۆریان ناكامڵ و كرچ و كاڵ بوون، لە ئاست ڕووداوێكی وا گەورەو دیپلۆماسیەتێكی وا ئاڵۆزوو ململانێی زلهێزەكاندا نەبوون.

-2-

## گەشەکردنی هەستو نەستی نەتەوەیی‌و هۆشیاریی سیاسیی بناغەی سەرکەوتنن

یەکێك لە هۆیە هەرە گرنگ‌و بنچینەییەکانی سەرنەکەوتنی کورد لە خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌دا، لاوازیی هەست‌و نەستی نەتەوەیی‌و کزیی هۆشیاریی سیاسیی بووە، چونکە ئەوانە مەرجی سەرەکین بۆ حاڵی بوونی جەماوەر لە رۆڵی خۆی، لە ئەرکەکانی سەر شانی، بۆ تێگەیشتن لە کێشەی سیاسی‌و دیموکراسی‌و نیشتمانی‌و نەتەوەیی میللەتەکەی، حاڵی بوون لە خۆی‌و دەوروپشتی‌و لەهێزە هەرێمیی‌و جیهانیەکان‌و رۆڵی هەریەکەیان لەناوچەکەو هەڵوێستی هەریەکەیان لە دۆزی کورد، لە تێگەیشتن لەئاستی پێگەییوی هەلومەرجەکان‌و رادەی ئامادەیی جەماوەر، لە تێگەیشتن لەنەخشەو ستراتیجی هەریەکەو جێگەی کوردو کێشەکەی لەسەرشانۆی سیاسی‌و سەربازیی‌و ئابووری لەناو ململانێیەکاندا.

لەوانەشدا تەنها سۆزی رووکەش‌و قسەو گوتار نوسین بەس نین، بەتەنها شانازی بە خۆوە کردن بەتەنها کورد بوون‌و ئامادەیی بۆ خەبات بەس نییە، بەڵکو ئەو هۆشیاریی‌و تێگەیشتنانەی کە مرۆڤی کورد دەخاتە سەر رێبازە دروست‌و مێژووییەکە، کە تێکۆشەر هۆشمەند دەکات‌و دەزانێت بۆچی خەبات دەکات کە خەڵکانی تێکۆشەرو سیاسیی هۆشیار دەخاتە ئەو ئاستەی کە بزانێت چۆن متمانە ئەدات بە سەرکردەو سەرکردایەتی خۆی‌و چۆن هەڵیدەبژێرێت‌و لەگەڵی دەبێت‌و لە کاتی شکستیی‌و کارەساتەکاندا چۆن هەڵوێست وەردەگرێت..چۆن هەست‌و نەستی نەتەوەیی بزوتنەوە دەخولقێنن، کۆمەلانی خەڵك دەبزوێنن بۆ وەدەستهێنانی پێناسەی نەتەوەیی خۆی،چۆن ئەوانە هۆکاری گرنگی رزگارین... لەقۆناغی رزگاریشدا لەدامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییدا... ئەم دەوڵەتەش دەبێتە فاکتەری زیاتر کامڵترو خەملاندنی بنەماکانی نەتەوە، بەرەو شارستانیەت، ئەگەر لەسەرەتاوە مەسەلەی دیموکراسی بەشێك بێت لەپرۆسەی رزگاریی‌و ئینجا لەبینای دەوڵەتی یاساو سەردەمدا..

-3-

## مەسەلەی نەتەوەیی گەلی کورد لە رزگاری چینە زەحمەت کێشەکان و سەرجەم چینە نیشتمانپەروەرەکاندا خۆی دەبینێتەوە..

قۆنـاغی رزگـاریی نیشـتمانی بـۆ نەتەوەیـەکی دابەشـکراویی داگـیر کـراوو چەوساوەو ماف زەوت کراوی وەك نەتەوەی کوردکە لە کێشە هەرە ئاڵۆزو پڕ لە گرێ کوێرەکانی ناوچەکەو جیهانە. ئەوانە بوونەتە هۆی ئەوەکەخاوەن خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی بێت...ئەو تایبەتێتیەش بۆتە هۆی ئەوە کە کێشەو خەبات و سەرفرازیی لە قۆناغەکەدا کێشەو خەباتی هەموو چین و بەش و توێژاڵەکانی نەتەوە بێت، نەك هەر سەبارەت بەوە کە هەموویان، جگە لەو توێژاڵ و گروپانەی لە پلە جیاجیاکاندا دەبنە هاوکارو داردەست و داگیرکەر، چەوساوەو زوڵملێکراوو ماف زەوتکراوی دەستی داگیر کەرن، بەڵکو لەبەرئەوەش کە چارەنوسی هەموویان پێکەوە بەستراوە، ئەزمونی خەباتی دوورودرێژی کورد، بەتایبەتی لەنیو سەدەی رابردودا، ئەوە دەسەلمێنن کە تەنانەت هاوکارانی ریزەکانی دەوڵەتی ناوەندیی لەشەڕی چەکداریدا، ئەو هەرەشەیەو دوا چەپۆکی کوشندە ئەوانیش دەگرێتەوە، چونکە چەوساندنەوەکە چەند لایەنییە راستەوخۆکانی نەتەوەیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتین، ئەوانەش، بێ بوواردان، هەموو لایەك دەگرنەوە، بێلایەن و بەلایەن نیشتمانپەروەروو ئازادوو دیموکرات لێیان قوتار نابن، دیسانەوە ئەزموونەکانی شەڕی چەکداریی و بزوتنەوەی کوردایەتی لەمەهاباد، ئەوەیان سەلماندووە کە ئەرکی گەورەی خەبات لەسەر شانی جوتیاران و زەحمەتکێشانی لادێ و بیروبازوی شار بووە، ئەگەرچی ئەمڕۆ گەلێ لە هەلومەرجەکانی خەبات، بەتایبەتی چەکداریی، وەك جاران نەماوەو گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە، لەگەڵ ئەوانەشداو تارادەیەکی زۆر ئامانجی خەباتی ئەمڕۆش کە سەرفرازییە هەر لە رزگاریی ئەوانەدا خۆی دەبینێتەوەو لە سەرکەوتنیشدا دەکرێت دەستکەوتەکانیان و بەرژەوەندیەکانیان رەچاو بکرێن و بۆیان دابین بکرێن، لەگەڵیشیدا پێویستە خەسڵەتە تایبەتیەکانی پلەکانی قۆناغەکە لە رووی چینایەتی و کۆمەڵایەتیەکانەوە لەبەرچاوبن و لەو راستییە حاڵی ببین کە تا

قەوارەی سەقامگیرو سەربەخۆو دەوڵەتی یاسا لە ئارادا نەبێت، تا هەرەشەکان بەردەوامبن، گۆڕانی بنەڕەتی لەو لایەنەدا نابێت و ناکرێت.

-4-

## یەکێتی ریزەکانی گەل و بڕوابوون بە دیالۆگی شارستانیانە

مەرجێکی گرنگی سەرکەوتنە.. ئەوانەش لەگەڵ هۆکارەکانی تردا، کامڵبوونی هەست و نەستی نەتەوەیی و هۆشیاریی سیاسی دەرەخسێنن و دەخەملێنن، ناتەبایی و پارچە پارچە بوون و ناکۆکی نائاسایی و لا خستنی بەرژەوەندییە نەتەوەیی و میللییەکانلەکۆسپە گەورەکانی بەردەم ڕێبازو ئامانجە ستراتیجییەکەی نەتەوەی کوردن، هەوڵدان بۆ لابەلاکردنی کێشەو گرێ و گۆڵەکان بەهێمنی و لە ڕێگەی لەیەکگەیشتن و دانیشتن و دیالۆگی شارستانیەوە، پێچەوانەکەشی دەبێتە هۆی قوڵکردنەوەی ناکۆکی و تەقینەوەو خولقانی ئاژاوەو شەڕی ناوخۆ، بۆ خەبات و کاروانی خەباتی میللەت بە زیان و مەینەت خولقێنەرە.. جێگۆرکێ لە لایەنەکانی ململانێ و کردنی ناکۆکیی ناو بەرەی گەل بەناکۆکی سەرەکی و پشت کردنە سەرەکیەکە یان هاوکاریکردن لە دژی هێزەکانی بەرەی گەل لەکارەسات و مەینەتی و شکستی زیاتر هیچیان لێ بەرهەم نایەت. هەر یەکێتیی ریزەکانی گەلە کەدەستەبەری سەرکەوتن بێت، یەکخستنی هێزو توانای چین و بەشە کۆمەڵایەتییەکانە کە ڕێگەی سەرکەوتن دیار ئەکات.

-5-

## مانەوەی ڕژێمی دەرەبەگی و سیستمی خێڵەکی
## هۆیەکی گرنگ بوو لەبەردەوام بوونی داگیر کردن و چەوساندنەوە...

کۆسپێکی گەورە بوو لەبەردەم پێشکەوتن و سەرفرازبوون لەداب و نەریتە کۆنەپارێزەکان، تەگەرە بوون لەبەردەم کامڵبوونی هەستی نەتەوەیی و هۆشیاریی سیاسیی و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و فیکری و خوێندەواریی و ئابووریەکان،

پایـەگاکانی داگـیرکردن و ناکۆکیـەکانی ناوخۆیـان بـەهێزتر دەکـرد، دژ بەئـەقڵی شارستانی و پێشکەوتن بوون، لـەناو مانـەوەی ئـەو رژێم و سیستـەمەدا یان تەنانـەت لـەناو مانـەوەی شوێنەوارەکانیاندا دەوڵـەتی نەتـەوەیی دانامـەزرێت، ناسیـۆنالیزمی نوێ کامڵ نابێت، خـەباتی یـەکگرتوو نایـەتـە دی، دیموکراتـی و ژیـانی فـرە حزبـی و پەرلـەمانی و یاسایی نـاخوڵقێن یـان ئەگـەر بـارودۆخێکی تایبـەتی یارمـەتیدەری خوڵقاندنی بێت وا سەقامگیر نابێت و هەمیشە لە بەردەم هەرەشەی ناوخۆدا دەبێت.

## -6-

## ستراتیجێکی نەتەوەیی و یەکخستنی هێزەکانی گەل ڕەخساندنی بەرەیەکی نیشتمانی.

سەرەتایـە بۆ خـەباتێکی گونجـاوی نـاو هەل‌ومـەرجی رەخسـاو لەسـەر رێبـازێکی دروست بۆ ئامانجە پلەیی و دورخایەنەکان، ئەوانەش لە تەبایی ریزەکانی گەلەوە، لە دەرککردن و هەست بە لێپرسراویەتی کردنـەوە دێنـە ئاراوە، بـێ ئـەو ستراتیجەو بـێ ئـەو بەرەیـە، سـەرکەوتن زەحمـەتتر دەبێـت بگـرە نشوسـتیی و شکسـتیی هەرەشـە لەدەسـتکەوتەکانیش دەکـات، لەوانەشـدا دەبێـت تایبەتێتییـەکانی هـەر پارچەیـەك، جیۆپۆلۆتیکی کوردستان، دەستکەوتەکان لەبەرچاو بن، هێزەکانی هـەر پارچەیەك لـە وردەکاریـــەکانی ئەومەســـەلانە بگـــەن و بـــەپێی دەســـتکەوتەکان بجوڵێنـــەوە، تەبا و سازاوو هاوکاربن..

## -7-

## لە خۆو لە دوژمن گەیشتن و دیاریکردنی دوژمنە سەرەکی و ناسەرەکیەکان

مـەرجێکی تـری خـەباتی نەتەوەیـە، ، بـێ لـە خـۆ گەیشـتن لـە هـەموو لایـەن و ڕووداوەکانیانەوە، بێ لە تواناکانی خۆ گەیشتن بێ لە بۆشایی و کەم و کورتی و هەڵەو هـەل و مەرجـەکان حـاڵی بوون، بـێ ناسـینی دوژمنەکـەو حـاڵیبوون لـە هـێزو توانـاو توانستی ئابووریی و سەربازی و سیاسیی و دیپلۆماسی و پەیوەندیەکان، بەبێ ئەوانە زەحمەتە کاروانی خەبات ڕووەو سەرکەوتن رابەریی بکرێت.. ڕووبەڕووبوونەوەکان بە زیانی گەورە کۆتایی دێن.

لەگەڵ ئەوانەشدا ناسینی دۆستو دوژمنی سەرەکیو ناسەرەکیی، زانینو ناسینی هەرەشەی راستەوخۆو پڕ لە مەترسی، لەسەرەتا گرنگو هەستیارەکانی نەخشەی ململانێو گەشە پێکردنی خەباتو زۆرانبازیی راستەوخۆیە..

## -8-

## حاڵی بوون لە جیۆپۆلۆتیکی کوردستان

بونی پارچەکانی کوردستان لە سنوری چەند دەوڵەتێکی جیاجیادا، هەم کێشەکەی کوردی ئاڵۆز کردووە هەم جیۆپۆلۆتیکەکەی پڕ لە گرێو گۆڵ کردووە، تائێستا هیچ دەوڵەتێکیان ئامادەنەبووە بۆ چارەسەری کێشەی کورد بەرێگەی ئاشتیو لێکگەیشتن، بۆیە دەرگای چارەسەرکردنی مەسەلەکەی لەسەر داخراوە. زیاتر لەوەش هەر چەندە دەوڵەتانی چوار دەوری کوردستان لە هەرێمەکەدا دەیان ناکۆکی کۆنو نوێ، کردوونی بە دوژمنی کلاسیکیو نوێی یەکتری، کەچی لە کێشەیکورددا تەبانو ئێستا لە زۆر لایەنەوە هاوکاری یەکتر دەکەن، لەلایەکی تر پارچە پارچەبوونی کوردو ژیانی فرە حزبیو بەنائاسایی دامەزراندنی ئەم حزبو ئەو رێکخراو لەهەر پارچەیەکدا فرە ئایدۆلۆجیو ئامانجو بیرو کارو کردەوەو نەخشەو تەکتیك، بارودخەکەیان زۆر زیاتر ئاڵۆز کردووە، چونکە ناکۆکیەکانی نێوانیان بەردەوامە، ململانێ بەردەوامە گوێ نەدان بە دەست کەوتەکان بەردەوامە، حاڵینەبوون لە ئەزمونەکانو بایەخیانو گرتنەبەری سیاسەتێکی تاکرەوانە زیاتر دەوام ئەدات بەبارودۆخەکەو کێشەکانیان زیاتر گرێ کوێراویی کردووە.

ئەوەی ئەمرۆ لەرەوتی گەشەکردنو پێشکەوتنەکاندا جێگەی هیوایە، جیهانگیرییو رۆڵی لایەنی ئابووریو کردنەوەی سنوورەکان کە پێدەچێت لەسەرەنجامدا جیۆئیکۆنۆمی جێگە بەرۆڵی جیۆپۆلتیك لێژ بکاتو ئاسۆیەکی باشتر بۆ کورد برەخسێت.

## -9-

## بەنێونەتەوەیی کردنی کێشەی کوردو تێگەیشتن لە بارودۆخە سیاسیەکان

دەروازەیەکی گەورە لەبەردەم رزگار بووندا دەکاتەوە، ئەمڕۆ زیاتر لە هەمو رۆژێکی تر بایەخی نێو نەتەوەیی کردنی دۆزی کورد لەبەرچاوە، هەوڵوکۆششی سیاسی و خەباتی دیپلۆماسی بۆ باش جێگیرترکردنی ئەم نێونەتەوەیی بوونە، بایەخدان بەدۆزی کوردو کێشەی نەتەوەیی کورد یەکێك لە شا رێگە گرنگەکانی خەباتی ئەم قۆناغەیە، لەبەرئەوە هەوڵی خوێندنەوەی بارودۆخە سیاسیەکان و رۆڵی زلهێزەکان زۆر گرنگە، چونکە لەوەدا خانەی کورد لەسەر شانۆی سیاسی نێو دەوڵەتی دەبینرێتەوە دەتوانرێت بەپێی جێگەی دۆزەکەو تواناو هەوڵ و کۆششی کورد ئاراستە بکرێت.

## -10-

## شۆرشی چەکداری و حاڵی بوون لە بارودۆخە سیاسیەکان. بۆ دانانی نەخشەو شێوەی خەبات

ئەمڕۆ زیاتر لە هەموو رۆژێکی تر بایەخی خەباتی سیاسی و دیپلۆماسی دەرکەوتووە هەندێ لایەنی ستراتیجی شەڕی چەکدار زیاتر دەرکەوتووە، باش لە زیانەکانی سەردەمی شەڕە سەپێنراوەکە بەسەر کوردا دەگەین-لە قودرەتی هێزو دەوڵەتەکان دەگەین، لە زیانەکانی شەڕی نابەرامبەریی دەگەین.

بۆیە ستراتیجی شەڕی سەربازی نوێ بە حاڵی بوون لە کۆی ئەو هۆو هۆکارانەی راستەوخۆو ناراستەوخۆ بەستراوەی نەخشەو شەڕی چەکدارین زۆر گرنگە، با دەرس و پەند لە ئەزمونەکانی رابردوو وەربگیرێ و هۆوهۆکارەکانی شکستیش دەستنیشان بکرێن.

-11-

تەبایی لەگەڵ حزبو هێزەکانی ناوسنوری حوکمڕانی سیاسیی هەر وڵاتەو خەبات بۆ خوڵقاندنی بەرەی نیشتمانیی، ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی نەخشەی خەباتی سەرکەوتوو، ئەوەش بواری هاوکاریو هاوڕێبازی خەبات دەهێنێتە ناو زنجیرەی هۆو هەلو مەرجاکانی سەرکەوتنەوە، لەسەر ئەو ڕێبازەش دەتوانرێت خەبات بۆ سستمێکی دیموکراسیو ژیانێکی هاوسانو بێ چەوساندنەوە بکرێت...

-12-

خۆ بەستنەوە بە بۆچوونو نەخشەو ڕێبازێك، کەئازادیی سیاسەتو جوڵەو مامەڵەدەخوڵقێنێت. بیرکراوەییو دەست واڵا بوون بۆ ئازادیی لە نەخشەدانانو لە مامەڵەدا بۆ خەباتو بۆ سەرکەوتنو ، زۆر گرنگن، هوشیاریی لەمامەڵە سیاسییو هاوکاریی لەناو کاروانە پڕ لەهەڵبەزوو دابەزەکەدا، لەبەردەم ئاڵوگۆڕە لەپڕو تێکچونو خوڵقانی موعادەلە سیاسییو سەربازییەکان، بزوتنەوەی ڕزگاریخواز لەکارەساتو نشوستی بەدوور دەکات.

بۆ ئەوەی ڕوونترو نوێتر بچینە ناو تێکڕای ڕووداوەکانی کۆمارەوە چاکتر وایە لە تێڕوانینێکی سەردەمەوە بچینەوە ناو کۆمارەکە بەلەبەرچاوگرتنی ڕۆڵ و کارتێکردنی هەلومەرجەکانی زەمین و زەمانە جیاجیاکان. باشیش وایەلە پێش دامەزراندنەوە بچینە ناو ڕووداوەکانەوە تاباشتر لە دەرس و پەندەکانی ئاشنابین و ببنە ڕێنمایی ئێستاو ئایندە.

دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان لە بەشێکی کوردستانی ئێراندا یەك هەل و ئەزموونی مێژوویی ئەوتۆیە کە تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ زیاتر بایەخی دەردەکەوێ و پتر سوود بەخش دەبێ، بەتایبەتی تائێستاش زۆر لایەن و ڕووداوی شاردراوەن، سەرچاوەی سەردەمەکە نەخراوەتە خزمەت ئەو نوسین و باس و لێکۆڵینەوانەی تا ئێستا کراون.. یان لە سنورێکی تەسکدا سوودیان لێوەرگیراوە.. سەنگی مێژوویی ئەم ڕووداوە چەند لایەنیە، ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم:

یەکەم: ئەزموونێکی سەردەمی ئازادیی و نیمچە سەربەخۆیی بەشێکی نەتەوەی کوردە، هەرچەندە تەمەن کورت بوو، بەڵام پڕ لە دەرس و پەندە.

دووهەم: بە ماوەیەکی کورت دوای ئەزموونێکی مەزنی تر خوڵقا، مەبەستم حوکمداری و مەلیکایەتیەکەی شێخ مەحمودی نەمرە، پێش ئەوەی کوردستانی باشوور بلکێنرێت بە میسۆپۆتامیاوەو بەدەستی بەریتانیاو دژ بە خواستی میللەت، ئەم دەوڵەتەی عیرقیان لێ دابمەزرێت.

سێهەم: بونی گەلێ دیاردەی یەکانگیرو لەیەکچووی گەلێ لایەنی ئەو هەلە مێژوویە لەگەڵ ئەم ئەزموونەی ئێستای کوردستانی عیراقدا کەلەڕاپەڕین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و کوردستانی فیدراڵەوە، دەست پێدەکات.. بۆیە ئەو تاقیکردنەوەیە گرنگیەکی تری سەردەمی هەیەو دەبێ زیاتر ڕووناکی بخرێتە سەر.

## ئاوڕێك لە ڕۆژانی پێش دامەزراندن

لەناو بارودۆخێکی نائاسایی و پڕ لە ئاژاوەو گرفتی زل و قەبەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی دوا دووەم جەنگی جیهان، لەناو هەل و مەرجی هاتنەکایەی زەمینەی جەنگی ساردو بەدەست هێنانی چەکی ئەتۆم و ململانێی ئاشکراو نهێنیدا بوو کە هەلە مێژوویەکە بۆ کورد خولقاو کۆماری خود موختاری کوردستان لەبەشێکی کوردستانی ئێراندا دامەزرێنرا، چونکە ئەو ئاژاوەو نائارامیە ڕۆژهەلاتیشی گرتبۆوە. لەناویاندا دەوڵەتی فرە نەتەوەی ئێران زیاتر ئاڵۆز ببوو، سەبارەت بە هاوکارییەکەی ڕژێمی تاران لەگەڵ ئەڵمانەکاندا بەبێ ئەوەی ئامۆژگاری و هەڕەشەی ئینگلیزو ڕووسەکان کاریکاتە سەری، بۆیە لە25ی ئابی 1941دا هێزەکانیان:

یەکەم: لە ڕۆژئاواو خوارووی ڕۆژئاواو دووهەم: لەسەرەوە، زۆر لەناوچەکانی ئێرانیان داگیرکرد کە پانتایەکی زۆری کوردستانی ڕۆژهەلاتیشی گرتبۆوە، بەهەمان دیاردەی دوو داگیرکەرییەوە، بەشی لای خوارووی لە ژێر دەستی بەریتانیا، بەشی سەرووی لە ژێر دەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەتدا بوو کەناوچەکانی: مەهاباد، بۆکان، شنۆ، نەغەدە سێبەری بوون..سەقزو بانەو مەریوان ناوچەی بۆشایی نێوان هەردوو هێزەکە بوون، جۆرێ لە GENTELMEN AGREEMENTی بێ لایەنی لەسەر سەقزو دەوروبەری بڕیار لەسەر درابوو..

لە دوایشدا هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێگەی خۆیان لە خوارووی ئێراندا گرت. هەرچەندە مەبەستی ناوکۆی زلهێزەکان لەسەرەتادا، دوورخستنەوەی نفووزی ئەڵمانیا، مسۆگەر کردنی گەیاندنی چەك و پێویستیەکانی جەنگ بۆ هێزەکانی سۆڤیەت، وەپاراستنی کێڵگەو بیرە نەوت و بەرژەوەندییە چاوەڕوانکراوەکانیان بوو، هەر دەوڵەتەش خواست و نەخشەی تایبەتی خۆی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو داگیر کردنە کەم و زۆر بۆ بەرژەوەندی گەلانی ناوچەکە نەبوو، بەلام ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ببوە هۆی وریا کردنەوەو جولاندنەوەی نەتەوە جیاجیاکان. کاتێکیش دام و دەزگای دەوڵەتی و ئەرتەش لە هەندێ ناوچەو شاردا داڕوخان، ئاوهەوایەکی نیمچە ئازادو دیموکراسی خولقا.. گەلێ ڕووداوی گرنگ ئەو

بەشەی كوردستانی ئێرانی گرتەوە، وەك سەرەنجامێكی ئەو بارودۆخە نوێیە، لەوانە:

× لە ساڵەكانی 1942-1946 بەڕێوەبەرایەتیەكی خۆماڵی لە ناوچەی موكریانو دەوروبەری دامەزرا بە سازكردنی دەستەی چەكدار، دامو دەزگاكانی بەڕێوە بردن، چاپخانەو دامەزراندنی كۆمەڵەی ژێكو دواتر حیزبی دیموكراتی كوردستان..هتد(1)

× لە ساڵانی1941-944 حەمە ڕەشید خان ناوچەكانی بانەو سەردەشتو سەقزی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. سەرەنجام ئەرتەشی تاران بە هاندانی ئینگیلزەكانو یارمەتی هەندێ عەشایەری كورد هێزەكەی ناوبراویان لە كەلی خان شكاندو بەناچاری پەنای بۆ عیراق برد(2).

× لەبەهاری(1322-1943)تیرەو ئیلەكانی ناوچەی ورمێ بەسەركردایەتی عومەرخانی شەریفی، زیرو بەگی بەهادوری ڕەشید بەگی جیهانگیری وەتەها بەگی هەركی بە هەندێ داخوازی عەشایەریو نەتەوەیەوە دێهاتی ناوچەكەیان گرتە ژێر دەستو ئابلۆقەی شاری ورمێیان دا، تا ڕۆسەكان كەوتنە ناوبژیو لەگەڵ تاراندا ڕێكیانی خستەوە.

× لە16ی ئەیلولی1942 كۆمەڵەی ژێ-كاف دامەزرێنرا، بە دورشمە نەتەوایەتییە مێژوویەكەوە(رزگاركردنی كوردستانی گەورە)هاتە سەر شانۆی سیاسی كوردستان، لە دواییدا هەر لە شوێنەواری ئەم ڕێكخراوە حزبی دیموكراتی كوردستان دامەزرێنرا، لەوەدا هەندێك پێیان وایە تەنها ناووبەرنامە گۆرین بووە، حزبەكە خۆشی دوای ساڵێك لە ئاڵوگۆرەكە یادی پێنجەمین ساڵەی دامەزراندنی كردووە نەك یەكەمین..مانای خۆی بە درێژە پێدەری ژێ-كاف دادەنا.

دوای لێدانی نفووزی ئەڵمانیاو دڵنیا بوون لە ساغ بوونەوەی ئێران بۆ زلهێزە هاوپەیمانەكان، بەریتانیاو وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە هۆشیاریو گومانەوە چاودێری جموجوڵی لەشكری سووروو ڕووداوەكانی ئازەربایجانو كوردستانیان دەكرد، مەبەستیان بوو لەناو نەخشەیەكی هاوبەشدا ئێران بە سنورە جوگرافیو سیاسیەكەیەوە بپارێزێ، بەیارمەتی دانی ڕژێمەكەو حەمەرەزا شا كە لەجێگای باوكی دانرا، بە جێگیركردنی هێزەكانی خۆیانو نفووزی سیاسییان، وە بەلەقكردنی جێگەی لەشكری سووروو كۆتایی هێنان بەو ئاڵۆزییەی تیندێسنی یاخیبوونو

دیاردەی پارچە پارچە کردنی ئێرانی هێنا بووە ئاراوە، بۆیە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا کە ناوەندەکەی کرماشان بوو بە کش‌و ماتی‌و بە ئارام مانەوە.

سەبارەت بەوانە لەگەڵ جەنگ وەستان‌و خۆ بەدەستەوەدانی ئەڵمانیا، ئەو دوو دەوڵەتە کەوتنە سەر ڕێبازی گوشار خستنە سەر ڕووسەکان بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی ئەو پەیمان‌و پرۆتۆکۆڵ‌و ڕێکەوتنانەی دەربارەی ئێران مۆر کرابوون، داواکانیش سادەو ئاسایی بوون هەر لەو سنورەدا بوون کە ڕووسەکان بەڵێنەکانی خۆیان لەکاتی خۆیدا جێبەجێ بکەن، بۆ ئاسانکردنی کارەکەو نەهێشتنی هیچ بڕو بیانویەك، هێزەکانی ئەمریکا لە 31ی کانونی دووەمی 1945دا هێزەکانی بەریتانیا لە 2ی ئازاری 1946دا لە ئێران کشانەوە.

بۆیە یەکێتی سۆڤیەت بیانویەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەمابوو بۆ مانەوەو نەکشانەوە، لێکدانەوەیەکی زۆریشیان لەسەر بەرەنگار نەبونێکی نوێ دەکرد، ئێرانیش لە ڕووی نەوت‌و ستراتیجی سەربازییەوە، بایەخێکی بێ وێنەی بۆی هەبوو، هەروەك چۆن بایەخی ستراتیجی‌و نەوتی بۆ و بەریتانیاو وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا هەبوو.

ئا لەو بارودخە نێودەوڵەتیەدا لێپرسراوانی سۆڤیەت کەوتنە سەر دەستپێکردنی یاریەکی سیاسیی گوشار سروشت، بەناوەڕۆك‌و خواستیش بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکان بوو، بە دیمەنیش دەستگرتن‌و یارمەتی دانی دوو گەلی ئازەرو کورد بوو.

ئەوەبوو ئاگاداری لێپرسراوانی ئازەرو کورد کرا کە کاتی ئەوە هاتووە سەردانی(باکۆ) بکەن بە داخوازیەکانیانەوە، تا وتوێژ لەسەر جێبەجێ کردنی بکرێت.(3) پێشەکی زۆر هەوڵ درا کە کورد بە ئازەربایجانەوە ببەسترێتەوە، بێ ئەوەی بتوانن رابەرانی کورد رازی بکەن.

بۆیە پرۆسەی دامەزراندنی کۆماری ئازەربایجان دەست پێکراو لە 11ی کانونی یەکەمی 1945دا بانگەوازێ بڵاوکرایەوە(4).

دوابەدوای ئەوە لە 2ی ڕێبەندانی 1324(22ی کانونی دووەمی 1946) دامەزراندنیجەمهوریەتی کوردستان بڵاوکرایەوە.

## کێشەکان لەناو سێ بازنەدا

ئەوەی زۆر گرنگ و جێگەی سەرنجە ئەو دامەزراندن و بڵاوکردنەوەیە یەك لایەنی بوو، هیچ مامەڵەیەکی سیاسی و دیپلۆماسی نێو دەوڵەتی لەگەڵدا نەبوو. جگە لە ئازەربێجان–تەنانەت یەکێتی سۆڤیەتیش هیچ جۆرە هەنگاوێکی لەو بابەتەی نەنا، هەرچەندە سەرەك کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران(هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان)بە سەرۆکایەتی حاجی بابەشێخ هاتنە سەر شانۆی کار، دام و دەزگاکانی حکومەت دامەزرێنران، لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم قەوارەیە هەرچەندە لەناو شەرعیەتی یاسایی و کۆبونەوەیەکی بیست هەزار کەسی کە وەك مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆ دێتە بەرچاوو هاتە ئاراوەو لە ژێر سێبەری زلهێزێکدا بوو، بەدەر لە بازنەی شەرعیەتی سنووری سیاسی و جوگرافی ئێران، کەوەك داگیر کەرێك، هەر بیریشی لەوە نەدەکردەوە ددان بەبوونی کۆماردا بنێ، سەرکردەو رابەری کۆمار بە نوسین و بە گوتەو بە جوڵە کۆمارەکەیان بەبەشێکی جیا نەبوەوە لە ئێران دادەنا خۆیان بە یاسای ناوەندەوە بەستبۆوە.. زەمینەکەیان بە بەشێکی زەوی ئێران دادەنا، تەواو بڕوایان بە گفتوگۆ بوو... لەگەڵ ئەوانەشدا هیچ جۆرە نەرمییەك و ئامادەبوونێك بۆ سەلماندنی جۆرێ لە مافی نەتەوایەتی پیشان نەدەدرا بگرە بە ئاشکراو لەسەر نەخشەی لەناو بردن کاریان دەکرد.

دیسان بۆ بازنەی نێو دەوڵەتی و مامەڵەی دیپلۆماسی بە دابڕاوی مایەوە، هەرچەندە سەرەك کۆمار لە دەرگای سیاسی و دیپلۆماسیی، هەرسێ دەوڵەتانی خۆرئاوای‌دا، بەڵام بێ وەرام بوون، ڕووسەکانیش لەناو کێشە زل و قەبەکانی خۆیاندا دەژیان و کاریان بۆ نەخشەی خۆیان دەکرد.

سەبارەت بەوانە کۆمارەکەی کورد هەرلە بەوەلەدبونیەوە لەناو سێ بازنەی پڕ لەکێشەدا دەژیا: کێشەی نەبوونی شەرعیەتی نێودەوڵەتان، کێشەی نەبونی شەرعیەتی هەرێمی و ناوچەیی و رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ پایتەخت، وە کێشەی ئابووری و سەربازی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی ناوخۆو نادیاری ئایندەو چارەنووسی کۆمار.

زیاتر لەوانەش، دوژمن و زلهێزە هاوکارەکانی، بارەکەیان زۆر بە پڕ مەترسی تر لە واقیع وەردەگرت، لەسەر حسابی لەت و پەت کردنی ئێران، گریمانی تەشەنەکردنی

کێشـەی کوردیـان دەکـرد بەھەرشـە لەسـەر پاشـەڕۆژێکی نادیـارو ئێسـتایەکی پـڕ لەمەترسیی. بڕوانە ئەم ھەواڵە کەمیدیای ئەو ڕۆژگارە بڵاوی کردبۆوە، لەڕۆژنامـەی کوردستانیشدا بەم جۆرە خرایە پێش چاو:

(دەنگوباسی دەرەوە)

ڕادیۆی بەیروت–لە خەبەرێکی کە پێمان گەییوەو لە قاهیرەوە وەرگیراوە دەوڵەتی جمھوری لـە ئـازەر بایجـان دامـەزراوەو، سـەرۆك جمـھوی کوردسـتان جـەنابی قـازی محەمـەدو پایتـەختی کوردسـتان ئـازاد شـاری مـھاباد، ئـەو جمـھوری کوردسـتانە داخـوازی وەسـەر گیرانی کوردستانی عیراق‌و تورکیا دەکـات مـەرام‌و ئـارەزووی وان سەربەستی‌و سەربەخۆیی کوردستانی گەورەیە مـەلا مستەفا بارزانی قائیدی شـەڕی بـارزان کـە ویستا لـە دەوڵـەتی جمـھوری کوردسـتان دادەنیشـێ لـەو جمھوریەتـە زۆر بەقەدرو حورمەتە.

ڕادیۆی بەیروت: بـەخبریك کـە لـە مەکتـەبی سیاسـی واشـنتۆن وەرگیراوە دەڵێـت مەسـەلەی ئـێران کەوتۆتـە مـەوقعێکی زەحمەتـەوە هـەتا کوردەکـان ئێسـتا داوای ئیستقلالی خۆیان دەکەن‌و زۆر مومکنە کە ئەم حرکاتانە ببنە سەبەبی یەکێتی هـەموو کورد بۆ داواکردنی استقلالی کوردستانی گەورە(5).

ئەوە لە کـاتێکدا ئـەو جـۆرە بیروتێندینسـە لـەناو نەخشـەو بڕیـاری داڕێژەرانـی سیاسـی کـوردا نـەبووە، خـۆ ڕووسـەکانیش هـەر تـەواو دژی کـاری وا بـوون، بگـرە نکوڵیشیان لە بوونی پەیوەندی‌و یارمەتیدانی ئەو کۆمارە خودموختارەش دەکرد.

لەنـاو ئـەو ئـاوو ھەوایـەدا وە بـۆ بـەرەنگار بونـی ئـەو دیاردانـە(ئەحمـەد قوام‌ولسەلتەنە) لەناو دیپلۆماسیەتی پڕ لە فڕو فێڵی ڕژێمی شاو مانۆڤری سیاسی سـەرکەوتووانە کەوتـە بـەکار خسـتنی ئەڵقـەکانی نەخشـەی یارییـەکی سیاسـی‌و دیپلۆماسی، سیما دڵسۆز بە گەل‌و داخوازیەکانی، دۆستانە بە یەکێتی سۆڤیەت‌و باش دراوسێتی، لـەناوەڕۆك‌و مەبەستیشدا بـۆ پـوچ کردنـەوەی مـانۆڤرو یاریەکـەی ڕووسەکان، بۆ کشانەوەی لەشکری سوور وە دەستبەرداربوون بوو لە ئازەرو کورد.

بۆیە کەوتە ھەنگاو نان بۆ ئەنجام دانی ڕیفۆرمی سیاسی‌و کۆمەلایەتی، کارکردن بۆ پرۆسـەی دیموکراسـی لەلایـەك، گـەرم کردنـی هـاتوچۆو پـەیوەندی گفتوگۆ لەگـەڵ

لێپرسراوانی مۆسکۆ لەلایەکی تر، تا پەیمانی دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوت مۆرکرا(6)، بەوەش ڕووسەکان ئاواتەکەیان بەدی هات.

لەسەرەنجامدا دوا بەشی لەشکری سوور لە 27ی نیسانی 1946 ئێرانی بەجێهێشت(7). هەموو ئەو چەك و تەقەمەنییە قورسانەی هەبوون وەریان گرتەوە، لەوانە دوو فرۆکەی بێ بۆمبا و چوار تۆپی کۆن کە لەڕۆژانی مەترسی و بۆ بەهێزکردنی بەرەکان لەکوردستان دوو دانەیان بۆ مەهاباد نێررا بو وەك کۆمەکی سەربازیی(8) بەو جۆرە دەردەکەوێت کە هۆو یارمەتیدەرە سەرەکییەکانی دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان:

بارودۆخی نێودەوڵەتان و ململانێیان، داڕوخانی دام و دەزگا و ئەرتەشی تاران، دروست بونی بۆشایی بەڕێوەبردن، یاری و مانۆڕی سیاسیی هەمەلایەنە لەگەڵ گەلێ هۆی تریش دەستەبەری بەپیرەوە چوونی ڕووداوەکەو دامەزراندنی کۆمار بوو، بەتایبەتی هیوا و خواستی جەماوەر لەرزگاری، بوونی حزبی دیموکراتی کوردستان و پێشەوا قازی محەمەد بوو.

بەڵام ئەوانە هەموو شتێك نەبوون، زەمینەی ڕەسیوی دامەزراندنی قەوارەیەکی خاوەن هەل و مەرجی ژیان و داکۆکی لە خۆکردن نەبوو، تەنها بۆ کاری سەرەتایی و سودوەرگرتن لەو هەلە مێژووییە ڕەخساوە، لەبار بوون، دەنا دەبوو بەتێگەیشتنی رەوتی ڕووداوەکان زۆر کاری تر بکرایە، زۆر هەنگاوی تر بنرایە، زۆر بە وردی و هۆشمەندی و قوڵی لە خۆو لە بارودۆخەکەو لەسەرجەم ڕووداوەکان و هەڵوێستی زل هێزەکان و ناکۆکی و ململانێ و پەیمانەکان بگەیشتنایە، لەبەر ڕۆشنایان نەخشەی کارو خۆ قایم کردن دابنرایە، سەرنجی پاشە ڕۆژو دیاردەو یاری و ڕووداوە چارەنوسسازەکان بدرایە.

## بۆشاییە ئاشکراکان

هەر لەسەرەتاوە بۆشاییەکان کەم و کورتی و دیاردەی ناقوڵا و کۆسپەکان، هەڵوێستی سەرچاوەی بڕیار... جوڵە و ڕاسپاردەکان.. هتد.. ئاشکرا بوون.

بۆ نمونە:-

× ساڵ دەهات و ساڵ دەڕۆی داواو داخوازیەکانی کورد بێ وەرام بوون، لە نێوان ساڵەکانی1942–1945دا بەڕێوەبەرایەتیەك دامەزرێنرا، بەهێز نەدەکرا، بزوتنەوە

چەکدارییەکەی ناوچەی ورمێ لە بەرژەوەندی تاران دوایی پێهێنرا، کاتێ یەکێتی سۆڤیەت هاتە وەرام ئیتر یاریو مەبەستەکە زۆر شاراوە نەبوون.

× هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمارەوە دەزانرا لاسەنگی هێزو چەكو ئازووقەو داهات لە چ ئاستێکدایە، کەچی هیچ هەنگاوێکی کاریگەر نەدەنرا، بەتایبەتی گوشاری سەربازی لەسەر مەهاباد ئاشکرا بوو، زۆر لەبەڵگەنامەکانی ئەو سەردەمە باری خراپی سەربازیی، لە ڕووی چەكو ئازوقەو کەرەسەی جەنگو ئابووریی سەربازی بەڕوونی ئاشکرا دەکەن چەکی قورس نەبووە، تەنانەت تفەنگیش لەئاستی پێویستدا نەبوو، جار بووە چەکدار لەبەر بێ فیشەکی بەرەی شەڕی بەجێهێشتووە، بۆ جلو پێخەفو پێڵاوو گۆرەوی، یارمەتی لەجووتیاران وەرگیراوە(9)..

× هەر لە سەرەتاوە دەوڵەتانی خۆر ئاوا، نەك هەر ئاوڕیان لە کۆمارەکە نەدەدایەوە، بەڵکو بۆ ڕووخاندنیشی نەخشەیان بۆتاران ساز دەکردو یارمەتیان دەدا.

بەو جۆرە لە ڕووی سیاسیو دیپلۆماسییەوە، بە دابڕاوی، بە سوود وەرگرتن لە باری جیۆپۆلۆتیکی ناوچەی کۆمار بە ئابلۆقە دراوی هێشتیانەوە، یەکێتی سۆڤیەتیش هیچ هەنگاوێکی بەرەسمی نەنا، هیچ جۆرە ڕێکەوتنێ، پرۆتۆکۆڵێ، بەڵێنێکی نوسراو لەگەڵ کۆماردا نەکرا، ئەو نەبوونی شەرعیەتە یاساییەی نێو دەوڵەتانو ناوچەکە مەترسیەکی ئاشکرای نیشان دەدا.

× هەر لەسەرەتای پرۆسەی داگیر کردنی ئەو ناوچانەی ئێران، گەلێ پەیمانو ڕێکەوتن لەنێوان دەوڵەتانی هاوپەیمانو لەگەڵ تارانیش مۆرکرا، مەبەستی سەرەکی هەموو لایەك پاراستنی سنوری سیاسیو جوگرافی ئێران.. ئێرانو یەکێتی خاكو میللەتانی بووە، بۆ بەڵێن دانو دووپات کردنەوەی چۆڵ کردنی ئێران بووە لە دوای جەنگ.

لە 29ی کانونی دووەمی1942 پەیمانێکی سێ قۆڵی ناسراو بە پەیمانی(الاتحاد) لەنێوان (عەلی سهیلی) وەزیری کاروباری ئێران، (سێر ریدر پۆلارد) سەفیری بەریتانیا لە تاران، (سەمیرنۆڤ) سەفیری یەکێتی سۆڤیەت لە تاران ئیمزا کرا، لە ماددەی یەکەمدا هەموویان بەڵێنیاندا بۆ ڕێز گرتن لە یەکێتی ئەرزو سەرداریو سەربەخۆیی ئێران لە ماددەی پێنجەمدا بڕیاردرا کە دوای ئاگر بڕو سەرکەوتنو ڕێکەوتن لەگەڵ ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکانی لە ماوەیەکدا کە لەشەش مانگ تێنەپەڕێ، دەبێ هێزەکانی

خۆیان لە ئێران ببەنە دەرەوە، کوردو رۆشنبیران هیوایەکی گەورەیان بە(ئیعلانی ئەتلەنتیك) بەستوو سەبارەت بەم برگانەی ناوی: (هەموو گەلێ دەبێ مافی ئەوەی هەبێت کە خۆی فۆرمی بەرێوەبردنی خۆی هەلبژێرێ)(10)

بەندەکەی ویلسۆن وەبیرهێنرایەوە،(هیچ گۆرانێکی ناوچەیی دژ بە خواستی گەلان نەکرێ).

لە راستیشدا ئەم برگەیەی دوایی لە دەستکەوتی تاران و دژ بەبەرژەوەندی کورد بووە، چونکە مەبەست لە خواستی گەلان خواستی دەولەتان بووە، بۆیە هەر ناوەرۆکی ئەمەشیان بە ئەنجام گەیاند،هەروەك چۆن لە دوایشدا دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان مەبەست لێی رێکخراوی دەولەتان بوو.

لە 27–29 دیسەمبەری 1943 کۆنگرەی تاران لە نێوان رۆزفلت، چەرچل وە ستالیندا بەسترا، یەکێ لە خالە گرنگەکانی: پاراستنی سنوورو یەکێتی ئێران و کشانەوەی هێزەکانی هەرسێ دەولەتەکان بوو، لە دوای برانەوەی جەنگ.

پێکهاتنی تاران و مۆسکۆ لەسەر دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوت و بلاوکردنەوەی دەقی پەیمانەکە، زیاتر لەوە قوام و لسەلتەنەو پەیوەندی نێوان هەردوو پایتەختی واباش کردبوو کە تەنانەت بکەونە بلاوکردنەوەی بەندو باوی خواستنی کچی ستالین بۆ حەمە رەزا شا کە لە دوایدا رۆژنامەی کوردستان بە خۆشییەوە هەوالی درۆبوونی باسەکە بلاوبکاتەوە.

کاتێ سەرانی دەولەتانی هاوپەیمان لە بۆتسدام کۆبوونەوە(11) بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ئەلمانیاو دابەشکردنی دەستکەوتەکان سەبارەت بە چۆل کردنی ئێران دوای برانەوەی جەنگ ئەو بەلێنەی دابوویان دووبارە کرایەوە.

لە 29ی ئازاری1946 تورکیاو عیراق پەیمانی باش دراوسێتیان ئیمزا کرد. مەبەستی ئەو رێکەوتنە زۆر روون و ئاشکرایانە مۆر دەکران بەرامبەر بە نەبوونی هیچ جۆرە بەلێنێك یان بەلگەنامەیەکی باوەڕ پێکراو لەلایەن سۆڤیێتەوە بۆ کورد لەگەل نەبوونی هیچ جۆرە یارمەتیەکی جیدی کە کۆمارەکە بکرێتە هێزێکی خۆراگر. بەلکو ئامۆژگاری کوردەکان کراو تا رێ لە ئەرتەشی تاران نەگیرێ، چونکە هێزێکی بچوك هەر بۆ چاودێری هەلبژاردن دێتە ناوچەکەو لە دوایدا دەکشێتەوە..!

## دیاردەی تری نائاسایی

زیاتر لەوانە ئەگەر سەرنجێك لەباری ناوخۆیی سنوری کۆمارەکەی کورد بدەین، لەناو تێڕوانینی هەرێمی، سیاسیو دیپلۆماسیی سەرکردایەتی حزبو کۆماردا، واگەڵێ دیاردەی سەیر تری سەردەمەکەمان دێتە بەرچاو..

-کۆمەڵگەی کوردەواری زۆر دواکەوتوو بوو، ئەگەر بزانین ئامارو ڕاژەی نەخوێندەواری دوای بیست ساڵ 1966 لە دامەزراندنو ڕووخاندنی کۆمار لە دێهاتەکانی: مەهاباد94٪ لە سەقز93.10٪ لە سنە92.9 ٪ کرماشان88.2٪ بووە، وا دەتوانین مەزەنەی سەردەمەکەی کۆمار بکەین، ئەم بارە نالەبارو دەردە کۆمەڵایەتیە کوشندەیە، دەیان گیروگرفتی گەورەو ناکۆکی ناو کۆمەڵی ڕۆژگارەکەی قوت کردبۆوە..

لێپرسراوانی حزبو کۆماریش هەڵقولاوو خولقاوی ناو ئەو دۆخە ئالۆزەبوون، بۆیە چارەکردنیان، تێگەیشتنی بارە نێو دەوڵەتیەکەو دیپلۆماسیەتە ئالۆزەکەی دەویست، کەبۆ ئەوان زەحمەت بووە.. بۆیە لە ڕۆژی کارەساتیشدا هەر ئەوە چاوەڕوان دەکرا کە ڕووی دا، بە تایبەتی ناکۆکی عەشایەریو یارمەتی دانی دوژمن، ململانێو ڕقەبەریو پاڵ بەیەکەوە نانو بۆربۆرین بۆ پەڕینەوە بۆ بەرەی داگیرکەر، لەڕۆژانی کۆتاییدا، دیمەنێکی کۆمەڵگەی دەهێنایە بەرچاو...

ئەوانە نائارامیو بێ باوەڕیی ڕەخساندبوو، ئەنجامی ئەوەش لە ڕۆژگاری سەختدا دەرکەوت چەندە ترسناك بووە.12.

-سەرکردایەتی کۆمار، زیاد لەپێویست خۆی بە وتووێژی بێ ئەنجام بەستبۆوە، بێ بناغە لێی بە ئومێد بوو، هەرچەندە جۆرێ لە جیاوازی بە ئومێدو بێ ئومێدی لە نامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی حزب (کەلەشوێنی خۆیدا دەبینرێت)لەلایەك وە سەرەك کۆمار لە لایەکی تر دەردەکەوێ(13). جگە لەوە زۆر لە لێپرسراوانی تر نە بڕوایان بە تاران بووە وە نە ئومێدو بڕواشیان بە گفتوگۆ بووە لە کاتێکدا ڕژێمی تاران تەنها بۆ کات بردنە سەرو دەستی دەستی، گفتوگۆی کردووە، خۆ لێپرسراوانی ئەرتەش هەر بە ئاشکرا لە نامەکانیاندا گاڵتە بە گفتوگۆ دەکەن (بڕوانە ئەفسەرانی ئەرتەش لە ب1 د.ج.ك-دا)، بگرە جاری وابووە ژاندارمەکان تەقەی لەو خەڵکە دەکرد، وەك ئەو

ڕووداوەی کەپێشوازیان لە نوێنەرانی ئازەرو کورد کرد لە تاران لە گفتوگۆی بانەمەڕی 1325دا، 2کوژراوو 3بریندار ئەنجامی بووە(14).

-وەك پێویست بە لێکۆڵراوەیی‌و دانانی نەخشە، مامەڵەی ڕووداوەکان نەدەکرا، لە دوژمن‌و لە نەخشەو گەمە سیاسیەکان لە دیپلۆماسیەتی هاوپەیوەند بە کێشەو مەسەلەی کوردەوە نەدەگەیشتن، ئەگەر جۆرێ لە تێگەیشتنیش هەبایە وا دژە کردارو نەخشەو کاری بەرامبەر نەبوو.

-خۆ بەستنەوە بە دورشمی خودموختارییەوە، دەرگای بیرکردنەوەی لە ئەڵتەرناتیڤێکی تر لەسەر داخستن، بڕیارە مێژوویەکەی دووی ڕێبەندانی1324 خرایە لاوە، کە ئیختیار درابووە دەست کۆمیتەی مەرکەزی‌و ئەنجومەن بۆ بە ئیستیقلالی تەواو گەیاندنی کورد لەو جێگایانەی لێی دەژین.

ئەوە لە کاتێکدا بووکە زۆربەی زۆری جەماوەر، زوربەی کاربەدەستان بڕوایان بە دورشمەکەی رزگاری هەبوو.

-خۆ بەستنەوە بە ستراتیجی (سەربازیی) بەرگری.. بە خۆ مەڵاسدان لە سەنگەرا بۆ چاوەڕوانی هێرشی دوژمن، کە ئەمە ڕۆڵی خۆی لە هیلاکی‌و نائومێدی لە پەلامارو دەستپێشخەری‌و هەڵبژاردنی زەمان‌و زەمینی جەنگدا بینی، لە کاتێکدا ئەرتەشی ئێران سەربەستی جووڵەو مانۆڤرو هێرش‌و پەلامارو کشانەوەی هەبوو.

هەرچەندە جیاوازیەکی گەورە لە نێوان هێزی چەکدارو چەك‌و تەقەمەنی‌و تفاقی جەنگ‌و کەرەسەی گواستنەوە هەبوو، بەڵام لە ڕووی توانای شەڕو ورەو باوەڕو گیانی خۆبەخت کردن بۆ نیشتمان بە پێچەوانەوە بو، لەبەرژەوەندی کورد بوو، بۆیە ئەگەر ئەو ستراتیجەو پەیڕەوکردنی ئامۆژگاری لێپرسراوانی سۆڤیەت بۆ شەڕ نەکردن نەبایە، وا ڕەوتی ڕووداوەکان بە جۆرێکی تر دەبوو یان هیچ نەبێ جۆرێ لەگەمەی سیاسی‌و مانۆڤەری سەربازی‌و نەبزگرتن‌و شەڕی دەروونی دەست پێدەکرا.

-هەوڵ نەدان بۆ سنور فراوانکردن بۆ سوود وەرگرتن لە توانای مرۆیی‌و زەمینی‌و ئابووریی ناوچەکانی تر، بۆ بێ بەش کردنی دوژمن لێیان، بەتایبەتی ئابووریی کۆمار زۆر لاواز بوو، خەڵکی زۆر هەژار بوون، کە دەنگی هەنگاونان بەرەو ئەو ڕێبازە بەرزدەبۆوە، گوێیان لێ نەدەگیرا، کەبەهۆی دەست درێژی دوژمنیشەوە ڕووداوێ بخوڵقێنرایە، نەخشەی سوود لێ وەرگرتن دانەدەنرا، هەر زوو هەڵەکە

لەدەست دەدرا، وەك شەڕو هێرشی(سەراو سەرچاوەو مل قەرەنی، دیسان شەڕی مامەشا).

شەڕی مامەشا گرنگییەکی تایبەتیی خۆی هەبووە رۆژنامەی کوردستان بەم جۆرە لەسەر رووداوەکەی نووسیی:

لەجەبهە

وەکو لەجەبهە وەلام گەیشتووە ئەم شەڕی دوایی کەلە گردی مامەشا رووی داوە دوژمن بە 3هەزار کەسەوە هێرشی هێناوەو تانكو تۆپو تەیارە لە ئەرزو ئاسمان پیشتیوانیان لە دوژمن کردووە تەنیا بە هۆی 30 کەس لە برایانی بارزانی دەستە مل قەرەنی بە سەرۆکی برای قارەمان مستەفا خۆشناو جواب دراوەتەوەو لەلایەن حەزرەتی پێشەوا ئەمر سادر بوو کە 11کەس لە شەرەکان کە یەکێ لەوانە برای خۆشەویست محمد قادری‌یە لە میدالیای قارەمانی پێبدرێت(16).

*زیاد لە سنوری پێویست کۆمار ئەوقی ئازەربایجانو سیاسەتی حکومەتەکەی کرا، هەرچەندە لە زۆر رووەوە بێ سود نەبوو. بەلام لە هەندێ رووی ترەوە بێ زیانیش نەبووە، بەتایبەتی ئازەرەکان رێبازی تایبەتی خۆیان هەبوو، رابەرو لێپرسراوە ناسیۆنالیستەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتیش لە هەموو روویەکەوە یارمەتیدەریان بوون، بە نەخشە کوردیان دەستەنگی ئەو کۆمارە کردبوو، کاتێ ئەو رایە خرایە بەردەم پێشەوا کە گوایە بۆ تەواوی کوردستان یەك ئۆستاندار دەبێت ئەویش قازی دەبێ(17). هیچ جۆرە ئامادەیەکی نیشان نەدابوو بۆ قەبوڵ کردن، بێ گومان ئەو یاریەش بێ مەترسیو مەرام نەبوو، کەچی ئازەرەکان لە گفتوگۆی مانگی جۆزەردان 1325 یاندا لەگەڵ رژێم لە تەورێز،نە نوێنەری کوردیان بەسەرکردەوە وە نەمەسەلەی نەتەوایەتی کوردو کۆمارەکەشی باس کرا، هەروەك بە ئەنقەست بیانەوێ مەسەلەکە خەفە بکەن

*نەبوونی ئازادیی جوڵەو دەست پێشخەری، چونکە رووسەکان لەچەند لایەنێکەوە سنوریان بۆ جموجۆڵی کۆمار دانابوو لەوانە:

نەجوڵان لەبەردەمی شەڕدا بۆ بەرگری نەبێ. خۆ بەستنەوە بە خود موختاریەوە، بەردەوامی لەسەر گفتوگۆ، بەستنەوە بە ئازەربایجانەوە.. بۆیە بیر لە جوڵەی سەربازیو مانۆڤەری سیاسی، ئەمری واقیع دروست کردن، کاری جەماوەریو

جوڵاندنی خەڵکی کورد لەناوچەکانی دەری سنور نەکرایەوە، نەبوونی ئەم ئازادییە ئەو چاوەروانی‌یە، ئەو بێ دەرامەتییە، بێ ئومێدی لە تاران، جۆرێ لە بێ ئومێدی لای خەڵکی خوێندەوارو هۆشمەند دروست کردبوو، بێ ئەوەی سەرنجی لێبدرێ‌و بیر لە هۆو چارەسەر بکرێتەوە.

لە سوچێکی‌تری تێڕوانین‌و شیکردنەوەوە، ئەگەر سەرنجێکی ووردی دیاردەی خۆبەدەستەوەدانی سەرۆك کۆمار بدرێ، بابەتیانە لێی بکۆڵرێتەوە، وا دەردەکەوێ کە هاندەری ئەو دیاردە نائاساییە، هەر تەنها بەڵێن‌و سوێندەکەی نەبوو بۆ مانەوە لەگەڵ خەڵکی کورد، وەك هەوڵێکی خاوکردنەوەی قینی رژێمی تاران بەرامبەر بە خەڵك بۆ تۆڵە، هەر سەبارەت بە بەڵێنی گیانی(سەرتیپ همایونی) بۆ پێشەوا.. نەبوون، بەڵکو گەلێ دیاردەو هۆی تر لەئارادا بوون‌و لە دروست بوونی ئەو پرۆسەیە رۆڵیان بینی لەوانە:

کشانەوەی لەشکری سوور، بێ نەخشەی هاوپەیوەندی بە چارەنوسی کۆمار.

*ئامۆژگاریی رووسەکان کە شەڕی ئەرتەش نەکەن.

*ڕووخاندنی کتوپڕی ئازەربایجان‌و راکردنی ڕابەرانی‌و شەڕی خوێناوی.

*نەبوونی پشت‌و پەنا، مانەوە بەتەنها، بێ چەکی قورس‌و هەل‌و مەرجی بە هێز بوون‌و داکۆکی بەرامبەر بەهێزی دوژمن کە لەو رۆژگارەدا گەلێ هەنگاوی وەرچەرخێنەری هەل‌و مەرجەکەی‌نابوو، زلهێزەکانیش یارمەتی دەری بوون.

*بڕوا نەبوونی قازی محمد بە جەنگ‌و خوێن رشتن، بە شەڕی بێ هودە، خۆ هەر لەسەرەتاوە کۆمەڵەی ژێ-کاف رێبازی خۆی لە شەڕی چەکدارو شۆرش دیار کردبوو، دیسان نامە پارێزراوەکانی پێشەوا تیشك دەخەنە سەر ئەم بۆچوونە.

* گرفت‌و هەڵەو بۆشایی‌و لاوازی‌و ململانێی ناوخۆ کەم نەبوون بەتایبەتی:

-ناکۆکی‌و ململانێ‌و رقەبەرایەتی نێوان ئێل‌و تیرەو بەرەباب‌و بەگزادەکان.

-نەبوونی دیسپلینی پێویست لەناو سوپاو چەکدارەکاندا.

-لاوازی زۆر لە سەرکردەکانی حیزب‌و کۆمار، زوو ورە بەردان کەلەگەڵ هەندێ سەرەك عەشیرەتیشدا کەوتنە بڵاوکردنەوەی گیانی خۆ بەستەوەدان.

-تەنیا هێزی جێگەی ئومێد. هێزەکەی بارزانی‌و ئەفسەرە لێهاتووەکانی کوردستانی عیراق بوو، پێدەچێ پێشەوا لای ئاسان نەبووبێ ئەو هێزە ببێتە چەتری

پاراستنی، بەتایبەتی هەر لەسەرەتاوە ئەو جێگەو هەلە بۆ بارزانی نەخولقێنرا کە رۆڵی خۆی ببینێ، هەر وەك نامەکانی خۆشی دەری دەخەن کەهەر بە(فەرماندە کل هێزی بارزانیان) ماوەتەوە بە پلەی(ژەنەراڵ)یەوە، دانانی بەشێکی گرنگ لە هێزەکەی، لکەکانی 1و2و3و4 بەسەرکردایەتی:

مستەفا خۆشناو، میر حاج، بەکر عەبدولکەریم، نوری ئەحمەد تەها، بەفەرماندەیی ژەنراڵ حەمە رەشید خان، ئەمەش بۆ خۆی جێگەی سەرنجە(18). لە ژمارەکانی رۆژنامەی کوردستانیشدا شتێکیوا نابینرێ کە پێچەوانەی ئەو قسەیە بێت، هەرچەندە بارزانیی هەندێ جار لەگەڵ وەزیری هێزدا(سەیف قازی) سەردانی بەرەکانی شەڕو هێزەکانی کردووە، رۆڵی گرنگی لە لابەلاکردنی ناکۆکی عەشایەریدا بینی، ئەو پلەیەی لەرێککەوتنە سەربازییەکەی نێوان کوردستانو ئازەربایجاندا بۆی دانراو، جگە لە رۆڵی هەموو هێزەکە کەلە کارەساتەکەشدا بە یەککگرتوویی لە مەیدانەکە دەرچوو، لەگەڵ ئەوانەشدا دیسان لە سەرچاوەی بڕیارەوەو ئەو رۆڵەی نەدرایە.

لەگەڵ ڕووخاندنی ئازەربایجان هەندێ سەرەك عەشیرەتو لێپرسراوان خۆیان بەدەست ئەرتەشەوە دا، لە راستیدا هەر لەدوای کشانەوەی لەشکری سوور، گەلێ لەو سەرەك هۆزانە ورەیان بەردا، لە دواییدا گەلێ لەلێپرسراوانیشی گرتەوە.

کورتو پوخت زەمینەی خۆییو باروذۆخەکەی کۆماری تێدا دامەزرێنرا، رەسیو کامڵ نەبوون، باروذۆخە نێودەوڵەتیەکەش لەسەر تەماحو مانۆڕو بەرژەوەندی دەجولاو ئاراستە دەکرا، دوژمن ئامادە نەبوو هیچ جۆرە پێکهاتنو رێکەوتنێ بکات کە لایەنی کەمی مافی نەتەوایەتیو نیشتمانی کوردی تیا بێت.

سەرکردایەتی کوردیش لەو ئاستەدا نەبوو کە بزانێو بتوانێ ئەڵقە لاوازەکانی موعادەلەکان بدۆزێتەوەو هەوڵی گۆڕانی بدات، هەر لەسەر بەڵێنو چاوەڕوانیی وەرگرتنی راسپاردەو بڕیارەکان دەژیا، سەرنجی رووداوەکانو پاشە رۆژو ئایندەی چارەنوسی نەدەدا، جەماوەریش لەسەرەتادا لەئازادیو باری دیموکراسی کە زۆر گرنگ بوون بەئومێد بوون، لەدواییشدا چاوەڕوانیی تاقەتبەرو ئینجا بەنائومێدی دەژیا.. بەتایبەتی ئەو هەموو ڕووناکییە سوورانە، دەردەکەوتن بێ ئەوەی رابەرانی کورد بجولێنو بگەنە ئاستی ڕووداوەکان، پێکهاتنی تارانو مۆسکۆو

پهیمانی نهوت، کشانهوهی لهشکری سوور بێرهخساندنی هیچ جۆره زهمان‌و دڵنیایهك، ئهوانه زهنگیمهترسی‌و نیشاندانی سهردهمی وهرچهرخاندن بوون.

سۆڤیهت بهمهرامی خۆی گهیشتبوو، یاریهکهی به ئهنجام گهیاندبوو، دهستبهرداری کورد بوو بوو، کهچی کورد لهسهر هیواو چاوهروانی‌و بهڵێن‌و باوهری خۆی دهژیا، سهیری رهوتی رووداوهکانی دهکرد، بهو بڕوایهوه که بهتهنها ناتوانێ کارێ بکات، کاتێ ساتی بڕیاری پێچهوانهی رهووتی مێژوو بوو، پێشهواش سهبارهت بهو هۆو ههل‌و مهرجانهی تیشکیان خرایهسهر، خۆی کرده قوربانی، کاروانێکیش له شههیدان رابهری کرد، دوور نهبوو، ئهگهر رێگهی پێچهوانهی ههڵبژاردایه مێژووی ئهمڕۆ به جۆرێکی تر نهنوسرایه، بێ گومانیشه که رهوتی رووداوهکان به جۆرێکی تر دهبوو، چونکه ئهو بڕیاره دوا ههل بوو، بهڵام وهك لێکدانهوهیهکی لۆجیکی، ئهگهر له ساتی هێمنی‌و لهسهر خۆییدا زۆر ههل لهکیس درابێ، وا دوا ههل له بارودۆخێکی وا سهخت‌و قورسدا ههر دهبێ بهو جۆره بێت کهبوو، دیاره ئیتر دوژمنی داگیرکهریش بڕیار لهسهر چارهنوسهکه ئهدات نهك خاوهن کێشهکه.

* * *

# پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی یانزدەهەم

1-پێش دامەزراندنی کۆمار، پێشەوا قازی محەمەد لە دیدەنیەکی رۆژنامە نوسیدا بوونی ئەو خود موختاریەی باس کرد.

بڕوانە رۆژنامەی کوردستان، ژمارە(1،2)رۆژی 11-1946/1/12.

2-دوای دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بە 200 سوارێکەوە خۆی گەیاندە مهاباد.

3-لە نیوەی دووەمی 1945دا ژەنەراڵ سەلیم ئەتاکشیوف ئاگاداری قازی محەمەدی کرد بۆ رێکخستنی وەفدی سەفەرکردن.

4-تا 26ی سەرماوەرزی1325(17ی کانونی یەکەمی 1946) ژیاو لەو رۆژە کۆتایی بە بەرێوەبەرایەتیەکەی هێنراو ئەرتەشی تاران مەهابادی داگیر کردەوە.

5-رۆژنامەی کوردستان، ژمارە(27) خاکە لێوە 1325(25ی مارسی 1946).

6-4ی نیسانی 1946 کەلەشوێنێکی تردا خراوەتە پێش چاو.

7-بڕوانە پاشە کشەی بارزانیەکان لە کوردستانی ئێران، ئەبولحەسەنی تەفرەشیان، بە کوردی کردنی حەسەنی سەیف (حەسەنی قازی)1987، ل14 ئەمە بەشێکە لە کتێبەکەی نوسەر بەناوی(قیام افسران خراسان)1977، ناوبراو ئەفسەرێکی کۆماری ئازەربێجان بوو نێردرا بۆ کۆمەکی مەهاباد، لە رووخاندنەکەشدا مایەوەو خۆی بەدەستەوە نەدا.

8-بڕوانە ئەبولحەسەنی تەفرەشیان، سەرچاوەی ناوبراو، ئەو دەنووسێ:

×ئەو دوو فرۆکەیە(ئاغای مورتەزای زەربەختو عەلی جودی) لە مەئموریەتی هەڵفڕین بەرەو ئازادی-دڵ لە تارانەوە دەگەل خۆیان هێنابوویان.

9-بڕوانە مەحمود مەلا عززەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، بەرگی یەکەم سوید 1991، ل43-47، 57-58،57،115،123، لەگەڵ گەلێك بەڵگەنامەی تریش.

10-ئەم ئیعلانە لە ناوەراستی ئابی 1941دا لەنێوان (چەرچلو رۆزفلت)دا ئیمزا کرا بڕوانە(Svenska Uppslags Bok Band2)(ئینسکلۆپیدیای سویدی) چاپی 1948،بەرگی 2 لاپەرە 682-683.

11-17تەموز-2ئابی 1945.

12–زۆر لە بەڵگەنامەکانی سەردەمەکە ئەو راستی‌یە باش ڕوون دەکەنەوە بۆ زانیاری ئەم لایەنە بڕوانە بەرگەکانی (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)..

13–بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە 97ی کۆمیتەی مەرکەزی، 132 پێشەوا قازی محەمەد، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، بەرگی یەکەم.

14–بڕوانە هەمان سەرچاوە ل 309–328.

15–بڕوانە دەوڵەتی جمهوری کوردستان–بەرگی یەکەم–بەڵگەنامەی ژمارە 24–30–32..هتد.

16–رۆژنامەی کوردستان ژمارە(60)رۆژی1946/6/20.

17–بروانە جعفەر مەهدی نیا، زندگی سیاسی قوام.

×دەوڵەتی جمهوری کوردستان نامەکانی پێشەوا ژمارە 20–132.

18–بڕوانە دەوڵەتی جمهوری کوردستان بەڵگەنامەی ژمارە 50 دیارە سەرچاوەی راستەقینەی بڕیارە گرنگەکان بۆ هەموو لكو دەستەکانی هێزی بارزانیان و ئەفسەرانی هەر بارزانی خۆیی بوو.

تێبینی:–ئەم لێکۆڵینەوەیە لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە 592–593 لە رۆژانی 20،1994/1/21دا بڵاوکراوەتەوە لەبەر سەنگی نوسینەکە بۆ یادی 52ساڵەی کۆماری مەهاباد کە لە 1946/1/22(2ی ڕێبەندانی 1324)دامەزرێنراو لە 17ی کانونی یەکەمی 1946دا ڕووخێنرا لەبەشی یازدەهەمدا دانرا.

## Abstract: -

Republic of Kurdistan is a historical event and of an important era of self-rule. The values of the studies and researches on its events are full of lessons and warnings for today and the days to come in the struggle of our nation and the experience of the self-rule. Moreover, that history was the second opportunity during the years of the first half of the twentieth century that emerged amid the international circumstances and become an opportunity through which the realization of the Kurdish historical right could be seen.

I have paid good attention to the events of the one-year Republic and the Mahabad experiment since I began my writings. I have been writing about the events and subjects of this history, holding seminars and panels for the last thirty years. The writings and studies published as books and booklets or articles in the newspapers and magazines in Kurdistan and outside have reached an extent to enrich the Kurdish library.

These three experiments which emerged through the three historical opportunities in the twentieth century. I refer to the rule and Monarchy of the immortal Sheikh Mahmood in South Kurdistan (1918-1924), Kurdistan Republic in Mukryan Region (22.1-17.12 1946) together with this experiment of the present historical opportunity which persists in Iraqi Kurdistan. Those events are three historical opportunities in such a political ground that many of their causes in their establishment and also the conflicts of their times have many similarities. The factors of the opportunities of the experiments, the level of the political geostrategic circumstances, the conflicts and the course of events are very important. The factor of pressure and its effects on the complications and plots, the role of the superpowers in the region together with other causes such as the internal threats are the main factors and causes which have similarities and could be studied largely.

The method of the studies are systematic and depends upon genuine documents of the time of the Republic and of the archives of the states concerned in the experiment and the conflicts on the region at that time.

I have divided this study into eleven parts with a short introduction and a gate through which we enter the world of the studies in the different times and sources and genuine documents.

The first part contains an objective writing of history. In the second part there is a quick view about the Kurdish society. There is a description of the confrontations and fightings, which took place in and for Kurdistan. Then the reasons are analyzed and the way they caused the backwardness of the Kurdish society. Later it sheds light upon the policy of the occupying and imperialist states.

The third part is about the Kurdish movement when the Red Army came. There emerged many favourable causes that directly affected the Kurdish movement positively. These created favourable conditions in the establishment of the Republic of Kursdistan. Then the main internal and external causes are focused on.

In the fourth part there is a short history of the foundation of the political organizations and their activities, including Kurdistan Liberation league, Gihandan league, Kurdistan Liberals Party, K.R. league and KDP. Then there is a description of the publications, activities and goals of each organization, with a comparison of the goals, the policies, the programmes and the strategy of each of these two organizations. In the fifth part the beginning of the political life, the activities and the relations of the Kurds with the surrounding world are reviewed, including the Bako visit, the start of talks and the Soviet attitude and their views, then the Kurds' determination on gaining their right to a self-rule republic and the type of the Ministries and establishments. Light is shed upon the historical name of the entity with the governmental and international names and with documents and analyses proving that the entity was a self-rule republic and not an independent one.

The sixth part gives a class and social evaluation of the leadership of the Democratic Party and the Republic of Kurdistan. We shed light upon the nature and characteristics of the Republic of Kurdistan.

The seventh part sheds light upon the consequences of the establishment and the collapse of the Republic through the achievements of the Republic of Kurdistan.

In the eighth part many studies on the events of the time are carried out. There is also a description of the conflicts and disputes, the complications surrounding the Kurdish society, the plots of the enemy

especially the army, which caused the foundation of the two republics in a political and military coincidence.

Then it describes how Tehran tried to keep those two republic away from each other, the emerging of the conflicts and the days and the last hours of the catastrophe, the detention of Qazi Mohamed and his friends, the trial and the death sentence and the way it was carried out.

The ninth part deals with the factors and reasons of the collapse of the Republic of Kurdistan, why it collapsed so easily and the internal and external reasons for that.

The tenth part reveals the lessons and warnings of the Republic in its establishment, collapse and the consequences.

In the end there is a thorough study of the five-year-old Mahabad experiment, the Republic of Kurdistan, which lasted nearly one year and a modern view about the Republic of Kurdistan.

The study should have contained many appendixes, especially of names, many documents of that time, many photographs and different maps but the limitedness of time and the immensity of the work were the two main reasons, which prevented the achievement of what we wished.

## تعريف بالكتاب

تشكل جمهورية كردستان، حدثا تأريخيا لعصر ادارة محلية هامة وحساسة في التطور السياسي لقضية الكورد الوطنية. ان اهمية البحث والدراسة في وقائعها، تكمن في انها زاخرة بالدروس والعبر لراهن ومستقبل شعبنا، وتجربة الأدارة الكردية، فضلا عن كونها الفرصة التأريخية الثانية التي سنحت في سنوات النصف الأول من القرن العشرين، وفي ظل ظروف دولية، لنيل الشعب الكردي حقوقه التأريخية. لذا فقد اوليت منذ بداية مسيرتي في مجال الكتابة، اهتماما خاصا بالاحداث التي وقعت في هذه الجمهورية، خلال عمرها الذي دام أقل من عام واحد، وتجربة مهاباد التي دامت لنحو خمس سنوات. فمنذ ثلاثين عاما، وأنا أنشر الأبحاث والدراسات واقيم الندوات حول احداث ومجالات التطور ومواضيع مختلفة لهذا الحدث في تأريخنا المعاصر، وقد وصلت نتاجاتي وأبحاثي وأصداراتي، سواء تلك التي صدرت على شاكلة كتاب أو كراس، أو على شكل بحوث في الصحف والمجلات والأصدارات الأخرى في داخل و خارج كردستان، الى الحد الذي جعلت المكتبة الكردية غنية بها، إضافة الى كونها ارشيفا أصيلا لتأريخ تلك الفترة الزاخرة بالأحداث الهامة.

ان التجارب والفرص التأريخية الثلاث التي سنحت لجزء من أمتنا في ادارة شؤونه في القرن العشرين، واقصد حكومة الشيخ محمود الحفيد في جنوب كردستان (*1918-1924*)، وجمهورية كردستان في منطقة موكريان من أعمال شرق كردستان (*1946/12/17-1/22*) محتويا تجربة مهاباد *1942-1946* التي برزت الى الوجود بعد احتلال الجيش الأحمر السوفيتي لمنطقة موكريان التي كانت مقدمة لظهور الجمهورية. مع التجربة والفرصة التأريخية الراهنة المستمرة في كردستان العراق منذ عام *1991*. تختلف عوامل واسباب بروز الواحدة منها عن الأخرى بسبب إختلاف الزمان والمكان والتحولات المختلفة في بنية المجتمع الكردي، كما أن هناك شبها كبيرا في العوامل والأحداث الاقليمية والدولية التي ساهمت في خلق كل منها، وبين المشاكل التي عاشتها كل تجربة في عصرها والأسباب التي أدت الى أنهيارها.

ان الظروف التي تهيأت لخلق تلك التجارب: الأوضاع السياسية والجيوستراتجية والصراع الدولي ومسيرة الأحداث.. عوامل الضغط وتأثيراتها على خلق الأزمات وحبك المؤامرات... دور القوى العظمى في إدارة الصراع على القضايا الاقتصادية والمناطق الجغرافية والاستراتيجية، قضايا النفط، التهديدات المحلية والأقليمية، إن كل ذلك تشكل عوامل هامة واساسية ساهمت مع العوامل الداخلية، في خلق التجارب الثلاث، مع الأخذ بنظر الاعتبار اختلاف المكان والزمان والمعادلات الدولية.

ان اسلوب كتابة المواضيع والدراسات التي يحتويها هذا الكتاب، منهجي، يستند على النهج العلمي في البحث والدراسة، علمي وموضوعي في التحليل .. يعتمد على الوثائق المهمة والحية لعهد الجمهورية

وارشيف الدول ذات العلاقة بالتجربة وبالخلاف والصراع على المنطقة في تلك الحقبة. أن كتاب (جمهورية كردستان) هو اخر حلقة من حلقات الكتب والأبحاث التي رأت النور خلال العقود الثلاثة الماضية، وأهم دراسة تأريخية وتحليل سياسي للأحداث التي لاتزال تكتنفها الغموض.

لقد قسمت الأبحاث والدراسات التي يضمها هذا النتاج الى احد عشر قسما، مع مقدمة وبوابة الدخول الى مباحث الكتاب.

الفصل الأول يتناول كيفية كتابة التأريخ بنهجها العلمي والموضوعي .. وفي الفصل الثاني هناك بحث قصير حول المجتمع الكردي، ويتم الحديث عن الحروب والصراعات التي جرت في كردستان ومن أجلها.. ومن ثم هناك مناقشة وتحليل للعوامل التي أدت الى نمو المجتمع الكردي بصورة غير طبيعية، كما تسلط الأضواء على سياسة الدول المحتلة والأمبريالية. ويتناول الفصل الثالث، الحركة التحررية الكردية، وكيف ازدهرت في عهد احتلال الجيش الأحمر لمناطق موكريان في كردستان الشرقية، مع ذكر عوامل مساعدة، أثرت بشكل مباشر على تقوية الحركة التحررية الكردية، وكيف أن ذلك هيأ الفرصة لتأسيس جمهورية كردستان. وفي هذا الفصل أيضا تسلط الأضواء على العوامل الداخلية والخارجية الأساسية التي أثرت ايجابيا على التطورات الداخلية للحركة الكردية. وفي الفصل الرابع هناك نبذة مختصرة عن تأريخ تشكيل التنظيمات السياسية، ونشاطات كل منظمة، بدءا من جمعية (انقاذ) كردستان وجمعية (جيهاندانى) الى حزب دعاة تحرر كردستان، جمعية ذ.ك واخيرا الحزب الديمقراطي الكردستاني(حزبى ديموكراتى كوردستان). ويتناول الفصل اصدارات ونشاطات وأهداف كل تنظيم، مع مقارنة لأهداف تلك المنظمات والتطورات التي حصلت على الهدف المركزي، وبرامجها، سياستها، واستراتيجيتها. أما الفصل الخامس، فيتناول بدايات الحياة السياسية ونشاطات وعلاقات الكرد بمحيطه.. الى جانب زيارة باكو، وبداية المفاوضات وموقف السوفيت واخر أفكارهم... ومن ثم اصرار الكرد على نيل حقوقه المتمثلة في تأسيس جمهورية تتمتع بالحكم الذاتي، والحديث معهم حول سبل تشكيل المؤسسات والأجهزة والوزارات. ويسلط القسم الأضواء على الاسم التأريخي للجمهورية، وهناك بحث تأريخي موثق يثبت انها كانت جمهورية تتمتع بالحكم الذاتي وليست مستقلة كما يفهمها البعض.

ويكرس الفصل السادس لبحث وتقييم التركيبة الطبقية والاجتماعية لقيادة الحزب الديمقراطي وجمهورية كردستان. مع تسليط الأضواء على طبيعة وخصوصية جمهورية كردستان. ويتناول الفصل السابع تأسيس وانهيار الجمهورية مع بيان المكتسبات المادية والمعنوية التي حققتها جمهورية كردستان.

ويتضمن الفصل الثامن بحوثا حول أحداث بارزة في ذلك العهد، ويتطرق الى الخلافات والصراعات والأزمات التي كانت تحدث في المجتمع الكردي، كما يتحدث عن مؤامرات الاعداء، وعلى نحو خاص من

قبل الجيش الشاهنشاهي، الـذي تسبب بـابرام اتفـاق سياسـي وعسـكري بـين جمهوريتي كردسـتان و ازربايجان، ومن ثم كيف سعت طهران من أجل احداث القطيعة بـين الجمـهوريتين... ومـن هنـاك الى ظهور الخلافات، ثم نحو افول نجم الكيانين ومن ثم حدوث المأساة.. اعتقـال القـاضي محمـد ورفاقـه وادانتهم وصدور حكم الاعدام بحقهم والوصية التي كتبت في اخر دقائق عمره ثم تنفيذه.

لقد كان من المفروض أن يتضمن هذا النتاج ملحقات عدة، وعلى نحو خاص ملحـق بالاسمـاء، وأن يرفق صورا لأغلب الوثائق التي القيت الضوء عليها، وأن يحتوي العديد من الخرائط والصور المختلفة، لكن عدم وجود الوقت الكافي من جهة ضخامة حجم الكتاب، مـن جهـة اخـرى كانـا عـاملين اساسـيين لعدم تحقيق التطلعات التي كنت أطمح اليها، تاركا ذلـك للأسـاتذة والبـاحثين اللذيـن يواكبـون كتابـة تأريخ تلك الفترة المهمة في مسيرة أمتنا...

## لیستی سەرچاوەكان

### 1-سەرچاوە كوردییەكان


-حەسەنی قازی، روانگەی پێشەوا.

-سەید محەمەد سەمەدی، ژێ كاف چبوو؟ چی دەویست؟ وەچی لێهات؟ مەهاباد 1981.

-علائەددین سەجادی، شۆرشەكانی كوردو كۆماری عیراق-بەغدا 1959.

-عبدالرحمن قاسملو، چل سال خەبات لەپێناوی ئازادی (بەشی یەكەم) چاپی 1985.

- د. كەمال مەزهەر ئەحمەد، كوردستان لەسالەكانی شەری یەكەمی جیهانیدا، چاپی یەكەم بەغداد 1975.

-د. كەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لەرۆژنامەنوسی كوردیدا، بەغدا 1978.

-كەریمی حسامی، كاروانێك لەشەهیدانی كوردستانی ئێران، 1971بەغدا.

-مەحمود مەلا عززەت/ تێروانینێكی سەردەم لەكۆمارەكەی مەهاباد. سلێمانی 1999.

-مەحمود مەلا عززەت، دیپلۆماسیەتی بزووتنەوەی كوردایەتی، سلێمانی 1973.

-مەحمود مەلا عززەت، دەولەتی جەمهوری كوردستان

بەرگی یەكەم ستوكهۆلم 1992

بەرگی دووهەم ستۆكهۆلم 1995

بەرگی سێهەم ستۆكهۆلم 1997

-مەحمود مەلاعززەت، كۆماری میللی مەهاباد، چاپی یەكەم 1984

چاپی دووەم 1986

لە بلاوكراوەكانی یەكێتی نووسەرانی كوردستان- چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ.

-میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری، بەسەرهاتی كورد، بەرگی یەكەم، سوید 2000.

-نەوشیروان مستەفا ئەمین، حكومەتی كوردستان، كورد لەگەمەی سۆڤیەتدا هەولێر 1992.

-هێمن، تاریك و روون (دیوان) چاپی بەغداد *1974*.

-کۆنگرەی سێهەمی حزبی دیموکراتی کوردستان(ئێران) ئەیلولی *1973*.

**2-سەرچاوە عەرەبییەکان:**

-ادموندز(سی. جی)، کرد وترك وعرب. ترجمة: جرجيس فتح الله، طبعة بغداد *1970*.

-جلال طالباني، كردستان والحركة التحررية القومية الكردية، بيروت *1971*.

-جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ترجمة: جعفر الخياط، بغداد*1964*.

-حسن محمد(د.)، مسألة النفط ومؤمرات الاستعمار في ايران/ ترجمة: احمد عبدالكريم، بغداد.

-خالفين،ن.آ ،( د.)، صراع على كردستان، ترجمة: د.احمد عثمان ابوبكر، بغداد. *1969*.

-سريدر پولارد-بريطانيا والشرق الاوسط، ترجمة حسن السلمان، بغداد *1956*،

-سليم طه التكريتي، معركة النفط في ايران، طبعة بغداد-*1951*.

-شاميلوف، حول مسألة الاقطاع بين الكرد، ترجمه وكتب مقدمة وعلق عليه الدكتور كمال مظهر احمد، بغداد *1972*.

-عبدالرحمن قاسملو(د.)، كردستان والاكراد، طبعة بيروت-*1970*.

-محمد توفيق وردي، قافلة الشهداء الاكراد والشعوب الايرانية، بغداد *1972*.

-مينورسكي،ن.ف (پروفيسور)، الاكراد، ترجمة:د.معروف خزندار، طبعة بغداد-*1968*.

**3-سەرچاوە فارسییەکان:**

-احمد شريفى، عشائرى بارزان و رهبران انها.

-بابا مردوخ روحانى، تأريخ مشاهير كرد، پخش دوم، جلدسوم، تهران *1371*.

-جعفر مهدى نيا، زندگى سياسى قوام السلطنة، *1366*.

-نجفقلى پسيان، از مهاباد خونين تا كرانەهاى ارس، آزماه *1328* تهران، *1949*.

**4–سەرچاوە ئینگلیزییەکان:**


*-Ferideh Kooli- Kamali Deh Kord. The rePublic of Kurdistan-its Rise and Fall-1988.*

*-Foreign Relation of the United Staes Diplomatic papers 1946, Volume Vll.*

*–Howell, jr. Wilson N, The Soviet Union and Kurds Astudy of National Minotry 1956.*

*-William Eagleton. The Kurdish Repulic 1946 London 1963.*


**5–سەرچاوە سویدییەکان:**


*Svenska Uppslags Bok Band 2–*(ئینسـسکلۆپیدیای سـویدی، بـەرگی 2 چاپی *1984*.


**گۆڤارو رۆژنامە:**


–گۆڤاری پەیڤ ژمارە *7* ئاداری *1988*.

–ڕۆژنامەی دەنگی کورد ژمارە *69 – 1960*.

–گۆڤاری تـودە، ڕێکخـراوی شۆڕشـگێڕی حزبـی تـودەی ئـێران لـەدەرەوەی وڵات، ژمارە *19*.

–گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە *3* مارتی *1946*.

–گۆڤاری گزینگ، ژمارە *13*

–گۆڤاری گزینگ ژ. (*17*) پایزی *1997*.

–گۆڤاری گزینگ ژمارە *18* زستانی *1988*.

–گۆڤاری گزینگ ژ(*14*) زستانی *1997*.

–گۆڤاری گزینگ ژ(*13*).

–گۆڤاری گزینگ ژ/ *13*.

–گۆڤاری ڕێبازی نوێ، ژمارە *21* کانونی یەکەمی *2000*

–گۆڤاری نوێکار، ژمارە *3*.

–گۆڤاری رابون، ژ(*22*) *1997*.

–گۆڤاری روناهی، ژمارە *7*و*8* ، بەغدا *1960*.

–گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە *24*و *1995/25*.

–گۆڤاری نیشتمان، ژمارە *3*و *4*ساڵی *1322*.

-گۆڤاری هەلاڵە، ژمارە *3* بانەمەڕی *1325*.
-ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە *413* بەغدا *1960*.
-ڕۆژنامەی دەنگی کورد ژمارە *69 - 1960*.
-ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە *10*و *11 -4*و*1946/2/6*.
-ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە *8* ، *1946/1/28*.
-ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە *5*، *6* جۆزەدانی *1325*.
-ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە *53*و *54 1946*.
-ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە *1401(1997/4/7)*.
-ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە *390*، *1993/5/17*.
-ڕۆژنامەی هەرێم، ژمارە *27*، *1993/6/10*.
-ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ڕۆژی *1995/12/10*.

لەگەڵ چەندین بابەت کەسودیان لێوەرگیراوەو لەشوێنی خۆیدا ئاماژەمان بۆ کردوون، ئەمەو زۆرینەی ژمارەکانی گۆڤارو ڕۆژنامەی سەردەمی جەمهوریەتی کوردستان و چەند گفتوگۆو چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەوانەی شارەزاییان لەو بارەیەوە لاهەبووە.

## لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانی نوسەر

**یەکەم-نوسین و دانراو:**

1-دیپلۆماسێتیی بزوتنەوەی کوردایەتی، سلێمانی 1973.

2-کۆماری میللی مەهاباد.

*چاپی یەکەم: کوردستان 1984(یەکێتیی‌نوسەرانی‌کوردستان بەچاپی گەیاند).

*چاپی دووەم، ستۆکهۆڵم 1986.

3-رەگ‌و ریشەی مێژوی تەقەلای بەعیراقیکردنی کوردو مەسەلەی کوردستان. سوید 1987.

4-کوردو ململانێ‌و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوە، کوردستان-1988(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپی کردو بڵاوی کردەوە).

5-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی یەکەم، ستۆکهۆڵم-1992.

6-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی دووەم، ستۆکهۆڵم-1995.

7-دەوڵەتی جمهوری کوردستان-نامەو دۆکومێنت-بەرگی سێیەم، ستۆکهۆڵم-1997.

8-بازنەکانی ململانێ‌و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد،

چاپی یەکەم، سلێمانی-1998 بنکەی ئەدەبیی‌و رووناکبیری گەلاوێژ بەچاپی گەیاندو بڵاوی کردەوە.

چاپی دووەم، سلێمانیی-1999(لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە.)

9-کاروانی بێ کۆتایی،

-چاپی یەکەم سلێمانی-2000 (دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم).

-چاپی دووەم، سلێمانی 2000 (لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپکراوە).

## دووەم-وەرگێران:

*1*-دەروێشەکان بەدوای راستیدا ئەگەڕێن، شانۆگەرییەکی سیاسییە، نوسینی:مستەفا حەللاج. لەگەڵ نوسینی پێشەکییەك بۆ دەقە کوردییەکەی.

- چاپی یەکەم، ئۆپسالا-*1983*.

-چاپی دووەم-سلێمانی*2000*.

*2*-جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لەخەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسیی، نوسینی: پرۆفیسۆر رادوڤان پاڤیچ، لەگەڵ نوسینی پێشەکییەك و رێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ دەقە کوردییەکە.

-چاپی یەکەم-ستۆکهۆڵم-*1985*.

-چاپی دووەم- کوردستان-*1986*(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان چاپ و بلاوی کردەوە).

*3*-کورتەی مێژوی فەلسەفە-بەرگی یەکەم-سوید-*1988* لەگەڵ نوسینی پێشەکییەکی *39*لاپەڕەیی لەژێر ناوی: " ئەم بەرهەمەو فەلسەفەو وشەیەك بۆ جولانەوەی نیشتمانیی کوردستان و نرخاندنی زانستیانە"لەگەڵ رێکخستنی فەرهەنگیلەیەك بۆ لێکدانەوەی زاراوە فەلسەفی و سیاسییەکان.

*4*-لەپێناوی گەشەپێدانی ئەرشیفە نوێ دامەزراوەکانی کوردستان (چۆن ئەرشیف دادەمەزرێنرێت)سلێمانی *2000*.

## سێهەم-بەرهەمی تری نوسەر کەبەناوێکی ترەوە بلاوکراوەتەوە:

-خەباتی کرێکاران-سلێمانی *1973*؛ بەناوی یەکێتی نەقابەکانی پارێزگای سلێمانی بلاوکراوەتەوە.

## چوارهەم-

لەگەڵ دەیان دیدەنیی و لێکۆڵینەوەو باسی بلاوکراوە لەگۆڤارو رۆژنامەدا، لەوانە: رۆژنامەی: خەبات، النور، برایەتی، التآخی، کوردستانی نوێ، الاتحاد، ئالای ئازادیی. گۆڤاری: رزگاری، گزینگ، مامۆستای کورد، رابوون، نوێدەم، ئاران، پەیڤین، نڤار، رۆژنامەی *UPPSALANYATIDNING*(بەزمانی سویدیی).

## چەند تێبینییەکی پێویست

**یەکەم:** بەرگێکی نوێی سەرچەمی بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی جمهوری کوردستان.

یەکێك لەو کارە مێژووییانەی بەدەستمەوەیە چاپکردنەوەی هەرسێ بەرگەکەی (دەوڵەتی جەمهوریەتی کوردستان)ە کە لە ساڵەکانی 1992 و 1995 و 1997دا لە سوید چاپکران، لە یەك بەرگی نوێی رێکخراودا، بە پێی کرۆنۆلۆجیی، سەرجەمی دوکمێنتەکانی ئەم کارە بەڵگەنامەییەو بەم چاپە نوێیەی بەرهەمێکی مێژوویی گرنگ و تەواوکاریی ئەم بەرهەمەی بەردەستتانەو هیوامە لە ئایندەیەکی نزیکدا رووناکی ببینێت.

**دووەم:** وەك سەرنج ئەدەن لە بەشی سەرەوەی تایتڵەکانی هەموو لاپەرەکانی ئەم کتێبەدا (جمهوریەتی کوردستان) نوسراوە ئەوەش لە رووی ئیملاییەوە دەبوایە وەك ناوی کتێبەکە (جەمهوریەتی کوردستان) بوایە.. هەرچەندە لە زۆر بەڵگەنامەی سەردەمەکەدا بەوجۆرەش نوسراوە.

**سێهەم:** هەندێ هەڵەی چاپو پەراندن لەم بەرهەمەدا روویداوە خوێنەری بەرێز بە سەلیقەی خۆی راستیان دەکاتەوە لەگەڵ داوای لێبوردن ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

* ل7 دێری 3 وشەی (میللەتان) هەڵەیە راستیەکەی وشەی(میللەتەکەمان)ە.

*ل71 بروانە: کوردستان و الحرکە القومیە الکردیە، جلال تاڵەبانی، بغداد 1970.

* ل87 دێری 5 وشەی (نەهاتووە) هەڵەیە راستیەکەی (هاتووە)یە.

* ل 116 ئەم بەیاننامەیەی ژ.ك لە (د.ئەمیری حەسەنپوور)ەوە بە دەستم گەیشتووە.

* ل 150 یەکەم چواردێری ژێر سەرباسی (هەینەی رەئیسەی میللی کوردستان) بەم جۆرەیە: "ئەم ناوە، زیاتر لە هەموو ناوە حکومەتییەکانی تر بەکاردەهات پێش راگەیاندنی دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان (قازی محەمەد) سەرۆکی بووە".

*ل186، دێری چوارەم، ژمارەکانی 1 و 3ی هاوپەیوەند بە پەراوێز: بروانە کتێبەکەی قاسملو (کوردستان و کورد) چاپی 1973. ل145، 147

*ل245-255 ژمارەکانی 4 بۆ 11ی هاوپەیوەند بە پەراوێزەوە (34 - 41)ە. کە زنجیرەکەی بە مجۆرەیە:

34- هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل23

William Eagleton, op. Cit. P.70-35

36- احمد شریفی، سەرچاوەی ناوبراو، ل41

37- هێمن، سەرچاوەی ناوبراو، ل24

38- شێروان، وەڵامێك بۆ نامیلکەی "30 یەمینساڵی بزوتنەوەی پیرۆزی 2ی رێبەندانی گەلی کورد" چاپی 1977، ل13

39- شێروان، هەمان سەرچاوە، ل9

40- تێکۆشەر، نامیلکەی ناوخۆی حیزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە 12، ل4

41- د. عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی ناوبراو، ل107

**چوارەم:** دەبو دەستخەتی نامەکەی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد لەگەڵ تایپکراوەکەیدا دابنرایە، بۆ سەرنجدان لەو دەستخەتە بروانە: دەوڵەتی جمهوری کوردستان بەرگی سێیەم، چاپی سوید 1997، ل749.

# زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ساڵی 2001

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| 94 | خەونە ترسناکەکانی یوسف | بەرزان فەرەج | |
| 95 | سەرەتاکانی سۆسیۆلۆژیا | | شوان ئەحمەد |
| 96 | عێلی جاوان | د. مستەفا جەواد | م. جمیل رۆژ بەیانی |
| 97 | هێماگەریەتی | | پێشڕەو حسێن |
| 98 | دەروازە | | هەڵکەوت عەبدوڵا |
| 99 | زۆربا | نیکۆس کازانتزاکیس | ڕەووف بێگەرد |
| 100 | بینای هونەری چیرۆکی کوردی | پەرێز سابیر محەمەد | |
| 101 | دەڕۆم پێکەنینی دەریا ببینم | سەلاح گوڵ ئەندامی | |
| 102 | بزوتنەوەی روانگەو شیعری نوێی کوردی | شادمان قادر حەسەن | |
| 103 | چیرۆکی وڵاتە دوورەکان | | حەمە رەشید |
| 104 | زمان و زانستی زمان | | د.محەمەد |
| 105 | چەند شانۆنامەیەك بۆ منالآن | | فاروق هۆمەر |
| 106 | شانۆگەریەکانی سلێمانی لە سالآنی (1926-1961)دا | یاسین قادر بەرزنجی | |
| 107 | گۆڤاری (دیاری کوردستان) | ئا: رەفیق ساڵح | |
| 108 | وا بەهار هات | حاجی جوندی | جەلال دەباغ |
| 109 | لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا | | ئازاد بەرزنجی |
| 110 | زەردەشت وای گوت | فردریك نیتشە | ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی |
| 111 | پیاوە سپییەکە | | خەبات عارف |
| 112 | دەفتەری شیعر | لەیلان سەعددەدین | مەهاباد صاڵح |
| 113 | بنەماکانی فسیۆلۆژی مرۆڤ | ئەکرەم قەرەداغی | |
| 114 | وانەی ئەم سەدەیە | کارل پۆپەر | شۆڕش جوانڕۆیی |
| 115 | کوردەکان | حەسەن ئەرفەع | سەردار محەمەد |

نرخی (40) دینارە

*ل، 75 بۆچوونەکەی سید محمدی حمیدی، سەرچاوەکەی: کوردستان ژمارە(69).
*ل. 80 دێڕی 12 (کۆمەڵەی ژیانی کورد) هەڵەیە، راستییەکەی(کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کورد)ە وەك لەو سەرچاوەیەدا هاتووە، ساڵی دامەزراندنەکەشی (1942)ە نەك 1943 وەك لەو لاپەڕەیەدا ئاماژەم بۆ کردووە.
*ژمارەکانی(10, 11, 12)ی هاوپێوەند بە پەراوێزەوە، بڕوانە: د.ج.ك بەرگی یەکەم سوید 1992 ژمارەی بەڵگەنامەکان(72, 97, 209).
*ل297-ژمارە(13)ی هاوپێوەند بە پەراوێزەوە، لە ل(290)ی کتێبەکەی علاءالدین سجادی-یە نەك ب. ئەلوەند.
*هەمان لاپەڕە- ژمارە(14)(ب. ئەلوەند)ە نەك زانا.
-ل 298 ژمارە(15)دووجار نوسراوە، یەکەمیان: نوسەرەکەی(زانا)یە.
دووەم، نوسەرەکەی(هێمن)ە.
-ل327، بەشی هەشتەم لە پاری دووەم، ژمارە(28)ی هاوپێوەند بە پەراوێزەوە دەکرێتە (20) سەرچاوەکەشی: کەریمی حسامی، کاروانێك لەشەهیدانی کوردستانی ئێران، ل 19.
-ل328، ژمارە (29)ی هاوپێوەند بە پەراوێزەوە هەڵەیەو راستییەکەی (21)ە بۆ درێژەی باسی رووداوەکانی ناو هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان لەو رۆژگارەدا، بڕوانە:

- حسن محمد، سەرچاوەی ناوبراو.
- علاء الدین سجادی، سەرچاوەی ناوبراو.
- سلیم طه التکریتی، سەرچاوەی ناوبراو.
- عبدالرحمن قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی.

